ئاستانه

# دیرگـــەلێک لە
# نەقڵ و عەقڵ و هزردا



نووسینی: عەبدولعەزیز تەڕیفی
وەرگێڕانی: هەڵمەت موحەممەد





عەبدولعەزیز تورەیفی

عەبدولعەزیز مەرزوق طەریفی لە ساڵی ١٣٩٦ کۆچی بەرانبەر ١٩٧٦ زایینی لە وڵاتی کوێت لە دایک بووە، دواتر چووەتە وڵاتی سعوودییە و، هەر لەوێش قۆناغەکانی خوێندن و، زانکۆی تەواوکردووە.

شێخ لەسەرەتاکانی تەمەنیدا هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە و چەندین وڵات گەڕاوە بۆ بەدەستهێنانی زانستە شەرعییەکان، لەوانە: مەغریب، توونس، میسر، هیندستان و عێراق و، لەلای زۆرێک لە موفتی و زانایانی جیهانی ئیسلامی زانستە شەرعییەکانی خوێندووە و ئیجازەی عیلمی و مۆڵەتی زانستی پێدراوە، شێخ یەکێک بووە لەو زانایانەی بە هەڵوێستی مەردانە و چاونەترس و حەقبێژی ناسراوە، لەسەر هەڵوێستی مەردانەی لە ساڵی ٢٠١٦ لەلایەن دەسەڵاتدارانی سعوودیەوە زیندانی کراوە و تاوەکوو ئێستا لە زینداندایە بەبێ هیچ تاوانێک!

دیارترین نووسراو و بەرهەمەکانی:

- التحجيل في تخريج مالم يخرج من الأحاديث والآثار في إرواء الغليل .
- زوائد سنن أبي داود على الصحيحين .
- الحجاب في الشرع والفطرة بين الدليل والقول الدخيل.
- الاختلاط: تحرير وتقرير وتعقيب.
- التفسير والبيان لأحكام القرآن.
- العقلية الليبرالية في رصف العقل ووصف النقل.
- الحرية بين الفكر والكفر.
- المغربية في شرح العقيدة القيروانية.
- الخرسانية في شرح عقيدة الرازيين.
- فصول في العقيدة: الرسالة الشامية.
- توحيد الكلمة على كلمة التوحيد.
- الفصل بين النفس والعقل.
- المعتزلة في القديم والحديث.
- الغناء في الميزان.
- العلماء والميثاق.

ناوی نووسەر : عەبدولعەزیز ئیبن مەڕزوق الطریفي
ناوی وەرگێڕ : هەڵمەت موحەممەد
دیزاینی ناوەوە و بەرگ : ڕێکخراوی ئاستانە
نۆبەتی چاپ : یەکەم ٢٠٢٣
تیراژ : ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (١٣٦٣) ی ساڵی ٢٠٢٣ پێدراوە

# کورتەیەک لە ژیانی شێخی طەریفی

ناوی: عەبدولعەزیز کوڕی مەڕزوق طەریفییە

وەک سیوطی لە کتێبی (الأنساب)دا دەڵێت: "طەریفی بە فەتحەی طاء و بە کەسرەش دەخوێندرێتەوە و بەشێکە لە هۆزی «طەیء».

لەدایکبوونی:

لە بەرواری ١٣٩٦/١٢/٧کۆچی لە دەرەوەی زێدی خۆی لەدایکبووە. خۆیی و براکانی لە کوێت لەدایک بوون بەهۆی کاری باوکیانەوە کە بە دوای ڕۆزیدا گەڕاوە. باوکی لە گەنجیدا، لە سەرەتای شەستەکاندا ڕۆیشتووە بۆ کوێت و مووسڵ و میسر بۆ کارکردن.

خوێندنی ئەکادیمی:

لە کۆلێژی شەریعە لە «زانکۆی میر موحەممەدی کوڕی سعوک د» لە شاری ڕیازی پایتەختی سعوودیە زانکۆی تەواو کردووە.

وەک توێژەرێکی زانستی، لە وەزارەتی کاروباری ئیسلامی کاری کردووە، پاشان بەڕێوەبەری توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکان بووە لە ناوەندی توێژینەوەکان، پاشان وەک توێژەرێکی زانستی کاری تێدا کردووە.

پرسیار لە شێخ کراوە دەربارەی دەستکردنی بە زانست و چۆنیەتی خوێندنی زانست؟

لە وەڵامدا گوتوویەتی: یەکەم مەتن کە لە تەمەنی ١٣ساڵیدا لەبەرم کرد،

بریتی بوو لە مەنظومەی (البیقونیة) لە زانستی فەرموودەناسیدا.

لە سەرەتادا شێوازێکی دیاریکراوم نەبوو، بەڵام دەستم کرد بە خوێندنەوە و لەبەرکردن. خوێندنەوەیەکی چڕوپڕم هەبوو، لە ١٥ ساڵیدا چەندان بەرگ کتێبم خوێندبووەوە، وەک تەفسیری (ابن كثير و زاد المعاد و سیرەی ابن هاشم و فەتاوای ابن تيمية) و جگە لەمانەش.

مرۆڤ لە فێربوونی زانست دوایی نایەت، زانست وەرگرتن دەبێت لە منداڵییەوە تاکوو ناوگۆڕ بێت، لەگەڵ ئەوەشدا تەنیا دەتوانیت کەمێک زانست کۆ بکەیتەوە، چونکە زانست دەریایە، دەریا!

هەفتانە چەند وانەیەکی کەم ئامادە دەبووم، بەنزیکەیی هەفتەی سێ وانە، بەڵام زۆرینەی کاتەکانم سەرقاڵی خوێندنەوە و کورتکردنەوە بووم، بەبێ پەیوەستبوونم بە زانستێکی دیاری کراوەوە. خوێندنەوەم لە هەریەک لە بوارەکانی: عقیدە، فقهـ، سیرە، مێژوو، زمانەوانی، شعر، ئەدەب و... هەبووە. هەروەها زۆر سوودم لە پوختکردنەوەی کتێبە درێژەکان بینیوە.

لە تەمەنی ١٧ و ١٨ ساڵیمدا، کتێبی تەفسیری (ابن كثير) و (زاد المعاد) م کورت کردووەتەوە لەگەڵ هەندێک لە (المغنی) و هەندێک لە بەشەکانی (فەتاوای ابن تيمية)، بەردەوام ئەم کتێبانەم لە کتێبخانەکەمدا پاراستوونە و چەندجار پێداچوونەوەم بۆیان کردووە.

هەروەها پێڕستی تەواوم بۆ (فەتاوای ئیبن تیمیة) داناوە.

بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، مرۆڤ دەبینێت کە چەند هەڵەی کردووە لە وەرگرتنی زانستدا و کەم کەمە دەست دەکات بە ڕاستکردنەوەیان.

خوێندنەوە و گەڕان، گرینگترین شتن کە فێرخواز زۆرینەی کات پێوەی سەرقاڵ ببیت.

ئەو کەسانەی لای خوێندوویەتی و ئەو مەتنانەی لەلای زانایان لەبەری کردوون و خوێندوونیەتییەوە:

پێشتر باسم کرد، یەکەم مەتن کە لەبەرم کرد (البيقونية) بوو لە تەمەنی ١٣ ساڵیمدا، پاشان پێش و دوای باڵغ بووون زۆرێک لە مەتنەکانم لەبەرکرد لە: (الإصول الثلاثة)، (كشفى الشبهات)، (كتاب التوحيد)، (فضل الأسلام)، (منظومة الرحيبة) و (بلوغ المرام) و سەدەها دێڕە شعر تاکوو ١٨ ساڵی، پاشان لەو ساڵەوە دەستم کرد بە لەبەرکردنی (سەحيح البخاري)، پاشان (سەحيح مسلم)، پاشان (سنن أبي داود) پاشان ئەوانی دیکە.

ئەو کتێبانەی کە خوێندوویەتیەوە بەسەر زانایاندا:

زۆرینەی کتێبەکانم لە دەرسەکاندا گوێ لێبووە و خوێندوەی من بەسەر زانایاندا کەم بووە، هەندێک لە (سنن أبي داود) و (البخاري) و هەندێک لە (علوم الآلة) بووە.

شێوازی لەبەرکردنی فەرموودەکان بەتایبەت سەنەدەکانی:

فەرموودەکان بە شێوازی دووبارەکردنەوە لە بەرم کردوون. کێشەی فێرخواز لە بەردەوام نەبووندایە، چونکە پچڕان دەبێتە هۆکاری سەختی لە لەبەرکردندا. ڕێژەی ئەو فەرموودانەشی لەبەرم دەکردن لە ڕۆژێکدا ٣٠ تا ٥٠ فەرموودە دەبوو، هەندێک جار زیاتر و هەندێک جاریش کەمتر.

ئەگەر فەرموودەکە سەحیح بووبێت، سەنەدەکانیشم لەگەڵ فەرموودەکەدا لەبەر کردوون. خۆ ئەگەر کێشەی تێدا هەبووا، ئەوە هەموو ڕێگەکانیم لەبەر دەکرد.

**خوێندنەوەی ڕۆژانە و ئەو کتێبانەی خوێندوویەتییەوە:**

ئەو کتێبانەی خوێندوومەتەوە زۆرن و باسکردنیان کاتی دەوێت، بەڵام

زۆرێک لە کتێبەکانی سوننەت ئەمانەن:

- سونەنی بەیهەقي
- سونەنی سەعیدی کوڕی مەنسوور
- سەحیحی (ابن خريمة و ابن حبان)
- موسەنەفی (ابن ابی شیبة و عبدالرزاق) (زیاد لە جارێک)
- (المحلی ابن حزم) (چەند جارێک)
- (الأوسط)ی ئیبن مونذیر
- (معرفة السنن)
- (الآثار)ی پێشەوا بەیهەقی
- سونەنی دارەقوطنی

لە کتێبە ففیقهییەکانیش

- لە فیقهی مالیکی:
- (التمهید)
- (الاستذکار)ی ئیبن عەبدولبەر
- (المدونة)
- (المقدمات)
- زۆرێک لە شەرحی (الرسالة)... هتد.

لەفیقهی ئەبی حنیفەشدا:

- (الحجة على أهل المدينة)

- (الآثار)ی ئەبی یوسف

- (حاشية)ی ئیبن عابدین

لە فیقهی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا، هەموو مسائلەکانی ئەحمەدی کە زانیبێتم، وەک:

- مسائل پێشەوا ئەحمەد بە گێرانەوەی (• عبدالله • مسائل صالح • مسائل ابن هاني • مسائل خلال • مسائل ابي داود • مسائل الكوسج)

- شەرحی زەرکەشی لەسەر (مختصر الخرقي)

- (شرح الكبير)

- (كشاف القناع)

- (منار السبيل) چەند جارێک... هتد

لە فقهی شافعي کتێبی:

- (الأم)

- (المجموع)

- (الشرح الكبير)... هتد

کتێبی تەفسیر زۆرینەی تەفسیرە موسنەدەکانم خوێندووەتەوە وەک:

- تەفسیری (الطبري)

- (ابن ابي حاتم)

- (البغوي)

- تەفسیری (ابن المنذر) بەدەستنووس پێش چاپکردنی

- تەفسیری (ابن كثير)

خوێندنەوەی پچڕ پچڕیشم بۆ تەفسیرەکانی (القرطبي)، (ابن عطية)، (الزمحشري) و (الثعلبي) و جگە لەمانەش هەبووە.

لە کتێبی مێژوودا:

- کتێبی (الطبقات)

- (تاريخ الأسلام) ذهبی

- (تاريخ دمشق) ابن عساكر

- (البداية و النهاية) ابن كثير

کاتی خوێندنەوەشم دیاری کراو نییە، لەنێوان ١٠ بۆ ١٣ سەعاتدایە بەپێی کات و کورتی و درێژی وەرزەکان.

ئەو زانایانەش کە لێیانەوە فێربووە:

- زانای پایەبەرز (عبدالعزیز ابن باز) کە چوار ساڵ لە دەرسەکانی ئامادە بووم، لەو ماوەیەدا هەندێک وانەی زۆر کەم ئامادەیی نەبووم.

- محمد عبدالله صومالی المكي

- (الأثیوبی) لە (نحو) و لە (صرف)دا

- دکتۆر (اديب محمد أجمل الأصلاحى)

- (صفى الرحمان المباركفورى)

- (محمد البرني هيندى) کە کتێبی (فتح البارى) لا خوێندووە.

- (عبدالله بن عقيل)

- (عبدالرحمان البراك)

- (شيخ عبدالكريم الخضير) کە (الباحث الحديث)ی لا خوێندووە بەسەریدا بە تەنیا لە ساڵی ١٤١٨ک.

- (شيخ صالح آل الشيخ) کە کتێبی (مفردات غرائب القران) و (سنن أبی داود)ی خوێندووە بەسەریدا لە ساڵی ١٤١٨ک.

ئەو کتێبانەی ڕاڤەی کردووون:

- (شرح العلل)ی (ابن رجب)

- (علل)ی (ابن المديني)

- (المنتخب لە علل) ی (خلال)

- سونەنی (الترمذي)

- (المحرر) (ابن عبدالهادي)

- (كتاب التوحيد) (محمد كوڕی عبدالوهاب) چەندجارێک

- (التميز المسلم)

- (نخبة الفكر) چەند جارێک

- (الموقظة)ی (ذهبي) چەند جارێک

- (الأربعون النووية) چەند جارێک

- (سەحیح البخاری) تا (کتاب الصلاة)

- (زاد المستقنع) و جگە لەمانەش

## کتێبە چاپکراوەکانی:

- (التحجيل في تخريج مالم يخرج من الأحاديث و الاثار في إرواء الخليل)

- (الغناء في الميزان)

- (المعتزلة في القديم والحديث)

- (المسانيد التفسير)

- (صفة صلاة النبي)

- (الحجاب في الشرع والفطرة)

- (العقلية اللبرالية في رصف العقل ووصف النقل)

- (التفسير والبيان لأحكام القران)

- (زوائد سنن أبى داود على سەحیحین و

- الكلام على علل بوضى حديثه)

- (شرح حديث جابر الطويل فى صيفة حجة النبى)

- (الإعلام بتوضيح نواقض الأسلام)

- (توحيد الكلمة على كلمة التوحيد)

# بیروباوەڕ، چەند حوکم و حیکمەتێک

* پۆلێنکردنی خەڵکی بۆ بێباوەڕ و باوەڕدار حوکمێکی خوداییە: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنْكُمْ كَافِرٌ وَمِنْكُمْ مُؤْمِنٌ﴾ [التغابن:٢] «خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروست کردووە، ئەوجا هەندێکتان بێباوەڕ و هەندێکیشتان باوەڕدارن.»

گەڕان بەشوێن دەستەواژەی سێیەم لە شەریعەتدا، دەستووەردانێکی بێهودەیە و هاوشێوەی گەڕانە بەشوێن ڕەگەزی سێیەم لەناو سروشتدا.

* مرۆڤایەتیی مرۆڤ کامڵ نابێت، تەنها بە باوەڕبوون بە خودای تاک و تەنها نەبێت، خودا دەفەرمووێت: ﴿آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ﴾ [البقرة:١٣] باوەڕ بهێنن وەک چۆن خەڵک باوەڕیان هێناوە.

* لاوازترین عەقڵ دەتوانێت بەرەو باوەڕهێنان بە خودا بتبات.

عەلی کوڕی ئەبوو تالیب بەو کەسەی فەرموو کە گومانی لە بوونی خودا هەبوو: "ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاست بێت، ئەوا هەردووکمان دەربازمان بووە، وەگەرنا من دەربازم بووە و تۆ تیاچوویت."

* باوەڕبوون بە خودا عەقڵ کامڵ دەکات و هەڵەی کەم دەکاتەوە، ئەو کەسەی بەهێزترین باوەڕی هەیە، کەمترین هەڵەی هەیە، لە فەرموودەیەکدا پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «لا يلدغ المؤمن من جحر مرتين»، «بڕوادار لەیەک کونەوە دووجار ناگەزرێت.»

* ئەگەر باوەڕ بە میرات بگیرایە، ئەوا کوڕەکەی نووح باوەڕەکەی باوکی بە میرات دەگرت، خۆ ئەگەر بێباوەڕیش بەو جۆرە بووبا، ئەوا دەبوو ئیبراهیم

بێباوەڕیی باوکی بە میرات بگرتبووبا: ﴿وَلا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلا عَلَيْهَا﴾ [الأنعام:١٦٤]، «هیچ نەفسێک هیچێک کردەوە پێش ناخات مەگەر ئۆباڵی بە ئەستۆی خۆیەتی.»

* خودا ڕێگری کرد لە ئیبراهیم داوای لێخۆشبوون بۆ باوکی بکات، ڕێگریشی کرد لە پەیامبەر داوای لێخۆشبوون بۆ دایکی بکات «استأذنت ربي أن أستغفر لأمي فلم يأذن لي» مۆڵەتم لە پەروەردگار خواست داوای لێخۆشبوون بۆ دایکم بکەم، بەڵام مۆڵەتی نەدام.

هیچ هاوبەشدانەرێک بە ئەندازەی دایک و باوکی پەیامبەرێک لە دەروونقدا گەورە نییە.

* ڕەچەڵەک و نەژاد بۆ یەکترناسینە، ئایینیش بۆ نزیکبوونەوەیە، کەواتە موسڵمانێکی دوور لە پێشترە بە دۆستایەتی و پشتیوانی لە کافرێکی نزیک: ﴿وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ [الحجورات:١٣] «کردوومانن بە چەندان گەل و هۆز، تاکوو یەکتری بناسن. بەڕێزترینتان لای خودا، پارێزکار و تەقوادارترینتانن.»

* دۆستایەتی و پشتیوانیکردنی کافران لە دژی باوەڕداران هێز و شکۆیەکی وەهمی و خەیاڵی و ڕسوایی و دۆڕانێکی یەکلا و حەتمییە: ﴿الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ [النساء:١٣٩]

«ئەوانەی دەبنە دۆستی بێباوەڕان و لە کۆمەڵی باوەڕداران دەتەکنەوە، ئاخۆ بەتەمان کە لای وان قەدر و حورمەتیان دەستکەوێت؟ با بزانن کە قەدر و ڕێز هەمووی تەنیا لەلای خوایە.»

* سوپاسکردنی کەسی چاکەکار بەشێکە لە ڕەوشتبەرزی، هەرچەندە

کەسەکە بێباوەڕیش بێت، بەڵام ئەو بێباوەڕە بەسەر موسڵمانێکی تاقانەپەرەستدا سەرناخرێت هەرچەندە موسڵمانەکە خراپەکار و تاوانباریش بێت، چونکە دادگەری لەگەڵ خوادا لەپێشترە لە دادگەری لەگەڵ دروستکراوەکانیدا.

* تووڕەبوون پێوەر و تەرازووی باوەڕ و خۆشەویستییە، ئەو کەسەی خۆشت دەوێت بێگومان لەپێناویدا تووڕە دەبیت، عائیشە دەفەرمووێت: "سوێند بەخوا هەرگیز پێغەمبەری خوا لەپێناو خۆیدا تووڕە نەبووە، تا ئەو کاتەی سنوورێکی خودا دەبەزێندرا ئەوکات لەپێناو خودادا تووڕە دەبوو."

* هەرکات تووڕەبوون لەپێناو خود و بنەماڵە و هۆز زیاتر بوو، لە تووڕەبوون لەپێناو خوادا، ئەوە نیشانەی دەرخەری لاوازی باوەڕە. ئەمە پێوانەیەکی تەواو دادگەرانەیە تاکوو هەموو تاکێک خۆی پێ بپێوێت و خۆی پێ بناسێت و بەهۆیەوە دەروونی چاک بکات.

* مرۆڤی هاوەڵدانەر ستەمی لە مافەکانی خوادا کردووە، هەرچەندە مامەڵەی بەرانبەر بە تۆ دادگەرانە و چاک بێت، ئەو کەسەی لە بابەتێکدا لە بەرانبەر تۆ دادگەر بووە، بەڵام هەموو مافەکانی باوکتی داگیرکردووە، ئەو کەسە بە ستەمکار لەقەڵەم دەدەیت. نموونەی هەرە بەرز بۆ پەروەردگارە، بێباوەڕانی بەدیهێناوە و بەڵام ئەوان مافەکانی پێشێل دەکەن.

* سزای گشتی و لەناوبەر دانابەزێتە سەر هیچ ئوممەتێک مەگەر کاتێک بێباوەڕییان لێ بەدەربکەوێت لەپاش ئەوەی کە باوەڕدار بوون: ﴿ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلا الْكَفُورَ﴾ [السبأ:١٧] «ئا بەو جۆرە تۆڵەمان لێ سەندن بەهۆی ناسوپاسی و کوفریانەوە و ئایا جگە لەوانەی زۆر سپڵەن تۆڵە لە کەس ئەسەنینەوە.؟»

* باوەڕ و دابینبوونی ئاسایش وابەستەی یەکترین، باوەڕ هۆکاری بوونە، ئارامی و ئاسایشیش پارێزەریەتی بۆ بەردەوامبوونی.

* خودا دەوڵەتی موسڵمانان هەرەس پێناهێنێت ئەگەر لەسەر ڕێبازی پەیامبەران بن، بەڵکوو جێگیریان دەکات تا ئەو کاتەی لە ڕێگە لادەدەن، ئەوکات هەرەس دەهێنن. سەرجەم شانشینەکانی ئیسلام لە وەختی لادانیاندا شکستیان هێناوە و لەناوچوون، نەک لە وەختی دەستگرتنیان بە ئایینەوە.

* هەندێک جار خودا دەسەلاتی دەوڵەتانێک بەردەوام دەکات هەرچەند لەسەرەتاشەوە لەسەر کوفر بووبن و ئیسلام نەبووبن، بەڵام خودا دەوڵەتێک ناهێڵێتەوە ئەگەر پێشینیان لەسەر ئیسلام بووبن کەچی ئەوان لابدەن و جگە لە ئیسلام هەڵبژێرن، لەبەرەوەی دابی خودا بەو جۆرەیە کە شتەکان بە ڕووخانی بنچینەکانیان دەڕووخێن.

* ئیسلام لە زەویدا هاوشێوەی خۆرە و هەرگیز ئاوا نابێت، ئەگەر لە شارێک ئاوا بێت، ئەوا لە شارێکی دیکە دەدرەوشێتەوە.

* ئیسلام ژیانە و کوفر مردنە، هەرچەندە باوەڕی ئوممەت کەم بکات، ئەوا نەخۆشی و دواکەوتنیان زیاد دەکات: ﴿يا أيها الذين آمنوا استجيبوا لله وللرسول إذا دعاكم لما يحييكم﴾ [الأنفال:٢٤] «ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە وەڵامی خوا و پێغەمبەر بدەنەوە کاتێک کە بانگتان دەکەن بۆ لای ئەوەی (ئایینەی) کە زیندووتان دەکاتەوە.»

* ئیسلام وەک شاخێکی ڕەگداکوتیو وایە، لەترسی لەناو چوونی بەرگری لێ ناکەین، بەڵکوو لەترسی پچڕان و بزربوونی ڕێی ئەوانەی ئەو ڕێبازەیان گرتووەتە بەر بەرگری دەکەین.

* ئیسلام بۆ چاککردن و ڕێکخستنی دین و دونیا هاتووە، کورتکردنەوەی لە دیندا تێکدانی دونیایە؛ کورتکردنەوەی لە دونیاشدا، تێکدانی دینە.

* ئیسلام یاسا و ڕێسای ئوممەتە و لادان لێی ئەستەمە، چونکە هاوڕای

سروشتی مرۆڤ دابەزیوە، بەڵام ڕاگەیاندنەکان ئیسلام وەها نیشان دەدەن کە تەنها ئاکار و ڕەوشتە و بەس، بانگخوازانی لەو جۆرە پێش دەخەن، تاکوو لایەنە گەورەکەی ئایین بشارنەوە.

* ئیسلام تەواو نابێت، تەنها بە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە نەبێت. بە ڕێگری لە خراپە، هەموو خراپەکان لە ناوخۆی ئیسلام لادەچێت و ئیتر شێواوی ڕووی تێناکات. هەروەها فەرمانکردن بە چاکەش دەبێتە هۆی هێنانی هەموو خێر و بێرە دەرەکییەکان و ئیتر کەم نابێتەوە.

* قیامەت هەڵناستێت تاکوو ئیسلام بەسەر هەموو ئایین و دەستوورەکانی سەر زەویدا سەرنەکەوێت: ﴿هُوَ الَّذِی أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ [التوبة: ٣٣]

«خوا زاتێکە کە پێغەمبەرەکەی ناردووە بە ڕێنموونی و ئایینی ڕاست، بۆئەوەی زاڵی بکات بەسەر هەموو ئایینەکاندا با موشریکانیش پێ یان ناخۆش بێت.»

* ئیسلام وەک چەرخ و تایەیە دەڕوات و دەسووڕێتەوە و شەخەڵ و پیسی پێوە دەنووسێت، بەڵام بە ڕۆیشتنی فڕێی دەدات و زیان بە ئیسلام ناگەیەنێت، بەڵام فیتنە و ئاشووب لەوەدایە کە شۆفێری ئەو چەرخە دەکات و بەرەو شوێنێک دەیبات کە خودا نایەوێت.

* ئیسلام پۆشاکێکە ئەوانەی کە دەیانەوێت، دەتوانن بیپۆشن. فیتنە و بەڵا لەوانەدا نییە کە نەیان پۆشیوە، چونکە ڕووتی و بێبەرگییان ئاشکرا و دیارە، بەڵکوو ئاشووب و بەڵا لەوانەدایە کە ئەو پۆشاکەیان بە هەڵگەڕاوەیی پۆشیوە، ئەم کارەیان ئەگەر ببێتە هۆی پۆشینیان لە دونیادا، ئەوا لە دوارۆژدا نایان پۆشێت.

سروشتی مرۆڤ دابەزیوە، بەڵام ڕاگەیاندنەکان ئیسلام وەها نیشان دەدەن کە تەنها ئاکار و ڕەوشتە و بەس، بانگخوازانی لەو جۆرە پێش دەخەن، تاکوو لایەنە گەورەکەی ئایین بشارنەوە.

* ئیسلام تەواو نابێت، تەنها بە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە نەبێت. بە ڕێگری لە خراپە، هەموو خراپەکان لە ناوخۆی ئیسلام لادەچێت و ئیتر شێواوی ڕووی تێناکات. هەروەها فەرمانکردن بە چاکەش دەبێتە هۆی هێنانی هەموو خێر و بێرە دەرەکییەکان و ئیتر کەم نابێتەوە.

* قیامەت هەڵناستێت تاکوو ئیسلام بەسەر هەموو ئایین و دەستوورەکانی سەر زەویدا سەرنەکەوێت: ﴿هُوَ الَّذِی أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ [التوبة: ٣٣]

«خوا زاتێکە کە پێغەمبەرەکەی ناردووە بە ڕێنموونی و ئایینی ڕاست، بۆئەوەی زاڵی بکات بەسەر هەموو ئایینەکاندا با موشریکانیش پێ یان ناخۆش بێت.»

* ئیسلام وەک چەرخ و تایەیە دەڕوات و دەسووڕێتەوە و شەخەڵ و پیسی پێوە دەنووسێت، بەڵام بە ڕۆیشتنی فڕێی دەدات و زیان بە ئیسلام ناگەیەنێت، بەڵام فیتنە و ئاشووب لەوەدایە کە شۆفێری ئەو چەرخە دەکات و بەرەو شوێنێک دەیبات کە خودا نایەوێت.

* ئیسلام پۆشاکێکە ئەوانەی کە دەیانەوێت، دەتوانن بیپۆشن. فیتنە و بەڵا لەوانەدا نییە کە نەیان پۆشیوە، چونکە ڕووتی و بێبەرگییان ئاشکرا و دیارە، بەڵکوو ئاشووب و بەڵا لەوانەدایە کە ئەو پۆشاکەیان بە هەڵگەڕاوەیی پۆشیوە، ئەم کارەیان ئەگەر ببێتە هۆی پۆشینیان لە دونیادا، ئەوا لە دواڕۆژدا نایان پۆشێت.

# مەزنڕاگرتنی خودا و ئایینەکەی و حوکمی بەرهەڵستکاریکردنی

* جوێندان بە خودا لە هاوەڵدانان و هەموو تاوانە لەناوبەرەکان گەورەترە، چونکە کوفرێکە پلەی لە سەرجەم کوفرەکان بەرزترە: ﴿وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ [الأنعام:١٠٨]

«جنێو مەدەن بەو بت و پەرستراوانەی کە ئەوان دەیانپەرستن لە غەیری (اللّٰه) جا ئەوانیش نەزانانە و دوژمنکارانە جنێو بە خودا بدەن.»

چونکە ئەمە کوفرێکە لەسەروو کوفرەکەی خۆیانەوە.

* ئەو کەسەی جوێن بە خودا دەدات لە کەسی مولحیدیش خراپترە، چونکە مولحید دەڵێت وانازانم کە بەدیهێنەرێک بوونی هەبێت، بەڵام جوێندەر بوونی خودا دەچەسپێنێت و جنێویشی پێ دەدات.

* هاوەڵدانەران ئاستی خودایان دانەبەزاندووە بۆ لای بت وبەردەکان، بەڵکوو ئاستی بت و بەردەکانیان بەرزکردووەتەوە و هاوتای پەروەردگاریان کردووە: ﴿إِذْ نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ [الشعراء: ٩٨] «کاتێک ئێوەمان دەبردە ئاستی پەروەردگاری جیهانیانەوە.»

کەسی هاوەڵدانەر جوێن بە بەرد و بتەکانی نادات لەپێناو مەزنڕاگری خودا، ئەو کەسەی جوێن بە خودا دەدات، ئەوا پێگەی خودای دابەزاندووەتە خوار بت و بەردەکانەوە.

* جنێودان بە خودا لە شامدا بڵاوبووەتەوە، بڵاوبوونەوەی ئەو تاوانە گەورەترە

لای خودا لە بڵاوبوونەوەی هاوبەشدانان، هەربۆیە لەسەر کاربەدەستان و زانایان پێویستە خەڵکی لەو مەترسییە هۆشیار بکەنەوە، چونکە هۆکارە بۆ نەمانی ڕەحمی خودا و دابەزینی سزای بۆیان.

* هەرکەس ئایینی خودا سەرنەخات، با چاوەڕوانی سەرکەوتنی خودایی نەکات: ﴿إِنْ تَنْصُرُوا اللَّهَ يَنْصُرْكُمْ﴾ [محمد:٧] «ئەگەر ئێوەپشتیوانی لە ئایینی خوا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن، ئەوا خودایش پشتیوانی لێوە دەکات و سەرتان دەخات.

* جوێندان بە خودا گەورەترین تاوانە کە لەناو خەڵکی شامدا بڵاوبووەتەوە، بۆیە واجبە لەسەریان پیسی ئەو تاوانە لەسەر زمان و ناو دڵیان دەرکەن وهەڵماڵن، وەک چۆن نوصەیرییەکانیان لە زەوییەکانیان دەرکرد، با باش بزانن خەڵکی بە هیچ جۆرێک بەسەر دوژمنیاندا سەرناکەون تەنها بەهۆی گەورە ڕاگرتنی پەروەردگاریانەوە نەبێت.

* تەنها و تەنها ئەو کەسانە گاڵتە بە ئایەت و بەڵگەکانی خودا دەکەن کە بەخششەکانی پەروەردگاری بەسەر خۆیەوە لەیاد کردووە، چونکە یادکردنەوەی نیعمەت هۆکاری گەورەڕاگرتنی خاوەن نیعمەتە: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ [البقرة:٢٣١]

«ئایەتەکانی خوا مەکەن بە مایەی گاڵتەجاڕیی خۆتان و یادی چاکە و بەخششی خوا بکەن بەسەرتانەوە.»

* ئەو ئەکتەرانەی گاڵتە بە دین دەکەن، ئەگەر بەو جۆرە گاڵاتانەوە ڕوو بکەنە سیاسەتمەداران، ئەوا دەبنە داواکراو و ڕاوەدوونراو. ئەی سیاسەتمەداران! ئایین بپارێزن، خودا سیاسەتتان بۆ دەپارێزێت.

* ڕێگری کردن لە ڕەخنەگرتنی ئاشکرا لە ئایین لەپێشترە لە ڕەخنەگرتن

لە سەرکردەکان. بە پاراستنی یەکەمیان، دووەمیان پارێزراو دەبێت، نەک بەپێچەوانەوە، لەگەڵ ئەوەی پاراستنی هەردووکیان لە ئاییندا کارێکی خوازراوە.

* تەنیا ئەوانە گاڵتە بە ئایین دەکەن کە ژیانی دونیا گاڵتەی پێ کردوون و فریوی داون: ﴿زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ اتَّقَوْا فَوْقَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ [البقرة: ٢١٢]

«ژیانی دونیا ڕازێنراوەتەوە بۆ بێباوەڕان و گاڵتەش دەکەن بە باوەڕداران، ئەوانەشی کە لەخواترسن، پێگە و جێگەیان لەسەروو ئەوانەوەیە لە ڕۆژی دواییدا.

* خەڵک کاتێک هەستیان بە ئارامی و ئاسایش کرد، بێباوەڕییان دەردەخەن و ئاشکرای دەکەن، کاتێکیش ترسیان هەبوو و شکستیان هێنا، نکۆڵی لێدەکەن: ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا﴾ [التوبة:٧٤] «سوێند دەخۆن بە خودا کە ئەوەیان نەگوتووە؛ کە بەڕاستی وتەی کوفریان گوت. هەروەها لە پاش باوەڕەوە، بێباوەڕ بوونەوە؛ خەم و تەمای شتێکیشیان بوو کە پێی نەگەشتن.»

* ئەوەی لە ڕاگەیاندنەکانەوە دەیبیستین کاتێک لە بەرگی ڕەخنەدا گاڵتە بە ئایین دەکەن و ئەو بێدەنگیە فەرمییەی لە بەرانبەریدا هەیە، ئەگەر هاوشێوەی ئەوە لە دژی سیاسی و سیاسەتمەداران کرابووا، ئەوا هەموو ئەو نووسەر و ئەکتەرەکانەیان بە خەواریج و ئاژاوەگێڕ ناوزەد دەکرد کە بەو کارە هەستاون

* دەکەونە ناو کوفرەوە و پاشانیش نکۆڵی لێدەکەن، خۆ ئەگەر نەشتوانن نکۆڵی بکەن، ڕاڤەی جیاوازی بۆ دەکەن: ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ﴾ [التوبة:٧٤] «سوێند دەخۆن بە خودا کە ئەوەیان نەگوتووە؛ کە بەڕاستی وتەی کوفریان گوت و لە پاش باوەڕەوە بێباوەڕ بوونەوە.»

* سەرەتا بە دەمدرێژی و سنوورشکاندن بەرانبەر بە شەریعەت دەستیان پێ کرد و بە خودای خاوەن شەریعەتیش کۆتاییان پێ هێنا.

* بوێری بەرانبەر ئایین بەهۆی دوو بڕیارەوە هاتەکایەوە:

١- بڕیاری دەرکردنی بابەتی ڕاگەیەندکاران لە دادگاکان، ئەمە جۆرێک لە پارێزبەندی ویستراو و بەمەبەستی تێدا دەردەکەوێت.

٢- لابردن و بەتاڵکردنەوەی تواناداری لێپرسینەوەی دادگا بۆ کەیسەکانی ڕێگری لە خراپە.

# مەزنڕاگرتنی خودا و لێترسانی و زانستبوون پێی

* چ پەروەردگارێکی بەخشندەیە مرۆڤی بەدیهێناوە و ماڵ و سامانی پێ داوە، بەدیهێندراوەکەی و بەخششەکانی دەکڕێتەوە و بە زۆر زیاتر پاداشتیان دەداتەوە، لە کاتێکدا هەموو دروستکراوەکان هەر ئەو خاوەنیانە و بۆلای ئەویش دەگەڕێنەوە: ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾ [التوبة:١١١] «خودا گیان و سامانی باوەڕدارانی کڕیوە و لە بەرانبەر ئەوەی بەهەشت بۆ وان بێت.»

* بە ئەندازەی نەزانینی پێگەی خودا، خەڵکی خۆی بچووک دەکاتەوە بۆ جگە لە خودا، پەیامبەری خوا (ﷺ) بەو پیاوەی گوت کە خوای کردە تکاکار بەسەریەوە «ويحك أتدري ما الله؟ إن شأن الله أعظم من ذلك.» «ماڵوێران دەزانیت خودا کێیە؟ پێگەی خودا زۆر لەوە بەرزترە.»

* ئەندازە و پێگەی بەدیهێنراوەکان جێگیرە، گەورە لای تۆ ئەوەیە خۆت بە گەورەی ڕابگریت، بێ ئەرزشیش هەر بەو جۆرەیە، هەڵەکردن لە گەورەدانانی پێگەی کەسێدا دەبێتە هۆی شێواندنی پێگەی کەسانی دیکە، بەڵام گەورە ڕاگرتنی بەدیهێنەر ئەندازە و پێگەی خەڵکیت بۆ ڕێکدەخەن، خودا دەفەرمووێت: ﴿مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ [الحج:٧٤]

»ئەوانە (بە هەقی خۆی) قەدری خوایان ڕانەگرت، بەڕاستی کە خودا بەهێز و شکۆیە.»

* خودا کات و زەمانەی دروستکرد کە لەوەو پێش زەمانە بوونی نەبوو، مرۆڤ گومان دەکات: پێش خودا چی هەبووە؟ چونکە مرۆڤ لە کاتێکدا دەژیێت کە

سەرەتا و کۆتای هەیە، وەک ژیانی خۆی و چواردەوری، وا گومان دەبات هەموو ئەوانەی لە گەردووندان وەک خۆی بەرەو تیاچوون دەچن.

* خودا هەموو شتێکت لە گەردووندا بۆ دەردەخات پاشان ونی دەکات و لێتی دەشارێتەوە، تاکوو بۆت دەربکەوێت تۆش بە هەمان شێوەی دەردەکەویت و پاشان نامێنیت، سەرەتاکەشت کۆتایی و شارانەوەیەکی هەیە.

* ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلأُ مَا عَلِمْتُ لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرِى﴾ [القصص:٣٨] «فیرعەون گوتی: ئەی پیاوماقووڵان! وا نازانم جگە لە من خوایەکتان هەبێت.»

تەنانەت نەیتوانی خوایەتیش بەجوانی بۆخۆی بچەسپێنێت، خودا دەبێت بە زانستەوە شتێک ڕەت بکاتەوە، نەک بڵێت: (ما علمت) "نازانم و نەمزانیوە."

* وتەی یەکێک لە زانایانی ماددەم خوێندەوە دەیگوت ئەگەر بتوانین ئامێرێک لە هاوشێوەی مێشکی مرۆڤ دروست بکەین کە توانای وەرگرتن و وەڵام دانەوەدا بەرکەوتەکانی هەبێت، ئەوا پێویستمان بەدروستکردنی ئامێرێک دەبێت بە قەبارەی زەوی: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلا تُبْصِرُونَ﴾ [الذاريات:٢١] هەروەها لە خودی خۆشتاندا؛ ئەرێ نابینن ئێوە؟

* تەنە ئاسمانییەکان لە گەردووندا چەندەها سەدەیە بە وردی و تەواوی دەڕۆن و بە هەمان ڕێڕەویشدا دەگەڕێنەوە بێ ئەوەی خاوەنی بیستن و بینین بن، لە کاتێکدا مرۆڤ ناتوانێت تا مزگەوتەکەی بچێت و بە هەمان شوێنپێ وهەنگاودا بگەڕێتەوە. ﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِى أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ [النمل:٨٨ ]

ئەمەش کاری خوداییێکە کە هەموو درووستکراوێکی بەوپەڕی تۆکمەیی و جوانکارییەوە هێناوەتەبوون.

* لە بەڵگە و نیشانەکانی خودا، ڕێکخستنی سووڕانەوەی گەردوونە، بەشوێن ئەویشدا ڕێخستنی کات هاتووە، لە سەرەتای دروستبوونییەوە هەتا ئەمڕۆ، لە

فەرموودەدا هاتووە ﴿إِنَّ الزَّمَانَ قَدِ استدارکَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ «زەمانە وەک ئەو ڕۆژە دەسووڕێتەوە کە خودا ئاسمان و زەوی دروست کردووە.»

* خودا خەڵکی کردووە بە چەند نەوە و جیلێک لەدایک دەبن و پاشان دەمرن تا دەسەڵاتی خۆی نیشانی بەندەکانی بدات لەسەر دووبارە زیندووکردنەوەیان، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکانێک نکۆڵی دەکەن، جا دەبوو چۆن بووبا ئەگەر هەموویان یەک نەوە بووان و بە یەک جار بمردنایە و زیندوو بوونایەتەوە؟ بێگومان زۆر خراپتر نکۆڵییان دەکرد.

* کاتێک بەتەمەنێک فەرمان بە گەنجێک دەکات کە هێشتا حیکمەتەکەی ئەو کارە بۆ گەنجەگە دەرنەکەوتووە، دەبینیت پێی پێدەکەنێت و گاڵتەی پێ دێت، بەڵام کاتێک ئەو گەنجە گەورە دەبێت و بە کرداری خۆی ئەزموونی دەکات، پەشیمان دەبێتەوە لە پشتگوێخستنی ئەو ئامۆژگاریانە. ئەمە لە کاتێکدا ئەزموونی نێوان ئەو دووانە تەنیا چەند ساڵێکە، ئەی دەبێت نێوان خودا و بەندەکانی چۆن بێت لە فراوانی زانستدا؟

* نەزانین و بێتوانایی منداڵێک بە کەم دادەنێت چونکە لەنێوان تۆ و ئەودا چەند ساڵێک هەیە تۆ تیایدا ئەو بابەتانە فێربوویت کە پێشتر نەت زانیوە، ئەی دەبێت پێگەی تۆ چۆن بێت بە بەراورد بەو پەروەردگارەی بەدی هێناویت و چەرخی زەمانەی دروستکردووە تاکوو تۆ بسووڕێنێتەوە و فێرببیت؟!

* خودا گەردوون هەڵدەسووڕێنێت بە جۆرێک کە حیکمەتی زۆرێک لە کارەکانی پەنهان کردووە، خۆ ئەگەر مرۆڤ ئەو حیکمەتانەی زانیبا، ئەوا جیاوازی نەدەما لەنێوان بەدیهێنەر و بەدیهێندراوەکاندا. هەڵسووڕاندنی گەردوون شایستەی فراوانیی زانست و وردیی حیکمەتەکانی پەروەردگارەوە.

*زانست دەبێتە هۆی چاندنی لەخواترسان لە دڵی مرۆڤدا، لەخواترسانیش بیرکردنەوە و پەندوەرگرتن دەچێنێت. ئەو کەسەی لە خودا نەترسێت، پەند

وەرناگرێت. هەروەها ئەو کەسەی زانستی نەبێت، لەخودا ترسانیشی نابێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ [الفاطر:٢٨] «لەناو عەبدانی خوادا هەر زانایان لێی دەترسن.»

﴿سَيَذَّكَّرُ مَنْ يَخْشَى﴾ [الأعلى:١٠]

«کەسێک لەخوا ترسی هەبێت، هەر زوو پەندی لێ وەردەگرێت.»

* هەر زانستێکی عەقڵی ئەگەر ترسی خودای لە دڵدا نەچاندی، ئەوە نەزانییە لە بەرگی زانستدا: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ [الفاطر: ٢٨]

ئەوانەی تەنها بە عەقڵیان ڕۆدەچن لە شەریعەتدا دینداربیەکی نەرم و دڵڕەقییەکی زۆریان تێدا دروست دەبێت.

* ترسی خودا بە ئەندازەی ناسینیەتی، هەرکەس خودا بناسێت بەو جۆرەی شایستەیەتی ئەوا بە ئەندازەیەکی شایستە لە خودا دەترسێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ [الفاطر: ٢٨]

* هەرکەس بەڕاستی خودا بناسێت، پێستی گرژ دەبێت کاتێک باسی خودا بکرێت لە ترس و خۆشویستنیدا. هەرکەسیش خوداناسینی کەمبێت، ترسی خودا لە دڵیدا نامێنێت و ئەندامەکانی جەستەی بەرەڵڵا دەبن. ﴿مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ [الحج: ٧٤] «ئەوانە (وەکوو پێویست) قەدری خوایان بە چاکی نەزانی، ڕێزی پەروەردگاریان بەتەواوی نەگرت، لەکاتێکدا بەڕاستی خوا زۆر بەهێز و بەتوانا و باڵادەستە.»

* ئەوانەی زۆرترین لەخواترسانیان هەیە، زۆرترین بەشی لێخۆشبوون و بەزەیی خودایی دەیانگرێتەوە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ [الملک: ١٢] «ئەوکەسانەی -لە نهێنیدا- لە پەروەرێنیان دەترسن، لێخۆشبوون و پاداشی گەورەیان هەیە.»

* سەرسامبوون و فریوخواردنی مرۆڤ بە زانستە مادییەکەی دەبێتە هۆی چاندنی خۆبەگەورەزانین لە بەرانبەر وەحی و سروشی خوادا، بۆ مەگەر زانستەکەی هەمووی بەخششی خودا نییە: ﴿فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِنْدَهُمْ مِنَ الْعِلْمِ﴾ [الغافر: ٨٣]

«جا کاتێک کە پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە و نیشانەی تەواوەوە بۆیان ڕەوانە کران، لەباتی ئەوەی باوەڕیان پێ بهێنن، خۆیان دڵخۆش کرد بەو ڕادە کەمەی زانست کە هەیانبوو.»

* لەو کاتەی مرۆڤایەتی دەستی پێ کردووە، مرۆڤ هەموو ڕۆژێک زانیاری نوێ دەست دەخات و بە ئەندازە و فراوانیی زانستی سەرسام دەبێت، چونکە تەنیا ئەوە دەبینێت کە فێری بووە، کەچی خۆبەکەمزانینی تێدا ناچێنێت، لە کاتێکدا دەبینێت ئەو ڕێژە فراوانەی لە نەزانین هەیە ﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلا قَلِيلا﴾ [الإسراء: ٨٥] «ئێوە کەمێک نەبێت، هیچتان لە زانست پێ نەدراوە.»

* هەر زانستێک عەقڵی مرۆڤ پێی گەیشتبێت، پێشتر ئاژەڵەکان پێی گەیشتوون لە کاتێکدا ئەوان عەقڵیان نییە، تا بەمە لاوازیی مرۆڤەکان دەربکەوێت و بزانن کە ڕێزیان وابەستەیە بە ئایینەوە، ئەگەرنا داڵ زۆر پێش فڕۆکە فڕیوە.

* مرۆڤ زۆرێک لە پێشکەوتن و شارستانییەتەکانی لە ئاژەڵەکانەوە وەرگرتووە وەک فڕین و جگە لەویش. ئەگەر جیاکاری نەکرێت لەنێوان زانستی ئیمان و زانستی ماددیدا، وا پێویست دەکات قەلەڕەش بەگەورە دابندرێت، چونکە خودا کردوویەتیە مامۆستا بۆ مرۆڤایەتی لە ناشتنی مردووەکاندا لەگەڵ ئەوەشدا بە (فُوَیسق) لە ڕێدەرچوو هەژمار کراوە، تەنانەت فەرمان کراوە بە کوشتنی. دەکرێت مرۆڤ بینا بێت بە ماددییات و کوێر بێت لە ئاست مافی پەروەردگاردا.

* خودا زانستێک ناداتە مرۆڤ کە لە هەموو لایەنەکانەوە بەرەو خراپەی ببات، بەڵکوو زانستی دەداتێ، بەڵام کەسەکە لە شوێنی شایستەی خۆیدا بەکاری ناهێنێت، بەوەش دەبێتە هۆکاری خراپبوونی دین و دونیایان.

# مەزنڕاگرتنی پێگەی پەیامبەرییەتی، حوکمی بەرهەڵستکاریکردنی

* گەورە ڕاگرتنی پەیامبەر هۆکارە بۆ لێخۆشبوون و سڕینەوەی تاوان، هەروەها نیشانەی لەخواترسانە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ [الحجورات: ٣ ]

«بەڕاستی ئەوانەی دەنگیان نزم دەکەنەوە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوای گەورە دڵەکانیانی زاخاو داوە بۆ لەخواترسان، ئەوانە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە ئامادەیە بۆیان.»

* بەشێک لە گەورەڕاگرتنی پەیامبەر (ﷺ) شوێنکەوتن و بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی و سوننەتەکانیەتی، هاوکات لەگەڵ ڕێزداری و گەورە باسکردنی کاتێک بەکەم باسکرا. هەروەها جێبەجێکردنی حەددە لەسەر ئەو کەسەی کە بێڕێزیی بەرانبەر سەروەرمان دەکات ئەگەر موسڵمان بوو، خۆ ئەگەر خاوەن پەیمان بوون لەگەڵ موسڵمانان، پەیمانەکەیان هەڵبوەشێندرێتەوە.

* ﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ﴾ [الشرح:٤] «ناوبانگیشتمان بەرزەوە کرد.»

ئەوکەسەی بەرد دەگرێتە ئەستێرە بەرزەکانی ئاسمان بێگومان بەردەکە دەگەڕێتەوە سەر خۆی: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾ [الکوثر:٣] «ئەوی لێت بەناتۆرەیە، بۆخۆی وەجاخی کوێرەیە.»

* هاوەڵدانەران ڕاگەیاندنەکانیان چڕ کردبووەوە لەسەر پەیامبەر (ﷺ)، ئەبوو لەهەب لە بازاڕی عوکاظ دەوەستا و هاواری دەکرد: خەڵکینە موحەممەد گومڕا

بووە، ئاگەداربن گومڕاتان نەکات، سەرنجام ئەبوو لەهەب و ڕاگەیاندنەکانی تیاچوون موحەممەد و ئایینەکەی مانەوە.

* نەفامەکان هەزارەها دێر شیعریان بە جوێن و درۆ لەسەر پەیامبەر (ﷺ) گوت، لە کاتێکدا شیعر گەورەترین ڕاگەیاندنی عەرەبەکان بوو، بەڵام مێژوو هیچ شعرێکیانی نەپاراستووە، لەکاتێکدا هەموو وتەکانی سەروەری پاراستووە. بێگومان هەرکەس شوێنی بکەوێت، هەر بەو جۆرە دەبێت، لە قورئاندا هاتووە ﴿أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي﴾ [يوسف: ١٠٨] «هەم خۆم هەم ئەو کەسانەش شوێنم کەوتوون.»

* هەرکەس گاڵتە بکات بە پەیامبەری خودا (ﷺ)، پارێزراو نابێت لە سزا، ئەگەر لە دونیادا تەوبە نەکات، ئەو سزایە دەچێژێت، جا زووبێت یان درەنگ. خودا دەربارەی ئەو جۆرە کەسانە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنْ يَتَوَلَّوْا يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾ [التوبة: ٧٤] ئەگەر هەر ڕوویان وەرگێڕا، خودا لەم دونیا و لەو دونیاشدا، سزای بەژانیان دەدا.

* هەرکەس ببینێت لە کۆڕێک یان لە شوێنێکدا شکۆی ئایین بەکەم دەگیرێت و ئەویش بێدەنگ بوو و وازی لە سەرخستنی ئایینەکەی هێنا لەترسی لەدەستدانی ئەو پێگەیەی کە بەدەستی هێناوە، ئەوا خودا پێگەی لەناو خەڵکی دادەبەزێنێت بە ئەندازەی ئەو پێگەیەی کە لە ئایین دابەزیوە، چونکە پاداشتەکان لە جۆری کردارەکانن.

* هەرکەس دژایەتی دۆستێکی خودا بکات، ئەوا جەنگی لەگەڵ خودا ڕاگەیاندوە، چ جای دژایەتی سەرداری دۆستانی خودا موحەممەد (ﷺ)، هەروەها ئەوانەی لە ڕیزی کەسانێک دەوەستن کە جەنگ دەکەن لەگەڵ خودا، خودا دەفەرمووێت «من عادى لي وليًا فقد بارزني بالحرب» «هەرکەس دژیەتی دۆستێکم بکات، ئەوا هاتووەتە مەیدان بۆ جەنگکردن لەگەڵ من.»

* کاتێک جوێن درا بە عائشەی دایکی باوەڕداران، (أسید) (رضي الله عنه) بەو کەسەی گوت کە پشتگیری لە جوێندەرەکە دەکرد: "تۆ دووڕوویت و پشتگیری لە دووڕوویەک دەکەیت." ئەمە دەربارەی کەسێک گوتراوە کە بەرگری کردووە لەو کەسەی جوێنی بە خێزانێکی پەیامبەر داوە، جا دەبێت چۆن بێت ئەگەر بەرگری لەکەسێک بکەن کە جوێنی بە پەیامبەر (ﷺ) دابێت؟

* خودا ڕێگری کردووە لە جوێندان بە بت و خودا بەردینەکان، لەکاتێکدا ئەوان جوێن دەدەنە سەرداری مرۆڤایەتی، ئیسلام ئایینێکە بانگیان دەکات بۆ ململانێی بەڵگە، ئەوانیش ئەقڵیان سەرقاڵە بە داخ و تۆڵەسەندنەوە.

* دروست نییە ئەو وتانە بۆ خەڵکی بگوازرێنەوە کە کەمدانانی پەیامبەر لەخۆ دەگرێت، هەرچەندە بۆ ڕاگەیاندنیش بێت، چونکە بڵاوبوونەوەی ئەو وتانە لای خودا زۆر گەورەترە لە بڵاوبوونەوەی داوێنپیسی، بەڵکوو دەبێت بەکورتی و بەبێ درێژەپێدان هەواڵ بدرێت بەو کەسانەی توانای سەرخستن و سزادانی ئەو جۆرەکەسانەیان هەیە.

* ڕۆڵگێڕان لە فلیمی سینەماییدا بۆ وەسفکردنی پەیامبەر (ﷺ) بەهیچ جۆرێک دروست نییە، هاوەڵان خۆیان پاراستووە لە گواستنەوەی وتەکانی لەترسی ئەوەی نەبادا لەکاتی گواستنەوەی وتەیەکیدا پێش و دوایەک ڕوویدات، چ جای کۆمەڵە کردارێک کە هەستان و دانیشتنی سەروەر نیشان بدات لەکاتێکدا ئەو کردارانە هەمووی وەحی و سرووشی خودا لەخۆ دەگرن.

* زۆرێک لە کردارەکانی پەیامبەر (ﷺ) سرووش و وەحییە، بچووکترین کرداری پەیامبەر بەشدارە لە پارێزراوبوونی لە هەڵە، ڕۆڵ بینینی ئەو لەناو دراماداد گێڕانەوەی زۆرشت لە خۆدەگرێت بەبێ بوونی بەڵگە لەسەریان، ئەمەش ئەو هەڕەشە توندە دەیگرێتە خۆ کە لە (سەحیحن)دا هاتووە: «من كذب عليّ متعمدًا فليتبوأ مقعده من النار» «هەرکەس درۆیەک بەدەم منەوە

هەڵبەستێت، با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا دیاری بکات.»

درۆی کرداری بێگومان دەچێتە ژێر ئەم فەرموودەیەوە، هەرچەندە لە پەرستشە پەتییەکانیش نەبێت، ئەوە لە پارێزراوەکانە.

* هەرکەس جووڵەیەک یان کارێک بداتە پاڵ پەیامبەری خودا (ﷺ) بێ بەڵگە و بێ ئەوەی بیداتە پاڵ کەسانێکی دیکە، ئەوا هەڕەشە و سزای توند دەیگرێتەوە و دەبێتە ئەنجامدەری تاوانێک لە تاوانە گەورەکان، بەڵگەکان ئەمە لەخۆ دەگرن، جا ئەو کەسەی فەتوای دروستیی بۆ ئەکتەر و ڕۆڵگێڕێک دەدات کە ڕۆڵی پەیامبەر (ﷺ) بگێڕێت بۆ چەند سەعاتێک بە وەسفکردنی وەستان و جووڵە و پۆشاک و ڕوانین وهەستان و دانیشتنیەوە لە کاتێکدا تەنیا بەشێکی کەم لە وەسفی ئەو حاڵەتانەی زاندراوە و پێمان گەیشتووە، ئەوە بێگومان ستەمی لە خودی خۆی کردووە.

* ﴿إِلَّا تَنْصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ﴾ [التوبة:٤٠] «ئەگەر ئێوە یارمەتی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) نەدەن ئەوە بێگومان خوا یارمەتیی داوە.»

خودا بەڵێنی سەرخستنی پەیامبەرەکەی داوە، بەڵام خەڵکی ئاگەدار کردووەتەوە لەوەی واز نەهێنن لە سەرخستنی پەیامبەر نەوەک سزای ئەو ئوممەتە سەرشۆرە بدات و خەڵکانێک بێنێتە جێیان کە پەیامبەرەکەی سەرخەن.

* هەر ئوممەتێک پێگەی پەیامبەری تێدا پێشێل بکرێت، بێگومان خودا ئەو ئوممەتە سەرشۆڕ و ڕیسوا دەکات.

* پەیامبەری خودا (ﷺ) پێویستی بە کەس نییە پاڵپشت و سەرخەری بێت، بەڵام هەموو تاکێک پێویستی بەوەیە پاڵپشتی ئەو بکات، تاکوو باوەڕی خۆی پێ چەسپاو بکات.

* فەرموودەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی «من نصر مسلما نصره اللّٰه» واتە: «هەرکەس موسڵمانێک سەربخات، خودا سەریدەخات. جا دەبێت ئەم مژدەیە بۆ ئەو کەسە چۆن بێت کە پێغەمبەرێک سەردەخات کاتێک پێگەی دەشکێندرێت، چونکە سەرخستنی پەیامبەر هۆکاری بە عیزەتبوونی سەرشۆڕان و بەهێزی لاوازان و سەرخستنی ستەملێکراوانە.

* فەرموودەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی «من خذل مسلمًا خذله اللّٰه» واتە: «هەرکەس موسڵمانێک سەرشۆڕبکات، خودا سەرشۆڕی دەکات.»

جا دەبێت ئەم هەڕەشەیە بۆ ئەو کەسە چۆن بێت کە ڕێزی پەیامبەر (ﷺ) شکێندرابێت، ئەویش تواناى سەرخستنی هەبێت و بێ هەڵوێست بووبێت؟!

* زانایان ناکۆکییان نییە لەسەر ئەوەی گاڵتەکردن بە پەیامبەر یان بەکەم دانانی پێگەی پەیامبەر (ﷺ) کوفر و لە دین دەرچوونە: ﴿... قل أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ -- لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾ [التوبة: ٦٥-٦٦ ]

«... بێژە: ئاخۆ گاڵتەتان بە خوا و پێغەمبەری خودا دەکرد؟ داوای لێ بووردنێ مەکەن؛ ئێوە لە پاش بڕواهێنان کافربوونەوە.»

* زانایانی هەموو مەزهەبەکان کۆدەنگن لەسەر بێباوەڕبوونی ئەو کەسەی گاڵتە بە پەیامبەر (ﷺ) دەکات یان پێگەی دادەبەزێنێت، زۆرینەیان پێیان وایە حەدی ئەو کەسە کوشتنە، (ابن المنذر) دەڵێت: "زۆرینەی زانایان لەسەر ئەم حوکمە کۆڕان."

* ئەبوو داود بە سەنەدێکی سەحیح ڕیوایەتی کردووە «کەنیزەکێک جوێنیدا بە پەیامبەری خودا و خاوەنەکەی کوشتی، ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە پەیامبەری خودا (ﷺ) بە دەنگی بەرز فەرمووی بەشایەدبن خوێنی بەفیڕۆ ڕۆیشتووە.»

* زۆرینەی زانایان دەڵێن: بابەتی تەوبە کردن لە جوێندان بە پەیامبەر دەگەڕێندرێتەوە بۆ لای خودا، بەڵام سزای دونیایی لەسەر لاناچێت، پەشیمانی و تەوبە لە جوێندان لە مافی مرۆڤە ئاساییەکان لا نابات، چجای سەرداری مرۆڤەکان (ﷺ)؟!



# فەزڵ و مەزنیی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) و حوکمی بەرهەڵستکاریکردنیان و هەندێک لە باس و حاڵی باطنییەکان

* لە فەرموودەدا هاتووە: «أنا أمنة لأصحابي فإذا ذهبت أتى أصحابي ما يوعدون» من جێی ئەمینی و ئاسایشی هاوەڵەکانمم کاتێک من ڕۆیشتم ئەو هەڕەشانەی دەربارەیان هاتووە هەمووی دێتەجێ..

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بەوەی پێناسەی صەحابە بۆ ئەو کەسانە بەکاردێت کە پەیامبەر لە ناویاندا وەفاتی کردووە و ئەوانیش لەسەرباوەڕ مردوون، هاوەڵان کەسانێکن لە هەموو خەڵکانی پاش خۆیان باشترن.

* لە فەرموودەدا هاتووە «أصحابي أمنة لأمتي فإذا ذهب أصحابي أتى أمتي ما يوعدون «هاوەڵانم جێی ئاساییشی ئوممەتەکەمن کاتێک ئەوان نەمان، ئەو هەڕەشانەی دەربارەی ئوممەتەکەم هاتوون دێتە ڕێیان.»

ئەگەر خۆیان بڕۆن ئەوا تێگەیشتن و زانستیان نەڕۆیشتووە و ماوە، ئەوان هۆکاری ئەمانن لە فیتنە و ناکۆکییەکاندا.

* هاوەڵان ڕێزدارترین مرۆڤن لە پاش پەیامبەران، پلە نزمترین کەسی ناو هاوەڵان ڕێزدارتر و پلە بەرزترە لە کەسانی دیکەی جگە لە خۆیان، یەک هەنگاوی ئەوان کە لەگەڵ پەیامبەر لە تێکۆشاندا ناویانە باشترە لە خەرمانێک کردەوەی کەسانی پاش خۆیان.

* شلگیری خەڵکی لە کەم دانانی پێشەوا و خاوەن ڕێزەکانیان و گەڕان بەشوێن هەڵەکانیاندا، نیشانەی لاوازیی ئوممەت و دەسەڵاتدار و زاناکانیان

دەردەخات، ڕێزدارترین کەسی ئەم ئوممەتە پەیامبەرە، پاشان هاوەڵان پاشان شوێنکەوتووان و کەسانی دیکە.

* مافی دایک و باوک تایبەتە لەسەر منداڵەکانیان، بەڵام مافی هاوەڵان تایبەت و گشتییە، چونکە دایک و باوک هۆکاری هاتنە دونیای منداڵەکانیانن، بەڵام هاوەڵان هۆکاری گەیشتنیانن بە بەهەشت، چون ئەوان قورئان و سوننەتیان گواستووەتەوە بۆ ئەم ئوممەتە.

* ڕێگری کردن لە خەڵکی لە بەرهەڵستیکردنی ڕێبازی هاوەڵان ئەوە ناگەیەنێت کە هاوەڵان پارێزاون لە هەڵە، بەڵکوو فەزڵ و گەورەیییان بەسەر کەسانی دیکەدا پێشی خستوون، خودا ڕێگری کردووە لە منداڵەکان وتەی ئۆف بەکاربهێنن بەرانبەر دایک و باوکیان ئەگەر هەڵەیەکیان ئەنجامدا، بەڵام هاوەڵان پێگەیان زۆر بەرزترە لە دایک و باوک.

* عومەری کوڕی خەتاب سزای ریددە و هەڵگەڕانەوەی جێبەجێ دەکرد و دەستی دزی دەبڕی و ڕەجمی زیناکاری دەکرد، هەروەها ڕێگری دەکرد لە نزیکخستنەوەی گاورەکان وەک ڕاوێژکار و دەسەڵاتدار، سزای پیاوان و ئافرەتانی دەدا لەسەر تێکەڵاوییان، بەڵام هیچ کەس نابینیت ئەو ڕۆڵە بگێڕێت.

* ئیبن عومەر دەڵێت: "جوێن مەدەنە هاوەڵانی محمد، هەڵوێستیی دەمێکی ئەوان باشترە لە پەرستشکردنی هەموو تەمەنتان." ئەمە جیاوازی فەزڵ و پێگەی نێوان هاوەڵان و تابعینە، جا دەبێت فەزڵ و پێگەی هاوەڵان لەسەر کەسانی دیکەی پاش ئەوان چۆن بێت.

* زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی هەرکەس جوێن بداتە هەموو هاوەڵان یان زۆرینەیان ئەوا بێباوەڕ بووە بە خودا. ئەگەر لەوە و پێشیش موسڵمان بووبێت، بەو کارەی دەبێتە هەڵگەڕاوە لە ئایین، تەوبەی پێ دەکرێت، ئەگەر نا دەکوژرێت.

* هەر کۆمەڵەیەک باوەڕی بە توقیە و درۆکردن هەبێت وەک رافیزە و عەلەویەکان، ئەوا زۆرترین فێڵ لە پێچەوانەکانیان دەکەن، چونکە هێزی بیروباوەڕ ئەگەر خاوەنەکەی بەتاڵی نەکاتەوە بەکردەوە کردن، ئەوا بە پەنگخواردوویی دەمێنێتەوە و شڵەژان و شێواوی دروست دەکات.

* ڕافیزەکان هەرکات بەسەر دوژمنەکانیاندا زاڵبوون و تواناداربوون تۆڵەی توند دەسەننەوە بە سووتانی جەستە و پارچە پارچەکردنیان، چونکە وادەبینن ئەوان هۆکاری ئەو شاردنەوەیەی ئایین و پەنگخواردنەوە بوون.

* هەرکەس سەیری مێژووی جەنگەکان بکات، بۆی دەردەکەوێت کە باطنییەکان، ئەوانەی شەریعەتی نهێنیان لایە، وەک قرامطە و چەند جۆرێکی ڕافیزە، بۆی دەردەکەوێت ئەوان زۆرترین ستەمیان کردووە کاتێک دەسەڵاتیان بەدەست هێناوە پاش بێدەسەڵاتییان.

* ئیسلام جۆر و بڕی کردەوە جەستەییەکانی زۆرکردووە و لایەنی نهێنی و زۆرلێکردنی تەسککردووەتەوە، چونکە دادگەری تەنیا لە دەروونێکەوە دەردەچێت کە بە بیروباوەڕ و کردەوە تێدا بەرجەستە بووبێت، جا ئەمە دەبێتە هۆی هاوسەنگ بوون و ئۆقرە گرتن، چونکە بیروباوەڕ پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ کارکردن. خۆئەگەر کردووە نەکات، ئەوا ڕق لە ڕێگرەکان هەڵدەگرێت. هەربۆیە نەهی کراوە لەوەی نەخۆشێک بە دۆزەخ بترسێندرێت کە لە سەرەمەرگدایە، بەڵکوو دەبێت ئومێدی بەزەیی خودای پێ بدرێت، چونکە ترس پاڵیدەنێت بۆ کردار ئەویش نەخۆشییەکەی ڕێگەی نادات، ئیدی بێئومێد و داڕووخاو دەبێت، لەوانەشە بەرەو ئەوە هەنگاوبنێت کە تەواو بێئومێد بێت لە دەربازبوون؛ چونکە لایەنی بیروباوەڕ قورسترە لەلایەنی کردەوە، لەوانەشە وای لێ بکات ببێتە بێباوەڕ و مولحید، تاکوو دەروونی ئارامبێتەوە.

* بیروباوەڕ بڕیار بەسەر هەست و سۆزدا دەدات، نەک هەست و سۆز بڕیار بەسەر بیروباوەڕدا بدات. یەکێک لەو تاقمانەی کە هەست و سۆزێکی زۆر بەسەر بیروباوەڕیاندا زاڵە ڕافیزەکانن، ئەگەر ئەو هەست و سۆزە لە بیروباوەڕیان داببڕێندرێت، ئەوا هیچیان نامێنێتەوە.

* باطنییەکان زۆر توند تۆڵە لە دوژمنەکانیان دەسەننەوە لەو کاتەی دەسەڵاتیان بەهێز دەبێت، لە هەموویان توندتر ڕافیزەکانن و لە ناو ئەوانیشدا نصیرییەکانن، چونکە ئەوان زۆر باسی ئازارەکانیان دەکەن و بەئاواتەوە چاوەڕوانی تۆڵەسەندنەوە دەکەن.

* جوولەکە و ڕافیزەکان ترسنۆکترینن ئوممەتن لە جەنگدا، کاتێک دبیت هێز و دەسەڵاتیان هەیە ئەوە بەهۆی بوێری و ئازاییانەوە نییە، بەڵکوو بەهۆی سەرشۆڕی ئەوانی دیکەوەیە.

*ڕافیزەکان پێیان وایە جەنگ لەگەڵ جوولەکەدا ناکرێت، تاکوو مەهدی دەرنەچێت، بەڵام دەڵێن جەنگ لەگەڵ ئەهلی سوننەدا دەکرێت، چونکە بۆچوونیان وایە سوننەکان ڕێگرن لە دەرچوونی مەهدی!

* ڕاست نییە کە گۆڕی زەینەبی کچی علی لە دیمشق بێت، مێژوونووسانی شیعە و سوننە جیاوازیان هەیە لەسەر کات و شوێنی وەفاتی، دەربارەی ئەو بابەتەش سێ بۆچوونیان هەیە، هیچ بەڵگەیەکیش نییە وتەی لایەنێکیان پارسەنگ بکات بەسەر ئەوانی دیکەدا.

* چەندین شار و وڵات لەسەر دەستی معاوییە ئازاد کرا کە بە ملیۆنەها خەڵک تیایدا موسڵمان بوون، وەک: ئەفغانستان و بوخارا و سەمەرقەند و تونس و سنوورەکانی لیبیا، فەزڵ و چاکەکانی دەپێچنەوە کە وەک لەوحی ئاسن قورسن، هەڵەکانیشی باس لێ دەکەن کە وەک کاغەز سووک و بێبەهان.

* وەحی فریادڕەسی ئوممەتە، ئوممەت بەبێ ئەو کۆنابێتەوە. گومڕاکان دەقەکان دەشێوێنن و دەیگۆڕن، بەڵام ڕافیزەکان ڕێگەیەکی کورتر دەگرنەبەر بۆ بەرپەرچدانەوەی وەحی، ئەویش ئەوەیە هاوەڵان پەک دەخەن تاکوو بەهۆیەوە هەموو ئایین پەک بخەن.

* ئەگەر بتەوێت لادانی گرووپ و مەزهەبە گومڕاکان دەربخەیت، ئەوا زیاتر پێویستت بە بەڵگەی نەقڵی هەیە وەک لە بەڵگەی عەقڵی، تەنها ڕافیزە نەبێت تەنها بەڵگەی عەقڵی بەسە بۆیان.

* گەورەترین کوژراو لە سەردەمی پەیامبەردا حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب بووە، کوژراو جەستەی شێوێندرا، پەیامبەری خودا (ﷺ) بینی و گریا و فەرمووی «لن أصاب بمثلك أبدًا» «هەرگیز موسیبەتی وەک ئەمەی تۆ نایەتەوە ڕێم.» لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژی کوژرانەکەشی نەکردە ماتەمینی.

* ئەگەر ئەو کارەی شیعە لە ڕۆژی کوژرانی حوسێندا ئەنجامی دەدەن لە گریان و لەخۆدان لە ڕووی لۆژیک و عەقڵەوە دروست بووایە، ئەوا دەبوو ئوممەت هەموو ڕۆژێک ئەو کارەیان بکردایە، چونکە هیچ ڕۆژێکی ساڵ نییە پێشەوایەکی چاکسازی تێدا نەکوژرابێت.

*علي کوڕی ئەبوو تاڵیب بەستەم کوژرا، حەسەنی کوڕی ٢١ساڵ پاش ئەو ڕووداوە ژیا، بەڵام هیچ ڕۆژێک شیوەنی بۆ باوکی نەکرد، شیعەش ئەوەی بۆ حوسێنی دەکەن بەو جۆرە بۆ عەلی ناکەن، لەگەڵ ئەوەی پێشەوا عەلی لە حوسێنی کوڕی زۆر گەورەتر و ڕێزدارترە.

# خاوەن پەرتووک، ئەهلی کیتاب

* گاور و جوولەکەکان بەرهەڵستییان بەرانبەر پەیامبەرانیش کردووە، جا یان دەبێت ویستی ئەوان سەربکەوێت، یان جەنگ بەرپا دەکەن: ﴿كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا لا تَهْوَى أَنْفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ﴾ [المائدة:٧٠]

«هەر کەس لەو پێغەمبەرانە پێچەوانەی دڵخوازی وان شتێکی بۆ هێنابان، هێندێکیان بەدرۆیان دەخستنەوە؛ هێندێکیشیان هەر بە کوشتن لە بەینیان دەبردن.»

جا کە ئەوان لەگەڵ پەیامبەران پاک نەبوون، لەگەڵ ئێوەدا چۆن پاک دەبن.

* گاورەکان تۆمەت دەخەنە پاڵ عائیشە لە ڕووداوی بوهتانەکەدا (إفک) چونکە ڕقێکی زۆریان لە ناخدایە بەرانبەر بە موحەممەد، بەڵام مریەم بە پاک دادەنێن لە کاتێکدا منداڵی بووە بەبێ مێرد، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە خۆشەویستییان بۆ عیسا هەیە. خودا هەردووکیانی بە پاک داناوە، بەڵام ئیرەیی بردن ڕێگری تێگەشتن لە عەقڵ دەکات.

*﴿هَا أَنْتُمْ أُولاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلا يُحِبُّونَكُمْ﴾ [آل عمران:١١٩] «ئاگادار بن! ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێت و ئەوان خۆشیان لە ئێوە نایەت.»

دۆستایەتی لای ئەوان بۆ سوود و قازانجە، دۆستایەتی هەندێک موسڵمان بۆ ئەوان، بەجۆرێکە ماڵ و سامان کەسایەتی و شکۆیان لەپێناو ئەو خۆشەویستیە درۆیینەدا داناوە.

* ﴿وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلا

نَصِيرٍ﴾ [البقرة:١٢٠] «ئەگەر تۆ پاش ئەو زانستەی بۆت هاتووە، شوێن ئارەزووی ئەوان بکەویت، ئیتر خودا دۆستایەتیت ناکات و تازە نایەتە یاریدەتەوە.»

ڕێسایەکی بەردەوامە هەر موسڵمانێک شوێن گاور و جوولەکە بکەوێت، سەرشۆڕی دەکەن، چونکە خودا وازی لە سەرخستن و پشتیوانی ئەو کەسەی هێناوە.

* ئەگەر ڕۆژئاوا وتیان "ئێمە دوژمنی ئیسلام نینن" ئەوا یان ئەوان درۆ دەکەن، یان ئێمە لەسەر ئیسلامێکی دروست نیین: ﴿وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ﴾ [البقرة:١٢٠]

«ئەم جوولەکە و فەلانە، تا نەچییە سەر ئایینی ئەوان، هەرگیز خۆشیان لە تۆ نایەت و لێت ڕازی نابن.»

* تەواوکردنی ئایین لەلایەن خوداوە بە ڕازیکردنی کافر و نزیک بوونەوە و چاوپۆشی نایەتەجێ، بەڵکوو هەر دەبێت بە پێناخۆشبوونیان بێت ﴿وَيَأْبَى اللَّهُ إِلَّا أَنْ يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ [التوبة: ٣٢] «خوداش خۆی بڕیاری داوە کە ئەم تیشکەی هەر سەرکەوێت و بگاتە جێ، جا با بێباوەڕانیش حەز نەکەن.»

* زۆرێک لە موسڵمانان جیاوازی ناکەن لەنێوان چاوپۆشی و زەلیلی لە ئیسلامدا، وەک چۆن کەسانێک جیاوازی ناکەن لەنێوان هێز بەرانبەر دوژمن و سنووربەزاندن و دەستدرێژیکردنە سەریان.

* ناکۆکی ڕێسای ژیانە، بێگومان ناکۆکی ناوخۆیی لەناو ئوممەتدا سەرهەڵدەدات ئەگەر سەرقاڵ نەبن بە دوژمنە دەرەکییەکانیانەوە، ڕۆژئاوا ئەم ڕێسایەی چاک پێکاوە فێریان کردووین چۆن چاوپۆشی دەکەین لێیان و چۆن ناکۆک دەبین لەنێوان خۆماندا.

# دووڕوویی و دووڕووان و سیفەتەکانیان

* ئیسلام لە شێوەی خانوویەکدایە، دووڕووەکان بنچینەکەی دەشکێنن چونکە لەناو خانوەکەدان، کافرەکانیش هێرش دەکەنە سەر دیوارەکانی چونکە لە دەرەوەن، بۆیە خودا هۆشداری زیاتر داوە دەربارەی دووڕووەکان بەراورد بە کافرەکان.

* ترسناکترین دوژمنی ئوممەت دووڕووەکانن؛ چونکە دوژمنێکی نادیارن، تەنانەت بەجۆرێکن لای زاناکانیش شاراوەن چ جای نەزانەکان، خودا بە پەیامبەرەکەی دەفەرمووێت: ﴿هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ [المنافقون:٤] «ئەوان دوژمنن؛ تۆ خۆیان لێ بپارێزە. خوا بیانکوژێت؛ ئەمانە ڕوو دەکوێ دەکەن؟»

* سەرنجی هۆکاری تێکشکانی سی دانە دەوڵەتی گەورە و بچووکم داوە، بۆم دەرکەوت لەناوچوونی هەموویان بەهۆی لاوازکردنی دەوڵەتەکانیانەوە بووە لەلایەن دووڕووانی ناوخۆییەوە، لە پاشان دوژمن ئەوانی لا لاوازبووە و هێرشی بۆ هێناوە و هەرەسی پێهێناون.

* هیچ دەوڵەتێکی موسڵمانان نەشکاوە تەنها بەدەستی دووڕووەکان نەبێت، ئەوان هاوڕایی و پشتیوانی خۆیانیان بۆ دوژمن دەرخستووە.

* ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ﴾ [التوبة:٦٨] «بڕیاری خودا هەر وەک بۆ خودانەناسەکان هەیە، دووڕووانی ژن و پیاویش دەگرێتەوە؛ بە تێکڕایی دەیانخاتە جەهەندەم و تا هەتا هەر تیا دەبن.»

خودا لەم ئایەتەدا پیاوان و ئافرەتانی دووڕووی بە تایبەت باسکرد، بەڵام لە میانەی باسکردنی کافراندا تەنها باسی پیاوانی کافر دەکات و ئافرەتانیان باس نەکردووە، ئەمەش بە هۆی ترسناکی هەبوونی ئافرەتانی دووڕووە لە ناوجەرگەی کۆمەڵگادا.

* لە فەرموودەدا هاتووە «وفي أصحابي اثنا عشر منافقا» لەناو هاوەڵانم دوازدە دووڕوو هەیە.

دەربارەی ئەو ژمارە کەمە دوو سوورەت و زیاتر لە چل ئایەت دابەزیوە، لە کاتێکدا وەحی دادەبەزی و پەیامبەری خوداش زیندوو بوو، دەبێت ئێستا ژمارەیان چەند بێت و چەندە ڕوونکردنەوەمان پێویست بێت.

* دووڕووەکان بەهێز دەبن بە بەهێزبوونی دوژمنە دەرەکییەکانیان، بۆیە خودا فەرمان دەکات دوژمنە دەرەکییەکان لاواز بکەن، تاکوو دووڕووەکان لاواز ببن: ﴿تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ﴾ [الأنفال: ٦٠] «هەرچی لە تواناتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕ و ئامادەی بکەن و لە ئامادەکردنی ئەسپ و سواری و کەمتەرخەمی مەکەن، تا دوژمنانی خوا و دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن، هەروا کەسانێکی تریش جگە لەم دوژمنانەی ئێستا.

* دووڕووەکان بەتەنها خۆیان ناتوانن خراپەکاری بەرپابکەن، بێگومان پێویستییان بە دوژمنێکی ناوەکی هەیە پاڵپشتییان بکات: ﴿وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ﴾ [المنافقون: ٤]

«کاتێکیش دێنە قسە، ئەوەی گوێ دەگرێت بۆ قسەیان، دەڵێی داری وشکی بەدیواردا هەڵسپێردراون.»

* دووڕووان هیچ شارستانییەتێکیان بونیات نەناوە، هەرگیز ئوممەت

لەسەر دەستی ئەوان نەوەستاوە، ئەگەر دییت ئەوان خۆگر و ڕاوەستاو بوون، ئەوا بزانە پاڵپشتێکیان هەیە و ئەوان پاڵیان پێوە داوە، خودا دەربارەی دووڕووان دەفەرمووێت: ﴿كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ﴾ [المنافقون: ٤] «دەڵێی داری وشکی بەدیواردا هەڵسپێردراون.»

* هەر دەبێت ئەم ئوممەتە بە هەندێک لە تاکەکانی تاقی بکرێتەوە کە هاوبیری دوژمنانی ئوممەتبن: ﴿وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ﴾ [التوبة: ٤٧] «هێندێکیشتان لەناودا بوون قسەکانی ئەوانیان گوێ لێدەگرت.»

گوێبیستی وتەکانتان دەبن بۆئەوەی بیگوازنەوە، گوێیەکانیان لای پەیامبەر بوو و دڵەکانیشیان لای دوژمنانی بوو.

* دووڕووەکان زۆر کەم فێڵ و پیلانەکانیان سەردەگرێت، هەروەها زۆر بەکەمی ئامانجەکانیان دێتەجێ، خودا دەربارەیان دەفەرمووێت: ﴿وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا﴾ [التوبة: ٧٤] خەیاڵیان دابووە سەر شتێک، بۆیان نەلوا پێکی بێنن.

* خودا هەندێک تەنگەژە لە ژیاندا دەهێنێتە پێش، تا ئەوەی لە ناخ و دەروونی دووڕووەکاندایە ئاشکرای بکات و دەری بخات کە چەند ڕقیان لە هەقە و دڵخۆشن بە ناهەقان: ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ أَنْ لَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ أَضْغَانَهُمْ﴾ [محمد:٢٩] «ئاخۆ ئەوانەی غەرەزیان لە دڵدایە، لایان وایە خودا ڕک و کینەیان ئاشکرا ناکا؟»

* تەنگەژەکان دەرخەری پیسیی دووڕووەکان و پاکیێتی بڕواداران: ﴿مَا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ حَتَّى يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾ [آل عمران: ١٧٩ ]

«خوا هیچ کاتێک باوەڕدارانی لە بارودۆخێکا نەهێشتووەتەوە؛ مەگەر لەبەرئەوەی ناپاکان لە پاکان هەڵاوێرێ و جیابکاتەوە.»

* گەڕان بە شوێن دووڕوواندا و جێبەجێبکردنی سزا لەسەریان کاری

کاربەدەستانە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾ [التوبة:٧٣] «ئەی پێغەمبەر! دەگەڵ خودانەناسان و ئەوانەی دووڕوویی دەکەن، بە شەڕ وەرە و بە توندوتیژی ڕەفتاریان دەگەڵ بکە.»

حەسەن دەڵێت: تێکۆشان دژ بە دووڕووەکان بکەن بە جێبەجێکردنی سزا لەسەریان.

* دیارترین نیشانەی دووڕووەکان ڕاکردنیانە لە جێبەجێکردنی حوکمی خودا لەسەریان ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا﴾ [النساء:٦١] «ئەگەر پێیان بوترێت: وەرن بۆ لای ئەوەی خوا ناردوویەتییە خوارەوە، هەروەها بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) دەبینی دووڕووەکان ڕووت لێ وەردەگێڕن بە ڕوو وەرگێڕانێکی تەواو.

* لە هەموو کاتێکدا نیشانەی دووڕووەکان بریتی بووە لە ڕاکردن لە جێبەجێکردنی حوکمی خودا و ترسان لە حوکمی خودا، هەروەها بەگەڕخستنی تەواوی هەوڵیان بووە بۆ شێواندنی حوکمی خودا: ﴿وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ﴾ [النور: ٤٨] «هەروەها کاتێک بانگ بکرێن بۆ لای (شەریعەتی) خوا و پێغەمبەر (ﷺ) بۆئەوەی حوکم بکات لەنێوانیاندا، یەکسەر کۆمەڵێک لەوانە ڕوو وەردەگێڕن.»

* نیشانەی هەرە گەورەی دووڕوویی بریتییە لە ڕقلێبوونەوە لە بەڵگە هێنانەوە بە قورئان: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنكَرَ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِالَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾ [الحج:٧٢] «وەکاتێک بخوێنردێتەوە نیشانە ڕوونەکانی ئێمە لە دەموچاوی ئەو کەسانەی بێباوەڕن، دەبینی ڕووگرژیو تووڕەیی نزیکە پەلامار بدەن بۆ ئەو کەسانەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە.»

* بەڵگە دەهێننەوە بەو ئەقڵە ناتەواو و کەمەی کە هەیانە، جا کاتێک سرووش دادەبەزێت، ڕادەکەن لێی: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْـزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا﴾ [النساء:٦١] «ئەگەر پێیان بوترێت: وەرن بۆ لای ئەوەی خوا ناردوویەتییە خوارەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) دەبینی دووڕووەکان ڕووت لێ وەردەگێڕن بە ڕوو وەرگێڕانێکی تەواو.»

* قورسترین شت لەسەر دووڕووان، بانگکردنیانە بۆ جێبەجێکردنی حوکمی خودا ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْـزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا﴾ [النساء:٦١] «ئەگەر پێیان بوترێت: وەرن بۆ لای ئەوەی خوا ناردوویەتییە خوارەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) دەبینی دووڕووەکان ڕووت لێ وەردەگێڕن بە ڕوو وەرگێڕانێکی تەواو.»

* نیشانەی دووڕووان ئەوەیە شکۆ و ڕێز بۆ بێباوەڕان دادەنێن و بەکەم تەماشای باوەڕداران دەکەن ﴿فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ [المائدة: ٥٤] «بەزوویی خوا لەباتیی ئەوان گەل و کۆمەڵێکی تر دەهێنێت کە خوا ئەوانی خۆش دەوێت و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێت. بەسۆز و بەبەزەییبەرانبەر باوەڕداران و بەهێز و توندن بەرانبەر بە بێباوەڕان.»

* زماندرێژی بەرانبەر موسڵمانان: ﴿سَلَقُوكُمْ بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ﴾ [الأحزاب:١٩] «دەست بە زمانشڕی دەکەن بەرانبەرتان.»

زمانشیرنی و گوفتنەرمی بەرانبەر کافران لە نیشانەی دووڕووانە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا﴾ [الحشر: ١١] «ئایا سەرنجێکت نەداوە بە لای ئەوانەی کا دووڕوو بوون دەڵێن بەو برادەرانەیان کە بێباوەڕ بوون لە (جوولەکە) خاوەن کتێبەکان: ئەگەر دەربکرێن، ئێمەش لەگەڵتان دەردەچین هەرگیز فەرمانبەرداریی کەس ناکەین لە دژی ئێوە.»

* دووڕووەکان ترسنۆکترین کەسانێکن دەبارەی ڕەخنەگرتن، چونکە ئەوەی شاردویانەتەوە زۆر گەورەترە لەوەی دەریان خستووە بۆیە ترسی ئاشکرابوونیان هەیە: ﴿وَإِذَا مَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ نَظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ هَلْ يَرَاكُمْ مِنْ أَحَدٍ ثُمَّ انْصَرَفُوا﴾ [التوبة:١٢٧] «هەرگا سوورەتێک دێتە خوار، هێندێک دەڕواننە هێندێکان: ئاخۆ کەس ئێوە دەبینێت؟ لە پاشان دەگەڕێنەوە و ئەوێ بەجێدێڵن.»

* نیشانەی دووڕووان پشتگیریکردنی جگە لە موسڵمانانە لە کاتی هاتنی هەر ڕووداو و پێشهاتێکدا، هەروەها گوێ نەدانیانە بە کەیس و کێشە و کاروباری موسڵمانان: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مَا هُمْ مِنْكُمْ وَلَا مِنْهُمْ﴾ [المجادلة:١٤] «ئاخۆ تۆ ئەوانەت نەدیت کە بوونە دۆستی ئەوانەی خودا غەزەبی لێ گرتوون؟ ئەوان نە لە ئێوەن؛ نە لەوانیش.»

* نیشانەی دووڕوو ئەوەیە زیاتر پشتگیری جوولەکە دەکەن وەک لە موسڵمانان ﴿ألم تر إلى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ ...﴾ [الحشر:١١ ] «ئایا سەرنجێکت نەداوە بە لای ئەوانەی کا دووڕوو بوون دەڵێن بەو برادەرانەیان کە بێباوەڕ بوون لە (جوولەکە) خاوەن کتێبەکان: ئەگەر دەربکرێن، ئێمەش لەگەڵتان دەردەچین ...»

* نیشانەی دووڕووەکان یەک ئامانجی و هاوئامانجبوونیانە لەگەڵ جوولەکە و گاوردا ﴿الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ﴾ [الحشر:١١] «ئایا سەرنجێکت نەداوە بە لای ئەوانەی کا دووڕوو بوون دەڵێن بەو برادەرانەیان کە بێباوەڕ بوون لە (جوولەکە) خاوەن کتێبەکان: ئەگەر دەربکرێن، ئێمەش لەگەڵتان دەردەچین ...»

* خێراترین کەسانێک لەم ئوممەتەدا کە لە کاتی پێشهاتەکاندا ئامانجی لەگەڵ گاور و جوولەکەدا یەک بگرێتەوە بریتین لە دووڕووەکان: ﴿فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَنْ تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ﴾ [المائدة:٥٢]

«ئەو کەسانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە، دەبینی کە بەپەلەن بۆ چوونە لایان؛ دەڵێن: ئێمە دەترسین تووشی بەڵا بین بۆیە دۆستایەتیتان دەکەین.»

* کاتێک قسە زۆر بوو، دووڕوویی زۆر دەبێت، چونکە دووڕووی گوفتاری بێ کردارە، زوبان تواناداره و ئەندامەکان بێتوانان. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لا تَفْعَلُونَ﴾ [الصف: ٢]

«ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، بۆچی ئەوەی دەیڵێن ئەنجامی نادەن.»

* پەیامبەر و هاوەڵان کرداریان دەکرد، بەڵام دووڕووان بیانوو و پۆزشیان دەهێنایەوە و دوادەکەوتن و خەڵکیشیان سارد دەکردەوە: ﴿لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾ [آل عمران:١٦٨] «ئەگەر بە قسەیان کردباین، نەدەکوژران.»

﴿بُيُوتَنا عَوْرَةٌ﴾ [الأحزاب:١٣] «کەسمان لەسەر ماڵەکانمان دانەناوە ئاگای لێ بێت.»

﴿شَغَلَتْنَا أَمْوَالُنَا وَأَهْلُونَا﴾ [الفتح:١١] «دارایی و ماڵ و خێزانمان نەیانهێشت بگەینە ئێوە بۆ جیهاد.»

﴿لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلا أَخَّرْتَنَا﴾ [النساء:٧٧] «ئەی پەروەرێنمان! بۆچی غەزات لەسەر نووسیوین، چی دەبوو تا ماوەیەکی تر دوات خستبا؟»

* دووڕووان زمان و گوفتاریان هەیە، سەرقاڵ مەبە بە قسە و زمانیانەوە، بەڵکوو سەرقاڵی دڵەکانیان بە کە هەڵسووڕێنەری زمانیانە.

* گرنگیدان بە ڕووکەش و پشتگوێخستنی ناخ نیشانەی دووڕووانە: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ﴾ [المنافقون:٤] «کاتێک دەیانبینیت، جەستە و شێوەیان سەرسامت دەکات، گەر قسەش بکەن، گوێیان بۆ دەگریت هەر ئەڵێی داری وشکی بە دیواردا هەڵسپێردراون.»

* خراپترینی خەڵکی ئەوانەن بە کردەوە خراپن، بەڵام وتەیان ڕاست و دروستە، پێشەوا عومەر دەفەرمووێت: «ترسناکترین شت لێی بترسم تێتاندا: دووڕوویەکی شارەزایە کە دانایانە بدوێت بەڵام بە ستەم کاربکات.»

* دووڕووەکان وتەی هەق بە زمان دەردەبڕن ﴿يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ﴾ [البقرة: ٢٠٤] «بە قسە سەرسامت دەکات لەم ژیانی دنیادا و خوا دەتکات بە شاهێد لەسەر (ڕاستیی) ئەوەی لە دڵیایەتی.»

بەڵام کاتێک بەدواداچوون دەکەیت بۆ کردارەکانیان، دەبینیت مەبەستی خراپە و شەڕیان لە پشت حەشارداوە: ﴿وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا﴾ [البقرة: ٢٠٥ ]

«کاتێک پشتی هەڵکرد، هەوڵ دەدات بۆ خراپەنانەوە لە زەویدا.»

*وتەکان جێی بایەخ نیین ئەگەر کردارەکان پێچەوانەیان بن: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ﴾ [البقرة:٢٠٤] «لەم خەڵکەدا ئی وا هەیە قسە و گفتی سەبارەت بە ژیانی دنیا بۆ تۆ سەیر و سەرسووڕهێنە و لەسەر ئەوەی لە دڵیایە خوا بە شایەت دێنێتەوە؛ کەچی هەر ئەوە کە لە دوژمناتی کردندا زۆر سەرسەختە.»

* دووڕووەکان جۆرەها شێواز بەکاردەهێنن بۆ چەسپاندنی پاڵپشتی و ڕاستگۆییيان بۆ ئیسلام، زۆر بوێرانە سوێند دەخۆن بۆ پەیامبەر لە کاتێکدا ئەو پەیامبەرە لە ئاسمانەوە سرووشی بۆ دادەبەزێت: ﴿وَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُمْ مِنكُمْ وَلَكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ﴾ [التوبة:٥٦] «بە سوێندەوە ڕەش دەبنەوە، دەڵێن: ئێمەش لە خۆتانین؛ درۆش دەکەن لە ئێوە نین؛ بەڵام ئەوان گرۆیەکی ترسەنۆکن.»

* دووڕووەکان بانگەشەی پاڵپشتی و دۆستایەتی موسڵمانان دەکەن، بەڵام لە کاتی ترس و تەنگانەدا لە ڕیزی ئوممەتدا ناوەستن و پاڵپشتیان ناکەن: ﴿وَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنْكُمْ وَمَا هُمْ مِنْكُمْ﴾ [التوبة:٥٦] «سوێندتان بۆ دەخۆن بە خودا کە ئەوانیش لە ئێوەن ...»

﴿لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَأً أَوْ مَغَارَاتٍ أَوْ مُدَّخَلا لَوَلَّوْا إِلَيْهِ﴾ [التوبة:٥٧] «گەر ئەنوایەک، یان ڕەهۆڵێک، یان ئەشکەوتێکیان شک بربا، بە هەڵەداوان بۆی دەچوون لە ترسەنۆکیدا.»

* دواکەوتنی ئەندامەکانی مرۆڤ لە کردەوە کردن بەڵگەیە لەسەر دواکەوتنی دڵی لە دڵنیایی و یەقین.

* ئەو کەسەی ئایینداریەکەی نەبێتە هۆی جێهێشتنی شوێنەوار بەسەر ڕووکەشیەوە، ئەوا شوێنەواری ناو ناخیشی کۆتاییدێت، هەرچەندە پاش ماوەیەکیش بێت.

* دووڕووەکان ئەوپەڕ ئامانجیان ڕازیکردنی خەڵکییە، بڕواداری ڕاستگۆ تەنها ئامانجی ڕازیبوونی خودایە: ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَنْ يُرْضُوهُ إِنْ كَانُوا مُؤْمِنِينَ﴾ [التوبة:٦٢] «سوێند بە خودا بۆ دەخۆن کە ئێوەیان لێ ڕازی بن. با ئەگەر خاوەن باوەڕن، کارێک بکەن خوا و پێغەمبەری خودایان لێ ڕازی بن.»

* نیشانەی دووڕوو ئەوەیە لەگەڵ زۆرینە و ڕەشایی خەڵکیدان و تەنها ئامانجیان ڕازیکردنی خەڵکییە هەرچەندە بۆ دەستخستنی ئەو ئامانجەشیان پێچەوانەی هەقیش کار بکەن: ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَنْ يُرْضُوهُ إِنْ كَانُوا مُؤْمِنِينَ﴾ [التوبة:٦٢] «سوێند بە خودا بۆ دەخۆن کە ئێوەیان لێ ڕازی بن. با ئەگەر خاوەن باوەڕن، کارێک بکەن خوا و پێغەمبەری خودایان لێ ڕازی بن.»

* ئەگەر دییت دەروونت زیاتر سوورە لەسەر ڕازیکردنی خەڵکی وەک لە ڕازیکردنی خودا، ئەوا بزانە بەشێکی دووڕوویی لە ناختدا شاراوەتەوە: ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَنْ يُرْضُوهُ إِنْ كَانُوا مُؤْمِنِينَ﴾ [التوبة:٦٢] «سوێند بە خودا بۆ دەخۆن کە ئێوەیان لێ ڕازی بن. با ئەگەر خاوەن باوەڕن، کارێک بکەن خوا و پێغەمبەری خودایان لێ ڕازی بن.»

* دووڕووەکان زۆرترین دڵەڕاوکێ و ترسیان هەیە لەناو هەموو خەڵکیدا، چونکە هەندێک شتیان شاردووەتەوە دەترسن ئاشکرا ببێت و پێش کاتی خۆی دەربکەوێت: ﴿يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تُنَـزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ﴾ [التوبة:٦٤] «ئەوانەی دووڕوون دەترسن سەبارەت بەوان سوورەتێک بێتە خوارێ، هەرچی لە دڵیاندا هەیە ئاشکرای کات.»

* دووڕووەکان ترسنۆکترین کەسانێکن دەبارەی ڕەخنەگرتن، چونکە ئەوەی شاردوویانەتەوە زۆر گەورەترە لەوەی دەریان خستووە، بۆیە ترسی ئاشکرابوونیان هەیە: ﴿وَإِذَا مَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ نَظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ هَلْ يَرَاكُمْ مِنْ أَحَدٍ ثُمَّ انْصَرَفُوا﴾ [التوبة:١٢٧] «هەرگا سوورەتێک دێتە خوار، هێندێک دەڕواننە هێندێکان: ئاخۆ کەس ئێوە دەبینێت؟ لە پاشان دەگەڕێنەوە و ئەوێ بەجێدێڵن.

* دووڕووەکان دڵەڕاوکێیەکی زۆریان هەیە بەهۆی ئەو ڕاستیەیەی شاردوویانەتەوە و ئەو درۆیەی دەریان خستووە، جا ڕق و کینەی ناخیان لە شێوەی گاڵتەجارێدا بەدەردەخەن: ﴿يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تُنَـزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ قُلِ اسْتَهْزِئُوا﴾ [التوبة:٦٤] «ئەوانەی دووڕوون دەترسن سەبارەت بەوان سوورەتێک بێتە خوارێ، هەرچی لە دڵیاندا هەیە ئاشکرای کات. بێژە: ئێوە گاڵتە بکەن.»

* ئەگەر دووڕووی لە دەرووندا زیادی کرد، ئەوا زیاتر چاودێری ڕەخنە دەکات و دوودڵی زیاتر دەبێت دەربارەی ڕەخنەگرتن لێی، بەڵام ئەوانەی خاوەن

دڵنیایی و باوەڕێکی تەواون، بڕیارەکانیان دوودڵی تێدا نییە، چون شتێکیان نییە تا بیشارنەوە ﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ﴾ [المنافقون:٤] «هەر هاوار و بانگێک بکرێت، هەر باسێک بێتەپێشەوە، دەزاننیش دژی ئەوانە، ئا ئەوانەن کە دوژمنن، کەوابوو خۆتیان لێ بپارێزە، وریایان بە.»

* بێلایەنی لە وەختی جیابوونەوەی هەق لە ناهەق نیشانەی دووڕوویيە: ﴿مُذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَلِكَ لا إِلَى هَؤُلاءِ وَلا إِلَى هَؤُلاءِ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلا﴾ [النساء: ١٤٣] «وازوازین لەم نێوانەدا؛ دوودڵن بچنە لای ئەمان، یان خۆبدەنە لای ئەوان. کەسێک خوا ڕێی لێ بگۆڕێت، تۆ ناتوانیت هیچ ڕێگەیەکی نیشان دەی.»

* ناڕوونی لە مەنهەج و ڕێبازدا لە کاتی هەبوونی ناکۆکییە بەهێزەکان نیشانەی دووڕوویيە: ﴿مُذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَلِكَ لا إِلَى هَؤُلاءِ وَلا إِلَى هَؤُلاءِ﴾ [النساء: ١٤٣] «وازوازین لەم نێوانەدا؛ دوودڵن بچنە لای ئەمان، یان خۆبدەنە لای ئەوان. کەسێک خوا ڕێی لێ بگۆڕێت، تۆ ناتوانیت هیچ ڕێگەیەکی نیشان دەی.»

* ناڕونیی وتە و گوفتار و ئاشکرا دەرنەبڕینی بۆچوونەکان، کارێکە نە شایستەی موسڵمانە و نە کافر، بەڵکوو سیفەتێکی چەسپاوی دووڕووەکانە: ﴿مُذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَلِكَ لا إِلَى هَؤُلاءِ وَلا إِلَى هَؤُلاءِ﴾

* ئەوانەی وازیان لە چاکە هێناوە و چاکەیان لا بێزراو بووە تەنها ئەوانەن کە فەرمانکردن بە چاکەیان پێناخۆشە، هەروەها کەسانێک ڕێگریکردنیان لە خراپە پێناخۆشە کە خۆیان ئەنجامیان داوە و خوازراوە لایان، خودا کۆبوونەوەی ئەم دوو وەسفەی بۆ دووڕووان چەسپاندووە.

* ئەوکەسەی خودای لەیاد کردبێت، ئەوا دروشمەکانی خودای بەرز ڕانەگرتووە ﴿يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ [التوبة:٦٧] «فەرمان بە خراپە دەدەن و ڕێگە لە

چاکە دەگرن؛ دەستی خۆشیان لە خێرکردن دەقووچێنن؛ خودایان لە بیر بردەوە و خوداش ئەوانی لە بیر کرد و دەست لێ بەردا. ئەوانەی دووڕوویی دەکەن، هەموویان لە ڕێ لادەرن.»

* دووڕووان جیاوازن دەربارەی دونیا، بەڵام هەموویان کۆکن لەسەر ڕقبوونیان لەو کەسانەی کە هەڵدەستن بە ڕێگریکردن لە خراپە؛ چونکە هەموویان یەک جۆر ئارەزوو حەزیان هەیە: ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ﴾ [التوبة:٦٧] «نێر و مێ لەم دووڕووانە وەکوو یەکن؛ فەرمان بە خراپە دەدەن و ڕێگە لە بەر چاکە دەگرن.»

* دووڕووان کاری لێپرسینەوە دەکەن، بەڵام بەپێچەوانەی باوەڕدارانەوە: ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ﴾ [التوبة:٦٧] «نێر و مێ لەم دووڕووانە وەکوو یەکن؛ فەرمان بە خراپە دەدەن و ڕێگە لە چاکە دەگرن.»

* ناکۆکی و ململانێیەکی کۆنە: ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ﴾ [التوبة:٦٧] «نێر و مێ لەم دووڕووانە وەکوو یەکن؛ فەرمان بە خراپە دەدەن و ڕێگە لە چاکە دەگرن.»

﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾ [التوبة:٧١] «ژن و پیاوی باوەڕدار دۆستی یەکترین؛ فەرمان بە چاکە دەدەن و بەر لە کاری خراپە دەگرن.»

* ئافرەتانی دووڕوو هاوبەشن لەگەڵ پیاوانی دووڕوو لە ڕقلێبوون و جەنگکردنیان دژ بەو کەسانەی لێپرسینەوایان لەگەڵ دەکەن، چونکە ئارەزوو حەزەکان هاوشێوەی یەکترییە: ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ﴾ [التوبة:٦٧]

* نیشانەی دووڕوو بەرەنگار بوونەوەی بەڵگە بەهێز و کردارە هەقەکانە بە گاڵتە و گەمە: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ﴾ [التوبة:٦٥]. خۆ ئەگەر لێشیان بپرسی: خەریکی چن؟ دەڵێن: ئێمە تەنیا خەریکی گەپ و گاڵتە بووین.

* گاڵتەپێکردن شایستەی ڕاستگۆیان نییە، بەڵام نیعمەتێکە خودا بەهۆیەوە بیروباوەڕی چەوتی دووڕووەکان ئاشکرا دەکات ﴿قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَا تَحْذَرُونَ﴾[التوبة:٦٤] «بێژە: ئێوە گاڵتە بکەن، ئەوەی خۆی لێ دەپارێزن، خودا هەر ئاشکرای دەکا.»

* کاتێک پەیامبەری خودا (ﷺ) سەرقاڵ بووایە بە دوژمنێکی دەرەکییەوە، ئەوا دووڕووان سەرقاڵی دوو کار دەبوون:

١ـ هەڵگیرساندنی ئاشووب لە بابەتە لاوەکیەکاندا، تا بەم کارە لە بابەتە گەورەکان سەرقاڵی بکەن.

٢. ئاوەڕدانەوەیان بەلای ئافرەتاندا بۆ دەستخستنی حەز و ئارەزوویان.

* کەسی دووڕوو تاوان دەکات و خۆی بەری دەکەن لە تاوانەکە، بەڵام باوەڕدار تاوان دەکات و دانی پێدادەنێت و تەوبە دەکات: ﴿وَمَنْ يَكْسِبْ خَطِيئَةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِ بَرِيئًا فَقَدِ احْتَمَلَ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا﴾ [النساء:١١٢] «هەرکێ بە هەڵە یان بەقەست، تاوانێکی لێ ڕوویدا و بیخاتە سەر بێگوناهێک، ئاشکرایە باری تاوانەکەشی و بوختانیشی لە سەر شانە.»

* نیشانەی دووڕووەکان دەستخستنی خۆشی دونیایانە لەسەر حسابی خۆشی دواڕۆژیان، ئیبن عومەر دەڵێت:

"ئێمە ئەگەر کەسێکمان لە نوێژی عیشا و بەیانیاندا نەدیبیا، گومانی خراپمان پێ دەبرد."

* تاوانی پەنهانی نیشانەی دووڕوویيە: ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لا يَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ﴾ [النساء:١٠٨] «تاوانەکانی خۆیان دەشارنەوە لە خەڵکی (لەترساندا) و نایشارمەوە لە خوا (شەرم ناکەن لە خوا) لە کاتێکدا خوا لەگەڵیاندایە، کاتێک (کە بەنهێنی) لەشەودا تەگبیر دەکەن و قسەیەک دەکەن خوا پێی ڕازی نییە.»

* نیشانەی دووڕوو ئەوەیە لە پێش چاوی خەڵکی جۆرە کردەوەیەک ئەنجام بدەیت، بەڵام هەرکات تەنها بوویت لە پەنهانیدا ئەنجامی نەدەیت، کەوابوو وازلە کردارە ئاشکراکان مەهێنە لەپێناو خەڵکیدا، بەڵام لە پەنهانیدا زیاتر ئەنجامی بدە تاکوو باوەڕت زیاتر پێی بچەسپێت.

* دووڕووەکان سەردەمی پەیامبەر بەوە دەناسرانەوە ماڵ و سامانیان دەگرتەوە و نەیان دەبەخشی لەو کاتانەی کە ئوممەت پێویسی بە پارە و سامانی ئەوان ببوایە: ﴿لا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ﴾ [التوبة:٤٤] « (بەڵام) ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی هەیە مۆڵەتت لێ ناخوازن (خۆ لە جیهاد و غەزا نادزنەوە) چونکە ئامادەن ماڵ و سامان و گیانیان لەپێناو خوادا بەخت بکەن.»

* نزیکترین کەس لە دووڕووییەوە ئەوانەن کە ترسیان لە دووڕووی نییە، ئەوانەی زۆر ترسی دووڕووییان هەیە زۆر دوورن لێیەوە، لە ئەسەرێکدا هاتووە «ما خاف النفاق إلا مؤمن، ولا أمنه إلا منافق. «لە دووڕووی ناترسێت، تەنها باوەڕدار نەبێت. هەروەها لێی بێخەم و ترس نابێت ئەگەر دووڕوو نەبێت.»

* دڵخۆشی کەسانێک کە پارێزراوبوون لەو بەڵایەی خودا دایبەزاندووەتە سەر کەسانێکی دیکە، ئەم جۆرە لە دڵخۆشی بە نیشانەی دووڕوویی هەژمار دەکرێت ﴿وَإِنْ تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا قَدْ أَخَذْنَا أَمْرَنَا مِنْ قَبْلُ وَيَتَوَلَّوْا وَهُمْ فَرِحُونَ﴾ [التوبة: ٥٠] «ئەگەر تووشی بەڵایەکیش بیت، ئێژن: ئێمە هەر لە پێشدا

مشووری خۆمان خواردووە و بە دڵی خۆشەوە خۆت لێ دوورەپەرێز دەگرن.»

* دڵخۆشی لە وەختی گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکانی خودا دێتەجێ، گوێڕایەڵی خودا دەبێتە هۆکاری بچووکبوونەوەی نەهامەتییەکانی دونیا، پارێزراوبوون لە موسیبەتەکان بەڵگە نییە لەسەر درووستیی ڕێبازی کەسەکە، بەڵکوو زۆرجار نیشانەی پێچەوانەبوونی ئەو بابەتەیە.

* باوەڕدار خۆشحاڵ دەبێت بە پارێزراوبوونی ئایینەکەی هەرچەندە دونیاش لە دەست بدات، بەڵام دووڕوو خۆشحاڵ دەبێت بە پارێزراو بوونی دونیای هەرچەندە ئایینەکەشی لە دەست بدات: ﴿وَإِنْ تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا قَدْ أَخَذْنَا أَمْرَنَا مِنْ قَبْلُ وَيَتَوَلَّوْا وَهُمْ فَرِحُونَ﴾ [التوبة:٥٠] «ئەگەر تووشی بەڵایەش بی، ئێژن: ئێمە هەر لە پێشدا مشووری خۆمان خواردووە و بە دڵی خۆشەوە خۆت لێ دوورەپەرێز دەگرن.»

* دووڕووەکان دروستییەتیی حوکمی خودا دەبەستنەوە بە پارێزراوبوونی دونیایان ﴿فَإِنْ كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِنَ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُنْ مَعَكُمْ وَإِنْ كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ﴾ [النساء:١٤١]. «ئەگەر سەرکەوتنێکتان لەلایەن خوداوە دەست بکەوێت، دەڵێن: ئەی ئێمە لهگەڵتان نەبووین؟! خۆ ئەگەر کافرەکان بەشێکیان بێت لە سەرکەوتن، دووڕووەکان دەڵێن: ئایا ئێمە لەسەر ئێوەمان نەدەکردەوە و نەمانهێشت ئیمانداران زیانتان پێ بگەیەنن.»

* دووڕووەکان ڕاستی و تەواویی حوکمی خودا دەپێون بە پارێزراوی دونیایان ﴿وَإِنْ تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا قَدْ أَخَذْنَا أَمْرَنَا مِنْ قَبْلُ وَيَتَوَلَّوْا وَهُمْ فَرِحُونَ﴾ [التوبة:٥٠] «ئەگەر تووشی بەڵایەش بی، ئێژن: ئێمە هەر لە پێشدا مشووری خۆمان خواردووە و بە دڵی خۆشەوە خۆت لێ دوورەپەرێز دەگرن.»

* نیشانەیەکی دووڕووان کە لە قورئاندا باسکراوە بەوەی جەنگی هزری دەکەن لە ڕێگای ناشرینکردن و شێواندنی هەڵگرانی ئەو هزرەوە، چونکە هەموو

هزرێک هەڵگری هەیە، کاتێک هەڵگری هزرەکە ناشرین بکرێت، هزرەکەش ناشرین دەبێت.

*دووڕووەکانی سەردەمی پەیامبەر خۆیان بە دوور دەگرت لە ڕەخنە گرتنی ئاشکرا لە ئیسلام بەڵام کەسە سەرمەشقەکانیان بە ئامانج دەگرت: وەک پەیامبەر و هاوەڵانی (ﷺ)، چونکە دەیانزانی شێواندنی خاوەن پەیامەکە دەبێتە هۆی شێواندنی پەیامەکەیە.

* دووڕووەکان ستایشی ئەوانە دەکەن کە سامانیان دەدەنێ، هەرچەندە ئەو کەسانە لەسەر ناهەقیش بن، زەمی ئەوانەش دەکەن کە ڕێگری سامان پێدانیان دەکەن، هەرچەندە لەسەر هەقیش بن ﴿فَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا وَإِنْ لَمْ يُعْطَوْا مِنْهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ﴾ [التوبة:٥٨] «ئەگەر بەشی خۆیان بدرێتێ، ڕازی دەبن؛ ئەگەر بەشیان بەر نەکەوێت، تووڕە دەبن و بۆڵە دەکەن.»

* دووڕووەکان دەترسن کوفرەکەیان دەربخەن لە ترسی سزادنیان، خۆ ئەگەر دڵنیا بوون کە سزا نادرێن، ئەوا کوفرەکەیان ئاشکرا دەکەن: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا ثُمَّ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا ثُمَّ ازْدَادُوا كُفْرًا﴾ [النساء:١٣٧]. «بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، دوایی پاشگەزبوونەتەوە، دووبارە ئیمانیان هێنایەوە دوایی پاشگەز بوونەوە، ئەوجا لەوەودوا زیاتر لە بێدینی و کافریدا ڕۆچوون.»

* دووڕووەکان کوفرەکەیان دەردەخەن بەگوێرەی ئاسایشیان، حوذەیفە دەڵێت: دووڕووەکانی ئەمڕۆ خراپترن لە دووڕووەکانی سەردەمی پەیامبەر(ﷺ) ئەوکات ئەوان دووڕووییان دەشاردەوە، بەڵام ئەمڕۆ ئاشکرای دەکەن.

* دووڕووەکان دەترسن ئەوەی شاردوویانەتەوە لە کاتێکی نەگونجاو و ناوەختدا دەربکەوێت، بەڵام بێگومان ئەو خۆپارێزیەیان ناپاکییان لە گەڵدا دەکات ئەوەی شاردوویانەتەوە بۆیان دەردەخات ﴿قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَا تَحْذَرُونَ﴾ [التوبة:٦٤] «بێژە: ئێوە گاڵتە بکەن، ئەوەی خۆی لێ دەپارێزن، خودا هەر ئاشکرای دەکات.»

* هەندێک جار دووڕووەکان بەسەرسامبوونیان بە بۆچوونەکانی خۆیان تاقی دەکرێنەوە، بەجۆرێک بە چاوی بەزەییەوە سەیری باوەڕداران دەکەن و دەڵێن فێڵیان لێکراوە و هاندراون: ﴿إِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ غَرَّ هَؤُلَاءِ دِينُهُمْ﴾ [الأنفال:٤٩] «بیر بکەرەوە هەرکاتێک دووڕووەکان و ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندا بوو، دەیانوت: ئەوانە (موسڵمانەکان) ئایینەکەیان فریوی داون.»

* دووڕووەکان متمانەبەخۆبوونێکی فراوانیان هەیە، ئەوەش وایان لێ دەکات بەدرۆ سوێند بخۆن لای خودا: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ [المجادلة:١٨] «ڕۆژێک کە خودا گشتیان زیندوو دەکاتەوە، ئەو جار سوێندێ بۆ ئەو دەخۆن، وەکوو بۆ ئێوە سوێند ئەخۆن؛ لاشیان وایە شتێکیان دە باراندایە. باش بزانن کە ئەمانە درۆزنن.»

* دووڕووەکان لە خەیاڵاتی سەرکەوتندا دەژین تەنانەت بەسەر خوداشدا: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ﴾ [النساء:١٤٢] «بە دڵ دەغەڵانی دووڕوو دەیانەوێت خوا فریو دەن، کەچی خوا ئەوان دەخەڵەتێنێت. خوداش لەلایەنێکەوە بۆیان دێت کە ئەوان زۆر بە ئەمین و پارێزراویان داناوە.»

* دووڕووەکان بە تێگەیشتنی تەسکی خۆیان لە تووشبوونی فیتنە و ئاشووب دەترسن، بەڵام گوێ نادەن بەو شتانەی لەوە گەورەترە: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي وَلَا تَفْتِنِّي أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا﴾ [التوبة:٤٩] «هەندێک کەس لەوانە دەڵێن: ڕووخسەتم بدە (با نەیەم بۆ جیهاد) و تووشی گوناە و خراپەم مەکە، ئاگادار بن (کە هەر لە ئێستەوە) کەوتوونەتە ناو گوناە و خراپەوە.»

* دووڕووەکان زۆر کەم پەند وەردەگرن، چونکە لە هەموو خەڵکی خۆبەگەورەزانترن بەرانبەر بە هەق ﴿أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ [التوبة: ١٢٦] «ئایا ئەوانە نازانن و نابینن کە

بێگومان تاقی دەکرێنەوە لە هەموو ساڵێکدا جارێ یان دوو جار، پاشان ئەوانە ناگەڕێنەوە، تۆبە ناکەن و پەند وەرناگرن.»

* زۆرجار دووڕووەکان ئایین بەکاردەهێنن، نەک لەبەر خۆشویستییان بۆ ئیسلام، بەڵکوو بە مەرامی تێکدانی ناوخۆیی ئەو کارە دەکەن: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ [التوبة:١٠٧]. «ئەوانەی مزگەوتەکانیان دروست کرد بۆ زیان گەیاندن (بە موسڵمانان) و خوانەناسی و جیاوازی خستنەنێوان ئیمانداران و بۆ بۆسەگرتن و خۆمەڵاسدانی کەسانێک کەدژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەیان کردووە.»

* دووڕووەکان بەشوێن کەنیزەکەکانی مەدینە دەکەوتن، کەنیزەکیان دەکڕی تاکوو بە خراپە پارەیان بۆ پەیدا بکەن، بۆیە پەیامبەری خودا (ﷺ) کارکردنی کەنیزەکەکانی قەدەغەکرد بەهۆی ئەوانەوە، کەچی کاتێک عائیشەیان (ڕەزای خوا لێ بێت) بەتەنها لەگەڵ صفوان (ڕەزای خوای لێ بێت.) دیت، دەستیان کرد بەقسەکردن دەربارەی شەرەف!

* دڵخۆشبوون بە لێکدانەوە و وتەی مادەگەرییەکان و ڕاکردن لە وتەی خودا دووڕووییە: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ [الزمر:٤٥]. «کاتێک یادی خوا بکرێت بە تاک و تەنیا تێکدەچێ و بێزار دەبێت دڵی ئەوانەی کە باوەڕیان نییە بە ڕۆژی دوایی، کەچی کاتێک ناوی پەرستراوانی بێجگە لە خوا ببرێت، یەکسەر شاد و ڕوخۆش دەبن.»

* دووڕووان بیروباوەڕییان لەسەر ماڵ و سامان دامەزراندووە، ڕاستگۆیانیش بیروباوەڕیان لەسەر ڕاستی دامەزراوە: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ فَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا وَإِنْ لَمْ يُعْطَوْا مِنْهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ﴾ [التوبة:٥٨]. «هەندێک کەس لەوانەی ڕەخنە و توانجت لێ دەگرن، لە دابەشکردنی خێرەکاندا. خۆ ئەگەر

ـەو خێر و سەدەقەیەیان پێبدرێت ڕازی دەبن و ئەگەر پێیان نەدرێت، تووڕە و نارازی دەبن.»

* دووڕووەکان زۆرهەڵە دەکەن لە دیاریکردنی پێگە و قەبارەیان لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا: ﴿يَقُولُونَ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ [المنافقون:٨]. «ئێژن: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە، بێگومان بەدەسەڵاتان ڕووت و لاتی لێ دەردەکەن. دەسەڵاتیش هەر بۆ خوا و بۆ پێغەمبەری و ئاپۆرەی باوەڕدارانە.»

متمانەیەک کە بە خەیاڵاتێکی تایبەتەوە لەگەڵی دەژین.

* هاوەڵان وەها بڕیاریان داوە کە بەرگریکردن لە دووڕووان و مناقەشەکردن لەپێناویاندا نیشانەی دووڕووییە، هەندێک جار لە کەسە باشەکانیشەوە ئەوە ڕوودەدات، ئوسەید فەرمووی: تۆ دووڕوویت و بەرگری لە دووڕووان دەکەیت.

# هەڵگەڕانەوە (الردة)

* ئیسلام پۆشاکێکە ناکەوێتە سەر زەوی، ئەگەر کۆمەڵانێک لە بەریانی دابنێن، خودا دەیکات بەبەر کۆمەڵانێکی دیکەدا: ﴿فَإِنْ يَكْفُرْ بِهَا هَؤُلَاءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَيْسُوا بِهَا بِكَافِرِينَ﴾ [الأنعام:٨٩] «جا ئەگەر ئەوانە بڕوایان پێ نەبێت، ئەوە بەڕاستی بە کەسانێکی ترمان (لە ژیر و هۆشمەندەکان) سپارد و بڕوایان پێیەتی و پشتیوانی لێ دەکەن و پێی بێباوەڕ نین.»

* ئیسلام بەردەوام لە گەشەسەندن دایە و کەم ناکات، سونەتی خودا وایە، ئەگەر یەک کەس هەڵگەڕێتەوە، ئەوا کۆمەڵێک لە شوێنی ئەو موسڵمان دەبن: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ [المائدة:٥٤]. «ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! هەر کەس لە دینی خۆی پاشگەز ببێتەوە، خوا لەمەولا کۆمەڵێ وا دەخاتەڕوو، خۆشی بوێن؛ ئەوانیش خوایان خۆش بوێت.»

* چەند تاکێک لە سەردەمی پەیامبەر (ﷺ) هەڵگەڕانەوە و کۆمەلانێک لە سەردەمی خەلیفەکان هەڵگەڕانەوە، بەڵام هیچ زیانێک نەگەیشت بە ئیسلام، بابەتی هەڵگەڕانەوە لە ئایین هیچ جێی زیان نییە ئەگەر تاکێک هەڵگەڕێتەوە ئوممەتێک لە شوێنی موسڵمان دەبێت ﴿مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ﴾ [المائدة:٥٤]. «ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! هەر کەس لە دینی خۆی پاشگەز ببێتەوە، خوا لەمەولا کۆمەڵێ وا دەخاتەڕوو، خۆشی بوێن؛ ئەوانیش خوایان خۆش بوێت.»

* کاتێک کوفر بوونی هەبوو، ئەوا هەموو ناوهێنان و بەکارهێنانی فیتنە و ئاشووب مەبەست لێی کوفرە، چونکە فیتنەی کوفر لە هەموو فیتنەکانی دیکە گەورەترە ﴿وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ﴾ [البقرة:٢١٧] «فیتنە گەورەترە لە کوشتن.» وشەی (فتنة) لێرەدا واتە کوفر.

* کوفر بە هەموو لایەنەکانییەوە بە ئەنجامدانی تاقە کردەوە دێتەجێ، بەڵام باوەڕ نایاتە جێ تەنها بە هێنانەجێی هەموو بەشەکانی باوەڕ نەبێت، هەروەها بە ئەندازەی کەمبوونی بەشەکانی باوەڕیش کەم دەکات، ئەم بابەتە هاوشێوەی مردنە کە تەنها بەیەک هۆکار دێتەجێ، بەلام ژیان پێویستی بە هەبوونی چەندین لایەنە.

* کاربەدەستان ڕێگری دەرچوونی ژێردەستەکانیان دەکەن کاتێک بیانەوێت لە سیاسەتی ئەوان دەربچن و ئەو کەسەش کە دەردەچێت لە سیاسەتیان بەندی دەکەن، ئەگەر ئەو کەسە ڕابکات و هەڵبێت لە دەستیان، هەموو وڵاتانی بە شوێندا دەگەڕێن لە ڕێی دەزگا هەواڵگیریەکانیانەوە، پاشان هەر خۆیان ڕێگە نەدان بە دەرچوون لە ئایین، و هەڵگەڕانەوە بە دیکتاتۆرییەت وەسف دەکەن لە ئیسلامدا.

* دەوڵەتانێک دەڵێن سەرچاوەی سەرەکی یاسا و دەستورمان ئیسلامە، پاشان ڕێگە دەدەن هاوڵاتییەکانیان بە ئازادی بتوانن هەڵگەڕێنەوە و بێباوەڕ بن بە یاسا و دەستوورەکەیان، جا ئایا ئەمە بەپێی عەقڵ یاخود نەقڵ تەواو و گونجاوە؟!

* سەیرە سەرکردەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن مرۆڤ سەرپشکانە دەتوانێت خودای خۆی هەڵبژێرێت، بەڵام ڕێگە نادەن ئازادانە سەرۆکێکی دیکە هەڵبژێردرێت جگە لە خۆیان، دەرچوون لە سنووری خودا بە ئاسایی دادەنێت، بەڵام دەرچوون لە خۆیان قەدەغە دەکەن.

* لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە «من بدل دینه فاقتلوه» «هەرکەس ئایینی خۆی گۆڕی، بیکوژن.»

موسڵمانان زۆر لە گاور و جوولەکەکان ناکەن تا بێنە ناو ئایینی ئیسلامەوە، بەڵام هەرکەس هاتە ناو ئایین بە کۆدەنگی زانایان ڕێگەی پێ نادرێت لێی دەربچێت و هەڵگەڕێتەوە.

* خودا سزای هەڵگەڕانەوەی داناوە تاکوو سەرکردەی موسڵمانان هەڵبستێت بەو کارە «من بدل دینه فاقتلوه» فەرموودەکە لە سەحیحی بوخاریدایە، ئەم حەددە پێشەوا عومەر و ئیبن عومەر و موعاز و أبو مووسا و جگە لە ئەوانیش جێبەجێیان کردووە.

* سنووری هەڵگەڕانەوە خەلیفە ڕاشدینەکان و ئەمەوییەکان و عەباسییەکان بەجێیان هێناوە، چونکە هەڵگەڕانەوە تێکدانی ناوخۆی دەوڵەتە و شکاندنی دەستوورە، بەڵام ئایا ئەو کەسانەی وادەبینن ئایین و دەوڵەت لێکجودان، درک بەم ڕاستییە دەکەن؟

* دەربارەی کوشتنی کەسانی هەڵگەڕاوە دە فەرموودە جێگیر بووە، ئەو ڕێژەیەش بە موتەواتر هەژمار دەکرێت، هەروەها خەلیفە ڕاشدییەکان و ئەمەوییەکان و عەباسییەکان هەموویان کەسانی هەڵگەڕاوەیان کوشتووە.

* کەسێکی پلەدار و گەورەی شاری قورتوبە سووکایەتی بە خودا کرد -پاکی و گەورەیی بۆ پەروەردگار-، ئیبن حەبیبی زانا گوتی: ئەوە جوێن بەو پەروەردگارەمان دەدات کە دەیپەرستین، ئەگەر لەسەر ئەمە بێدەنگ ببین، ئەوا بەندەگەلێکی خراپین، دەستی کردە گریان و بابەتەکەی گەیاندە سەرکردەکەیان، تاکوو فەرمان دەرکرا بە کوشتن و لەسێدارە دانی ئەو کەسە.

* ئەگەر حوکمی هەڵگەڕانەوە تەنها لەسەر یەک کەس جێبەجێ بکرابا لە وانەی کە سنووریان بەزاندووە لە مافی خودا و پەیامبەرەکەیدا، ئەوا ئەو کارانە چەند جار دووبارە نەدەبوونەوە و قەڵەمی نووسەرەکانیش ئەو کارەیان بە سووک سەیر نەدەکرد.

* ئەگەر هەڵگەڕانەوە لە ئایین لە دەوڵەتێکدا دەرکەوت و وازهێندرا لە سزادانی هەڵگەڕاوەکان، ئەوە نیشانەیە لەسەر جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت لەناو ئەو دەوڵەتەدا، هەروەها گۆڕانی دەوڵەتەکەیانە لە دەوڵەتی دیین و دونیاوە بۆ دەوڵەتی دونیا بەبێ دیین.

* دەبینن ئایینی خودا جوێنی پێ دەدرێت و دەڵێن: خودا لەکوێیە بۆ ئایینەکەی سەرناخات؟! دەستپێشخەری دەکەن بۆ وەرگرتنی سزای پڕ ئێش، نازانن چاکەی چاکەکاران و خراپەی خراپەکاران سوود و زیان بە خودا ناگەیەنێت، پێوەری خودا جیاوازە لە پێوەرەکانی خەڵکی.

* خودا سزای خۆی بەخێرایی ناهێنێتە پێش بۆ ئەوانەی دژایەتی دەکەن، چونکە ئەوانەی بەخێرایی تۆڵە دەسەننەوە ئەوانەن کە دژایەتی کاریگەری لەسەر داناون، چونکە مرۆڤ بە هێندەی ئازاردانی تۆڵە دەسەنێتەوە، هیچ دەوڵەتێک هێز و لەشکرە سەربازییەکەی ئامادە ناکات بۆ دژایەتی مێرولەیەک! خودا زۆر لەوەش بڵندترە.

# شەریعەت گونجاوە بۆ هەموو سەردەمێك، هەتا ڕۆژی دوایی

* وەحی تیشکێکی بەهێز و درەوشاوەیە، هەرکەس لە پشتییەوە بڕوات، دەبێتە ڕێنمووی و هیدایەت بۆی؛ هەرکەسیش ڕووبەڕووی بێتەوە، ئەوا کوێری دەکات و دەیسووتێنێت.

* دەربازبوون گوریسێکە لە ئاسمانەوە دابەزێندراوە، بە هچ جۆرێک لە زەوی هەڵناگیرێت، ئەو کەسە ڕزگاری نابێت کە گوریسەکە فڕێ بدات بەرەو ئاسمان ئەگەر ئەو زاتەی لە ئاسمانە گوریسەکەی تێبگرێت بە مەبەستی لە ناوبردنی.

* بۆ گەیشتن بەهەر شتێک ڕێگەیەکی دیاریکراو و تایبەت بەخۆی هەیە، هەندێک لە ڕێگەکان درێژ و ماندووکەرن و هەندێکیان گومڕاکەر و لاڕێ بەرە، کورترین و باشترین ڕێگەی بەرەوخوداچوون قورئان و سونەتی پەیامبەرە بە تێگەیشتنی هاوەڵان.

* ئەگەر خەڵکی بەگوێرەی فەرمانی خودا بەڕێوە بڕۆن، ئەوا ژیانیان هاوشێوەی هەسارەکانی ناو گەردوون بەڕێکی بەڕێوە دەڕوات، بەڵام وازلە فەرمانانەکانی خودا دەهێنن و ژیانیان شپرز و شێواو دەبێت ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ﴾ [النور:٦٣] «با ئەوانەی کە خۆیان لە فەرمانی ئەو دەدزنەوە، ترسیان هەبێت کە فیتنە و بەڵایەکیان بەسەر بێت.»

* ئەگەر خەڵکی دەستیان وەردابا لە جووڵە و ڕێڕەوی خۆر، ئەوا ناکۆک دەبوون لەسەر کات و ئەندازەی گەرمییەکەی، هەندێکیان پلەی گەرمی خۆریان

زیاد دەکرد و هەنێکیشیان کەمیان دەکردەوە، ئەوکات هەر کۆمەڵە کەسانێک خاوەن کات و پلەی گەرمییەکی تایبەت بە خۆیان دەبوون و هەر کۆمەڵێکیان گاڵتەیان بە ئەوانەی دیکە دەکرد لەسەرئەوەی هەڵیانبژاردوە. بەڵام کاتێک بۆیان دەرکەوت ئەوان هیچ دەسەڵاتێکیان نییە لە حوکمە گەردوونیەکانی خودادا، دەروونی خۆیان لەسەر ڕاهێنا و ڕازی بوون پێی، ئەو کەسەی حەزی لە گەرما یان سارەما نەبووبێت، ملکەچانە ڕازی دەبێت پێی کاتێک ڕووی تێ دەکات، لە کاتێدا بیروباوەڕیان دەگۆڕن بەگوێرەی ئارەزوویان. خۆ ئەگەر دەروونیان جێگیر و وابەستە بکردایە لەسەر حوکمی شەرعی خودا، ئەوا ئارام و دڵخۆش دەبوون، لەگەڵئەوەی ملکەچبوون بۆ حوکمی شەرعی خودا لە حوکمی گەردوونی خودا جەخت لێکراوەترە.

* یاسایەکی گەردوونی چەسپاوە کە تەمەنی هزر و بیروباوەڕەکان درێژترە لە تەمەنی مرۆڤەکان، ئەگەر حوکمێک بۆ ڕۆژگاری خۆت دابنێیت، ئەوا بۆ کەسانی پاش خۆشت داناوە، بۆیە تەشریعی خودایی پێوەری حوکمەکەی بۆ درێژایی سەدەکانە نەک بۆ ڕۆژگاری تۆ.

* بۆچوون و بیروباوەڕەکان تەمەنیان لە تەمەنی مرۆڤەکان درێژترە، هەڵەیە ئەگەر بۆچوونێک بەباش بزانیت بەوەی تەنها گونجاوە بۆ ڕۆژگار و سەردەمی خۆت، پاشان ئەو بۆچوونە لە پاش مردنت خەڵکی بەخراپەدا ببات، بۆیە خودا کاروبار و حوکمی خەڵکی گرتووەتە دەست خۆی.

* حوکمەکان و یاساکان تایبەت نیین بە دامەزرێنەرەکانیانەوە بە جۆرێک بە مردنی خاوەنەکانیان لەناو بچن، حوکمەکان لەگەڵ خاوەنەکەیان نانێژرێن وەک کفنەکانیان، بەڵکوو دەمێنێتەوە و وابەستی نەوەی پاش خۆیان دەبن، بۆیە خودا دەستووردانانی بە خۆی تایبەتکردووە ﴿إن الحكم إلا لله﴾ [الأنعام: ٥٧] «فەرمان هەر فەرمانی خوایە.»

* کورتکردنەوەی شەریعەت تەنها لە جێبەجێکردنی سزاکاندا کارێکی هەڵەیە، بەڵکوو جێبەجێکردنی شەریعەت زۆر گشتگیرترە، قەدەغەکردنی قەدەغەکراوەکان و حەڵاڵکردنی حەڵاڵەکان و پاراستنی سامانی خەڵکی و مافەکانیانە: ﴿وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ [الحديد:٢٥] «کتێب و هۆی هەڵسەنگاندنمان ناردە خوار؛ هەتا خەڵک بە دادگەری لەناو یەکدا ڕەفتار بکەن.»

* ئەوانەی وەسفی ئیسلام بە داخراو دەکەن ئەوانەن کە تەنها بە چاوی سەر دەڕواننە ئیسلام نەک بە بەرچاوڕوونی: ﴿وَإِنْ تَدْعُوهُمْ إِلَى الْهُدَى لا يَسْمَعُوا وَتَرَاهُمْ يَنْظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لا يُبْصِرُونَ﴾ [الأعراف:١٩٨] «ئەگەر بانگیان بکەن بۆ ڕێگای ڕاست، ئەوان نابیستن، وادەزانی بۆ تۆ دەڕوانن، لەکاتێکدا ئەوان هیچ نابینن.»

* لە ئیسلامدا کراوەیی و فراوانییەک هەیە پێویستە لەلایەن کەسانێکەوە دەربخرێت ئەگەرچی بۆ خودی خۆشیان پێویستیان نەبێت، ئەوا بۆ بنەبڕکردنی دەنگۆی ئەوانە بەکاردێت کە ئیسلام بە داخراوی و تەسکی دەبینن، پەیامبەری خودا (ﷺ) سەیری حەبەشییەکانی دەکرد کاتێک یارییان دەکرد فەرمووی «لتعلم يهود أن في ديننا فسحة» «تاکوو جوولەکەکان بزانن لە ئایینی ئێمەدا کراوەیی هەیە.»

* هەموو ئەو بەڵگانەی عەقڵ دەیانهێنێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و ڕەخنەگرتن لە شەریعەت، بێشک ئەو بەڵگانە دەبینێتەوە کە لە ڕێگایەکی دیکەوە ڕووبەڕووی خۆشی دەبنەوە. جا یان دەبێت بیان شکێنێت، تاکوو بەردەوام بێت، ئەوکاتیش تووشی دژیەکی بووە؛ یاخود دەبێت بگەڕێتەوە و لە سەرەتای سەرەتاوە لایانبدات!

* دژایەتی هەق و ڕاستی دەکەن بەهەمان بەڵگەی پێشینەکانیان، بەڵام بەشێوازێکی تازە و سەردەمیانە دەری دەبڕن، واگومان دەبەن وتەی تازەیان هێناوە و تەواو سەرسامن بە وتەکەیان، خودا دەفەرموویّت ﴿بل قالوا مثل ماقال الأولون﴾ [المؤمنون:٨١] «نەخێر، ژیر نابن و تێناگەن، بەڵکوو ئەمانیش هەر ئەوە دەڵێن کە پێشینان وتیان.»

* لە ئایینی ئیسلامدا بابەتێکی شاراوە بوونی نییە کە دیینداری سەرجەم تاکەکانی لەسەر وەستابێت، هەموو ئەو بابەتە گشتیانەی خەڵکی پێویستیانە بڵاوە گەڕان بەشوێنیاندا لە ناو بابەتە وردەکاندا کات بەفیڕۆدانە، ئەو کارە گومان دروست کردنە لە تەواوی و کامڵی قورئان و سونەت.

* وەسفکردنی حوکمی خودا بە دواکەوتووی و نەگونجان لەگەڵ سەردەمدا بەڵگەی نەفامەکان بووە بەرانبەر پێغەمبەران بەکاریانهێناوە﴿حَتَّى إِذَا جَاءُوكَ يُجَادِلُونَكَ يَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلا أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾ [الأنعام:٢٥] «کاتێک بێن بۆ لات دەمدەمێ و بەربەکانێت لەگەڵ دەکەن، ئەوانەی بێباوەڕن دەڵێن: ئەم قورئانە هیچ نییە بێجگە لە ئەفسانەی پێشینان.»

* دەعوەی پەیامبەری خودایان (ﷺ) بە دواکەوتووی وەسف دەکرد و دەیانگوت: ﴿أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾ [القلم: ١٥] «ئەفسانەی پێشینانە.»

دەیانگوت بانگەوازەکەی و دەپووکێتەوە بە مردنی و وەسفیان دەکرد بە «الأبتر» دوابڕاو، کەچی ئەوان مردن و دینەکەیان پووکایەوە و ناوی موحەممەد و ئایینەکەی مایەوە و بەردەوام بوو.

* کاتێک جگە لە خۆت دەستدەگرێت بە ڕاستییەکی کۆنەوە، بزانە ئەو هەڵەیەی تۆ لەسەری دەڕۆیت زۆر کۆنترە، چونکە هەموو لادانەکان لە بیروباوەڕ و ڕەوشت و پۆشاک و کڕین و فرۆشتندا لەپێش ئیسلامدا بوونیان هەبووە. ئێستا دووبارە دەبێتەوە.

* واز لەو حوکمە دەهێنن کە خودا دایبەزاندووە، بانگەشەی ئەوە دەکەن لەگەڵ ئەم سەردەمە ناگونجاێ، بەڵام عیسای کوڕی مریەم لە پاش ئەوان دێت و تەنها حوکم بەو شەرعە دەکات کە ئەوان بە نەگونجاو وەسفی دەکەن، نەنگی لە کاتەکەدا نییە، بەڵکوو نەننگی لە کاربەدەستەکاندایە.

* خودا بەتەواوی داهاتووی ئەم ئوممەتەی نیشان پێغەمبەرەکەی داوە، تاکوو بە جۆرێک حوکم بدات کە گونجاو بێت بۆ هەموو کاتێک ﴿مَا مِنْ شَيْءٍ كُنْتُ لَمْ أَرَهُ إِلَّا وَقَدْ رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي هَذَا حَتَّى الْجَنَّةُ وَالنَّارُ﴾ «هەر شتێک کە نەمدەبینی پێشتر، وا لەم جێگەیەمەوە دیتم تەنانەت بەهەشت و دۆزەخیش.»

* خەڵکانێک گومانیان وایە ئەگەر دەوڵەتێک شەرع جێبەجێ بکات، تووشی لاوازی و دارِمانی ئابووری دەبێت، لە کاتێکدا پەیامبەر هوود بەڵێنی بە گەلەکەیدا ئەگەر شەرعی خودا جێبەجێی بکەن، خودا هێز و خۆشگوزەرانییان پێ دەدات: ﴿يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَى قُوَّتِكُمْ﴾ [هود:٥٢] «لە ئاسمانەوە بارانی پڕ بەرەکەتتان بۆ دەبارێت. هێز و دەسەڵاتتان بۆ زیاد دەکات، زیاد لە هێز و دەسەڵاتی ئێستای خۆشتان.»

* دەوڵەتانێک وازیان لە شەریعەتی خودا هێناوە لەترسی ناسەقامگیربوونی دەوڵەتەکەیان و هەوڵی ڕازیکردنی دوورەکان، ئەمە هەمان بەڵگەی کافرانی قوڕەیش بوو ﴿وَقَالُوا إِنْ نَتَّبِعِ الْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَا﴾ [القصص:٥٧] «بت پەرستەکانی مەککە وتیان: ئەگەر پەیڕەوی لە دینەکەی تۆ بکەن، ئەوا لەسەر ئەم زەوی و ناوچەی خۆماندا دەرفێنرێین.»

* بۆچوونەکان نابنە هەق و ڕاستی، تەنیا بەوە خاوەنەکانیان سەرسام و قایل بووە پێیان ﴿ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾ [الكهف: ١٠٤

«ئەو کەسانەی تەقەللایان لە ژیانی سەر دنیایەدا بەفیڕۆچووە و لاشیان وایە کارێکی چاکیان کردووە.»

خودا چەندان حوکمی هەیە کە پێچەوانەی عەقڵی لاوازی ئێمەیە.

* عەقڵانێک وەستاون لە بە باش و جوان دانانی هەندێک لە حوکمەکانی خودا، هۆکاری ئەمەش لاوازی باوەڕیانە بەخودا ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ [المائدة: ٥٠] «ئایا ئەوانەی حوکمی نەفامی دەکەن، کێ حوکم و بڕیاری لە هی خوا باشترە لای کەسێک کە یەقینیان هەیە؟»

ئەو کەسەی یەقینی نەماوە بەرانبەر خودا، ئەوا ڕێگری بەباش دانانی لێ کراوە.

* ئەو کەسەی حوکمەکانی خودا بەباش دانەنێت، ئەوە نیشان دەدات کە یەقینی تەواوی نییە بە خودا ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ [المائدة: ٥٠]

* ئەگەر کەسێک حوکمێک لە حوکمەکانی خودا بە باش دانەنێت، ئەو کارەی بەڵگەیە لەسەر لاوازی یەقینی بەخودا: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ [المائدة: ٥٠]

* مەرج نییە حوکمەکانی خودا یەکبگرێتەوە لەگەڵ قەناعەت و ویستی کەسەکاندا ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ [البقرة: ٢١٦]

«جەنگتان لەسەر پێویست کرا کە لاتان ناخۆشە، دەکرێ شتێکتان پێ ناخۆش بێت و باش بێت بۆتان.»

* پێویستە لەسەرمان حوکمی خودا پیادە بکەین هەرچەندە نەفسمان شتانێکی دیکەش بخوازێت، پەیامبەری خودا (ﷺ) بە ئاڕاستەی ئەقسا نوێژی ئەنجام دەدا، هەرچەندە لە دڵەوە زیاتر حەزی بە کەعبە دەکرد ﴿فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا﴾ [البقرة:١٤٤]

»دەسا دڵنیا بە، ئێمە لە نوێژەکاندا ڕووت بەرەو ڕووگەیەک وەردەگێڕین کە خۆت پێت خۆشە.»

* خۆئەگەر خەڵکی بە ئەندازەی کاروباری دونیایان شارەزاییبیان لە بابەتەکانی ئاییندا ببووایە، ئەوا هەرگیز نکۆڵی حوکمەکانی ئیسلامیان نەدەکرد: ﴿يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ﴾ [الروم: ٧] «تەنیا ڕواڵەتی ئەم ژیانی دونیایە دەزانن بەڵام بێئاگان لە ڕۆژی دوایی.»

* پەیامبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: «لعن الله من غير منار الأرض» «لەعنەتی خودا لەوانەی سنووری زەوی دەگۆڕن.»

پەیامبەر ئەم وتەیەیی فەرمووە تاکوو مافی خەڵکی نەفەوتێت، جا دەبێت چی چاوەڕوانی ئەوانە بکات کە شەرعی خودا دەگۆڕن تاکوو سنوورەکانی خودا بگۆڕن لەو ڕێگایەوە؟!

# لەخواترسان و شوێنەوارەکانی تاوان

* تەقوا و لەخواترسان لە دڵدایە، بەڵام خۆ ناکرێت دڵ زیندوو و بەئاگا بێت و ئەندامەکانی جەستە بێ جووڵە و مردوو بن.

* خودا تەقوای ناو دڵ وەرناگرێت تاکوو کرداری چاکە بەشوێنیدا نەیات: ﴿فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ [الأعراف:٣٥ ]

«ئەوانتان کە خۆپارێزن و ئاکاری چاک ڕەچاو دەکەن، نە ترسێکیان لەسەر هەیە و نەخەفەت دەخۆن.»

* لەگەڵبوون و پارێزگاری خودایی بۆ مرۆڤەکان وابەستە بە تەقوا و خۆپارێزییەوە، هەرکەس بیەوێت و لێی نزیک ببێتەوە، بەدەستی دەهێنێت. ئەوەی لێی دوور بکەوێتەوە، لە دەستی دەدات ﴿واتقوا الله واعلموا أن الله مع المتقين﴾ [البقرة:١٩٤] «لەخواترسانتان هەبێت و پارێزکاری بکەن و چاکیش بزانن کە بەڕاستی خوا لەگەڵ پارێزگارانە.»

* ئەو کەسەی لە پەنهانیدا لە خودا بترسێت، لە ئاشکرادا سەرپێچی ناکات.

* پێگەی تۆ لای خودا بەوە دیاری دەکرێت کە پێگەی خودا لای تۆ چەندە لە کاتی پەنهانیدا. ئەگەر پاراستت، خودا بەرزت دەکاتەوە؛ ئەگەر نەتپاراست، ئەوا دات دەبەزێنێت.

* پاراستنی ئەندامەکان لە تاوان لە کاتی لاویدا، یارمەتیدەرە کە خودا ئەو ئەندامانە بپارێزێت لە دوو شت لە کاتی پیریدا:

دەیپارێزێت لە عاقیبەت شەڕی.

دەیپارێزرێت لە خەڵەفان و شێتی.

یەکێک لەو پارێزگاریانەی خودا دەی بەخشێتە بەندەیەکی کە ئەندامەکانی لە لاویدا لە تاوان پاراستبێت، ئەوەیە خودا لە تەمەنی پیریدا لە هەموو جۆرە ئافەتێکی عەقڵیدا دەیپارێزێت. ئیبن عەباس دەفەرمووێت: "هەرکەس قورئان بخوێنێت، خودا دەیپارێزێت لەوەی ببرێتەوە بۆ لاوازترین تەمەن و خەڵەفاو بێت.»

* ئارامگری و لە خواترسان پایەکانی جێگیربوونن ﴿وإن تصبروا وتتقوا لا يضركم كيدهم شيئا﴾ [آل عمران:١٢٠] «جا ئەگەر خۆگر بن وپارێزکار بن، پیلان و تەڵەکەی ئەوانە هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنێت.»

* ئەو کەسانەی زۆرترین لێبووردەیی و چاوپۆشیان هەیە خاوەنی زۆرترین تەقوا و پارێزکارین، ئەوانەش کە کەمترین چاوپۆشی و لێبوردەییان هەیە ئەوا دڵڕەق ترینن و لاوازترین باوەڕیان هەیە، ﴿وأن تعفوا أقرب للتقوى﴾ [البقرة: ٢٣٧] «بەخشینیش لە ئاکاری تەقوا نزیکترە.»

* گوێڕایەڵی و تاوان لە یەکتر ڕادەکەن، ئەو کەسەی دەیەوێت لە تاوان دەربازی ببێت، با بە چاکە و گوێڕایەڵیی بەرانبەری بوەستێتەوە تاکوو لە ناودەچێت.

* مرۆڤ لە پەرستش وگوێڕایەڵی خودا بێبەش نابێت تەنها بە تاوان نەبێت، چەندێک تاوانەکە گەورەبێت، بێبەشبوون لە پەرستشی گەورەتر دەبێت.

* هەرکەس زۆر پەرستش ئەنجام بدات، لە تاوان ڕادەکات. ئەو کەسەشی تاوان زۆر ئەنجام دەدات، لە پەرستش و گوێڕایەڵی خودا ڕادەکات.

* خودا ئەگەر بەندەیەکی خۆشویست، ئەوا پەرستش و گوێڕایەڵی لا خۆشەویست دەکات.

﴿حبب إليكم الإيمان وزينة في قلوبكم﴾ [الحجورات:٧] «بەڵام خودا ئیمان

و بڕوای لا خۆشەویست کردن، لەنێو دڵتاندا شیرینی کرد و ڕازاندییەوە.»

خۆ ئەگەر ڕقی لە بەندەیەک بوو، تاوانی لا خۆشەویست دەکات ﴿ولكن كره الله انبعاثهم فثبطهم﴾ [التوبة: ٤٦] «بەڵام چونکە خوا هاتنیانی پێ خۆش نەبوو، گرێی خستە بەردەمیان و ورەیان نەما و پاڵیان لێ دایەوە.»

* هەرچەندە مرۆڤ پەرستش و گوێڕایەڵی بۆ خودا زۆربێت، زیاتر شکۆمەند و ڕێزدار دەبێت. هەرچەندە تاوانی زۆربێت، سەرشۆڕی زیاتر دەبێت: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّلِحُ يَرْفَعُهُۥ﴾ [فاطر: ١٠] «هەرکەس گەورەیی و سەربەرزی دەوێت (لە خوای بوێت) چونکە بەڕاستی هەموو گەورەیی و دەسەڵات، هەر بۆ خودایە و وتەی پاک و چاک تەنیا بۆ لای ئەو سەردەکەوێت و کردەوەی چاک بەرزی دەکاتەوە.»

* گەورەترین بێبەش ئەو کەسەیە تاوان ئەنجام دەدات پاشان هیچ پەشیمانییەک نایەت بەدڵیدا، چونکە پەشیمانی تەوبە بەشوێن خۆیدا دەهێنێت و ڕێگری دەکات لە دووبارە ئەنجامدانەوەی ئەو تاوانە.

* ئەگەر کەسێک تووشی تاوان بوو پاشان هیچ ناڕەحەتی و ئازاری نەچەشت لە سەری، ئەوە نیشانەی ئەوەیە خودا گەورەترین شتی لێ وەرگرتووەتەوە کە ئەویش ناسینی خودایە، چونکە ئەندازەی تاوان بە ئەندازەی نەناسینی ئەو زاتەیە کە سەرپێچییەکەی بەرانبەر دەکرێت.

*تاوان شوێنەوار و ئازاری هەیە، چاکەش خۆشی و هۆگری هەیە، ئەو جۆرە چێژە تەنها باوەڕدار هەستی پێ دەکات، لە فەرموودەیەکدا پەیامبەر دەفەرمووێت: «إِذَا سَاءَتْكَ سَيِّئَتُكَ وَسَرَّتْكَ حَسَنَتُكَ فَأَنْتَ مُؤْمِنٌ» «ئەگەر تاوانەکانت ئازاریان دایت و چاکەکانت دڵخۆشیان کردیت، ئەوا تۆ بڕواداریت.»

* هەرچەندە مرۆڤ زاناتربێت بە هەق و ڕاستی، ئەگەر تاوانی ئەنجامدا، ئەوا ئەو تاوانەی گەورەتر لەسەر هەژمار دەکرێت و دەنووسرێت: ﴿فلما جاءهم ماعرفوا كفروا به فلعنة الله على الكافرين﴾ [البقرة: ٨٩] «کاتێک ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات کە دەیانناسی، بڕوایان پێ نەکرد، کەواتە با نەفرین و لەعنەتی خوا لەسەر کافران بێت.»

* هەرچەندە مرۆڤ زاناتر بێت بە هەق و ڕاستی، ئەنجامدانی تاوان لە هەقیدا گەورەتر دەبێت، خودا لەسەر تاوانەکەی سزای نادات، بەڵکوو لەسەر زانست و ئەنجامدانەکەی سزای دەدات، تاوانێکی بچووک کە زانایەک ئەنجامی بدات، گەورەترە لە تاوانێکی گەورە کە کەسێکی نەزان ئەنجامی دەدات.

* کەسی تاوانکار ئەگەر ڕووبکاتەوە خودا هەرچەندە لە سەرەتای ڕێگەی گەڕانەوەیدا بێت بۆلای خودا، زۆر باشترە لای خودا لە کەسێکی گوێڕایەڵ کە پشت بکاتە خودا هەرچەندە ئەوگوێڕایەڵە لە سەرەتای ڕێگەی پشتکردنە خوداشیدا بێت.

* خودا ئەنجامدانی تاوانی نهێنی بۆ مرۆڤەکان ئاسان کردووە تاکوو ئیمانیان تاقی بکاتەوە ﴿لِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَخَافُهُ بِالْغَيْبِ﴾ [المائدة: ٩٤] «تا دەرکەوێت چ کەسێکی بەپەنامەکی و بەنهێنیش لە خوا دەترسێت و لە حەرامکراوەکانی دوور دەکەوێتەوە.»

* یەک تاوان لە مافی خەڵکیدا گەورەترە لە حەفتا تاوان لە مافی خودادا، چونکە خودا لە ڕۆژی دوایدا لە مافی خۆی خۆش دەبێت، بەڵام خەڵکی بێگومان داوای مافەکانیان دەکەن.

* بێئومێدبوون لە ڕەحمی خودا لە پاش ئەنجامدانی تاوان، گەورەترە لە خودی تاوانەکە، چونکە بەخشندەیی خودا زۆر فراوانترە لە بێئومێدبوون: ﴿قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ﴾ [الحجر: ٥٦] «گوتی: کێ لە بەزەیی خودا بێهومێدە، مەگین لە ڕێ لادەرەکان؟»

* تاوانی گەورە لەگەڵ دانان بە حەرامییێتیدا، ساناترە لە تاوانێکی بچووک کە بدرێتە پاڵ شەریعەت و بە ناوی شەرعەوە بکرێت، چونکە پاڵدانی تاوانە بچووکەکان بۆ لای شەریعەت بە تاوانی گەورە هەژمار دەکرێت!

* سەرپێچی خودا بکەیت و ئومێدی لێخۆشبوونت هەبێت، باشترە لەوەی سەرپێچی بکەیت بەدوای کەسێکدا بگەڕێیت بۆتی حەڵاڵ بکات، ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ [الأنعام: ٢١] «جا کێ هەیە لەوە ستەمکارتر بێت کە شتی نادرووست و درۆ بۆ خودا هەڵدەبەستێت؟ یان ئایەت و فەرمانەکانی خودا بە درۆ دەزانێت؟! چونکە بەڕاستی ئەو ستەمکارانە سەرفراز نابن.»

* وازهێنان لە تاوان لەپێناوی جگە لە خودادا تاوانباری لەسەر مرۆڤەکە لادەدات، بەڵام پاداشت و بەرەکەتی وازهێنانەکەی پێ نادرێت، چونکە پاداشت وەرگرتن لەسەر ئەنجام دان و ئەنجام نەدانی کردەوەکان کاتێک دێتەجێ کە بەندە نییەتێکی پاکی هەبێت لەپێناو خودادا.

* زۆرێک لە خەڵکی چاکە لە خراپە جیادەکەنەوە، بەڵام تەنها ئەو زانایانەی خودا ڕێنموونی کردوون پلەبەندی نێوان چاکەکان جیادەکەنەوە و دەیزانن: ﴿وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ [فصلت: ٣٤] «چاکە و خراپە چوونیەک نین بە چاکترین شێوە وەڵامی (خراپە) بدەرەوە.»

* خەڵکی دەکەونە نێو حەرامەکانەوە کاتێک دەرگای حەڵاڵیان بە ڕوودا دابخرێت، یەکەم چارەسەری حەرام کردنەوەی دەرگای حەڵاڵەکانە.

* ئەگەر خودا تووشی بەڵایەکی کردیت کە پێی ڕازی نەبوو، ئەوا بزانە لە دڵتدا پشتبەستن بە جگە لە خودا هەبووە، هەرچەندە بۆ چرکەیەکیش بووبێت، خودا ڕادەستی ئەوەی کردوویت کە پشتت پێی بەستووە، یەکێک لە نزاکانی پەیامبەر ئەوە بووە کە فەرموویەتی: «ولا تكلني الا نفسي طرفة عين» ڕادەستی خۆمم مەکە بۆ چاوتروکانێکیش بێت.

* ئەگەر باوەڕدار تاوانێکی ئەنجامدا پێش ئەوەی شوێنی ئەنجامدانی تاوانەکە جێ بهێڵێت، با تەوبە بکات تاکوو شوێنەواری شوومی و ڕەشی ئەو تاوانە نەیەتەوە ڕێی و نزیکترین کاری لێ خراپ نەکات، داوای لێخۆشبوون بەربەستێکە لەنێوان تۆ و شوێنەواری تاوانەکانتدا.

* مرۆڤ بەهۆی تاوانەکانیەوە بێبەش دەبێت لە ڕۆزی: ﴿فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ كَثِيرًا﴾ [النساء:١٦٠] «لەبەرئەو ستەم و ناهەقییەی جوولەکە کردییان، چەندین شتی حەڵاڵ و ڕەوامان لێ قەدەغە کردن.»

* ستەم و تاوان هۆکاری بێبەشبوونن لە بەخششەکان، هەروەها هۆکاری دابەزینی سزا و تیاچوونی ئوممەتانن: ﴿فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ﴾ [النساء:١٦٠]

* تاوان سەرکەوتن دوادەخات، و داوای لێخۆش بوون پێشی دەخات ﴿قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٤٧]

«دەیانگوت: ئەی پەروەرێنمان! تۆ لە گوناهان و لە ئەندازە لادانمان ببوورە و جێ هەنگاومان پتەوتر کە و بە سەر بێبڕوایاندا زاڵمان بکە.»

* ناکۆکی و تاوان هۆکاری تیاچوون و شکستی ئوممەتن: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِي ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم﴾ [آل عمران: ١٥٢] «هەتا ئەو کاتەی کە ساردیی ڕووی تێ کردن و بوو بە ناکۆکیتان لە کاردا و سەرپێچیتان کرد.»

* خراپەکاران بەسەر چاکەکاراندا سەرناکەون، تەنیا بەهۆی تاوانی چاکەکارانەوە نەبێت، خودا دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ﴾ [آل عمران: ١٦٥] «کاتێک بەڵا

و ناخۆشییەکتان تووش هات، بۆ دەڵێن: ئەمە چی بوو؟ بۆ وامان بەسەرهات؟ (ئەی بۆ لەیادیان چوو، خۆ لە جەنگی بەدردا) بەڕاستی ئێوە دوو ئەوەندەتان بەوان کرد.»

* جیاوازی ئوممەت بەهۆی تاوانەکانیانەوە سەری هەڵداوە، مشتومڕ دەکەن و دەیانەوێت لەیەکتری تێ بگەن کەچی ناکۆکیان زیاد دەکات، چونکە بە ئەندازەی تاوانەکان دڵەکان لێک دوور دەکەونەوە، لەفەرموودەدا: «ڕیزەکانتان تەواو ڕێکدەخەن، یاخود خودا ناکۆکی دەخاتە نێو دڵەکانتانەوە.»

* دڵەکان ناکۆکی و دوورکەوتنەوەیان تێدا ڕوو دەدات، هەرچەند بە هۆکاری تاوانێکی بچووکیشەوە بێت، پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: «ڕیزەکانتان تەواو ڕێکدەخەن، یاخود خودا ناکۆکی دەخاتە نێوانتانەوە، ئەگەر دڵەکان ناکۆک بوون، ئەوا بزانن بەهۆی تاوانەوە ڕوویداوە.

* تاوان قفلّ کەری دڵە لە تێگەیشتن و ڕامان لە قورئان: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ﴾ [محمد: ٢٤] «ئاخۆ ئەوان لەو قورئانە ڕانامێنن، یان دڵیان گاڵە دراوە؟»

* تاوان دڵ بەند و زیندانی دەکات: ﴿لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ [الأعراف: ١٠٠] «ئەگەر بمانەوێت بەهۆی گوناهەکانیانەوە دووچاری بەڵایان دەکەین و مۆر دەنێین بەسەر دڵیاندا، بۆئەوەی ئەوان نەبیستن.

* تاوانێکی بچووک هەندێک جار دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی چاکەیەکی گەورە، لە فەرموودەدا هاتووە پەیامبەری خودا (ﷺ) لە غەزایەکدا لە شوێنێک دانیشت تەنگ و تەسک بوو بەدەنگی بەرز فەرمووی: «هەرکەس جێگەی خەڵکی تەسک بکاتەوە، یان ڕێگەیان بگرێت، ئەوا پاداشتی جیهادی بۆ نییە.»

* تەوبەکردن هیدایەت و ڕێنمونییەکە لەلایەن خوداوە، پێویستە مرۆڤ لە پەروەردگاری داوا بکات، نەوەک چاوەڕوانی دەروونی خۆی بێت: ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ [التوبة:١١٧] «لەپاشان خوا ڕێنمایی تەوبەی کردن، ئیتر ئەوانیش تەوبەیان کرد و خوا بەخشینی. بەڕاستی تەنیا ئەو خوایە قبووڵکاری تەوبە و لێبووردە و زۆریش دڵۆڤان و میهرەبانە.»

* یەکەم دەرگای وەرگرتنی تەوبە ئەوەیە بەندە دان بە تاوانەکانیدا بنێت لەبەر قاپی پەروەردگاردا، پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت «بێگومان ئەگەر بەندە دانی نا بە تاوانەکەیدا و پاشان تەوبەی کرد، ئەوا خودا لێی خۆش دەبێت.»

* هەرکەس دان نەنێت بە تاوانەکانیدا، تەوبەی لێ حەرام دەبێت، چونکە ئەوەی نەزانێت قەبارەی تاوانەکەی چەندە، داوای لێخۆش بوونی بۆ ناکات: ﴿وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُواْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [التوبة: ١٠٢]

«هی تریش هەن دانیان ناوە بە گوناهەکانی خۆیاندا، کارێ باش و یەکێ خراپیان تێکەڵ کرد؛ شایەد خودا تۆبەیان لێ قبووڵ بکا خودا لە گوناھ دەبوورێت و دلۆڤانە.»

* خودا تەوبە لە تاوانێک وەرناگرێت کە مرۆڤەکە سووربێت لەسەر ئەنجامدانی ئەو تاوانە، چونکە سەرەکیترین مەرجی تەوبە بڕیاردانی وازهێنانە لە تاوان: ﴿وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ [آل عمران: ١٣٥]

«جگە لە خودا کێ لە گوناهان دەبوورێت؟ جا ئەوانەی کە لە سەر کارێک زانیویانە هەڵەیە، پێ داگر نین.»

* خودا دەرگای تەوبەی والا کردووە، بەڵام ئارەزووبازەکان خەڵکی لێ وەردەگێڕن ﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمًا﴾ [النساء: ٢٧]

«خودا دەیەوێت تۆبەتان لێ قبووڵ کات. ئەوانەش وا ئەکەونە شوێن هەوا و هەوەس، دەیانەوێت -بە تەواوی- ئێوە لە ڕێگە لا بدەن.»

*هەرکەس گومانی باش بەخودا ببات، ئەوا خودا ڕێنموونی دەکات. هەر کەس گومانی خراپ بەخودا ببات بەرەو تیاچوونی دەبات. لە فەرموودەیەکدا خودا دەفەرمووێت: «من لەگەڵ گومانی بەندەکەمم کە پێم دەبات.»

* جیاوازی نێوان گومانی باش بردن بە خودا و نەترسان لە پیلانی خودا بریتییە لە کردەوە. ئەو کەسەی گومانی باش دەبات بە خودا کردەوە دەکات، ئەوەشی لە پیلانی خودا بێترس و بێ باکە ڕۆدەچێت لەتاواندا.

* ئەو کەسانەی کردەوەکانیان زیاتر لە پیناو خۆیاندایە، نەک لەپێناو هەقدا، هەر ئەوانەن کە زۆرترین گومانی خراپ بە خودا دەبەن: ﴿وطائفة قد أهمتهم أنفسهم يظنون بالله غير الحق ظن الجاهلية﴾ [آل عمران:١٥٤] «دەستەیەکی تریش بەڕاستی هەر خەمی خۆیان بوو، گومانی ناڕەوایان دەبرد بە خوای گەورە بە گومانی نەفامانەوە.»

* ﴿قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيۡهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي﴾ [طه: ١٨]

«گوتی: ئەمە عاساکەمە، وەبەر پشتی خۆ دەدەم و گەڵای پێ دادەوەرێنم بۆ ڕانەکەم.»

گۆچانەکەی لە ڕێنموویی ماڵاتەوە بوو بە ڕێنموویی مرۆڤەکان، پشتبەستن بە خودا ئامانجە گەورەکان بۆ بەندە ئاسان دەکەن، هەرچەندە هۆکارەکانی گەیشتن بەو ئامانجەش لاواز بن.

* کەسانێک خەمی قورسیان دێتە ڕێ بۆ شتگەلێکی بێبەها، خەمە قورسەکانیش لەسەر کەسانێکی دیکە سووک دەکرێت، هەمووان دەدرێنە پاڵ ئەوەی پشتیان پێ بەستووە ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾ [الطلاق: ٣] «هەر کەسێک پشت بە خودا ببەستێت، ئەوە خوای بەسە.»

* ئەو کەسەی زاناترینە بە خودا، سنگ فراوانترینە لە دونیادا، خودای ناسیوە و ئازار و خەفەتی خەڵکی لەیاد کردووە.

* زۆرجار هۆکارەکانی هێز و دەسەڵات کۆدەبنەوە، بەڵام سەرکەوتن دەستەبەرنابێت، چونکە مرۆڤەکان پشتیان بەو هۆکارانە بەستووە و وازیان لەپشت بەستن بە خودا هێناوە، هەرکەس پشت بە خودا ببەستێت، بەسیەتی: ﴿وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ [الطلاق:٣]

* هەندێک جار خودا بەندەکەی هیدایەت دەدات بۆ هەق و ڕاستی، بەڵام سەری ناخات، چونکە بە تەنها پشتی بەوە بەستووە کە ڕێنمووی کراوە لەلایەن خوداوە: ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا﴾ [الفرقان:٣١] «ئەوە بەسە پەروەردگارت ڕێنوێن و یاریدەدەرت بێت.»

پشت بەخودا ببەستە لە داواکردنی ڕێنمووی و کردەوە پێکردنیشیدا، ئەوکات سەردەخرێیت.

* کارەکانی مرۆڤ دەرباز نابن لە هەبوونی خراپە تیایاندا، پشتبەستن بە خودا پاکیان دەکاتەوە، بۆیە پەیامبەری خودا (ﷺ) زۆرجار نزای دەکرد و دەیفەرموو:اللهم إني أعوذ بك من شر ما عملت ومن شر ما لم أعمل «خودایە پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەو کارانەی ئەنجامم داوە و خراپەی ئەوانەشی ئەنجامم نەداوە.»

* هەرشتێک پشتت پێ بەستووە و کردووتە پاڵپشت بۆ خۆت ئەوا هەرکات پشتی تێ کردی، پاڵپشتەکەت لەدەست دەدەیت، کەواتە تەنها پشت بەو خودایە ببەستە کە زیندووی تەواوە و مردنی بەسەردا نایات، خودا دەفەرمووێت: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ﴾ [الفرقان:٥٨] «لە کارەکانتدا تەنیا پشت بەو خوایە ببەستە کە هەمیشە زیندووە و هەیە و هەرگیز نامرێت.»

* هەرکەس پشت بە جگە لە خودا ببەستێت، خودا ئەو شتە دەکاتە هۆکاری سزا و تیاچوونی.



# نییەتی پاک و ڕاست و شوێنەوارەکانی

* نییەتپاکی ئەگەر لە عادەتەکاندا بوونی هەبوو ئەوا دەبێتە هۆی لادانی ڕووپامایی لە پەرستشەکاندا، ئەو کەسەی خەوتنی وەک پەرستش هەژمار بکات ئەوا ڕووپامایی ناهێنێتە ناو شەونوێژەکانی.

* کردەوەکان لاواز دەمێننەوە لە جا هەر پلە و پایەیەکدابن، نییەت پاکی بەرزیان دەکاتەوە و نیەت خراپیش بەرەو ژێریان دەبات.

* نیەتی چاک مرۆڤ بەرز دەکاتەوە هەرچەندە کردەوەیەکی کەمیشی هەبێت، نیەتی خراپ مرۆڤ دادەبەزێنێت هەرچەندە کردەوەی زۆریشی هەبێت.

* وەرگیرانی کردەوە لەلایەن خوداوە بە قەبارەی کردەوەکان نییە لە ڕووکەشدا، بەڵکوو بە هێزی ڕاستگۆییی ناو دڵە، هەر نییەتە کە مرۆڤ بەرز دەکاتەوە یان دای دەبەزێنێت.

* بەئەندازەی ناسینی بەندە بۆ پەروەردگاری، ئیخلاص و نییەتپاکی بۆ خودا لە کردەوەکانیدا کاریگەری دەبێت، بۆیە خودا کردەوەی خەڵکانی کەمزانست ڕێکدەخات هەرچەند کەموکوڕییش لە نییەتیاندا هەبێت، بەڵام زانا تەنیا بەوەی نییەتی تەواو نەبێت دەستی لێ بەردەدرێت.

* ئەو کەسانەی ڕێنمای کراون و هیدایەتیان زیاترە، ئەوانە ڕاستگۆترین کەسانێکن لە نییەتیاندا ﴿فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ [الفتح:١٨]

«جا خوا ئاگادار بوو بەوەی لە دڵیاندایە بۆیە دڵنیایی و ئارامی بۆ ناردن وە پاداشتی دانەوە بە سەرکەوتنێکی نزیک.»

* بوونی نییەتپاکی زیاتر بەرەو هەقت دەبات وەک لە کردەوەکانت: ﴿ولو علم الله فيهم خيرا لأسمعهم﴾ [الأنفال:٢٣] «خۆ ئەگەر خوا زانیبای خێرێک بە ناوچاویانەوەیە، کارێکی دەکرد کە وشەی هەق و ئامۆژگارییەکانی قورئان ببیستن.»

نیەتی خێر لەدڵتدا هەبێت، خودا خێر و چاکە دەخاتە کردەوەکانتەوە.

* ڕاستگۆیی لەگەڵ خودا بەهێزترین پردە بۆ گەیشتن بە هەق و ڕاستی، هەرکەس ڕاست بکات لەگەڵ خودا ئەوا خودا دەیگەیەنێتە ئامانجەکانی.

* خودا بەهۆی نییەتپاکییەوە خێر و چاکەی زیاتر بە مرۆڤ دەدات وەک لە کردەوەکانی: ﴿إِنْ يَعْلَمِ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِمَّا أُخِذَ مِنْكُمْ﴾ [الأنفال:٧٠] «ئەگەر خوا بزانێت چاکەیەک لە دڵتاندایە، باشترتان دەداتێ لەوەی لێتان وەرگیراوە.»

* خودا زیاتر پاداشت لەسەر نییەت دەداتەوە وەک لە کردەوەکان ﴿فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ [الفتح: ١٨] «جا خوا ئاگادار بوو بەوەی لە دڵیاندایە بۆیە دڵنیایی و ئارامی بۆ ناردن و پاداشتی دانەوە بە سەرکەوتنێکی نزیک.»

* خودا زیاتر بەهۆی نیەتپاکییەوە ڕۆزی بە مرۆڤ دەبەخشێت وەک لە ئەزموونی کارکردنی، لە فەرموودەیەکدا پەیامبەری خودا (ﷺ) دەربارەی کڕیار و فرۆشیار دەفەرمووێت: «ئەگەر ڕاست بکەن و عەیبەکان دەربخەن، خودا بەرەکەت دەخاتە کڕین و فرۆشتنەکەیانەوە.»

* خودا تەنها ڕێنموونی ئەوانە دەکات بۆ کردەوەی چاکە کە ڕاستگۆی لە دڵیاندا بەدی دەکات: ﴿فَلَوْ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ [محمد: ٢١] «ئەگەر بەرانبەر بە خودا ڕاست بن، هەر بە قازانجی خۆیانە.»

* نییەتت چاک بکە، خودا کردەوەکانت بۆ چاک دەکات: ﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا﴾ [الإسراء: ٢٥] «پەروەردگارتان چاک دەزانێت بە هەرچی لە دڵ و دەروونتانداية، ئەگەر ئێوە چاک بن و نیازی چاکتان ببێت، ئەوا بێگومان خوا لێبوردەیە بۆ تۆبەکاران.»

* هەرکەس ئومێد و ونییەتی ئەنجامدانی چاکەی هەبێت ڕاستگۆیانە لەپێناو خودادا، ئەوا خودا پاداشتی کردەوەکەی بۆ دەنووسێت، لەفەرموودەیەکدا پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: «نییەت ڕاستەکان دەڵێن: ئەگەر ماڵ و سامانم ببوایە وەک فلان کەس چاکەم پێ دەکرد، ئەوا بە نیەتی خۆی لەگەڵ دەکرێت و لەپاداشتدا هاوتان.»

* هەرکەس نیەتی چاکەی هەبێت، خودا هۆکارەکانی بۆ دەهێنێتە پێش و دەرگاکانی بەڕودا دەکاتەوە: ﴿إِنْ يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا﴾ [النساء:٣٥] «ئەگەر هەردووک ڕازی بوون پێکبێنەوە و نیەتیان پاک بوو، ئەوا خواش یەکیان دەخات وپێکیان دێنێتەوە وپیرۆزی دەخاتە کارەکانیانەوە.»

* نییەتپاکی خراپە لە مرۆڤ لادەدات هەرچەندە ئەو خراپەیە لێوەی نزیک بێت: ﴿كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ [یوسف: ٢٤]

«بۆ ئەمە بوو کە خراپە و شوورەیی لێ وەپرینگێنین؛ ئەم یەکێ بوو لە عەبدە دڵپاکەکانمان.»

* نییەت پاکی نابێتە پاڵپشتی ئەوەی هەموو کردەوەیەکی ئەنجامدراو هەق و ڕاست بێت، لە ئەسەرێکدا هاتووە «وکم من مرید للخیر لن یصیبه» چەند کەس ویستی چاکەی هەبوو، بەڵام نەیپێکا.

# فەزڵ و گەورەیی پەرستش و پلە و ئاستەکانی

* خودا دەرگای خێر تەنها لەو کەسانە دەکاتەوە کە لە دەرگاکەی دەدەن، هەرکەس ڕووی تێ بکات خودا بەرەو ڕووی دێنێت، هەرکەس پشتی تێ بکات، خودا لێی لادەدات: ﴿إِنْ تَسْتَفْتِحُوا فَقَدْ جَاءَكُمُ الْفَتْحُ﴾ [الأنفال:١٩] «ئەگەر سەرکەوتنتان دەوێت، بەڵێ وا یارمەتیی خواتان بۆ هات.»

* ئەگەر خودا ویستی چاکەی بە کەسێک هەبێت، چاکەی لا خۆشەویست دەکات و هۆکارەکانی بۆ دەڕەخسێنێت، ئەگەر ویستی شەڕی پێ بێت، ئەوا لە خراپەدا بەکاری دەهێنێت، پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: «ئەگەر خودا ویستی چاکی بە بەندەیەک بێت، بەکاری دەهێنێت.»

* پەرستشەکان دەبنە هۆی لادانی حەرامکراوەکان لەڕێی بەندەدا، هەرچەندە هۆکارەکانی ساز و ئامادەبن: ﴿كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ [یوسف: ٢٤] «ئا بەو شێوەیەمان کرد (بۆئەوەی هەرچی گوناه و تاوان و خراپەیە لێی دوور دەخەینەوە) بەڕاستی ئەو لە بەندە هەڵبژاردە و پاکەکانی ئێمەیە.»

* ئەنجامدانی پەرستشی زۆر دەبێتە هۆی پارێزراوبوون لە گومان: ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ﴾ [الزمر:٣٦] «مەگەر هەر خودا بەس نییە کە ئاگای لە بەندەی خۆی بێت؟»

* ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ﴾ [الزمر:٣٦]

پەیوەندیەکی پتەو هەیە لەنێوان پەرستشی خودا و پاراستنی خودا بۆ

بەندەکەی، هەرچەندە مرۆڤ پەرستشی زۆر ببێت، خودا پاراستنی بۆ ئەو بەندەیەی زۆر دەبێت، پەرستش پاراستن دەهێنێتەجێ بەبێ داواکردنی.

* شوێنەواری کردەوەکان لەسەر ڕوخسار دەردەکەون: ﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنْكَرَ﴾ [الحج: ٧٢] «لە دەموچاو و دیمەنی بێبڕواکاندا گرژی و تاڵی و نکۆڵی دەبینی.»

﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾ [الفتح:٢٩] «نیشانیان لە شوێنەواری سوجدەبردنەکانیانەوە بۆ خوا لە ڕوخسارياندا دیارە.»

* کردەوەی چاک بەرەکەت و فەڕێک دەداتە خاوەنەکەی، جا ئەگەر مرۆڤ بەرەکەت و فەڕی کردەوە باشەکانی لە خودی خۆی و سامان و خانەوادەیدا بەدی نەکرد، ئەوا با بەخۆیدا بچێتەوە.

* وتەی هەق یارمەتیدەرە لەسەر کردەوەی چاکە، هەروەها هۆکاری لێخۆشبوونە لە تاوان ﴿... وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ۝ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ [الأحزاب: ٧٠-٧١ ] «... قسەیەکی هەق و چاک و لەجێی خۆی بکەن ئەوسا خودا کردەوەتان بۆ چاک دەکات و لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت.»

* کۆچکردن بۆ لای پەیامبەری خودا زۆرقورس بوو، تەنها هیمەت بەرزەکان ئەنجامیان دا. هەندێک لە هاوەڵان دواکەوتن، بەڵام پاش ئازادکردنی مەککە زۆر پەشیمان بوونەوە، ئەوەی هاوەڵان پەشیمان بوون لەسەر لەدەستدانی، وا ئێستا لەبەردەست تۆدا بوونی هەیە "العبادة في الهرج كهجرة إلي «پەرستش لەکاتی فیتنە وەک کۆچکردنە بۆلای من.»

* هەموو ئەو پەرستشانەی مرۆڤ ئەنجامی دەدات کاتێک دەگاتەوە بە خودا زۆر بە کەمی دەزانێت، نەک لەبەر کەمتەرخەمی مرۆڤ تیایدا، بەڵکوو لەبەر گەورەیی خودا، لە ئەسەرێکدا هاتووە: «ئەگەر کەسێک بەڕوودا کڕنووش

بیات، لەو ڕۆژەی لەدایک بووە تا ئەو ڕۆژەی دەمرێت، پیربێت لە ڕەزامەندی خودادا، هێشتا لە ڕۆژی دوایدا زۆر لای بێ ئەرزشە.»

* خۆشبەختیی ڕاستەقینە لە پەرستشدایە، خۆشییەکانی دیکە کاتین و تێدەپەڕن.

* مرۆڤ لە ژیاندا تەنها بە پەرستش خۆشبەختی بەدەست دەهێنێت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً﴾ [النحل: ٩٧] «ئەوەی کاروکردەوەی چاجەی کردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت، لەکاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بێت بە ژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دوونیادا دەیژیێنین.»

* بەرزترین پلەی ئیخلاص و نییەت پاکی، سووربوونە لەسەر شاردنەوەی پەرستشەکان وەک سووربوون لەسەر شاردنەوەی تاوانەکان.

* کردەوە چاکەکانت بشارەوە، خودا دەری دەخات، خۆ ئەگەر دەری نەخست ئەوا لە بەخشندەییەتی بۆت، نەوەکا پشت بە کردەوەکەت ببەستیت و فەڕ و بەرەکەتەکەی لەدەست بدەیت.

* گەورەترین هۆکاری نزیکبوونەوە لە خودا، ملکەچی و کزۆڵیی دەرخستنە بۆ خودا لە خەڵوەت و پەنهانییەکاندا.

* نیشانەی کەسی ڕاستگۆ لەگەڵ خودادا ئەوەیە دڵخۆش دەبێت بە کاتی پەنهانی بۆ ئەنجامدانی پەرستش، وەک چۆن گوناهکار دڵخۆش دەبێت بە کاتی پەنهانی بۆ ئەنجامدانی تاوان.

* خودا مرۆڤ زۆرزیاتر بەرز دەکاتەوە بە پەرستشە پەنهانەکانی هەرچەندە ڕێژەیان کەمیش بێت، بە بەراورد بەو پەرستشانەی کە بەئاشکرا ئەنجامی داون هەرچەندە زۆریش بن.

* ڕشتنی دڵۆپە فرمێسکێک لەپێناو خودادا لە کاتی پەنهانیدا زۆر گەورەترە لە ڕێژنە فرمێسکی ئاشکرا. لەو حەوت تاقمەی خودا دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە «پیاوێکە لە پەنهانی یادی خودا دەکات و چاوی پڕفرمێسک دەبێت.»

* پاکترین کردەوەکان ئەو کردەوانەن کە شاراوەن، جا هەرکەس گومانی لە کردەوەیەکی ئاشکرای هەیە، با لە پەنهانیدا زۆر لەو کردەوەیە ئەنجام بدات، چونکە پەرستشی پەنهانی کردەوەکان پاک دەکەنەوە لە ڕووپامایی.

*هەر چەندێک مرۆڤ لە پەنهانیدا بێت لەگەڵ خۆیدا، هێندە لە خوداوە نزیکترە ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةً﴾ [الأعراف: ٥٥] «بە نهێنی و بە سەرکزی هەر پەروەرندەتان لەبیر بێت و لەبەری بپاڕێنەوە.»

خودا پێی خۆشە بەنهێنی داوای لێ بکەیت، بەهۆی تەواوییەتیی دەوڵەمەندی و بێپێویستییەوە، بەڵام مرۆڤ پێی خۆشە بە ئاشکرا داوای لێ بکەیت بەهۆی پێویستبوونی بە منەت بارکردنتەوە.

* پەرستشی نهێنی گەورەترە لە پەرستشی ئاشکرا، بۆیە نوێژی ویتر کە تەنها یەک ڕەکاتە گەورەترە لە هەموو سونەتەکان، چونکە کۆتا ڕەکاتی شەوە و تەواو شاراوەیە، جا هەرچەند کاتی ئەنجامدانی دوابکەوێت لەشەودا باشترە.

* هەرچەند پەرستشەکانت نهێنیتر بێت چەسپاویت زیاتر دەبێت، وەک مێخێک وایە ئەندازەی چەسپاویی ڕووکەشەکەی وابەستەیە بە ئەندازەی ڕەگ داکوتانی لە ناخی زەویدا، مێخێکی گەورە کە بەشێکی زۆری ئاشکرا بێت، ئاسان هەڵدەکەندرێت بەڵام مێخێکی بچووک کە زۆرینەی شاراوە بێت و بەزەویدا چەقی بێت قورس و ئەستەمە هەڵکەندنی، ئەمەش تەنها بەهۆی شاراوەبوونیەتی.

* پەرستشی نهێنی هۆکاری جێگیربوونە لە کاتی فیتنە و ئاشووبەکاندا، هەروەها گوریسێکی بەهێزی نێوان خودا و بەندەیە، پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: «من استطاع منکم أن یکون له خبیء من عمل صالح فلیفعل» «هەرکەس لە ئێوە دەتوانێت کردەوەیەکی نهێنی هەبێت، با هەیبێت.»

* پەرستشی نهێنی و پەنهانی بریتییە لەو پەرژینەی مرۆڤ دای دەنێت بەدەوری دڵیدا بۆ پاراستنی لە نسکۆ و لادان لە ڕێی ڕاست، ئەو کەسانەی سکاڵای هەرلاوازییەکیان دەکەن، دەبینیت ئەوانەنن بە دەگمەن پەنهانانە لەگەڵ خودا خەڵوەت و پەرستشیان هەبووە، هەربۆیە توێشوی پەیامبەرخەڵوەتی شەوگار بوو.

* پەرستشی پەنهانی و نهێنی گەورەترین هۆکاری چەسپاوییە لەسەر ئایین، زۆرێک لەوانەی تووشی لادان بوون لە ڕێگەی ڕاست، تەنیا پەرستشی ڕووکەشیان هەبووە، پیاوێک پرسیاری لە حوزەیفە کرد: ئایا من لە دووڕووەکانم، گوتی: کاتێک تەنهایت نوێژ دەکەیت، ئەگەر تاوانت کرد، لەپەنهانیدا داوای لێخۆشبوون دەکەیت؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: بڕۆ خودا تۆ لەدووڕووان ناگێڕێت، ئەو کەسانەی سکاڵای ڕووپامایيان هەیە زۆرینەیان پەرستشی پەنهانییان کەمە یاخود هەر نییانە.

* هەرچەندێک مرۆڤ پلەی بەرز ببێتەوە، ئەوا زیاتر پێویستی بە پەرستشی پەنهانی هەیە تاکوو زیاتر دامەزراوی بکات، زۆرێک لەو ستوون و عەموودانەی دەکەون ئەندازەی بەشە شاراوەکەیان نەگونجاوە لەگەڵ بەرزییان، لاوازترین ئارەزوو دەیانخات بەزەویدا.

* دروستبوونی جیاوازیی لە ئەنجامدانی پەرستشەکان لەلایەن مرۆڤەوە لە حاڵەتی ئاشکرا و نهێنیدا هەروەها لە زۆری و کەمی و بەئاگابوون و درێژکردنەوەی زۆرجار بەڵگەیە لەسەر ئەندازەی دووڕوویی لە دڵدا.

* ئەگەر کارێکی ئاشکرات سەرسامی کردیت، ئەوا پاکی بکەرەوە بە زۆر ئەنجامدانی ئەو کارە لە پەنهانیدا، چونکە کردەوە پەنهانەکان هۆکاری پاککەرەوەن بۆ کردەوە ئاشکراکان.

* پەنهانییەکان پێوەر و تەرازوی ئاشکراکانن، هەرکەس لە پەنهانیدا باش بێت، کردەوەکانی باشە، ئەو کەسەش پەنهانی خراپ بێت، کردەوە چاکەکانی تەنها بۆ دووڕووی دەردەخات.

* تەنها ئەوانە بەدەست ڕووپامابییەوە دەناڵێنن کە پەرستشی پەنهانیان کەمە.

# یادی خودا، پێگە و مەزنی و حوکمەکانی

* یادی خودا ژیانی ڕۆحەکان و ڕۆحی ژیانە، ئارامی دڵ و دەروون و هێوری ناخە ﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾ [الرعد: ٢٨] «باش بزانن کە یادی خوا ئۆقرە و ئارامی دڵانە.»

* دڵئارامی لەکاتی یادی خودادا نیشانەی بەهێزیی باوەڕە، دوورکەوتنەوە و تەمبەڵی لە یادی خودا نیشانەی لاوازی ئیمانە ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾ [الرعد: ٢٨

«ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە خوا هەیە و بە یادی خوا دڵیان ئارام دەبێتەوە.»

* باشترین هۆکار بۆ پاککردنەوەی دەروون، زۆر یادی خوداکردن و زۆر ئەنجامدانی نوێژە ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ١٥﴾ [الأعلى: ١٤ – ١٥]

«دیاریشە هەر کێ پاک ژیا، ڕزگار بووە. یادی نێوی پەروەرندەی کرد و نوێژی بەجێ هێنا.»

* یادی خودا دڵ نەرم دەکات بۆ وەرگرتنی هەق، هەروەها دەیپارێزێت لە گومڕایی ئارەزوو: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ﴾ [الزمر: ٢٢]

«هاوارە بۆ ئەو کەسانە دڵڕەقن لە یادی خودا؛ کە ئەمانە بە ئاشکرا ڕێگەی خۆیان گوم کردووە.»

* یادی خودا لەگەڵ هەوا و ئارەزوو دژیەکن، هەرچەندە زمان تەڕ و پاراو بێت بە یادی خودا، هەوا و ئارەزوو دووردەکەوێتەوە لە دڵ ﴿وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا﴾ [الكهف: ٢٨] «گوێ لە مستی کەسێ مەبە کە نەمانهێشت دڵی یادی ئێمە بکا و هەر لە شوێن ئارەزووی خۆیەوەیە.»

* یادی خودا هۆکاری پارێزراوییە لە فیتنە و ئاشووب کاتێک دێنەپێش، هەروەها پارێزراوییە لەو کارەساتانەشی کە مرۆڤ تێی کەوتووە: ﴿لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا﴾ [الجن: ١٧] «تا تاقییان کەینەوە تێیدا هەر کەسێک ڕوو وەرگێڕێ لە یادی پەروەردگاری خۆی، دەیخاتە ناو سزای دژوارەوە.»

* یادی خودا هۆکاری جێگیربوونە لە کاتی فیتنە و ئاشووبدا، هەروەها لە کاتە ناهەموار و ئاستەنگەکاندا، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ [الأنفال: ٤٥] «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، کاتێک (لە جەنگدا) لەگەڵ کۆمەڵێکدا ڕووبەڕوو بوونەوە، خۆگر بن (هەڵنەیەن) یادی خوا زۆر بکەن بۆئەوەی سەرکەوتوو بن.»

* یادی خودا دڵ لە دووڕوویی پاک دەکاتەوە، خودا دەربارەی دووڕووەکان دەفەرمووێت: ﴿ولا يذكرون الله إلا قليلا﴾ [النساء:١٤٢] «زۆر کەمیش یادی خوا دەکەن.» دەربارەی باوەڕداران دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾ [الأحزاب: ٤١]

«ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! فرە یادی خوا بکەن و لە یادی ئەو ڕامەوەستن.»

* یادی خودا یارمەتی مرۆڤ دەدات لەسەر جێگیربوونی زانست و یادهاتنەوەی: ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ [الكهف: ٢٤] «ئەگەر لە بیریشت نەما، یادی پەروەرندەت بکە.»

چونکە لە بیرچوونەوەی ڕاستییەکان لە شەیتانەوەیە و یادی خوداش شەیتان دوور دەخاتەوە ﴿وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ﴾ [الكهف: ٦٣] «دیارە شەیتان نەیهێشت وەبیرم بێتەوە.»

* زۆر یادکردنی خودا یارمەتیدەری مرۆڤە لەسەر تەواو پێکانی بۆچوونەکان، ئەو کەسەی یادی خودا کەم دەکات، زۆر کەم بۆچوونەکانی دەپێکێت، ئەگەر یش بی پێکێت بەرەکەت و فەڕی کەم دەبێت: ﴿وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ﴾ [الكهف: ٢٨]

«گوێ لە مستی کەسێک مەبە کە نەمانهێشت دڵی یادی ئێمە بکات و هەر لە شوێن ئارەزووی خۆیەتی.»

* نزیکترین کەس لە خوداوە ئەو کەسەیە زۆرترین یادی خودا دەکات، خودا دەفەرمووێت: «من لەگەڵ بەندەکەمم کاتێک یادم دەکات، ئەگەر تەنها خۆی یادم بکات، ئەوا لای خۆم باسی دەکەم، ئەگەر لای کەسانی دیکە یادم بکات، ئەوا لای کەسانێکی باشتر لەو باسی دەکەم.»

* ئەو کەسانەی زۆرترین سپاسگوزارییان بۆ خودا هەیە، ئەوانەن کە زۆرترین یادی خودا دەکەن، یادی خودا دەروازەی هەموو سپاسگوزارییەکە. ﴿فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ﴾ [البقرة: ١٥٢] «کەواتە یادم بکەن، تا منیش یادتان بکەم، سوپاسم بکەن و پێنەزانی ناسوپاسیم مەکەن.»

* دڵەکان ڕەق دەبن و تەنها بە یادی خودا نەرم دەبنەوە، دڵ تەنگ دەبێت و تەنها یادی خودا ئاسوودەی دەکات، لە فەرموودەیەکی سەحیحدا هاتووە: «من بێئاگایی بەسەر دڵمدا دێت و داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەم سەد جار لە ڕۆژێکدا.»

* سەرلێشێواوی لە پێکانی هەقدا نیشانەی تەواو دەسەڵاتپەیداکردنی شەیتانە بەسەر کەسانی سەرگەرداندا: ﴿كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَـٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ﴾ [الأنعام: ٧١] «بە وێنەی ئەو کەسەی کە شەیتانەکان سەریان لێ شێواندبێت، لە زەویدا سەرگەردانن.»

یادی خودا شەیتان و سەرگەردانکاری شەیتان دووردەخاتەوە.

* ویردەکانی بەیانیان و ئێواران مرۆڤ لەو وەسفە لادەدات کە بەبێئاگا و غافڵ بنووسرێت: ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَـٰفِلِينَ﴾ [الأعراف: ٢٠٥] «لە دڵ و دەروونتدا یادی پەروەردگارت بکە، بە پاڕاناوە و ترس و بیمەوە، بەبێ ئەوەی دەنگ بەرزبکەیتەوە لە بەرەبەیانی و دەما و دەمی ئێواراندا و لە بێئاگایان مەبە.»

* هەندێکجار مرۆڤ بەردەوام زیکرەکانی دەخوێنێت و پارێزگاری لێ دەکات، بەڵام تووشی ئازار و ناڕەحەتی دێت، چونکە تەنها بەزوبان دەری بڕیوە، بەیەقینەوە لە دڵەوە دەری نەبڕیوە، هەروەها شارەزای واتاکانی نەبووە، لە فەرموودەیەکدا پەیامبەر (ﷺ) دەفەرموێت "قالها موقنا بها «بەیەقین و دڵنیاییەوە گوتبێتی.»

* یادی خودا و تێڕامان: دووپەرستشن بەردەوام لەگەڵ مرۆڤدان لە هەموو کات و شوێنێکدا ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ [آل عمران: ١٩١] «ئەوانەی یادی خوا دەکەن، بەپێوە و بەدانیشتوویی و بەڕاکێشانەوە بیر لە درووستکردنی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە.»

* باشترین زیکر و یادی خودا ئەوەیە تێڕامانی لەگەڵدا بێت لە دروستکراوەکان و بەڵگە و نیشانەکانی خودا، ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ [آل عمران: ١٩١]

* هەناسەکان هیچ پیت و وشەیەکیان لە "لا إله إلا الله باشتر نەگوتووە، چونکە ئەو وتەیە قورسترە لە شاخە بەرزەکان و دەریا فراوانەکان.

* گەورەترین شت یارمەتی بڕوادار بدات لەسەر خۆڕاگری بەرانبەر وتەی حەسوودەکان بریتییە لە پشتبەستن بە یادی خودا و نوێژکردن: ﴿فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا﴾ [طه: ١٣٠] «کەواتە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ئارام بگرە لەسەر ئەوەی ئەوان دەیڵێن و پەروەردگارت بە پاک ڕابگرە و سوپاسی بکە لەپێش هەڵهاتنی خۆر و لەپێش ئاوابوونیدا.»

* زیکرکردن بە تەسبیح و بە موور و هیچ کێشەی تێدا نییە لەسەر بۆچوونی دروست، نازانم کەس لە سەلەف بە بیدعەی هەژمار کردبێت، بەڵام بە پەنجەکانی دەست بکرێت باشترە.

* نزیکترین کەس لە بەزەیی و ڕەحمی خوداوە ئەوکەسەیە کە زۆرترین (استغفر الله) دەکات و دەگەڕێتەوە لای خودا: ﴿لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ [النمل: ٤٦]

«بۆ لە خودا داوا ناکەن عافووتان بکات؟ بەڵکوو بەزەیی پێتاندا بێت.»

* فریشتەکان خودا پاکڕادەگرن و (سبحان الله) دەکەن و داوای لێخۆشبوون بۆ خۆیان ناکەن، چونکە تاوان ناکەن، ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِى ٱلْأَرْضِ﴾ [الشورى: ٥] «فریشتەکان بەپاکی یاد و سوپاسی پەروەردگاریان دەکەن و داوای لێبووردن دەکەن بۆ ئەوانەی لە زەویدان.»

ئەو کەسەی تاوانی زۆرە، پێویستە داوای لێ خۆشبوونەکەی زیاتر بێت لە پاکڕاگرتن و (سبحان الله) وتنی.

* باشترین کاتی (سبحان الله) لە بەیانیدایە وەک داوای یارمەتی لە خودا لەسەر کردەوە کردن لەو ڕۆژەدا، هەروەها لە ئێوارەشدا وەک ملکەچی بۆ خودا:

﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمۡسُونَ وَحِينَ تُصۡبِحُونَ﴾ [الروم: ١٧] «کەواتە پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ خودا، کاتێک کە ئێوارە وبەیانی دەکەنەوە.»

* داوای لێخۆشبوون کردن لە بەرە بەیاندا باشترین زیکر و یادی خودایە ﴿وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ﴾ [الذاريات: ١٨] «بەری بەیان، داوای لێبوردنیان دەکرد.»

بەڵام تەسبیحات هەمووی فەزڵ و پلەو پاییەیان یەکسانە لە شەو و ڕۆژدا ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمۡسُونَ وَحِينَ تُصۡبِحُونَ﴾ [الروم:١٧]

* باشترین کاتی داوای لێخۆشبوون کاتی بەرەبەیانە، باشترین شێوازی لە کڕنووش بردندایە لە شەونوێژدا، خودا دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ﴾ [آل عمران: ١٧]

تەبەری دەڵێت: ئەوانەن کە داوای داپۆشینی کەموکوڕیەکانیان دەکەن لە بەرەبەیاندا.

* ئەو کەسەی بێتوانایە لە شەونوێژ لە بەرەبەیاندا، ئەوا پێویستە بێتوانا نەبێت لە داوای لێخۆشبوون کردن و (أستغفر الله) وتن تیایدا: ﴿وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ﴾ [آل عمران: ١٧] «سەرلەبەیان لە خودا دەپاڕێنەوە لێیان خۆش بێت.»

* داوای لێخۆشبوون لە گەورەترین هۆکارەکانی دامەزراوییە، هەروەها هۆکاری پارێزراوبوونە لە هەڵگەڕانەوە: ﴿وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ﴾ [هود: ٥٢] «ئەی گەلەکەم داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، دواتر بگەڕێنەوە لای ئەو (ئەگەر وا بکەن) خوا لە ئاسمانەوە (باران) بەلێزمە دەبارێنێت بەسەرتاندا و هێزی تر زیاد دەکات بۆ هێزەکەتان.

* ﴿ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا. - يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارًا﴾ [نوح: ١٠-١١]

«داوای لێخۆشبوون بکەن لە پەروەردگارتان بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێخۆشبووە. ئینجا گەر وا بکەن، بارانی خوڕەم و لێزمەتان بۆ دەبارێنێت.»

هیچ کێشە نییە ئەگەر کەسێک داوای لێخۆشبوون بکات بەبێ دیاریکردنی ڕێژەکەی بە مەبەستی تەوبە و گەڕانەوەی بۆ لای خودا، هەروەها لەگەڵ مەبەستی ئاسانکاری لە هاوسەرگیری و ماڵ و ساماندا.

# فەزڵ و مەزنیی قورئان و حوکمەکانی

* قورئان وەک ڕۆشناییە و عەقڵیش وەک چاو، هەندێک جار نابیناکان هەست دەکەن و دەتوانن کەمێک ڕێ بکەن، هەندێک جاریش کەسی مولحید لەوانەیە ڕاستی بپێکێت بە بیرکردنەوە، بەڵام بەبێگومانی هەردووکیان هەر بەزەویدا دەکەون.

* قورئان زانست و هزرە، تاکوو چاوەکان و دڵەکان داخراوبن لێی، گەنجینەی ورد و بەروبوومی قورئان نابینن ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ﴾ [محمد: ٢٤]

«ئاخۆ ئەوان لەو قورئانە ڕانامێنن، یان دڵیان گاڵە دراوە؟»

* قورئان گەنجینەیەکە تەنها ئەوانە نهێنیەکانی درک پێ دەکەن کە بەردەوام پەڕەکانی هەڵدەدەنەوە و لێی دەڕوانن، ئیبن مەسعوود دەڵێت: «هەرکەس زانستی دەوێت، با لە قورئاندا بگەڕێت، چونکە زانستی سەرەتا و کۆتایی تیادایە.»

* قورئان کراوەیە بۆ ئەو کەسانەی لێی ڕادەمێنن، بەڵام خودا دڵەکان قفڵ دەکات دەربارەی وەک سزایەک بەهۆی تاوانەکانیانەوە، یان بێبەشی دەکات بەهۆی خۆبەگەورەزانینەوە: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ﴾ [محمد: ٢٤]

* تێڕامان لە قورئان دڵ چەسپاو دەکات، بۆچوونەکان ڕاست دەکاتەوە و دەیپارێزێت لە ئارەزوو.

* قورئان نور و ڕۆشناییە، ئەو کەسەی ڕێگەی هیدایەتی پێ نەدۆزرێتەوە، ئەوا عەقڵی پەردەی بەسەردا دراوە، وەک ڕۆشنایی خۆر وایە، ئەوانەی چاویان داپۆشیوە سوودی لێ نابینن: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا﴾ [النساء: ١٧٤] «ڕۆشناییەکی ئاشکرامان بۆ ئێوە ناردووەتە خوارێ.»

* قورئان گەورەترین ڕۆشناییە بۆ عەقڵەکان، چونکە وتەی بەدیهێنەری عەقڵەکانە، بەدیهێنەر زاناترە بەوانەی بەدیهێناون، ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا﴾ [النساء: ١٧٤]

﴿قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ﴾ [المائدة: ١٥] «لە لای خواوە ڕووناکی و کتێبێکی دیاری دەرتان بۆ هاتووە.»

﴿وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾ [الأعراف: ١٥٧] «شوێنی ئەو نوورە کەوتوون (کە قورئانە) و هاوڕێ لەگەڵیدا ڕەوانە کراوە.»

* قورئان دەرمانە بۆ نەخۆشییەکانی هەواوئارەزوو: ﴿وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ﴾ [یونس: ٥٧]

چارەی دەردی دڵانیشە.

هەرکەس دەرمانی نەخۆشییەکان لەناو سنگیدا هەبێت، ئەوا هەواو ئارەزوو ناچێتە ناویەوە: ﴿بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ﴾ [العنکبوت: ٤٩]

بهڵکو قورئان نیشانهکانی ئاشکران و لهدڵ و دهروونی کهسانێکدان کهزانستیان پێ دراوە.

* قورئان پێوەرە بۆ دەرخستن و هەڵماڵینی بیرە پوچەکان تەنها ئەوانەی تێرامانی تێدا دەکەن بۆیان دەردەکەوێت: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا﴾ [النساء: ٨٢] «ئێوە بۆ بیرناکەنەوە لە قورئان؟ خۆ ئەگەر لەلایەن یەکێکی ترەوە بووایە جگە لە خوا بێگومان دژیەکی و جیاوازی زۆریان تێدا دەدییەوە.»

* قورئان زۆر قورسە لەسەر خاوەن ئارەزووەکان هەرگیز ناتوانن بەرپەرچی بدەنەوە، ناچار بە ستەم و تۆمەت هەڵبەستن تۆڵە دەسەننەوە: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ يَكَادُونَ يَسْطُونَ﴾ [الحج:، ٧٢] «کاتێک ئایەتەکانی ئێمە بەڕوونی و ئاشکرایی بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، لە ڕوخساری ئەواندا کە بێباوەڕن بێزاری و تاڵی و گرژی بەدی دەکەیت، خەریکە پەلاماری خوێنەرەوەی ئەو قورئانە بدەن.»

* قورئان گەورەترین بەربەست و سزایە لەپێش باتڵەکان، پارێزراوە و هیچ بۆنەیەک هەڵیناوەشێنێتەوە و ئارەزوو و گومانەکانیش نای گۆڕن، گێڕدراوەتەوە لە فەرموودەدا: «ئەم قورئانە جیاکەرەوەیە و هیچ گاڵتە و گەپ نییە. هەر لە دەسەڵاتدارێک وازی لێ بهێنێت، خودا پشتی دەشکێنێت.»

* هەندێک لە واتا و مەبەستەکانی قورئان بەکۆبوونەوەی کۆمەڵانێک لە خاوەن هزر و ئەقڵ نەبێت دەرناکەوێت: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ [الروم:٢٤] «بەڕاستی لەوەدا بەڵگە و نیشانە زۆرن بۆ خەڵکانێک عەقڵی خۆیان دەخەنە کار.»

بەهۆی کۆبوونەوەی چەند عەقڵێکەوە، گەنجینەی واتا و مەبەستەکانی پێ دەدۆزرێتەوە، وەک چۆن کۆبوونەوەی هێزی کۆمەڵێک گەنجینەکانی زەوی پێ دەردەهێنرێت.

* هەموو یاسا گشتیەکانی ژیانی مرۆڤ، یاسای ئوممەتان و دەوڵەتانی پێشوو سەرەتا و کۆتاییان، هەروەها خۆش گوزەرانی و سزایان هەمووی لە قورئاندا باس کراوە: ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ [الزمر: ٢٧] «سوێند بێت بەڕاستی لەم قورئانەدا هێناومانەتەوە بۆ خەڵکی هەموو جۆرە نموونەیەک تا پەند و ئامۆژگاری وەرگرن.»

* هەرکات خۆبەگەورەزانین لە مرۆڤدا هەبوو، ئەوا تێڕامان و تێگەیشتنی

ـە قورئان کەم دەکات، چونکە هەرگیز خۆبەگەورەزانین و زیرەکی کۆنابنەوە: ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ - أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ﴾ [المؤمنون: ٦٧ -٦٨] «خۆتان زۆر بەزل دەزانی و لە شەونشینی خۆتاندا، هاتەران پاتەرانتان بوو.»

ئاخۆ ئەوان لەم وتەیە ڕانەماون.

* تاوانەکان ڕێگری لە عەقڵ دەکەن لە تێگەیشتن و تێڕامانی قورئان و بەربەست لە بەردەم دڵدا دادەنێن لە هێزی تێگەیشتن بێبەشی دەکەن: ﴿وَلَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ [الأعراف: ١٠٠] «ئەگەر بمانەوێت بەهۆی گوناهەکانیانەوە دووچاری بەڵایان دەکەین و مۆر دەنێین بەسەر دڵیاندا بۆئەوەی نەبیستین.»

* ئەو دڵەی هۆگری خوێندنەوەی وتەی ئەدیبەکان و فەیلەسووفەکان بووە و بێزار و دڵتەنگ دەبێت لە کاتی خوێندنەوەی وتەی خودادا، ئەوا ئەو دڵە بەهۆی تاوانەکانیانەوە قفڵکراوە و سزا دراوە بە بێبەشبوون، ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ﴾ [محمد: ٢٤]

«ئاخۆ ئەوان لەو قورئانە ڕانامێنن، یان دڵیان گاڵە دراوە؟»

* ئەگەر دڵ سەرقاڵ بوو بە جگە لەو شتانەوە کە چاو لێیان دەڕوانێت، ئەوا سوود لە چاوی وەرناگرێت، خۆ ئەگەر دڵ سەرقاڵ بوو بە خۆشەویستیی فەیلەسووفەکانەوە، وتەکانیان دەبینێت، بەڵام کوێر دەبێت لەئاست بینینی ئەو وتانەی کە بۆ هەموو چاوێک دەرکەوتوون لە وەحیدا.

* ئەگەر کەسێک تەنها قورئانی بەس نەبوو بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە بۆ نیشاندانی هەق و ڕاستی، ئەوا عەقڵەکانیش تەنیا سەرگەردانی بۆ زیاددەکەن: ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ [العنكبوت: ٥١] «ئایا بۆ ئەوان بەس نییە، کە ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا.»

*هەر شتێک یەکبگرێتەوە لەگەڵ قورئاندا ئەوە زانست و هەقە، هەرشتێکیش پێچەوانەی بێت ئەوا نەزانی و هەواو ئارەزووە: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ [الجاثية: ١٨] «لەپاشان تۆمان خستە سەر شەریعەتێک لەبارەی ئایینەوە تۆش شوێنی بکەوە و شوێن هەواوئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن.»

* گەورەترین ڕۆشنایی بۆ ئەقڵ و بەرچاوڕوونی بۆ چاوەکان بریتییە لە وتەی بەدیهێنەر بۆ دروستکراوەکانی، ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا﴾ [النساء: ١٧٤] «ڕۆشناییەکی ئاشکرامان بۆ ئێوە ناردووەتە خوارێ.»

لە لای خواوە ڕووناکیتان بۆ هاتووە. ﴿قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ﴾ [المائدة: ١٥]

﴿وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾ [الأعراف: ١٥٧]

لە دووی ئەو ڕووناکییە دەچن کە لەگەڵ ئەو نێردراوە.

* هەموو خەڵکی ناتوانن یاسایەکی باشتر و تەواوتر و گونجاوتر لە قورئان بۆ ژیانیان پێکبێنن: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ [يونس: ٥٨] «ئەی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) بە ئیمانداران بڵێ: با دڵشاد و شادومان بن بە فەزڵ و بەخشش و ڕەحمەتی خوایی (کە قورئان و بەرنامەی خودایە)، کەوابوو با هەر بەوە دڵخۆش بن هەر ئەوەش چاکترە بۆیان لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی خەریکن کۆی دەکەنەوە و کەڵەکەی دەکەن.»

ئیبن عەباس دەڵێت: فضل الله بریتییە لە قورئان.

* ئەو کەسەی زۆرترین شوێنکەوتنی بۆ قورئان هەیە نزیکترین کەسە لە سۆز و بەزەیی خوداوە: ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ [الأنعام: ١٥٥]

«ئەم کتێبە پیرۆز و پڕ لە پیتەشمان ناردووەتە خوار. هەمووتان پەیڕەوی لەو بکەن و ترسیشتان لە خودا هەبێت، بەشکوو بەزەیی پێتاندابێت.»

* زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە سوننەت و چاکەیە لە کاتی یادی خودادا دەستنوێژ هەبێت، ئەم بابەتە بۆ قورئان زیاتر جەختکراوەترە با لەسەر موسحەفیش نەبێت، بەڵام ڕاجیان دەربارەی دەستدان لە قورئان بەبێ دەستنوێژ بۆچوونی ڕاستیش دروستبوونیەتی.

* قورئانخوێندن بۆ کەسی لەشگران و ئافرەتان لەکاتی سووڕی مانگانەدا بەبێ دەست لێدان لە موسحەف جێی ناکۆکی زانایانە، بۆچوونی پەسەند دروستیێتییەتی، بە سەحیحی لە ئیبن عەباسەوە هاتووە کە لە کاتی لەشگرانیدا قورئانی خوێندنووەتەوە، پرسیاریان لێی کردووە و دەربارەی ئەو کارەی گوتویەتی: "خۆ هەر ئەوە لە هەناومدا هەیە."

*بە سەحیحی لە ئەبوو میجلەزەوە هاتووە دەڵێت: "چوومە لای ئیبن عەباس، گوتم: لەشگران قورئان دەخوێنێت؟ گوتی: کاتێک هاتییە لام، من حەوت یەکی قورئانم خوێندبوو و لەشگرانیش بووم." بەدروستی لە پێشەوا عومەر و علییەوە هاتووە ڕێگرییان لە لەشگران کردووە لەو کارە.

* بۆچوونی بەهێز پێویست نەبوونی دەستنوێژە بۆ خوێندنی قورئان لە موبایل و کۆمپیتەردا، هەرچەندە دەستیش لە شاشەکانیان بدرێت، چونکە ئەو ئامێرانە حوکمی موصحەف وەرناگرن لە گەورەدانان و سووکایەتی پێکردن و کڕین و فرۆشتنیاندا.

# دوعا، پلە و پێگە و حوکمەکانی

* نزا کردن لە کڕنووشدا نزیکترە لە وەڵام دانەوە وەک لە قنووتدا، باشترین شوێنی نزاکردن لە نوێژی تەنهادا بریتییە لە:

کڕنووش

پاشان نێوان دوو کڕنووشەکان

پاشان لە تەحیاتی کۆتادا

پاشان لە قنووتدا

* خودا نزاکردنی پەنهانی پێخۆشە، چونکە تەنها ئەو کەسانە بە پەنهانی نزادەکەن کە دڵیان لە خوداوە نزیکە: ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعًا وَخُفۡيَةً﴾ [الأعراف: ٥٥]

بە نهێنی و بە سەرکزی هەر پەروەرندە و لەبیر بێت و لە بەری بپاڕێنەوە.

* پاڕانەوەی پەنهانی گەورەترە لە پاڕانەوەی ئاشکرا، چونکە تەنهابوون و خەڵوەتی داواکار لەگەڵ داوالێکراودا ڕاسترین وتە لەخۆدەگرێت، بۆیە خودا فەرمان دەکات بە پەنهانی لێی بپاڕێینەوە ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعًا وَخُفۡيَةً﴾ [الأعراف: ٥٥] «بە نهێنی و بە سەرکزی هەر پەروەرندەتان لەبیربێت و لە بەری بپاڕێنەوە.»

*باشترین پاڕانەوە ئەوەیە ئەوپەڕ پەنهانی و ئەوپەڕ ترسانی تێدا کۆببێتەوە: ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعًا وَخُفۡيَةً﴾ [الأعراف: ٥٥]

* هەرچەندە مرۆڤ پەنهان بێت لەگەڵ خۆیدا، هێندەش لە خوداوە نزیکترە: ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعًا وَخُفۡيَةً) [الأعراف: ٥٥] «خودا پێی خۆشە بەپەنهانی داوای لێ بکرێت، چونکە تەواو دەوڵەمەند و بێپێویستە، بەڵام مرۆڤ پێی خۆشە بە ئاشکرا داوای لێ بکرێت چونکە پێویستی بە منەتبارکردنت هەیە.»

* یەکێک لە سوننەتە لەیادکراوەکان: ڕوانینە بۆ ئاسمان لەکاتی پاڕانەوەدا وەک بەگەورەدانان ﴿قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ [البقرة: ١٤٤] «بەڕاستی ئێمە گەڕانی ڕوخسارت ڕوو بە ئاسمان دەبینین.»

میقداد دەڵێت: "پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەری بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان و گوتم: ئێستا دەپاڕێتەوە."

* ئامادەبوونی دڵ لەکاتی پاڕانەوەدا مەرجێکی وەرگیرانی پاڕانەوەیە، خەڵکی زۆرترین پاڕانەوەیان بریتییە لە ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ [الفاتحة: ٦] لەگەڵ ئەوەدا گومڕا دەبن، چونکە پاڕانەوەی زوبان بەتەنها بێ ئاگابوونی دڵ پاڕانەوەیەکی بێئەرزشە.

* ناکرێت باوەڕدار پاڕانەوەکانی تەنها بۆ قازانج و داوای دونیا بێت و دواڕۆژ لەیاد بکات لە پاڕانەوەکانیدا ﴿فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖ﴾ [البقرة: ٢٠٠] «هەندێک لە خەڵکی هەیە دەڵێت: پەروەردگارا لە دونیادا خێروخۆشیمان پێ ببەخشە. بێگومان ئەو جۆرە کەسە لە قیامەتدا بێبەهر و بێبەش و بێڕێزە.»

* سوننەتە مرۆڤ داوا لە دایک و باوکی بکات بۆی بپاڕێنەوە بەتایبەت لە کاتی کەمتەرخەمی کەسەکە و باشییێتی دایک و باوکیدا: ﴿قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا ٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ﴾ [یوسف: ٩٧]

«وتیان: بابە! ئێمە لە ڕێ لامان داوە، لە پەروەرێنت داوا کە لێمان خۆش بێت.»

* سوننەتە نزا و پاڕانەوە بۆ نەوەکانیشت بکەیت لەگەڵ منداڵەکانتدا هەرچەندە پێش لە دایکبوونیشیان بێت، خێزانی عمران دایکی مەریەم دەیگوت: ﴿وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ [آل عمران: ٣٦]

«من ناوم لێ ناوە مریەم، ئەوا ئەویش و وەچەیشیم بە تۆ سپارد؛ کە لە شەیتانی نەحلەتی بیانپارێزی.»

* ئەگەر کارێکی چاکەت بەرانبەر کەسێک ئەنجام دا، داوای نزا و پاڕانەوەی لێ مەکە، بەڵکوو خۆت ڕوو بکە پەروەردگار و ئەو کردەوەیەت بکە هۆکاری پاڕانەوەکەت: ﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾ [القصص: ٢٤]

«ئەوسا ئاوی بۆ هەڵێنجان؛ پاشان خۆی گەیاندە سێبەر. گوتی: ئەی پەروەرندەی من! من ئاتاجی ئەو خێرەم کە بۆم دەنێری.»

* هیچ کێشە نییە بە کەسێک ڕابگەیەنیت کە نزای بۆ دەکەیت، بەمەبەستی هۆگربوونی زیاتر و خۆشەویستی نێوانتان: ﴿قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا﴾ [مریم: ٤٧] «فەرمووی سەلامەت لێ بێت، لەمەودوا داوای لێبوردنت بۆ دەکەم لە پەروەردگارم (چونکە) بەڕاستی ئەو (پەروەردگار) لەگەڵمدا میهرەبانە و دوعام گیرا دەکات.»

* ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي﴾ [غافر: ٦٠]

«پەروەرندەتان گوتوویە: لە بەرم بپاڕێنەوە، ئەوسا بە دەنگتانەوە دێم. ئەو کەسانەی -هەر لەبەر خۆبەزلزانین- نایانەوێت بمپەرستن، بەزەبوونی دەچنە دوڕجەهەندەمەوە.»

لە نیشانەکانی خۆبەگەورەزانین کەمی پاڕانەوەیە لە خزمەت خودادا، پاڕانەوە لە خزمەت خودادا دەروون دەشکێنێت و وادەکات مرۆڤ خۆبەکەمزان بێت بەرانبەر مرۆڤەکانی دیکە.

* دەبینیت کەسێک بەیانی دوعا لە منداڵەکەی دەکات و لە ئێوارەشدا سپاسگوزاری خودایە لەسەر ئەوەی ڕاستەوخۆ خودا وەڵامی دوعاکەی نەداوەتەوە، نیعمەتی دواکەوتنی وەڵام نەدانەوەی دوعاکەی بۆچەد کاتژمێرێک بۆ دەرکەوت، هەندێک جار خودا وەڵامی بەندەکەی ناداتەوە لەو ڕۆژەی کە تیایدا پاڕاوەتەوە، چونکە خودا دەزانێت پاش چەند ساڵێکی دیکە دەبێتە هۆی تیاچوونی.

* هیچ شتێک باشتر نییە بۆ دەروون بە وێنەی نزا و داواکردنی هیدایەت بۆ ڕکابەرەکانت، هەرکات ئەوان بە دەروون و دڵتدا هاتن تۆ داوای ڕێنموونیان بۆ بکە، بۆ ئەوەی دەروونت پارێزراو بێت لە کینە و هەروەها بەو هۆیەوە شەیتان وازبهێنێت لە ئەوان بهێنێت بە دڵ و دەروونتدا لە ترسی داواکردنی هیدایەت بۆیان.

*«اللهم اغفر لي خطاياي و ذنوبي كلها، اللهم وانعشني و اجبرني و اهدني لصالح الأعمال و الأخلاق، إنه لا يهدي لصالحها ولا يصرف عني سيئها إلا أنت» ئەمە زیکرێکە پاش نوێژ دەگوترێت، کاڵبووەتەوە و وازلێهێندراوە لەناو خەڵکدا.

* خودا لە بەرەبەیاندا لە بەندەکانی نزیک دەبێتەوە، جا پێویستە دڵەکان و جەستەکان ڕووی تێ بکەن بەملکەچی دەربڕین و داوا لێکردنی.

* سوننەتە نزا و پاڕانەوە لە بەرەبەیاندا بەتایبەت لە کاتی گەشتدا: «سمع سامع بحمدلله وحسن بلائه علينا، ربنا صاحبنا و أفضل علينا، عائذا بالله من النار» "کەسێک گوێبیستی سپاسگوزاریمان بوو بۆ خودا و چاکەی ئەو لەسەر ئێمە و خودایە لەگەڵمان بە و بمان پارێزە و فەڕ و بەخششی خۆتمان بەسەردا

دابەزێنە، پەنا بە خوداش دەگرین لە ئاگری دۆزەخ فەرمووده‌یەکی جێگیرە و کەم کەس کاری پێ دەکات.

* «أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذَا الْيَوْمِ فَتْحَهُ, وَنَصرَهُ وَنُورَهُ, وَبَرَكَتَهُ, وَهُدَاهُ, وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِيهِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهُ»

واتە: «بەیانیم بەسەردا هات و موڵک و سامانیش بەیانیان بەسەردا هات هەر بۆ خودای جیهانیان، خودایە من داوای چاکەی ئەم ڕۆژەت لێ دەکەم، وەکوو: گەیشتن بە ئامانج و سەرکەوتن بەسەر دوژمندا و ڕۆزی پاک و هەڵبژاردنی ڕێگەی ڕاست، پەناشت پێ دەگرم لە شەڕ و خراپەی ئەم ڕۆژە و ئەوەیش، کە بەدوایدا دێت.»

* «اللَّهُمَّ فَالِقَ الْإِصْبَاحِ، وَجَاعِلَ اللَّيْلِ سَكَنًا وَالشَّمْسِ وَالْقَمَرِ حُسْبَانًا، اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ، وَأَغْنِنِي مِنَ الْفَقْرِ، وَأَمْتِعْنِي بِسَمْعِي وَبَصَرِي وَقُوَّتِي فِي سَبِيلِكَ» «ئەی پەروەرندەی هێنەری بەرە بەیان، گێڕەڕی شەو بە ئارامی، ڕۆشناییدەری خۆر و مانگ، قەرزداریم لەسەر لابدە، دەوڵەمەندم بکە لە هەژاری، لەڕێی خۆتدا گوێ و چاو و هێزم بەکاربهێنە.»

* «أعوذ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ، الَّتِي لَا يُجَاوِزُهُنَّ بَرٌّ وَلَا فَاجِرٌ، مِنْ شَرِّ مَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ، وَشَرِّ مَا يَعْرُجُ فِيهَا، وَمِنْ شَرِّ مَا ذَرَأَ فِي الْأَرْضِ، وَشَرِّ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا، وَمِنْ فِتَنِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَمِنْ طَوَارِقِ اللَّيْلِ، إِلَّا طَارِقًا يَطْرُقُ بِخَيْرٍ يَا رَحْمَنُ» «پەنا بە وشە تەواوەکانی خودا دەگرم کە نە پیاوچاک و نە پیاوخراپێک چارێناکەن، لە خراپەی هەرچی لە ئاسمانەوە دابەزیوە و هەرچی پیایدا چۆتەسەرەوە، و خراپەی هەرچی لە زەویدا بڵاوبووەتەوە و خراپەی هەرچی لێی دێتەدەرەوە، و لە ئاشووبەکانی شەووڕۆژ، و لە دەرگادەرانی شەو، مەگەر لەدەرگادەرێکی خێر هەڵگر.

* خودایە نەمان دەیتە دەست نەفسی خۆمان چونکە بێتوانایین، نەشمان دەیتە دەست خەڵکی کە سەرگەردانمان بکەن.

* ئەی بەخشەری عەقڵ و گۆیاکەری زوبان، خودایە هیچ کەلێنێک بۆ هەوا و ئارەزوومان مەهێڵەوە لە عەقڵماندا، ناهەقی لەسەر زوبانی ئێمە مەکە بەڵگە، خودایە هیچ شەفاعەتکارێکم نییە گەورەتر بێت لەوەی دان بەوەدا دەنێم تەنها تۆ شایستەی پەرستنی.



# فیقهییاتێک، چەند بابەت و حوکمێك

* فیقە وەک ئاو وایە و هەڵگرانی وەک پەرداخن، پەیامبەری خودا (ﷺ) ئەو ئاوەی کردووەتە ناو پەرداخی هاوەڵانەوە، هاوەڵانیش بۆ شوێنکەوتووانیان و بەو جۆرە بەردەوام بووە، ئەو ئاوە لێڵ دەبێت و ڕێژەی لێڵیەکەی زیاد دەکات، هەرچەندە ڕێژەی کردنە ناو پەرداخەکانی زۆرتر بێت، جا تۆ بە پاک و ڕوونی لە پەرداخەکانی سەرەتای وەربگرە.

* فیقهی هاوەڵان زۆر بەرزە بەڵام زۆرینەی لە شێوەی کرداردایە نەک وتە، ئەو کردارانە شوێنکەوتووان وەریان گرتووە و کردوویانە بە وتە، بۆیە فیقهی شوێنکەوتووان گشتگیرترە، هەرکەس فێرگەکانیان بە باشی بزانێت ئەوا فیقهی باش و پاکی وەرگرتووە.

* ناکۆکیی ئوممەت لەسەر واتا بنەڕەتییەکانی قورئان، لە نیوەی سەدەی دووەمەوە سەری هەڵدا، ئەمەش بەهۆی موسڵمانبوونی خەڵکانێکی زۆرەوە کە عەرەب نەبوون و دڵسۆزییەکی زۆریان بۆ ئیسلام هەبوو، بەڵام شارەزا نەبوون بە زمانەوانی قورئان.

* ئەو هاوەڵانەی لە ئیسلامدا فیقهیان گواستووەتەوە ١٩٥ هاوەڵ بوون و ٣٢١ تابعین بوون، هیچ موسڵمانێک نییە منەت و چاکەی ئەوانی بەسەرەوە نەبێت، ئەوان لە پێشەوەی ئەو کۆمەڵەن کە لەفەرموودەی «خير الناس قرني» ئاماژەی پێ داوە.

* ئەو تابعی و شوێنکەوتووانەم ژمارد کە فیقهیان لێوە گواستراوەتەوە ژمارەیان ٣٢١ تابعی بووە، ٨٠ کەسیان لە مەدینە بوون، ١٦ لە مککە، ٦ لە

یەمەن، ٦٠ لە بەسرە، ١١٢ لە کوفە، ٣٠ لە شام و ٧ لە میسر.

* هەندێک لە تابیعین فیقهیان دەدرێتە پاڵ، بەڵام لە شارێکی دیاریکراودا جێگیر نەبوون، هاتووچۆیان کردووە، ئەوانیش بەنزیکەی دە کەس بوون و فیقهێکی کەمیان هەبووە و بەروبوومی فیقهەکەشیان زۆر کەمتر بووە.

* پاکترین فیقه پاش هاوەڵان، فیقهی مەدینەییەکانە کە ٨٠ تابیعین بوون، شوێنکەوتووانیشیان کە ٢١ کەس بوون، بەتایبەت لە فیقهی نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و بەکرێدانی بەروبووم و سنوورەکان و بەڵێننامەکان و میراتدا.

* فەقیهەکانی مەککە ژمارەیان ١٦ تابعین بووە، شوێنکەوتووە سەرەکییەکانیشیان ١٢ کەس بوون، ئەوانیش وردترین فیقهیان هەبووە لە بابەتەکانی حەج و خوێن و بەخشینەکان و بەکرێداندا.

* فەقیهەکانی بەسرە ژمارەیان ٦٠ تابعین بووە، شوێنکەوتووانیان ٣٢ کەس بوون، کوفەش ١١٢ تابعین بوون، شوێنکەوتووانیشیان ٤٧ کەس بوون، فیقهیش لە بەغدا تەنها لە شوێنکەوتوواندا دەرکەوتووە ئەوانیش ١١ کەس بوون. ئەوانیش شارەزاترن بە سزا و -تەعزیرات- سەرکۆنەکردنەکان و خوێن و حوکمی بێباوەڕانی ژێردەستەی موسڵمانان (أهل الذمة).

* هەندێک لە خەڵکی سەدە کۆتاییەکان کۆمەڵە وتەیەک دەدەنە پاڵ پێشەوا ئەحمەد، بەهۆی ئەوەی لە پەرتووکەکەی بەیهەقیدا نووسراوە «قال الإمام أحمد - پێشەوا ئەحمەد» فەرموویەتی: ئەمە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نییە، بەڵکوو ئەوە بەیهەقییە، وتەی «الإمام - پێشەوا» لەلایەن ڕاوییەکانی سونەنەکەیەوەیە بۆی داندراوە.

# نوێژ و حوکمەکانی

* ئەو کەسەی باشترین پەیوەندی لەگەڵ بەدیهێنەریدا هەیە، باشترین پەیوەندیشی لەگەڵ خەڵکیدا هەیە: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾ [العنكبوت: ٤٥]

«نوێژی بکە؛ نوێژخوێندن مرۆڤ لە کاری ناشیرین و ناڕەوا دەپارێزێت.»

* نوێژ بنچینەی پەرستشەکانە و مەی و ئارەقیش بنچینەی خراپەکانە، خودا دەربارەی نوێژ دەفەرمووێت ﴿تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾ [العنكبوت: ٤٥]

«مرۆڤ لە کاری ناشیرین و ناڕەوا دەپارێزێت.»

دەربارەی ئارەقیش دەفەرمووێت ﴿وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ [المائدة: ٩١]

«لە نوێژ و یادی خودا لاتان دەدات.»

* ئەو کەسەی خاوەنی زۆرترین نوێژە لە هەمووان باشتر جڵەوی ئارەزووەکانی دەکات، ئارەزووەکان زاڵ دەبێت کاتێک نوێژ پشتگوێ دەخرێت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلشَّهَوَٰتِ﴾ [مريم: ٥٩]

«لە دوای ئەوان کەسانێک بوونە جێگریان، بە لای نوێژدا نەدەچوون و شوێن ئارەزووی خۆیان دەکەوتن.»

* نوێژ و یادی خودا فراوانی و ئاسوودەییە بۆ دڵ، هەروەها ئارامییە لە کاتی دڵتەنگی و قسەی خەڵکی و فێڵەکانیاندا: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا

يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ [الحجر: ٩٧-٩٨] «ئێمە ئاگامان لێ هەیە کە تۆ لە گفتی ئەمانە دڵتەنگ دەبیت. سا هەر شوکری پەروەرندەی خۆت لەبیر بێت و لە ڕیزی سوژدەبەران بە.»

* باشترین کار مرۆڤ ئارام و خۆڕاگر بکات لەو کاتانەی کە لەلایەن خەڵکییەوە بێزارکراوە، ئەنجامدانی نوێژە لە کاتی خۆیدا ﴿فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ﴾ [ق: ٣٩]

«سا خۆبگرە لە بەرانبەر ئەو شتانەی ئەوان ئێژن. هەر پەسنی پاکی پەروەرندەی خۆت بدە؛ لەپێش گزینگی هەتاودا و بەر لە دەمی ڕۆژاوابوون (لەو کاتانەدا نوێژبکە.)»

* نوێژ پەروەردەت دەکات لەسەر ئارامگری، بەو دووانەش (نوێژ و ئارامگری) سەرکەوتن دەستەبەر دەبێت،

﴿وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ [البقرة: ٤٥] «داوای یارمەتی بکەن لەڕێی ئارامگرتن و نوێژەوە.»

﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ [طه: ١٣٢]

«بە کەسوکاری خۆت بێژە نوێژان بکەن؛ خۆشت وازی لێ مەهێنە و ئارامی لەسەر بگرە.»

* پارێزگاری کردن لە نوێژ و فەرمان کردن بە خانەوادە بۆ ئەنجامدانی نوێژ هۆکاری ڕۆزییە: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ [طه: ١٣٢] «ئەی موحەممەد (ﷺ) فەرمان بدە بە ئەندامانی خێزانەکەت بە نوێژکردن، خۆشت ڕاگر و بەردەوام بە لەسەر بەجێهێنانی. ئێمە داوای ڕۆزیت لێ ناکەین، بەڵکوو ئێمە ڕزق و ڕۆزی تۆ دەدەین، سەرەنجامی چاک بۆ تەقوایە.»

* کرنووش بردن بۆ خودا سەربەرزی و هێزە، بەڵام تەنانەت بەپێوە وەستانیش بۆ جگە لە خودا سەرشۆڕییە.

* کرنوش گەورەترین پایەی نوێژە، چونکە کاتێک دەپاڕێیتەوە تیایدا، کزۆڵی جەستە و ملکەچی دڵ و کزۆڵی دەنگی تێدا کۆدەبێتەوە. لە فەرموودەدا هاتووە: «نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگارییەوە کاتی کڕنووش بردنە، جا زۆر تیایدا بپاڕێنەوە.»

* کڕنووش بردن بۆ خودا، پارێزراوبوونە لە هەموو پەژارە و فێڵ و ترسێک: ﴿فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ -سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ. - كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب﴾ [العلق ١٧-١٨-١٩]

«دەبا ئەوسا هاوار بۆ یانەکەی بەرێت، ئێمەش بەرپرسی دۆزەخی لێ دەنگ دەدەین، هەرگیز پەیڕەوی لەو مەکە و سوژدە بەرە و نزیک بەوە.»

* کەسی گەشتیار دەتوانێت ڕوخسەتەکانی گەشت وەربگرێت، هەر ئەو کاتەی چووە سەر ئامێری گواستنەوەکەی ئەگەر مەبەستی بوو گەشتێک بکات کە شاری خۆی بەجێ بهێڵێت، ئەوا بە گەشتیار هەژمار دەکرێت هەرچەندە دەستی بە گەشتەکەی نەکردبێت، وەک حاجییان تەنیا بە ڕۆیشتنیان لە عورف و لای خەڵکی بە حاجی وەسف دەکرێت، هەرچەندە ئیحرامیشیان نەپۆشیبێت.

* دەرچوون لە شار و ئاوەدانی لەسەر بۆچوونی پەسەند پەیوەست نییە بە ڕوخسەتەکانی گەشتەوە؛ گەر بووایە، دروست دەبوو بۆ ئەو کەسەی لە قەراغی باکوری شاری قاهیرەیە نوێژ کورت بکاتەوە لەپاش تێپەڕاندنی چەند مەترێک، بەڵام ئەوانەی لە باشورن دەبێت ٢٠٠کم ببڕن ئەگەر هەردوولا یەک ئامانجی گەشتیان هەبێت.

* شارەکان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بەرفراوان بوون، بەجۆرێک هەردوو جەمسەری شارەکان سەدان کیلۆمەتر لێکدوورن وەک هەندێک لە پایتەختە

گەورەکان، ناکرێت بە کەسێک بگوترێ کە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەرچووە دروست نییە ڕوخسەتەکانی گەشت وەربگری تا لە ڕۆژئاوای دەرنەچێت.

* ئەو کەسەی بە دڵنیاییەوە دەیەوێت گەشت بکات و بارگەوبنەی پێچاوەتەوە و هیچ شتێکی نەماوە تەنیا ڕۆیشتن نەبێت، بۆی دروستە نوێژ کورت بکاتەوە و ڕۆژوو بشکێنێت هەرچەندە هێشتا لە شارەکەی خۆی دەرنەچووبێت ئەمەش لەسەر بۆچوونی پەسەند، بە مەرجدانانی تێپەڕبوون لە شار قورسە بەتایبەت لە ئێستادا کە شارەکان زۆر فراوان بوون.

* دروستە بۆ گەشتیار نوێژەکانی کورت بکاتەوە هەرچەندە ماوەی مانەوەکەشی درێژ بێت، تا ئەوکاتە دەتوانێت کە حاڵی وەک حاڵی نیشتەجێی لێ نەهاتبێت و بەردەوام لە چاوەڕوانی گەڕانەوەدا بێت بۆ شاری سەرەتای.

* کۆکردنەوەی نوێژ دروستە بەهۆی هەبوونی با یان خۆڵبارینی توندەوە، هەندێک با تەنگ و چەڵەمەی زیاترە لە باران، فەرموودەکان تەنها تایبەت نیین بە بارانەوە، بەڵکوو بۆ لابردنی قورسییێتی و ئاستەنگەکانن.

* هەڵکردنی با بەبێ باران نزیکترە لە سزاوە لە فەرموودەدا هاتووە: «پەیامبەری خودا (ﷺ) کاتێک هەورێکی ڕەشی لە ئاسمان بدیبا، دەهات و دەچوو، دەچووە ژوور و دەهاتە دەرەوە، ڕەنگی دەم و چاوی دەگۆڕا، کاتێک باران بباریبا ئەوکات هێور دەبوویەوە.»

* خەڵکی وازیان لە سونەتێک هێناوە، ئەویش ئەنجامدانی نوێژە لە ماڵەکانیان لە کاتی باران باریندا، بانگ بێژیش لە بری حەیەعەلەکان بڵێت: "الصلاة في الرحال» نوێژ کردن لە ماڵەوە لە کاتی باراندا باشترە لەوەی نوێژ کۆبکەیتەوە و بەکۆمەڵ نوێژ بکرێت.

* ڕوخسەتێک هەیە پێویستە زیندوو بکرێتەوە هەرچەندە خەڵکی بەرهەڵستی بکەن، ئیبن عەباس فەرمانی بە بانگبێژەکەی دەکرد لە کاتی باراندا بڵێت نوێژە کانتان لەماڵەوە بکەن، خەڵکی بەرهەڵستییان کرد، گوتی: پێتان سەیرە؟ بێگومان کەسێک ئەو کارەی ئەنجام داوە کە لە من زۆر باشترە.

* لە هەموو ژیانمدا نەم بیس‌تووە بانگبێژێک لە کاتی باراندا بڵێت: «الصلاة في الرحال» لە کاتێکدا ئەمە سونەتە، نوێژ کۆکردنەوە ڕوخسەت و ڕێگەپێدراوە، نوێژ کۆکردنەوە بەهۆی بارانەوە جێگیر نەبووە لە پەیامبەری خوداوە (ﷺ)، تەنها کرداری هاوەڵان لەو بارەیەوە هەیە، کرداری ئەوانیش بەسە بۆ درووستیێتی ئەو کارە.

* زۆرینەی پرسیاری خەڵک دەربارەی باران و حوکمی نوێژکۆکردنەوەیە یان کۆکردنەوە لە کاتی بارانێکی کەمدا، هەروەها جیاوازییان دەربارەی دووبارە کردنەوەی ئەو نوێژە، ئەگەر کاریان بە سونەتی بانگ بکردایە و بگوترایە «نوێژەکانتان لە ماڵەوە ئەنجام بدەن» ئەوا ئەو قورسیێتی و ئاستەنگانە نە دەمان.

* لە کاتی باران بارینی بەردەوام یان پەیدابوونی قوڕ و لیتەیەکی زۆر بە هۆی بارانێکی پچڕپچڕەوە، دروستە نوێژ کۆبکرێتەوە، ئەم حوکمە بۆ ئەوانەیە کە گەیشتوونەتە مزگەوت، بەڵام ئەو کەسانەی هێشتا دەرنەچوون لە ماڵەکانیان سونەت وایە نوێژەکانیان لە ماڵەوە ئەنجام بدەن.

* لە پەیامبەری خوداوە (ﷺ) بە دروستی هاتووە قنووت خوێندن لە کاتی تەنگانە و دابەزینی بەڵادا لە کۆتا ڕەکات لەپاش ڕکووع ئەنجامی دەدرێت لەهەر پێنج نوێژەکەدا، دەست بەرز دەکرێتەوە و داوا لەخودا دەکرێت و راستەوخۆ ناوی بابەتەکە دەبردرێت بەبێ پێشەکی.

* لە شەرعدا نەهاتووە پێشەکی و پاشەکی لە قنووتی دابەزینی بەڵادا هەبێت، بەڵکوو ڕاستەوخۆ بە پێویستییەکە دەست پێ دەکرێت و پاش باسکردنی پێویستییەکە کۆتایی بە قنووتەکە دەهێندرێت، هاوشێوەی ئەمە: «خودایە موسڵمانە لاوازەکانی ئەوێ و ئەوێ سەربخەیت، خودایە سزای خۆت دابەزێنە سەر فلان کەس.»

* سونەتە لە کاتی قنووت‌دا دەنگ زیاد لە پێویست بەرز نەکرێتەوە، (ابن المسیب) دەڵێت: "ئەمە لەو شتانەیە خەڵکی دایان هێناوە و بیدعەیە." عائیشە دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾ [الإسراء:١١٠] سەبارەت بە دوعا و پاڕانەوە دابەزیوە.

* دروستە لە کاتی قنووتی تەنگانەدا ناوی ستەمکاران ببەیت و نزایان لێ بکەیت وەک پیامبەری خودا ناوی کۆمەڵە هۆزێکی لە قنووتدا بردووە «رعل و ذكوان و عصية و مضر» هەروەها ناوی ئەو کەسەش دەبردرێت کە دوعای بۆ دەکرێت.

* پێویستە لە قنووتدا دوعا لە دوژمنان بکرێت، تاکوو بیروباوەڕی خۆشەویستی و ڕەقلێبوون لە دڵی موسڵماناندا بچەسپێت، تاکوو لە شەڕیان پارێزراو ببین و شوێن کرداری سەلەف بکەوین، ئەعرەج دەڵێت: هەرچەند گەیشتووم بە زانایان لە ڕەمەزاندا لەعنەتیان لە کافران کردووە.

* ئەوەی جێگیر بووە دەربارەی ماوەی درێژی ئەندازەی قنووت لە نوێژی وەتردا ئەوەیە کە هاوشێوەی ئەندازەی سوورەتی ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾ ئەمە ڕای نەخەعییە و پێشەوا ئەحمەد کەمێک زیاتری پێ باش بووە، درێژکردنەوەی زۆر پێچەوانەی کرداری سەلەفە.

* قنووتی کاتی دابەزینی بەڵا پەرستشێکە پێویست بە وەرگرتنی مۆڵەت ناکات بۆ ئەنجامدانی لە لای زۆرینەی زانایان، بەڵام پێویستە وردکاری بکرێت

لە هاتنەجێی وەسفداربوونی بەڵا، ئەمەش بە فەتوای زانایەکی شارەزا دەبێت، ناکرێت دیاریکردنی ئەو بابەتە خەڵکی عەوام بڕیاری لەسەر بدات.

* قنووتی دابەزینی بەڵا وابەستەیە بە کاتەوە وەک تەکبیراتی ناو جەژن و بانگ، هەرکات هۆکارەکەی هاتەدی، ئەوا دروستە ئەنجام بدرێت. هیچ کەس بۆی نییە ڕێگری لەو کارە بکات، بەڵکوو تەنها ڕێگری لە کەسە نەشازەکان دەکرێت وەک چۆن ڕێگری لە بانگبێژی نەزان دەکرێت.

*سەرکردە دەتوانێت ڕێگری بکات لە قنووتی دابەزینی بەڵا بەهۆی پێشهاتێکەوە وەک جیاکارییەک لە حوکمە بنەڕەتییەکەی خۆی، کەواتە بنەڕەتی کارەکە دروستە و ڕێگریکردن لێی جیاکارییە، بەڵام دانانی ڕێگری بە حوکمی بنەڕەتی و دروستبوون بە جیاکاری ئەوەیان کارێکی نامۆیە.

* قنووتی دابەزینی بەڵا سونەتە لە کاتی خۆیدا، دەتواندرێت مۆڵەت لە سەرکردە بخوازرێت ئەگەر ئەو سەرکردەیە چاودێری قازانجی دیین و دونیایی ژێردەستەکانی دەکرد، نەک تەنها بڕوانێتە لایەنی دونیاییان.

* هەینی گەورەترین ڕۆژی هەفتەیە، سوورەتێکی تایبەت دەربارەی ئەو ڕۆژە دابەزیوە، لە ئیسلامدا بە (الجمعة) ناوبراوە بەڵام عەرەب بە (عروبة) ناویان بردووە، خۆشۆردن و یادی خودا و پاڕانەوە و زوو ڕۆیشتن بۆ ئەو نوێژە شەرع بەپێویستی داناوە.

* خۆشۆردن بۆ ڕۆژی هەینی بە باشترین خۆشۆردن هەژمار دەکرێت، بە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە دەست پێ دەکات، ئەم خۆشۆردنە لە مافی ئەو کەسانەی کە بەژداری نوێژی هەینی دەبن زیاترجەخت کراوەیە، بەڵام بۆ ئافرەت و گەشتیار بەو جۆرە نییە، لە فەرموودەدا هاتووە إذا جاء أحدكم إلى الجمعة فليغتسل «ئەگەر کەسێکتان هاتە نوێژی هەینی، با خۆی بشوات.»

* باشترین کردووەکانی ڕۆژی هەینی: سەڵاواتدانە لەسەر پەیامبەری خودا (ﷺ) چونکە ڕۆژی هەینی گەورەترین ڕۆژە و پەیامبەری خوداش (ﷺ) گەورەترین مرۆڤە.

* مینبەرەکانی مزگەوت تەنها بۆ ئامۆژگاری نین، بەڵکوو دەبێت بۆ بەرچاوڕوونی ڕووداو و پێشهاتەکانی ئوممەتیش بەکاربهێندرێت، لە بوخاریدا هاتووە: پەیامبەری خودا (ﷺ) لەسەر مینبەرەکەی باسی ئەو هۆزانەی دەکرد کە پاڵپشتی بوون و ئەوانەشی کە دوژمنی بوون: لە هۆزەکانی أسلم و غفار و عصیة.

* ئەو فەرموودە و ئەسەرانەی دەربارەی پیرۆزباییکردنی جەژن هاتوون باس لە پیرۆزبایکردنی ناو ڕۆژی جەژن دەکەن، بەڵام هیچ ڕێگرییەک بەدی ناکرێت ئەگەر لە وەوپێش پیرۆزبایی بکرێت، ئەگەر کەسێک ویستی پیرۆزبایی کردن کەمێک پێش بخات ئەوا با شەوی جەژن بیکات، بەڵام ئەنجامدانی لە بەیانی جەژندا باشترە.

* پیرۆزباییکردنی جەژن بە هەموو وتەیەکی واتادار و جوان دێتە جێ، هیچ فەرموودەیەکی دیاریکراو دەربارەی وشەی پیرۆزبای کردن نەهاتووە، دروسترین شت لەو بارەوە هاتبێت تەنها پیرۆزباییکردنی هاوەڵانە لە یەکتری بە وتەی: (تقبل الله منا و منک)، پێشەوا ئەحمەد ڕشتەی گێڕانەوەکەی بە پەسەند داناوە.

* وادەرناکەوێت هاوەڵان و شوێنکەوتووان بەردەوام بووبن لەسەر یەپیرۆزباییکردنی چەژن بە وتەی (تقبل الله منا و منک)، بۆیە پێشەوا مالیک دەڵێت: "نە دەزانم هەبووبێت و نە ڕێگری لێ دەکەم." پێشەوا مالیکیش شارەزاترین کەسە بەحاڵی هاوەڵان.

* جەژنی ڕەمەزان: هەرکات ڕەمەزان تەواو بوو سونەتە (الله أکبر) بکرێت، واتە بە خۆرئاوابوونی شەوی جەژن دەست پێ دەکات و بە نوێژی جەژن کۆتای

دەبێت ﴿وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ﴾ [البقرة: ١٨٥] «ڕۆژەکانی بەڕۆژوو ببن و یادی خودا بکەنەوە کە ئەو ڕێگەی نیشان داون.»

* تەکبیر کردن باشترین کارە بۆ کۆتاپێهێنانی ڕەمەزان و شەوی جەژن، ئیبن عەباس دەڵێت: هەق و مافە لەسەر موسڵمانان کاتێک مانگی شەوالیان دیت (الله أكبر) بکەن تاکوو لە جەژن تەواو دەبن.

* ئەنجامدانی ئەم کارانە سونەتە لە جەژنی ڕەمەزاندا: خۆشۆردن، پۆشینی جوانترین پۆشاک، بۆن لەخۆدان، خواردنی چەند خورمایەکی ژمارە تاک پێش ئەنجامدانی نوێژ، ڕۆیشتن بە پێ، بەژداری پێکردنی خانەوادە لە نوێژی جەژن و گەڕانەوە لە ڕێگەیەکی دیکەوە.

* تەکبیری دیاریکراو لە جەژنی قورباندا لە پاش نوێژی بەیانی ڕۆژی عەرەفەوە دەست پێ دەکات و کۆتایی دێت بە خۆرئاوابوونی کۆتا ڕۆژی جەژنی قوربان -کۆتا ڕۆژی أيام التشريق-.

* ئەنجامدانی دووڕکات لە پێش نوێژی جەژن و پاش نوێژی جەژن دروست نییە بەس تەنها نوێژی هاتنە مزگەوت نەبێت، لە (سەحیحین)دا هاتووە: پەیامبەری خود (ﷺ) هیچ نوێژێکی لەپاش نوێژی جەژن نەدەکرد، ئەو فەرموودانەی لەو بارەیەوە هاتوون لە پەیامبەر و هاوەڵانەوە سەحیح نیین.

* هەرکەس ئامادەی نوێژی جەژن بوو، نوێژی جومعەی لەسەر لادەچێت، تەنها نوێژی نیوەڕۆ دەکات، بەڵام پێشنوێژ و وتاربێژ، دەبێت جومعە بۆ ئامادەبووان بکەن، ئەم بابەتە بە دروستی لە پەیامبەری خوداوە هاتووە هەروەها لە پێشەوا عومەر و عوسمان و زۆرێک لە هاوەڵانەوە هاتووە.

* خۆرگیران و مانگگیران ئاگەداری و هۆشدارییەکە لە خوداوە بۆ بەندەکانی، ئەو خودایەی توانای لابردنی ڕۆشناییانی هەبووبێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ئەوا

بەتوانایە لەسەر لابردن و گیرانی هەتاهەتاییان، ئەو پەروەردگارەی بەتوانایە لەسەر گۆڕینی حاڵی هەسارەکان، بەتواناشە لەسەر گۆڕینی حاڵی ئەوانەی لەسەری دەژیین.

* نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران سونەتێکی جەختکراوەترن بەراورد بە شەونوێژ، شافعی دەفەرمووێت: "وازهێنان لەو نوێژە دروست نییە، پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت فإذا رأيتم ذالك - أي الكسوف- فادعوا الله وكبروا وتصدقوا وصلوا «کاتێک ئەوەتان دیت -واتە خۆرگیران و مانگ گیران - لە خودا بپاڕێنەوە و (الله أكبر) بکەن و خێربکەن و نوێژ ئەنجام بدەن.»

* نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران، دوو ڕەکاتن لە هەر ڕەکاتێکیاندا دوو چەمینەوە و دوو کڕنووشیان تیادایە، پێش هەر چەمینەوەیەک سوورەتی (الفاتحة) و قورئانێکی زۆر دەخوێندرێت، بەبێ ئەوەی بانگ بدرێت، بەڵکوو دەگوترێت «الصلاة جامعة» پیاوان و ئافرەتان بەکۆمەڵ ئەو نوێژە دەکەن.

* ئەگەر خۆرگیران و مانگگیران بەچاو نەدەبیندران، ئەوا نوێژیان بۆ ئەنجام نادرێت، چونکە دیتنی چاو هەژمار دەکرێت، نەوەک زانستی گەردووناسی. ئەگەر بە زانستی گەردووناسی هەژمار بکرایە، ئەوا بۆ هەموو خۆرگیران و مانگ گیرانێک دەبوو نوێژ ئەنجام بدرایە، هەرچەندە لە وڵاتانێکی دیکەش ڕووی بدایە.

# زەکات و خێرکردن و سامانی گشتی

* زەکات واجب نابێت تەنها بە تێپەڕ بوونی ساڵێک نەبێت، سوننەتە ئەو زەکاتە پێش بخرێت بۆ ئەو کات و ساتانەی گەورە و ڕێزدارن وەک ڕەمەزان و شەعبان و مانگە قەدەغەکراوەکان، هەروەها لە کاتی پێویستی موسڵمانان وەک هاتنی جیهاد و هەژاری.

* ئاڵتوونی ئافرەت -خشڵی بەکارهێندراو- زەکاتی تێدا واجب نییە هەرچەندە زۆریش بێت، بەڵام بە مەرجێک بەکاری بهێنێت ئەگەر هەرچەندە بە تەنیا لە بۆنەکانیشدا بێت، لەسەر بۆچوونی دروست، ئەمەش وتەی زۆرینەی هاوەڵان و زۆرینەی زانایانە.

* دروستە زەکات بدرێتە کەسانی کەمدەرامەت کە ویستی ئەنجامدانی حەجی فەرزیان هەیە تا حەجی پێ ئەنجام بدەن، ئەمەش وتەی ئیبن عەباسە، بەڵام زەکاتدان بەو کەسانەی لەپێناوی خودادا جیهاد دەکەن باشترە لەوەی بدرێتە ئەو کەسانەی حەجی پێ ئەنجام دەدەن.

* لای زۆرینەی زانایان زەکاتی سەرفترە واجبە لەسەر گەورە و گچکە، سەرپەرشتی خانەوادە دەتوانێت لەبری هەموو تاکەکانی خانەوادەکەی تەنانەت خێزانیشی ئەو زەکاتە بدات، ئەم زەکاتە سوننەتە بۆ کۆرپەلەی ناوسکی ئافرەتی دووگیانیش بدرێت.

* واباشترە هەموو تاکەکانی خانەوادە زەکاتی سەرفترە بۆ خۆیان بدەن ئەگەر خاوەن سامانێکی سەربەخۆ بوون، وەک ئەو کوڕانەی فەرمانبەرن، خۆ ئەگەر گەورەیی خانەوادەکە زەکاتەکە لەبری هەموویان بدات ئەوا لە بری

هەموویان دەکەوێت، هەندێک لە سەلەف بەسوونەتیان داناوە کە زەکاتی سەرفترە بۆ خزمەتکاریش بدرێت.

* باشترین کات بۆ زەکاتی سەرفترە لەنێوان نوێژی بەیانی و نوێژی جەژندایە.

* زەکاتی سەرفترە دروستە پێشبخرێت بۆ ڕۆژێک یان دووڕۆژی پێش جەژن، هاوەڵان ئەوکارەیەن ئەنجام داوە، ئیبن عومەر پێش سێ ڕۆژ زەکاتی سەرفترەکەی دەنارد.

* دواخستنی زەکاتی سەرفترە بۆ پاش نوێژی جەژن باتڵ و وەرنەگیراوە وەک دواخستنی نوێژی بەیانییە بۆ پاش خۆرهەڵاتن کە ئەمەش پووچەڵە تەنها لە کاتی عوزرێکی وەک بیرچوونەوە نەبێت. زەکاتی سەرفترە لە خواردنی گشتی وڵات دەدرێت، وەک برنج و ئارد بەپێی شار و وڵاتی خۆیان، نابێت خواردنێک بە زەکاتی سەرفترە بدرێت کە لە شاری خۆیاندا خواردنی سەرەکی نییە و لە شارێکی دیکە خواردنی سەرەکییە.

* خواردنی زەکاتی سەرفترە بەپێی گۆڕانی کات و شوێن دەگۆڕێت، لەمڕۆدا لە خورما و جۆ دروست نییە هەرچەندە لە فەرموودەکاندا باس کراوە، چونکە جۆ لەمڕۆدا خواردنی سەرەکی نییە و خورماش وەک میوە بەکاردێت نەک خواردنی سەرەکی ژەم.

* ئەندازەی صاعێک خواردن پێویستە لە زەکاتی سەرفترەدا بدرێت، ئەو کەسەی زەکاتەکە دەدات دەتوانێت دوو جۆر خواردن بدات، بە مەرجێک بەهەردووکیان بگاتە ئەندازەی صاعێک و هەژارەکان بتوانن بە تەنها و بەیەکەوە سوودی لێ ببینن.

* بە هاودەنگی زانایان سوننەتە زەکاتی سەرفترە بە خواردن بدرێت نەک بە پارە، زانایان ناکۆکییان هەیە دەربارەی دروستبوون و لە بریکەوتنی

سەرفترەکە ئەگەر بە پارە بدرێت، هەندێک لە سەلەف ڕێگەیان داوە بە پارە زەکاتی سەرفترە بدرێت، بەڵام وەک خۆپاراستن بە خواردن بدرێت باشترە.

* لە پەیامبەری خودا (ﷺ) و هاوەڵانەوە نەهاتووە زەکاتی سەرفترەیان بە پارە دابێت، بەڵکوو هەندێک لە شوێنکەوتووانەوە بە دروستیان داناوە بە پارە بدرێت ئەویش بۆ پێویستی و قازانجی هەژاران وەک ناردنی بۆ شارێکی دیکە کە ڕێژەی هەژاری زۆرتری تیادابێت.

* باشترە زەکاتی سەرفترە بدرێتە هەژارانی ئەو شارەی زەکاتدەرەکەی تێدا نیشتەجێیە، خۆ ئەگەر شارێکی دیکە هەبوو و زیاتر پێویستیان بوو، ئەوا دروستە بۆیان بگوازرێتەوە، ئەگەر نەدەتواندرا خواردنەکان بگوازرێتەوە دروستە پارەیان بۆ ڕەوانە بکرێت کاتێک سوودێکی ڕوون وئاشکرا لەو بابەتەدا بەدی دەکرا.

* زەکاتی سەرفترە بۆ خزمەتکار و کارگوزار دوو حاڵەت لەخۆدەگرێت:

یەکەم: ئەگەر لە بەڵێننامەکەیاندا خواردن پێدان بە مەرج گیرابوو، ئەوا دروست نییە زەکاتی سەرفترەیان پێ بدرێت.

دووەم: ئەگەر لە بەڵێننامەکەیاندا خواردن لەسەر خۆیان بوو، دروستە زەکاتی سەرفترەیان پێ بدرێت.

* بەخشین باشترین و پاکترین کردەوەیە، بڕوادار کاتێک مرد خۆزگە دەخوازێت بگەڕێتەوە دونیا تاکوو ببەخشێت: ﴿رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ [المنافقون: ١٠]

«ئەی پەروەرندەی من! بۆچی تا ماوەیێکی نزیک مەودات نەدام، کە ئەوسا خێر بکەم و لە ڕیزی کار چاکەکان بم؟»

* ئەو کەسانەی زۆرترین بەخشینیان هەیە، زۆرترین بەرەکەت لە ماڵ و سامانیاندا هەیە، لە فەرموودەدا هاتووە کە پەیامبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی ما نقصت صدقة من مال «هەرگیز بەخشین لە ماڵ وسامان کەم ناکات» لە فەرموودەی قودسیدا هاتووە: «ئەی نەوەی ئادەم ببەخشە، پێت دەبەخشم.»

* بەخشینی ماڵ و سامان بەوپەڕ پێخۆشبوونەوە نیشانەی ئیمانە، هەروەها بەخشین بە نابەدڵی نیشانەی دووڕووییە، خودا دەربارەی دووڕووەکان دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَـٰرِهُونَ﴾ [التوبة: ٥٤] «ئەو ماڵەش کەوا دەیبەخشن، زۆر بە نابەدڵی دەیدەن.»

*ستەمی ستەمکار بە بەخشین لادەچێت، بە سەحیحی لە نخعیەوە هاتووە دەڵێت: «هاوەڵان وایان دەبینی کەسی ستەملێکراو ئەگەر لەپێناو خودا ماڵ و سامانێک ببەخشێت ئەوا ستەمەکەی لەسەر لادەچێت.» ئەم کارەش زۆرێک لە خەڵکی لێی بێئاگان، قورئانیش ئاماژەی پێ داوە.

*بەخشین یارمەتی ستەملێکراو دەدات لە بەرانبەر ستەمکاردا، هۆکارە بۆ لادانی خراپەی ستەمکار بەسەریەوە هەروەها شوێنەواری ستەمەکەی لەسەر کەم دەکاتەوە: ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ [البقرة: ٢٧٠] هەرماڵێکی دەیکەنە خێر، یان دەقەبەڵ خودای دەکەن، خوا دەیزانێت و ئەوانەی ستەمکارن هیچ یاریدەدەریان نییە.

* پەیامبەری خودا (ﷺ) کاتێک کۆمەڵێکی ڕەشوڕووت و کەمدەرامەتی دەدی دەموچاوی سوور هەڵدەگەڕا و هانی خەڵکی دەدا لەسەر بەخشین. بە سەحیحی هاتووە کۆمەڵێک هاتنە لای پەیامبەر پێپەتی و ڕووت و ڕەجاڵ بوون، کاتێک پەیامبەر ئەمەی دی، ڕەنگی گۆڕا و چووە ژوور و هاتەوە دەر، پاشان سەرکەوتە سەر مینبرەکەی و هانی خەڵکی دا لەسەر بەخشین.

* خودا دەفەرموویت: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾ [البقرة: ١٩٥] "تا دەتوانن ماڵی خۆتان لە ڕاهی خودا ببەخشن؛ خۆشتان بە فەتەڕات مەدەن بە دەستی خۆ.»

یەکێک لە هۆکارە خوداییەکان بۆ لەناوبردن و سزای کۆمەڵانی خەڵکی، نەبەخشینی ماڵ و سامانە لە کاتی پێویستیدا.

* خودا نیعمەتەکانی هەڵناگرێت لەسەر کەسی سوپاسگوزار، گەورەترین سپاسگوزاریش بریتییە لە بەخشین، هەروەها یەکێک لە باشترین کردەوەکان خواردن دانە لەکاتی برسییێتی و قاتوقڕیدا، ﴿أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ﴾ [البلد: ١٤] «یا نان دانە، لە ڕۆژی قاتوقڕیدا. واتە: برسێتیەکی زۆر.»

* ئەو کاتەی مرۆڤ سامانێک دەبەخشێت و بەشوێن کەسی شایستەدا دەگەڕێت، بەڵام دەکەوێتە دەست کەسێک کە شایستە نییە، ئەوا پاداشتی تەواوی بەخشینەکەی بۆ هەژمار دەکرێت، لە سەحیحدا هاتووە: پیاوێک نەزری کرد و بە بەخشینێکەوە دەرچوو، پاشان بەخشینەکەی کەوتە دەستی دەوڵەمەند و دز و ئافرەتێکی زیناکارەوە.

* شوانێک لە سەردەمی پەیامبەردا کۆمەڵە وشترێکی زەکاتی دزی، کۆمەڵانێکیش هەبوون لە دەستکەوتی جیهادیان دەدزی و دووڕووەکانیش بە نهێنی یارمەتی جوولەکەکانیان دەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا زەکات نەوەستێندرا، چونکە وەستاندنی زەکات بەڵایەکی گشتییە.

* دووڕووەکان ئابڵووقەی سامانییان وەک ڕێگەیەک بەکاردەهێنا بۆ دروستکردنی ناکۆکی لەناو هەقدا: ﴿يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَفۡقَهُونَ﴾ [المنافقون: ٧] «دەڵێن: دارایی مەبەخشن بەوانەی لەگەڵ پێغەمبەردان تاکوو بڵاوەی لێ بکەن، لەکاتێکدا هەرچی گەنجینەکانی ئاسمانەکان و زەوی هەیە، هەمووی هی خوایە، بەڵام دووڕووەکان نازانن.»

* ماڵ و سامان بۆیە بە «مال» ناوبراوە، «إما مال عنک أو ملت عنه» چونکە یان تۆ لە ئەو لادەدەیت یان ئەو لە تۆ لادەدات «هەر دەبێت یەکیان واز لەوی دیکەیان بهێنێت.»

* ئایین و سامان موڵکی خودایە، هیچ کەس نابێت دەستوەردانی تێدا بکات، خودا دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ [الأنعام: ٦٨]

«هەرگا ئەوانە دەبینیت دەربارەی نیشانە و ئایەتەکانمان خراپ دەدوێن، تۆ ڕوویان لێ وەربگێڕە.»

لە فەرموودەشدا هاتووە إن رجالا يتخوضون في مال الله بغير حق فلهم النار «کەسانێک بە ناهەق دەست وەردەدەنە سامانی خوداوە، ئەوانە سەرئەنجامیان دۆزەخە.»

* ئایین لە ئاسمانەوە دابەزێندراوە و ماڵ و سامانیش لە زەویەوە دەرهێندراوە، سامان بۆ ئایین وەک گۆزەیە بۆ ئاو، ئەو گۆزەیە دەوری ئاوەکە دەدات و دەیپارێزێت و بەسەر تینواندا دەیگێڕێت.

* خۆ ئەگەر خەڵکی هێندەی سەرقاڵبوونی دڵ و جەستەیان بە دونیاوە، دڵ وجەستەیان بە خوداوە سەرقاڵ ببوایە، ئەوا هەموویان دەبوونە دۆست و خواپەرستی تەواو. لەفەرموودەدا هاتووە: تعس عبد الدينار«تیاچێت بەندەی دینار.»

* کڕین و فرۆشتن حەڵاڵە و بنەڕەت تیایدا حەڵاڵییەتییە، پەیامبەری خودا شتی کڕیوە، بەڵام فەرموودەیەک نازانم ئەوە جێگیر بکات کە پەیامبەری خودا شتێکی فرۆشتبێت لەپاش پەیامبەر بوونییەوە. ئەمەش چەندین حیکمەتی زۆر لەخۆدەگرێت.

* ماڵی میراتی حەرام:

١-ئەگەر ماڵەکە داگیرکراو بوو و خاوەنەکەشی ناسراو بوو وەک ئەوەی ماڵەکە لە کەسێک دزرابێت یان لە ماڵی گشتی، ئەوا ئەم جۆرە ماڵە بەمیرات نابرێت و سوودی لێ وەرناگیرێت.

٢ ماڵی حەرام کە بە ڕەزامەندی پەیداکرابێت، وەک ڕیبا، ئەوا بەمیرات دەگیرێت.

* لەناوبردن و بەفیرۆدانی سامان باشترە لەوەی ستەمکاران سوودی لێ ببینن، ﴿أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾ [الكهف: ٧٩] «ئەو کەشتییەی (عەیبدارم کرد، چەند هەژارێک خاوەنی بوون لە دەریادا کاریان دەکرد، جا منیش ویستم عەیبداری بکەم، لە کاتێکدا لەو ناوەداپاشایەک هەبوو کە هەموو کەشتییەکی (چاک و ڕێکوپێکی) داگیر دەکرد.»

* ﴿وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ﴾ [آل عمران: ٤٩] «هەواڵی ئەو شتانەی کە دەیخۆن و هەڵی دەگرن لە ماڵەکانتاندا پێتان ڕادەگەیەنم.»

ئەگەر دەرخستنی ئەو شتانەی خەڵکی هەڵیدەگرن حەرام بووبا، ئەوا دروست نەدەبوو بۆ عیسا ئەو کارە بکات، ئەمەش چارەسەرە بۆ لادان و دەرخستنی گەندەڵی لە سامانی گشتیدا، چونکە ماڵی حەڵاڵ نابێتە جێی شەرمەزاری بۆ خاوەنەکەی.

* ئەو کەسەی کارێک یان فەرمانبەرییەک دەکات، دروست نییە کارەکەی بکاتە هۆکاری وەرگرتنی پارەی زیادە، لە فەرموودەدا هاتووە: «من استعملناه على عمل فرزقناه فما أخذ بعد ذلك فهو غلول» «هەرکەسمان ڕاسپارد بۆ ئەنجامدانی کارێک، بڕێکمان ڕۆزی بۆ دیاریی کرد، ئەوەی لەو بڕە زیاتر وەربگرێت، ئەوا دزی کردووە لە دەسکەوتی گشتی.»

* ئەو سامانەی بەهۆی پۆستێکەوە بەدەست هاتووە پێویستە بگێڕدرێتەوە بۆ داهاتی گشتی، لە پێشەوا ئەبووبەکرەوە بە سەحیحی هاتووە: "سەیر بکەن بزانن لەو کاتەی بوومەتە کاربەدەستی بڕواداران چەند لە سامانەکەم زیادی کردووە، بینێرن بۆ کاربەدەست و خەلیفەی پاش خۆم."

* حەرامە سەرکردە زیاتر لە خەرجی و شوێنی نیشتەجێبوون و خزمەتکار و سواری پێ بدرێت، لە فەرموودەدا هاتووە: من اتخذ غير ذلك فهو غال أو سارق «هەرکەس لەو ئەندازەیە زیاتر وەربگرێت، ئەوا سامانی گشتیی خواردووە یان دزیوە.» سامانی دزی کڕین و فرۆشتنی پێوە ناکرێت و بەمیراتیش ناگیرێت. بە سەحیحی لە فەرموودەدا هاتووە: من كان لنا عاملا فليكتسب زوجة وإن لم يكن له خادم فليكتسب خادما ومن لم يكن له مسكن فليكتسب مسكنا ومن اتخذ غير ذلك فهو غال أو سارق «هەرکەس دەبێتە کاربەدەستی ئێمە و ژنی نییە، ئەوا با ژن بهێنێت؛ ئەگەر خزمەتکاری نەبوو، با خزمەتکار بگرێت؛ ئەگەر خانووی نەبوو، با خانوو بکڕێت؛ ئەوەی لەو ئەندازە زیاتر ببات، ئەوا بردنی دەسکەوتی گشتییە یان دزییە.»

* هەرکەس کارێکی گرتە دەست، ئەوا بۆی نییە لە ئەندازەی پێویستی بۆ ماڵ و خزمەتکار و خێزان و سواری زیاتر وەربگرێت. جگە لە ئەمانە، بە بردنی دەسکەوتی گشتیی هەژمار دەکرێت، چونکە لە فەرموودەدا هاتووە: «من كان لنا عاملا فليكتسب زوجة و خادما ومسكنا، وغير ذلک غلول.»

* ئەو کەسەی ماڵێکی پێ دەدرێت تا دڵی ڕاگیر بکرێت، ئەوا ئەوەندەی دەدرێتێ تاکوو لە خراپە و ئاشووبی پارێزراو ببیت، یان بە هۆیەوە زیاتر بەرەو چاکە دەچوو، ئەوا بۆ هاتنەدی ئەم مەبەستە ئەگەر ماڵ و سامانەکە زۆریش بێت دەیدرێتێ، بەڵام کاتێک کاربەدەست بۆ قازانجی خودی خۆی بەکاری دەهێنا، ئەگەر زیاتر لە ئەندازەی پێویستی خۆی برد، ئەوا حەرامە.

* ئەو کەسەی بێکارە و هیچ کارێکی دەست ناکەوێت تا بیکات، ئەوا لە ئیسلامدا مافی هاوکاریکردنی بۆ داندراوە لە سامانی گشتیدا ﴿... فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ﴾ [المعارج: ٢٤]

واتە: «ئەوانەی لە کار بێبەشن.»

ئەمەش مافێکی پێویست و بەردەوامە ﴿حَقّٞ مَّعۡلُومٞ- لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ﴾ [المعارج: ٢٤- ٢٥]

* بێکاران مافیان لە سامانی گشتیدا هەیە و پێویستە بەشێکیان پێ بدرێت ﴿... فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ- لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ﴾ [المعارج: ٢٤-٢٥]عائیشە دەفەرمووێت: (المحروم): ئەو کەسەیە کە خەریکە بژێویەکی بۆ ژیان دەست نەکەوێت، (معلوم): دیاریکراوی وەک مووچە.

* ئەو کەسەی نەدارە دەتوانێت داوای پێویستییەکانی لە سامان و کەلوپەل لەو کەسانە بکات کە مافی بەسەریانەوە هەیە، هەرچەندە کەسەکە پێگەشی بەرز بێت. پیاوێک بە پەیامبەری خودای گوت: "ئەی موحەممەد! بەشێکم پێ بدە، خۆ لە ماڵی خۆت و بابت پێم نادەیت.»

*ماڵ و سامان دڵی هاونیشتیمانیان بە لای سەرکردەدا هۆگر ناکات، بەڵکوو بێهۆش و ئارامیان دەکاتەوە، کاتێک بێ پارە بوون دەڕژێنە سەر جادە و ئاشووب هەڵدەگیرسێنن ﴿لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡ﴾ [الأنفال: ٦٣]

«ئەگەر هەرچی لەم سەرزەمینەدا هەیە، هەمووت بەخت بکردایە، نەت دەتوانی وا لێکیان کۆ بکەیتەوە؛ بەڵام خودا کۆی کردوونەوە و هۆگری کردوون.»

* ماڵ و سامان دڵی هاونیشتیمانیان بە لای سەرکردەدا کۆناکاتەوە، بەڵکوو ئارامیان دەکاتەوە، جا هەرکات برسی بوون، ئەوکات دەڕژێنە سەر

جادە و دەیانەوێت سەرکردە لاببەن. خۆ ئەگەر ئیسلام کۆیان بکاتەوە، ئەوا دابڕان لەنێوانیاندا ڕوونادات تەنها بە کوفر نەبێت، هەژاری و برسییەتی هیچ کاریگەرییەک ناخاتە سەر ئەو کۆبوونەوەیەیان.

* کۆکردنەوەی خەڵکی لەسەر جگە لە بیروباوەڕ، وەک پێدانی پارە و سامان، کۆکردنەوە و هۆگرییەکی کاتییە، لە کاتی هەر پێشهاتێکدا ئەو هۆگرییە بوونی نامێنێت، خودا دەفەرمووێت: ﴿لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾ [الأنفال: ٦٣]

*دڵی خەڵکی بە سامان ڕادەکێشرێت، بەڵام جێگیر و هۆگر نابێت تەنها بە کۆکردنەوەیان نەبێت لەسەر یەک بیروباوەڕ ﴿لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ﴾

* زۆرێک لە سەرکردەکان بەهەڵەداچوون بەوەی سامانیان کردووەتە سەرچاوەی جێگیرکردنی خەڵکی لە دەوریان، بەڵام سامان تەنها هۆکارێکە بۆ کرانەوە و نزیکبوونەوەی دڵ بۆ ئەو بیروباوەڕی کەسی بەخشەر پیادەی دەکات، بۆیە سامان بە «مال» ناوبراوە چونکە دڵ بەرەو بەخشەرەکەی دەبات «لمیل القلوب الی معطیه».

* بیروباوەڕ ئەگەر ڕەگی داکوتا و لە دڵدا چەسپا، خەڵکی کۆدەکاتەوە و جێگیریان دەکات هەرچەندە لەسەر هەژاریش بێت، بەڵام جێگیرکردنی خەڵکی بە ماڵ و سامان پەیوەستە بە دابەشکردنیەوە. پێدانی ماڵ و سامان دەبێتە هۆی خراپە و داواکردنی زیاتر بەخشێنی ١٠پێیان، وایان لێ دەکات داوای ٢٠ بکەن.

* هەموو ئەو دەوڵەتانەی خەڵکییان لە دەوری خۆیان بە سامان جێگیر کردووە، کاتێک بەرزی و نزمی، یان هەژارییەکیان بەسەردا هاتووە، هەرەسیان هێناوە. هەر بەو جۆرەیە هەموو ئەو دەوڵەتە مادەگەریانەی ئەمڕۆ بۆ بەردەوامبوون و مانەوەیان لەوانی دیکە وەردەگرن و دەدزن.

# فیقهی ڕۆژوو و حوکمەکانی ڕەمەزان

* مانگی ڕەمەزان مانگێکی گەورەیە، دەرگاکانی ڕەحمەت لەو مانگەدا هەمووی والاّیە، پێویست بە لەدەرگادان ناکات تاکوو دەرگات بۆ والا بکرێت، بەڵکوو تەنها پێویستی بە هەڵنانی چەند هەنگاوێکی کەمە بۆ چوونە ژوورەوە، نەک چاوەڕوانی ئەوە بیت کەسێک هەڵتبگرێت و بتباتە ژوورەوە.

* ڕەمەزان مانگی سەرکەوتن و سەربەرزی و پتەوبوونە، زۆرینەی ئەو غەزایانەی لە ڕەمەزاندا کراوە سەرکەوتن بوون بۆ موسڵمانان، تیایدا: مەککە، قودس، هیند، سند، ئەندەلوس و قوستەنتینییە ... فەتح کراون.

* خودا بابەتی ڕۆژووی ئەم ئوممەتەی ئاسان کردووە و تەنها وابەستەی کردووە بە دیتنی مانگەوە، بەڵام هەندێک هەر پشت هەڵدەکەن و ڕێڕەوی نەوەکانی ئیسرائیل دەگرنەبەر کاتێک فەرمانیان پێ کرا مانگایەک سەرببڕن، ئەوان بەدوای ڕەنگ و تەمەن و سیفەتەکانیدا دەگەڕان.

* چاوەکان وێنەی خۆر و مانگ دەبینن لە بەرگەهەوادا، نەک خودی خۆر و مانگە بنەڕەتییەکە، لەنێوان خودی خۆر و مانگ و وێنەدانەوەکانیاندا چەند خولەکێک هەیە، ئەو کەسانەی دەڵێن زانستی فەلەکی دیاری کەری مانگە با لەسەر بنەڕەتی دیتنی خۆر و مانگەکە بڕۆن نەک وێنەدانەوەکەیان.

* ئەژماری فەلەکی ئێستا کەموکورتی تیادایە، چونکە ئەوە هەژمار دەکات کە چاو دەیبینێت لە بەرگە هەوادا، ئەگەر لەسەر خۆر و مانگی بنەڕەتی کاتەکان هەژمار بکرێت، ئەوا کاتی نوێژەکان هەمووی دەشێوێت، لە هەژمارکردنی بینینی ئاسایی ڕادەکەن کەچی لەسەریشی ئەژماردەکەن!

* دیاریکردنی مانگی ڕەمەزان بە دیتنی مانگ یان تەواوکردنی سی ڕۆژی مانگی شەعبان دەبێت، ئەو وڵاتەی مانگی تێدا نابیندرێت لەگەڵ وڵاتێکی نزیکی بەڕۆژوو دەبێت کە مانگ تیایدا دەردەکەوێت. ئەگەر وڵاتی نزیکیش نەبوو، ئەوا کار بە ڕۆژمێر بکات.

* هەرچوار پێشەواکە هاوڕان لەسەر ئەوەی کە کارکردن بە بینینی مانگ لە شەودا بێت یان لە ڕۆژدا وەرگیراوە، ئەگەر هەرکات ببیندرێت لە پاش نیوەڕۆوە، ئەوا بەیانی ئەو ڕۆژە مانگی تازەیە، کرداری هاوەڵان بەم جۆرە بووە.

* هەندێک لە فەلەکییەکان وا گومان دەبەن هەرکات مانگ پێش خۆر ئاوا ببێت، ئەوا خەڵکی بە هیچ جۆرێک مانگ نابینن، ئەمەش هەڵەیە، دیتنی مانگ لە ڕۆژدا هەژمارکراوە و هاوشێوەی دیتنیەتی لە شەودا، لای زۆرینەی فەقیهەکانیش بەو جۆرەیە.

* پیرۆزبایکردن بە هۆی نزیک بوونەوە و هاتنی ڕەمەزان دروستە، بەڵکوو کارێکی چاکە، بەهۆی گشتگیربوونی پیرۆزباییکردن بە کردەوە چاکەکانەوە، وەک وەرگیرانی تەوبەکەی کەعبی کوڕی مالیک، بەڵام هیچ فەرموودەیەکی تایبەت نەهاتووە لەسەر دروستییەتی پیرۆزباییکردنی هاتنی ڕەمەزان.

* ڕۆژوو حەرامە بۆ کەسێک کە گومانی زاڵی وابێت زیان بە ژیانی دەگات ئەگەر بەڕۆژوو بێت. ئەبوو هورەیرە ئەو جۆرە کەسەی بە خۆکوژ ناوی بردووە، لە ئەبوو هورەیرەوە هاتووە گوتوویەتی: «لو مات ما صليت عليه» ئەگەر بمرێت، نوێژی لەسەر ناکەم، ڕشتەی گێڕانەوەکەی سەحیحە.

* بە کۆدەنگی زانایان دووگیان و شیردەر دروستە بەڕۆژوو نەبن کاتێک ترسیان لە خودی خۆیان یان لە منداڵەکەیان هەبوو، بۆچوونی دروست دەربارەیان واجببوونی گرتنەوەی ڕۆژووەکانیانە بەبێ ئەوەی کەفارەت بدەن، ئەمە بۆچوونی بەهێزە کە لە ئیبن عەباس و ئیب عومەرەوە هاتووە.

* گوێ نەدان بە ئەنجامدانی حەرامەکان لە ڕەمەزاندا، پاداشتی ڕۆژوو کەم دەکاتەوە، هەندێک جار پاداشتەکەی تەواو لادەبات، ڕیوایەت کراوە لە ئەنەس و نەخەعییەوە: غەیبەت ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە، واتە پاداشتەکەی دەبات وەک بەتاڵبووەی لێ دەکات.

* هەر مرۆڤێک خراپەی زیاتر بوو لە مانگی ڕەمەزاندا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شەیتانە بەند کراوەکەی کە لەگەڵیدا بووە خراپەی لە ئەو کەسە کەمتر بووە، هەر ئەو شەیتانە لە خراپە گەورەکان گێڕاویەتییەوە، کاتێک شەیتانەکەی بەند دەکرێت، ئەوکات ئەو مرۆڤە دەستی واڵا دەبێت. فەرموودەکان ئەمە دەگەیەنن.

* هەندێک جار مرۆڤ پێویستی بە شەیتان نییە تاکوو گومڕای بکات، چونکە خودی خۆی گومڕایە و بەندکردنی شەیتانەکەی لە ڕەمەزاندا هیچ کاریگەرییەک دروست ناکات لەسەری: ﴿قَالَ قَرِينُهُ رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ﴾ [ق: ٢٧] «ئەو (شەیتانەی لە دنیادا) لەگەڵیدا بوو، دەڵێ ئەی پەروەردگارم من ئەوم سەرکەش نەکرد، بەڵکوو خۆی لە گومڕاییەکی دووردا بوو.»

* لە ڕەمەزاندا گەشت کردن ناپەسەندە بێ بوونی پێویستی و قازانجێکی دیاریکراو، بۆئەوەی مرۆڤ لە پەرستشەکان بێ ئاگای نەکات، لە عائیشەوە بە دروستی ئەم وتەیە هاتووە: "گەشتم پێ خۆش نییە لە ڕەمەزاندا، ئەگەر ڕەمەزان هات پێم خۆشە نیشتەجێ بم."

* پەلە کردن لە ئەنجامدانی نوێژی بەیانی لە مانگی ڕەمەزاندا سونەتە پاش ئەوەی کاتەکەی زانرا و جێگیر بوو، زەیدی کوڕی ثابت دەڵێت: «نێوان پارشێو کردن و ئەنجامدانی نوێژ ئەندازەی پەنجا ئایەت بوو» ئەو ئەندازەیە بە خوێندنێکی ئاسایی نزیکەی ١٠ خولەک دەخایەنێت.

*وتەی "إني صائم" لە کاتی دەمەقاڵێدا سوننەتێکە زۆرێک لێی بێئاگان، وتەی هەندێک لە خەڵکی "اللهم إني صائم" بە زیادکردنی وتەی (اللهم) هیچ بنەڕەتێکی نییە لە فەرموودە و ئەسەردا.

* وتەی "إني صائم" "من بەڕۆژووم" کاتێک ڕۆژووەوان دەریدەبڕێت لە کاتی دەمەقاڵێ چەند سوودێک لەخۆ دەگرێت:

١- ئاگەدار کردنەوەی کەسی بەرانبەرە بەوەی ئەو بێتوانا نییە، بەڵکوو بێدەنگییەکەی لەپێناو خوادایە.

٢- یادهێنانەوەی ڕێزی پەرستشەکانە کە نابێت خەڵکی بە خراپە نزیکیان ببنەوە.

* ئەگەر ڕۆژووەوانێک لەناو خەڵکیدا بوو بێئاگایانە شتی خوارد، ئەوا بیری دەهێندرێتەوە کە ئەو بەڕۆژووە لەبەر ڕێزی مانگی ڕەمەزان، هەروەها تاکوو نەبێتە جێی سەرنجی خەڵکی و بەهۆیەوە گومانی خراپی پێ ببرێت. بەڵام ئەو ڕۆژووانەی لای کۆمەڵێکی ناسیاو یان لەماڵەوە بەبێئاگایی شتی خوارد و خواردەوە ئەوا بەئاگا ناهێندرێتەوە.

* ئیبن عومەر ویستی ئاو بخواتەوە و بیریان هێنایەوە کە بەڕۆژووە گوتی: "خودا ویستی ئاوم پێ بدات تۆ نەتهێشت." سەنەدی گێڕانەوەکەی سەحیحە، هیچ پێچەوانەیەکی ئەمە وتەیەش لە هاوەڵانەوە نەهاتووە.

* باشترین شت بەربانگی پێ بکرێتەوە خورمایە، پاشان ئاو، پاشان شیر. هیچ تایبەتمەندیەک نەهاتووە دەربارەی خورمای تەڕ؛ ئەو فەرموودەیەی باس لە پێشخستنی خورمای تەڕ بەسەر وشکدا دەکات مونکەرە. ئەبوو حاتەم و ئەبوو زەرعە و بەزار بە مونکەریان داناوە.

* خورما باشترین خواردنە بەربانگی پێ بکرێتەوە، سێ خورما کەمترین ڕێژەیە کە لە سونەتدا هاتبێت بۆ بەربانگ کردنەوە، پاشان چەند قومێک لە ئاو، لە پەیامبەری خوداوە (ﷺ) نەهاتووە پێش نوێژ جگە لە خورما و ئاو زیاتری خواردبێت، ڕۆژووەوان لە پاش نوێژ چی بووێت، دەتوانێت بی خوات.

* ئەگەر ڕۆژووەوان لە ڕێگای کاتژمێرەوە بۆی دەرکەوت کە خۆر ئاوا بووە، سوننەتە بەربانگ بکاتەوە هەرچەندە بانگیش نەدرابێت، چونکە بانگ و بەربانگ هەردووکیان بەیەکسانی پەیوەستن بە خۆرئاوابوونەوە، خودی خۆیان پەیوەست نین بە یەکترەوە.

* ئەو ڕۆژوەوانەی دڵنیابووەتەوە لە خۆرئاوابوون، لەگەڵ ئەوەشدا بەربانگ دوادەخات و چاوەڕوانی بانگی دەکات، ئەوا بەم کارەی پێچەوانەی سونەتی کردووە، چونکە ئەم کاتژمێرانەی ئێستا بانگبێژ و کەسانی دیکەش کاری پێ دەکەن، ئیبن عومەر کاتێک دڵنیا دەبوو کە خۆرئاوا بووە، بەربانگی دەکردەوە هەرچەندە گوێی لە بانگیش نەبووایە.

* هەر شتێک نەگاتە ناو گەدە یان شوێنگرەوەی گەدە، ڕۆژوی پێ بەتاڵ نابێتەوە، وەک ئەوانەی دەگەنە سییەکان وەک بەخاخی ڕەبۆ و عەتر و دوکەڵی بخورد و تامکردنی خواردن.

* ڕۆژو بەتاڵ نابێتەوە بە سیواک و هەویری ددان، قەترەی چاو، ڕشانەوە -لەسەر بۆچوونی بەهێز-.

* لیک نابێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەی ڕۆژوو، هاوشێوەی ئەوەش سیواکە هەرچەندە تەڕیش بێت، هەروەها فلچەی ددان و قەترەی چاو و گوێ و چاوڕشتن.

* پشکنینی خوێن ڕۆژووی ڕۆژووەوان بەتاڵ ناکاتەوە لەسەر بۆچوونی بەهێز، هەروەها دەرزی ماسولکە، ئۆکسجین، لەشگران بوون، قوتدانی تف و بەڵغەم و هەموو ئەو پاشماوانەی لە خواردنی پارشێوو لەناو دەمی ڕۆژوەواندا ماونەتەوە هیچیان ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوە.

* ڕۆژوو بەهۆی برینەوە بەتاڵ نابێتەوە، وەک خوێنی پووک و ددان ئەگەر نەچنە ناو هەناوەوە، هەروەها دەرزی نیو بەنج و دەرمانە بەکاربراوەکان لە ڕێی کۆمەوە.

* ڕۆژووەوان بۆی دروستە تامی خواردن بکات و پاشان دەری بداتەوە، ئەم کارە هاوشێوەی ئاو لە دەم وەردانە کۆمەڵێک لە زانایان ڕێگەیان بەو کارە داوە، ئیبن عەباس ڕێگەی داوە بۆ تامکردنی ئەو خواردنەی کە کەسێک دەیەوێت بیکڕێت. حەسەن گوێزی بۆ کوڕەزاکەی دەجووی و دەیدایە لەکاتێکدا خۆی بەڕۆژوو بوو.

* جگەرە کێشان ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە چونکە بەمەبەستەوە لە دەمدا کۆدەبێتەوە و بەشێکی زۆریشی دەچێتە گەدەوە، لەبەر ئەم هۆکارە هەموو پزیشکەکان کۆکن و جگەرە بە هۆکارێکی شێرپەنجە و سووتانەوەی گەدە دادەنێن، بۆیە بە خواردنەوە دادەندرێت. -لە زمانی عەرەبیدا (شرب الدخان) خواردنەوە بۆ جگەرە بەکاردەهێندرێت-.

* خواردنی پارشێو پێویستە بە هیچ جۆرێک وازی لێ نەهێندرێت، هەرچەندە شتێکی کەمیش بێت. لە فەرموودەدا گێڕدراوەتەوە: «خواردنی پارشێو بەرەکەتە، وازی لێ مەهێنن، هەرچەندە ئەندازەی خواردنەوەی قومێک ئاویش بێت.»

* بەڵگەگەلێک لە سوننەت ئاماژە بەوە دەدەن کە خواردنی پارشێو گەورەتر و ڕێزدارترە لە بەربانگ، چونکە زۆرێک لەو دەقانەی دەربارەی بەربانگکردنەوە

هاتوون تەنها ئاماژە بە پەلەکردن دەکەن بۆ بەربانگ کردنەوە، بەڵام لە بارەی خواردنی پارشێووەوە دەقی تایبەت هاتووە، چونکە ئەو کەسەی پارشێوو دەکات خواردنەکەی یارمەتیدەری دەبێت لەسەر بەجێهێنانی پایەیەک لە پایەکانی ئیسلام. ڕۆژەکان لە مانگی ڕەمەزاندا پێگە بەرزترن بۆیە بەهێزبوون تیایاندا تەواوترە و گرنگتر داندراوە. ڕۆژوو شکان بە هەموو ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن دێتەجێ، تەنانەت بە سەرجێبیکردنیش وەک ئیبن عومەر ئەنجامی داوە، بەڵام پارشێو تەنها بەخواردن دێتە جێ. سووربوونی خەڵکی لەسەر بەربانگکردنەوە و بێئاگابوونیان لە پارشێوکردن، هۆکاری نەزانینیانە بە پلەبەندی پەرستشەکان. پێویستە خەڵکی لەسەر هەردوو بابەتەکە سووربن بەتایبەت پارشێو گرنگی زیاتری پێ بدرێت.

* ئامادەکردنی پارشێو بۆ ڕۆژووەوان گەورەترە لە بەربانگ ئامادەکردن بۆیی، چونکە خواردنی پارشێو گەورەتر و ڕێزدارترە، چونکە پارشێوکار ڕوو دەکاتە پەرستشێکی وەک ڕۆژوو کە یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام، هەروەها هیچ فەرموودەیەک جێگیر نەبووە دەربارەی فەزڵ و گەورەیی بەربانگکردنەوەی ڕۆژووەوان، فەزڵی خوداش فراوانە.

* پارشێوکردن بە خورما یان بەکارهێنانی خورما تێیدا سونەتە، ئەمە سونەتێکە زۆر کەس لێی بێ ئاگایە، وا گومان دەبەن خورما تەنها بۆ بەربانگ کردنەوە سونەتە، لە فەرموودەی ئەبوو هورەیرەدا هاتووە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: «نعم سحور المؤمن التمر» باشترین پارشێو پێکەری بڕوادار خورمایە. ئەبوو داود گێڕاویەتەوە و ڕشتەکەی ڕاستە.

* ئەو کەسەی پارشێوو دەکات بۆی دروستە ئەو خواردن و خواردنەوەی لە دەستیدایە تەواوی بکات و بیخوات هەرچەندە گوێی لە بانگی بەیانیش بێت، کۆمەڵێک لە سەلەف ڕێگەیان بەو کارە داوە و چەند فەرموودەیەک ڕیوایەت دەکرێت و بەمەرفوعی دەیدەنە پاڵ پەیامبەر (ﷺ).

* پیرۆزبایی کردن بە بۆنەی چوونە ناو دە شەوی کۆتایی ڕەمەزانەوە کارێکی چاکە، بەڵام هیچ فەرموودەیەکی دروست لەبارەیەوە نەهاتووە، بەڵکوو دەتوانێت دەستەواژەیەک هەڵدەبژێردێت کە هاندان بێت بۆ کردەوەی چاکە و پیرۆزباییش لەخۆبگرێت.

* پێویستە نیوەی دووەمی ڕەمەزان زیاتر کۆششی تێدا بکرێت بەراورد بە نیوەی یەکەمی، ئەمەش ڕوواڵەتی کاری پەیامبەر (ﷺ) و هاوەڵان بووە.

* پەیامبەر لە دەی کۆتایدا ئیعتکافی دەکرد، لەگەڵ ئەوەی بەڕێوبەری دەوڵەتی ئیسلام و موفتی خەڵکی بوو، هەموو خەڵکی پێویستیان پێی بوو لەگەڵ ئەوەشدا خۆی یەکلا کردبووەوە بۆ ئعتکاف ئەم کارە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستە کارەکان دوابخرێت لەو پێناوەدا.

* دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان باشترین شەوەکانی ئەو مانگەیە، بۆیە لە کۆتایی مانگدا داندراوە، چونکە دەروونەکان سەرەتا چالاکن و پاشان نشوستیان بەسەردێت، چالاکبوونی سەرەتا لە هەموو مانگێکدا بوونی هەیە، بەڵام چالاکبوونی پاش نشوست پەیوەستە بە فەزڵی دەی کۆتاوە.

* خودا دە شەوی کۆتایی ڕەمەزانی گەورەتر داناوە لە سەرەتاکەی، چونکە دەروونەکان لە سەرەتاوە چالاکن و لە کۆتایدا چالاکییان نامێنێت، ڕاستگۆیان بەردەوام دەبن و دووڕووەکان چالاکییان لە دەست دەدەن، چونکە جێگیربوون بە ئەندازەی ئیمانی کەسەکە پەیدا دەبێت.

* ئەو کەسەی سەرەتای ڕەمەزان کەمتەرخەم بووە و لە کۆتاییەکەیدا چالاک بووە، باشترە لەو کەسەی لە سەرەتادا چالاک بووە و لە کۆتایدا کەمتەرخەم بووە، لە فەرموودەدا هاتووە «إنما الأعمال بخواتيمها».

کردەوەکان بە کۆتاییەکانیان هەژمار دەکرێن.

* پیرۆزبایی کردن بە بۆنەی چوونە ناو دە شەوی کۆتایی ڕەمەزانەوە کارێکی چاکە، بەڵام هیچ فەرموودەیەکی دروست لەبارەیەوە نەهاتووە، بەڵکوو دەتوانێت دەستەواژەیەک هەڵدەبژێردێت کە هاندان بێت بۆ کردەوەی چاکە و پیرۆزباییش لەخۆبگرێت.

* پێویستە نیوەی دووەمی ڕەمەزان زیاتر کۆششی تێدا بکرێت بەراورد بە نیوەی یەکەمی، ئەمەش ڕوواڵەتی کاری پەیامبەر (ﷺ) و هاوەڵان بووە.

* پەیامبەر لە دەی کۆتایدا ئیعتکافی دەکرد، لەگەڵ ئەوەی بەڕێوبەری دەوڵەتی ئیسلام و موفتی خەڵکی بوو، هەموو خەڵکی پێویستیان پێی بوو لەگەڵ ئەوەشدا خۆی یەکلا کردبووەوە بۆ ئعتکاف ئەم کارە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستە کارەکان دوابخرێت لەو پێناوەدا.

* دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان باشترین شەوەکانی ئەو مانگەیە، بۆیە لە کۆتایی مانگدا داندراوە، چونکە دەروونەکان سەرەتا چالاکن و پاشان نشوستیان بەسەردێت، چالاکبوونی سەرەتا لە هەموو مانگێکدا بوونی هەیە، بەڵام چالاکبوونی پاش نشوست پەیوەستە بە فەزڵی دەی کۆتاوە.

* خودا دە شەوی کۆتایی ڕەمەزانی گەورەتر داناوە لە سەرەتاکەی، چونکە دەروونەکان لە سەرەتاوە چالاکن و لە کۆتایدا چالاکییان نامێنێت، ڕاستگۆیان بەردەوام دەبن و دووڕووەکان چالاکییان لە دەست دەدەن، چونکە جێگیربوون بە ئەندازەی ئیمانی کەسەکە پەیدا دەبێت.

* ئەو کەسەی سەرەتای ڕەمەزان کەمتەرخەم بووە و لە کۆتاییەکەیدا چالاک بووە، باشترە لەو کەسەی لە سەرەتادا چالاک بووە و لە کۆتایدا کەمتەرخەم بووە، لە فەرموودەدا هاتووە «إنما الأعمال بخواتيمها».

کردەوەکان بە کۆتاییەکانیان هەژمار دەکرێن.

* لە تەواوی ئەقڵ و هۆشیارییە کە مرۆڤ باشترین توێشوو ئامادە بکات بۆ ڕۆژی دوایی، باشترین توێشوو بۆ ڕێبواری سەر ئەو ڕێگەیە لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندایە. کەواتە پێویستە مرۆڤ هەوڵبدات باشترین توێشووی تێدا کۆبکاتەوە، چونکە لەوانەیە جارێکی دیکە پێی نەگاتەوە، ڕێگەی سەفەریش زۆر دوورە.

* زیندوو کردنەوەی دە شەوەی کۆتا بە شەونوێژکردن سوننەتی پەیامبەرە (ﷺ)، لە عائشەوە هاتووە دەڵێت: «پەیامبەری خودا لە بیست شەوی سەرەتای ڕەمەزاندا خەوتن و نوێژکردنی تێکەڵ دەکرد، کاتێک دە شەوی کۆتا بهاتایە خۆی گورج و توند و تۆڵ دەکردەوە (نەدەخەوت).»

* سوننەتە ئافرەتان لەماڵەکانیاندا شەونوێژ بکەن وەک چۆن پیاوان لە مزگەوتدا ئەنجامی دەدەن، چونکە پەیامبەری خودا (ﷺ) کاتێک دە شەوی کۆتا بهاتایە خۆی گورج دەکردەوە و شەوەکانی زیندوو دەکردەوە و خێزانەکانی بەخەبەر دەهێنایەوە.

* ئەو ئافرەتەی بێبەش بووە لە ئەنجامدانی نوێژ بەهۆی سووڕی مانگانەوە، ئەوا دەتوانێت لە نوێژگەکەی دابنیشێت قورئان بخوێنێت و بپاڕێتە و یادی خودا بکات و داوای پێویستییەکانی لە خودا بکات بەبێ ئەوەی نوێژ ئەنجام بدات، ئومێد وایە پاداشتی دە شەوی کۆتایی و شەوی قەدری بۆ تۆمار بکرێت.

* ئەو کەسەی بەهۆی عوزرێکی ئاشکراوە نەتوانێت دە شەوی کۆتا زیندوو بکاتەوە وەک کارێکی قورس کە نەتوانێت مۆڵەت وەربگرێت، ئەگەر نوێژی عیشا و بەیانی بە کۆمەڵ ئەنجام بدات پاداشتی زیندووکردنەوەی ئەو دەشەوە و شەوی قەدری بۆ دەنووسرێت، ئەمەش بە دروستی لە ئیبن موسیبەوە هاتووە.

ڕووکەشی سوننەت پاڵپشتی وتەی سەعیدی کوڕی موسیب دەکات، ئەوەش وتەیەکی زۆر پەسەندە، فەزڵ و ڕەحمی خودا لەوە زیاترە کە سنووردار بکرێت.

* پێویستە ئەو کەسەی چووە ناو مزگەوتەوە نییەتی ئیعتکافی هەبێت، هەرچەندە کاتێکی کەمیش بمێنێتەوە، جا ئافرەت بێت یاخود پیاو، لە یەعلا کوڕی ئومییەیەوە هاتووە کە یەکێکە لە هاوەڵانی پەیامبەر ئیعتکاف کردن بۆ دەمێک (وەک کاتژمێرێک) جێگیر بووە، هەروەها بە مرفوعیش ئیعتکافی شەوێک جێگیر بووە.

* ئەو کەسەی نەیتوانی دە شەوی کۆتایی ئیعتکاف بکات با شەوە تاکەکان ئیعتکاف بکات، هەرکەس توانای ئەوەشی نەبوو ئەوا با شەوی بیست و حەوت ئیعتکاف بکات، هەرکەس توانای ئەوەشی نەبوو با بۆ سەعاتێکیش بێت ئیعتکاف بکات، چونکە یەعلای کوڕی ئومەییەی صەحابی بۆ کاتژمێرێکیش ئیعتکافی دەکرد.

*خەسارەت مەندە، خەسارەت مەندە، خەسارەت مەندە، ئەو کەسەی چەند سەعاتێک لە کاتەکانی نەفرۆشێت بۆ بەدەستهێنانی هەشتا و سێ ساڵ: ﴿لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾ [القدر:٣] «شەوی بەفەڕ و ڕێز چاکترە لە هەزار مانگ.»

* ئەگەر بە کەسێک بگوترێت: "مووچەی سێ مانگت بە یەک مانگ دەدرێتێ ئەگەر بچیت بۆ فڵانە شاری دوور، ئەوا ئەو کەسە خۆی بۆ ئامادە دەکات و دووردەکەوێتەوە لە ماڵەوە لەو پێناوەدا." شەوی قەدر هاوشێوەی ٨٣ ساڵ پەرستشە.

* باشترین کار لە شەوی قەدردا ئەنجام بدرێت قورئان خوێندنە، چونکە ئەو شەوە بەو هۆیەوە ڕێزدار بووە و لەو شەوەدا قورئان دابەزیوە.

* هیچ فەرموودەیەک نەهاتووە دەربارەی دیاریکردنی شەوێک بە شەوی قەدر، بەڵکوو تەنها نیشانە و ئاماژە دەربارەی هاتووە، لە پێشترینیان شەوە تاکەکانە لەوانیش ٢٧ پاشان ٢١ پاشان ٢٣.

* هیچ نیشانەیەکی پێش وەختەی یەکلاکەرەوە دەربارەی شەوی قەدر جێگیر نەبووە، بەڵکوو چەند نیشانەیەکی گوماناوی پاش تەواوبوونی شەوەکە هاتوون، بە دروستی هاتووە «خۆر لە بەرەبەیانی ئەو شەوەدا بە تیشک وبەتین نییە» بەڵام نە وەڕینی سەگ و نە بوونی دەنگی گوێدرێژ و کەڵەشێر لەو بەرەبەیانەدا بە دروستی نەهاتووە.

* هیچ شتێک جێگیر نەبووە دەربارەی دیاریکردنی شەوی قەدر بەوەی هەرکات شەوی هەینی و شەوێکی تاک کۆببێتەوە ببێتە هاوڕێ بەڵگە لەسەر دیاریکردنی ئەو شەوە بە قەدر یان فەزڵێکی تایبەتی هەبێت، چونکە ڕۆژەکان شوێنکەوتەی شەوی پێش خۆیانن.

* کێشە نییە خەونەکان وەک هۆکارێکی دیاریکەر بەکاربهێنیت بۆ دیاریکردنی شەوی قەدر، لە سەحیحدا هاتووە لە پەیامبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: أرى رؤياكم قد تواطأت في السبع الأواخر «وا دەبینم خەونەکانتان هەمووی لەسەر حەوتی کۆتایی کۆبووەتەوە.»

* ئەنجامدانی شەونوێژ لە تەواوی شەودا لە عیشاوە تا بەیانی پێچەوانەی سوننەتە، تەنها لە ڕەمەزاندا نەبێت، سوننەتە بۆ ئەو کەسەی بەتوانایە هەمووی زیندوو بکاتەوە، خەوی ڕۆژ باشترە لە خەوی شەوان لە ڕەمەزاندا، بەتایبەت بۆ ئەو کەسەی پەرستش دەکات.

* دروستە بۆ نوێژخوێن نوێژی وتر بکات جا یەک ڕەکات یان سێ یان پێنج بەیەکەوە، بەڵام ئەگەر ویستی سوورەتی (الأعلى) و (الكافرون) و (الإخلاص) بخوێنێت، سوننەت وایە هەرسێ ڕەکاتەکە بە یەک سەلامدانەوە ئەنجام بدات.

* هەندێک لە پێشنوێژەکان بەردەوام سوورەتی (الأعلى) و (الكافرون) لە دوو ڕەکاتی وەتر دەخوێنن پاشان (الإخلاص) لە یەک ڕەکاتەکەدا دەخوێنن، سونەت وایە سێ ڕەکاتەکە بەیەک سەلام بکات نەک بە دوو سەلام.

* پاش تەواوبوونی نوێژی وتر سونەتە مرۆڤ سێ جار بڵێت: (سبحان الملک القدوس) لە جاری سێیەمدا زیاتر دەنگ بەرزبکاتەوە، بەڵام (استغفرالله و لا إله الا الله) لە پاش نوێژی وتر لە سوننەتدا نەهاتووە.

* نوێژی تەراویح لە خیلافەتی ئەبووبەکردا نەکرا بەهۆی سەرقاڵیی بە جیهادی هەڵگەڕاوەکانەوە، جیهاد گرنگتر و لەپێشتر بووە لە تەراویح، عومەر خەڵکی بۆ تەراویح کۆکردەوە بە پێشنوێژی ئوبەی کوڕی کعب، ئەویش تەنها لە نیوەی دووەمی ڕەمەزانەوە قنووتی دەخوێند.

* بەردەوام نەبوون لەسەر قنووت لە تەراویحدا چاکترە، چونکە هاوەڵان لەسەری بەردەوام نەبوون بەڵکوو تەنها لە پاش نیوەی دووەمی کۆتایی خوێندوویانە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) خۆی ئەنجامی نەداوە.

* تەراویح بەو ناوە ناونراوە، چونکە هاوەڵان لەنێوان نوێژەکاندا پشوویان دەدا (یستریحون) بەهۆی درێژی نوێژەکانەوە، پێشەوا عومەر پشووی دەدا بە نوێژخوێنان بە ئەندازەی ڕۆیشتنی کەسێک لە مزگەوتەوە تاکوو سلع کە شاخێکە ٧٠٠مەتر دوورە لە مزگەوتی پەیامبەرەوە.

* هاوەڵان نوێژی تەراویحیان درێژ دەکردەوە، پێشەوا عومەر لەنێوان نوێژەکان بۆ ماوەیەک پشووی پێیان دەدا، ئەیووب ئەندازەی پشووی نوێژی تەراویحەکانی بە ئەندازەی سی ئایەت دەبوو. بەڵام دەبینیت نوێژی هەندێک لە خەڵکی ئەم سەردەمە بە ئەندازەی پشووەکانی پێشین دەبێت.

* ئەگەر پارانەوەی پێشنوێژ لە نزای قنووتدا زۆربەی ستایشی خودا بوو، هیچ کێشە نابێت نوێژخوێنان ئامین بکەن، چونکە داواکردن و یادی خودا نزاکردن لەخۆ دەگرێت، ڕیوایەت کراوە کە لە فەرموودەیەکی قودسیدا خودا دەفەرمووێت: «هەرکەس یادی من سەرقاڵی بکات لە داواکردن لێم ئەوا لەو کەسانەی باشتر پێ دەدەم کە داوایان کردووە.» ئەمەش لە چەند ڕێگەیەکەوە ڕیوایەت کراوە لە سونەن و جگە لەوانیشدا هاتووە.

* ئەو کەسەی (آمین) دەکات پاش نزاکردنی نزاکارێک، هاوتای ئەو کەسەیە کە نزاکە دەکات، خودا دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَا﴾ [یونس: ٨٨]، پاشان فەرمووی: ﴿قَالَ قَدْ أُجِيبَتْ دَعْوَتُكُمَا﴾ [یونس:٨٩] نزاکار یەک کەسە، بەڵام وەڵامدانەوەکە بۆ دوو کەس بوو مووسا و هاروون.

* هیچ کێشە نییە نوێژخوێن قورئان هەڵبگرێت جا پێشنوێژ بێت یاخود نوێژخوێنی تەنها، ئەگەر لەبەری نەبوو یان دەبووە هۆی ڕامانی زیاتر، ئەمە لە عائیشە و ئەنەسەوە جێگیر بووە، زووهری دەڵێت: کەسە تایبەت و چاکەکانمان لە ڕەمەزاندا لەسەر موسحەف قورئانیان خوێندووە.

* بازرگانیی دوارۆژ وەک بازرگانی دونیایە وەرز و کاتی تایبەتی هەیە، مرۆڤ دەتوانێت ئەو کاتانە بقۆزێتەوە و تیایدا قازانجێکی زۆر بە ماوەیەکی کەم بەدەست دەهێنرێت، بە دروستی لە ئەبوو هورەیرەوە هاتووە بە مەوقوفی: الغنيمة الباردة: الصوم في الشتاء «دەستکەوتی بێ ئەرک: ڕۆژووە لە زستاندا.»

# حەج و قوربانیکردن

* لەلای زۆرینەی زانایان واجبە حەج دەستبەجێ ئەنجام بدرێت، هەرکەس کاتی حەجی فەڕزی بەسەردا هاتوو توانای هەبوو بچێت، بەڵام حەجی نەکرد ئەوا لەسەر بۆچوونی بەهێزی زانایان تاوانبارە، بەڵام حەج واجب نییە لەسەر قەرزدارێک نەتوانێت قەرزەکەی بداتەوە.

* ئەگەر حاجیانی ماڵی خودا بیانەوێت تەوافی (إفاضة) لەگەڵ تەوافی ماڵاوایی بەیەکەوە بکەن و دوایبخەن بۆ کۆتایی، ئەوا کارێکی دروستە، چونکە تەوافی ماڵاوایی بەمەبەست نەگیراوە لە خودی خۆیدا، وەک تەوافی سەرەتا وایە بۆ سڵاو کردنە لە کەعبە و دەکرێتە تەوافی ئەو کەسانەشی عەمرەی (تمتع) دەکەن.

* هەموو بەڵگەکان ئەوە دەگەیەنن کە پەیامبەری خودا ڕەجمی شەیتانی پاش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا کردووە، زانایان جیاوازییان نییە دەربارەی ئەنجامدانی ئەو کارە، بەو شێوازە جەخت لێکراوەترە، بەڵام هەندێک لە سەلەف ڕێگەیان داوە بەو کەسانەی ویستی پێشخستنی حەجیان هەیە پێش نیوەڕۆ ڕەجمی شەیتان بکەن.

* یەکێک لەسوننەتە لەیادکراوەکان ئەوەیە: کەسانی جگە لە حاجییان ئاژەڵی قوربانی بنێرن بۆ مەککە لە ڕۆژی قوربانیدا لەگەڵ حاجییان ئاژەڵی قوربانیەکەی بۆ سەرببڕن، ئەگەر ئەوەی ئەنجام دا، واجب نییە لەسەری قوربانی دیکە بکات، هەروەها واجب نییە لەسەری لە موو و نینۆکی نەگرێت.

* هەرکەس چوو بۆ حەج هەرچەندە بەتەنهاش بێت لەسەری نییە قوربانی بۆ خۆی و خانەوادەکەی بکات، هەروەها لەسەری نییە کەسێک ڕاسپێرێت لە وڵاتەکەی خۆی قوربانی بۆ بکات، ئەمەش لە سەلەفدا لە عائیشە و جگە لەئەویشەوە هاتووە.

* ئومێد وایە پاداشتی حەجی تەواو بۆ ئەو کەسە بنووسرێت کە حەجی فەڕزی بەجێ هێناوە و حەزدەکات دووبارە حەج بکاتەوە بەڵام وازی لێ دەهێنێت و ناچێت تاکوو نەبێتە هۆی بارگرانی و قەرەباڵغی بۆ ئەو کەسانەی حەجی فەرزیان نەکردووە تاکوو ئەوان بتوانن بچن، ئەو کەسە بەو کارەی ئومێد وایە پاداشتی حەجەکەی بۆ بنووسرێت لەکاتێکدا لە ماڵەکەی خۆیدا دانیشتووە.

* ئەو کتێبە بەپێزانەی نووسراون دەربارەی مەناسیکی حەج بەپێی مەزهەبەکان: مەزهەبی پێشەوا مالیک کتێبی (ابن عاشور) شافعی کتێبی (المناسک)ی نەوەوی، ئەبوو حەنیفەش کتێبی (تحفة الناسک) و ئەحمەد کتێبی (شرح العمدة)ی ئیبن تەیمییە.

* هەندێک لەوانەی خۆیان دەدەنە پاڵ فیقە، دەستکاریکردنی ڕیش بە تاشین دانانێن تەنانەت ئەگەر لاجانگەکانیش دەرکەون، کاتێکیش پرسیاریان لێ بکرێت دەربارەی سەرتاشینی حاجیان لەسەر ئەو شێوازە بە تاشین ناوی دەبەن نەک کورتکردنەوە!

* قوربانی کردن یەکێکە لە باشترین کردەوەکانی جەژنی قوربان، بەڵام پێویست ناکات هەژارەکان بارگرانی لەسەر خۆیان دروست بکەن و قەرز بکەن بۆئەوەی قوربانی ئەنجام بدەن، بەدروستی لە ئەبووبەکر و عومەرەوە هاتووە قوربانییان وازلێ هێناوە تاکوو خەڵکی نەکەونە ناو ئەو بارگرانییەوە.

* قوربانی لەسەر گەشتیار و حاجییانی ماڵی خودا پێویست نییە -لە وڵاتەکەیان بۆیان ئەنجام بدرێت- (نخعي) دەڵێت: "ڕوخسەت دراوە بە حاجییان و گەشتیاران قوربانی نەکەن، ئەمەش ڕیوایەت کراوە لە عومەر و ئیبن عومەر و زوهری و جگە لەئەوانیشەوە."

* ناپەسەندە زیادەڕەوی بکرێت لە قوربانیدا تەنها لە کاتی پێویستدا نەبێت، ئەبوو ئەیوبی ئەنساری دەڵێت: "ئێمە یەک ئاژەڵمان دەکردە قوربانی لەبری کەسەکە و خانەوادەی، پاشان خەڵکی پۆزیان پێوە لێ دەدا ئیتر بوو بە پۆزلێدان."



# جیهاد

* شەریعەت پێویستە بە دوو چاو بپارێزرێت نەک بە یەک چاو، ئەوانەی شەریعەت دەپارێزن فەزڵ و پایەیان گەورەترە لە سەنگەرنشین و ئەوانەی سەنگەرەکان دەپارێزن «دوو چاو هەرگیز ئاگر نایان سووتێنێت.... چاوێک کە نەخەوێت و لەپێناو خودادا پاسەوانی بکات.»

* جیهادی بەڵگە و وتەکان زۆر بەهێزترن لە جیهادی شمشێر ﴿وَجَٰهِدۡهُم بِهِۦ جِهَادًا كَبِيرًا﴾ [الفرقان: ٥٢]

«بە هەموو هێز و تواناوە هەر بە گژیاندا وەرەوە. واتە: بەبەڵگە ڕوونەکانی قورئان.»

* پەرستشی پێنووس بۆ خودا، ئەوەیە سەری شۆڕکات و مرەکەبەکەی بڕژێت لەپێناو پاراستنی دیین و پاراستنی شەریعەت و تێکۆشان لە بەرانبەر دوژمنانی ئاییندا، ئەمە زۆر گەورەترە لە فرمێسکی پەرستشکاران و خوێنی شەهیدان.

* پێویستە بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان مرۆڤی باوەڕدار نەوەستێنێت لە جیهاد کردن بە وتە، چونکە باشترین هۆکاری نزیک بوونەوەیە لە خودا لە مانگی ڕەمەزاندا، جەنگی بەدر و ئازادکردنی مەککە و قادسیە هەمووی لە ڕەمەزاندا بووە، جیهادکردن بە زوبان گەورەترە لە جیهاد کردن بە شمشێر.

* خودا دەفەرمووێت: ﴿وَجَٰهِدۡهُم بِهِۦ جِهَادًا كَبِيرًا﴾ [الفرقان: ٥٢]

مەبەست لە ئایەتە تێکۆشانە بە بەڵگەکانی قورئان و ڕونکردنەوەکانی،

تێکۆشان و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ بیدعە و بیروباوەڕە خراپ و لادەرەکان لەپێشترینە کە ئەم ئایەتە لەخۆی بگرێت.

* خودا هیچ ئوممەتێکی سەرنەخستووە تەنها بە خوێنیان نەبێت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُواْ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً﴾ [التوبة: ١٦] «ئایا گومانتان وابوو کە وازتان لێ دەهێنرێت لە کاتێکدا خوا ئاشکرای نەکردووە ئەوانەی تێکۆشان لە ئێوە. نەهییان کرد و هەڵیان نەبژاردووە جگە لە خوا و پێغەمبەرەکەی و موسڵمانان بە هاوڕاز و جێی نهێنییان.»

* کوشتن واتای دۆڕان و ژێرکەوتنی هەق نییە، بەڵکوو لەوانەیە ببێتە یەکەم دەرگای سەرکەوتنی ئەو هەقە. زۆرێک لە پەیامبەران کوژراون، بەڵام هەق نەکوژراوە.

* نەفس موڵک و خاوەندارییەتییەکەی ناگەڕێتەوە بۆ مرۆڤ، بەڵکوو یان بۆ هەواو ئارەزووی خودی مرۆڤەکەیە یاخود ئارەزووی کەسانی دیکەیە یان گوێڕایەڵە بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار. بۆیە خودا ئەقڵی بە کڕیار بۆ نەفس داناوە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ﴾ [البقرة: ٢٠٧] «هی ئاواش هەیە لە خەڵکی کە گیانی خۆی دەفرۆشێت بۆ ڕەزامەندیی خودا و خوداش میهرەبانە بە بەندەکان.»

* کورتترین و خێراترین ڕێگە بۆ بەهەشت جیهادە، کورتترین ڕێگەش بۆ چوونە دۆزەخ هەر جیهادە، ڕاستگۆکان بەرەو خودا دەگەڕێنەوە بەبێ تاوان، تەنها قەرزداری نەبێت، ئەوانەش کە درۆیان کردووە یەکەم کۆمەڵن ئاگریان پێ خۆش دەکرێت.

* دژایەتیکردنی ناهەقی و خۆڕاگری بەرانبەری و هەڵگرتنی ئازارەکانی ئەو ڕێگایە، دەروونی مرۆڤ پاک دەکاتەوە لە ئارەزوو و چنۆکی ئەوکات هەق و

ڕاستی ئاشکراتر و ڕوونتر دەبینێت بەراورد بە کەسانی دیکە: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ﴾ [العنکبوت: ٦٩]

ئەوانەی لە ڕای ئێمەدا چوونە غەزا، ئێمەش ئەوان بە ڕێگەی خۆماندا دەبەین.

* ئەگەر ئوممەت سەرقاڵ نەبوو بە دوژمنی دەرەکییەوە، ئەوا دوژمنایەتی ناوخۆییان تێدا دەردەکەوێت، ناکۆکییان تێدا ڕوودەدات و هەرەس دەهێنن، چونکە ئوممەت ناکۆکییە بچووکەکان لەیاد دەکات، ئەگەر ناکۆکی دەرەکی گەورەی هەبێت، هەر بۆیە خودا جیهادی داناوە.

* دووڕووەکان لە ناوجەرگەی ئوممەتدا بە دوو هۆکار بەهێز دەبن:

کاتێک دوژمنانی دەرەکی بەهێز بن.

کاتێک ئوممەت سەرقاڵ ببن بەو بابەتانەی ناکۆکی لاوەکییان تیادایە.

هەربۆیە دووڕووەکان ڕەقیان لە جیهادە چونکە هەردوو هۆکاری بەهێزبوونیان پەک دەخات.

* جیهاد بیروباوەڕی ئوممەت دەپارێزێت و دەوڵەت سەقامگیر دەکات، هەر ئوممەتێک وازی لێ بهێنێت ناکۆکی ناوخۆیی و داڕمان ڕووی تێ دەکات: «مَنْ لَمْ يَغْزُ أَوْ يُجَهِّزْ غَازِيًا، أَوْ يَخْلُفْ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ ؛ أَصَابَهُ اللَّهُ بِقَارِعَةٍ قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ»

«هەرکەس جیهادنەکات، یان موجاهیدێک ئامادە نەکات، یان سەرپەرشتی و ئەرکی خانەوادەی موجاهیدێک لە ئەستۆ نەگرێت، ئەوا خودای گەورە ئافاتێکی بەڕیشەوە دەکات بەر لە ڕۆژی دوایی.»

* هەرچەندە جیهاد لە پرۆگرامی پەروەردەدا سڕاوەتەوە، بەڵام خۆ لە قورئاندا ناسڕێتەوە، جیهاد بەرەکەت و فەڕی تایبەتی خۆی هەیە بۆ هەر ئوممەتێک کە جێبەجێی دەکات، هەروەها شوومی و بەڵای تایبەتی هەیە ئەگەر وازی لێ بهێنن، پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت إذا ترکتم الجهاد سلط اللّٰه علیکم ذلا«ئەگەر وازتان لە جیهاد هێنا خودا سەرشۆڕیتان بەسەردا دەدات.»

* لە فەرموودەدا هاتووە: «ئەگەر وازتان لە جیهاد هێنا، خودا سەرشۆڕیتان بەسەردا دەدات و لای نادات تاکوو نەگەڕێنەوە سەر ئایینەکەتان» ئەم سەرشۆڕییە بۆ ئەوانەیە کە تەنها وازیان لە جیهاد هێناوە، جا دەبێت چ سەرشۆڕییەک ڕوو بکاتە ئەو کەسانە دژایەتی دەکەن و دەیشێوێنن؟!

* یارمەتی نەدانی موجاهیدان نیشانەی تیاچوونە: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾ [البقرة: ١٩٥]

موفەسیرەکان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە واتای ئایەتەکە ئەوەیە: «ئەگەر وازتان لە بەخشین هێنا، تیادەچن.»

* ئەو کەسەی لەپێناو خودادا جیهادی کردووە پاداشت وەردەگرێتەوە هەرچەندە لەسەر جێگەی خەوی خۆی بمرێت: ﴿وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ [آل عمران: ١٥٧]

«ئەگەر لە ڕێگای خوادا بمرن، یان لە ڕای خودا بە کوشت چن، دیارە لێخۆشبوونی خودا و بەزەیی ئەو زۆر چاکترە لەو شتەی کۆی دەکەنەوە.»

* کەسی موجاهید بە موجاهید و تێکۆشەر هەژمار ناکرێت تاکوو پێش کوشتنی دوژمنەکانی هەواوئارەزووی خۆی نەکوشتبێت.

* ئارامگرتن لەسەر ئارەزووەکانی نەفس قورسترە لە ئارامگرتن لەسەر ئازاری دوژمنان.

* ئەو کەسەی نەتوانێت دژ بە ئارەزووەکانی جیهاد بکات، ئەوا ناتوانێت دژ بە دوژمنەکانیشی جیهاد بکات، لە فەرموودەیەکدا گێڕدراوەتەوە:أفضل الجهاد: أن يجاهد الرجل نفسه و هواه «باشترین جیهاد ئەوەیە هەرکەس بەرانبەر هەوا و ئارەزوی خۆی جیهاد بکات.»

* هەرچەندە کەسی تێکۆشەر و موجاهید لە کۆمەڵی موسڵمانانەوە نزیک بێت، هێندەش لە خۆشەویستیی خوداوە نزیک دەبێت. بە ئەندازەی دوورەپەرێزی، تووڕەیی و ڕقی خودای بۆ مسۆگەر دەبێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ [الصف: ٤] «بەڕاستی خوا کەسانێکی خۆش دەوێت کە بە یەک ڕیز دەجەنگن لە ڕێی خوادا و دەڵێیت کۆشکێکی قایمی چەسپیون.»

* موجاهیدان بەهۆی حەز و چنۆکی دڵ و تاوانی پەنهانییەوە تێکدەشکێن و سەرناکەون، ئیبن مەسعوود دەڵێت: «ئەگەر سوێندم بخواردایە کە لە ڕۆژی جەنگی ئوحوود کە کەسمان دونیای ناوێت، سوێندەکەم نەدەکەوت، تاکوو خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا﴾ [آل عمران: ١٥٢]

«ئی وا هەبوو حەزی لە ماڵی دنیا بوو.»

* یاد و زیکری خودا هۆکاری دامەزراوییە لە فیتنە و ئاشووبەکاندا، هەروەها دامەزراوییە بۆ موجاهیدان لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ [الأنفال: ٤٥]

«ئەی گرۆی خاوەن باوەڕان! ئەگەر بەرانبەر دوژمنان ڕووبەڕوو بوونەوە، خۆ بگرن و گەلێک یادی خودا بکەن، بەڵکوو ئێوە سەرکەون.»

* بیروباوەڕی ڕاست بەبێ ئارامگری سەرناکەوێت، بزانە کۆمەڵێکی کەمی ئارامگر بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە بێباوەڕەندا سەردەکەون: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ

غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ [البقرة: ٢٤٩]

«زۆر جار کۆمەڵێکی کەم -بە ئیزنی خوا- بە سەر کۆمەڵێکی زۆردا سەر دەکەون.»

* خاوەن جەستەیەکی بەهێز بەهۆی جەستەیەوە سەرناکەوێت ئەگەر دڵی لاواز بێت، چونکە هێزی ڕاستەقینە بریتییە لە هێزی دڵ، هەرچی هێزی جەستەش شوێن کەوتەی هێزی دڵە: ﴿فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِ﴾ [الأنفال: ٦٦] «ئەگەر ئێوە سەد کەس بن و خۆڕاگر بن زاڵ دەبن بەسەر دوو سەدیاندا.»

* ئەگەر ئامۆژگاریی موجاهیدێکت کرد لە کاتی ئەنجامدانی هەڵەیەکیدا، ئەوا لەکاتی شکستهێنانیدا بە هەمان شێوە سەری بخە، بەشێک لە خراپی زانایان سەرقاڵ بوونیانە بە ئامۆژگارییەوە و وازهێنانیانە لە سەرخستن.

* کەسایەتی و «نامووسی» موجاهیدان هاوشێوەی کەسایەتی دایک و باوکە، ئەو کەسەی بەناهەق قسە لەسەر کەسایەتییان دەکات، ئەوا خراپەیەکی گەورەی هێناوەتە سەرخۆی، لە فەرموودەیەکدا پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ» «حەرامییەتی ئافرەتانی تێکۆشەران لەسەر ئەوانەی ماونەتەوە و تێکۆشانیان نەکردووە وەک حەرامییەتی دایکیان وەهایە.»

* ڕاکردن لە باسکردنی جیهاد دووڕووییە و خۆشویستنی جیهادیش بەشێکی باوەڕە، دروست نییە هزری هیچ باوەڕدارێک لێی بێئاگا بێت تەنانەت ئەگەر بە بیرکردنەوەش بێت لە دەروونیاندا، لە فەرموودەدا هاتووە «مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ» «هەرکەس بمرێت و غەزای نەکردبێت، بە دڵیشیدا نەهاتبێت، ئەوا لەسەر بەشێک لە دووڕووی مردووە.»

* دووڕووی و خۆشویستنی جیهاد لە دڵێکدا کۆنابنەوە، لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: «مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ.»

* خودا دووڕووەکانی ئاشکرا کرد بۆ پەیامبەرەکەی (ﷺ) بە باسکردنی جیهاد: ﴿فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ﴾ [محمد: ٢٠] «کاتێک سوورەتێکی ڕوون و دامەزراو نێردرابێتە خوارەوە و تێیدا باسی جەنگ کرابێت، دەبینیت ئەو کەسانەی نەخۆشی لە دڵیاندا هەیە، تەماشای تۆ دەکەن وەک تەماشاکردنی کەسێک کە لە ترسی مردن لەهۆش خۆی چووبێت.»

* تەنها باسکردنی جیهاد لە ناخدا دووڕووی لا دەدات، ئیدی دەبێت خودی موجاهیدان چۆن بن، لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە «مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ»

# چەند فەرموودە و ئەسەرێک

* هەموو فەرموودەوانان لە سەدەی یەکەمدا کۆبوونەوە بۆ پاراستنی فەرموودەکان لە درۆ، جا کاتێک فەرموودەکان جێگیربوون و دەقەکانی پارێزران، درۆ هاتە ناو واتای فەرموودەکانەوە وفەرموودەکان لە چوارچێوەی خۆیان لادران، ئەمڕۆ ئوممەت زیاتر پێویستی بەو زانایانەیە کە واتاکانیان بۆ بپارێزێت لەوانەی پیتەکان و دەستەواژەکان دەپارێزن.

* پەڵپ گرتن بە بۆچوونی کەسی لە دژی سونەتێکی جێگیر و ئاشکرا بێگومان هەڕەشەی خودا دەیگرێتەوە کە دەفەرمووێت: ﴿لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ [الحجرات: ٢] «دەنگتان بەرز مەکەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (ﷺ) و بە دەنگی بەرز قسەی لەگەڵدا مەکەن وەک دەنگ بەرزکردنەوەتان لەگەڵ یەکتری نەوەک کردەوەکانتان بەتاڵ ببنەوە و خۆشتان هەستی پێ مەکەن.»

* بڵاوکردنەوەی ئەو فەرموودانەی کە گومان هەیە لە ڕاستێتیان حەرامە، ئەو کەسەی بڵاوی دەکاتەوە لە جێگەی درۆکاردایە تیایدا، چونکە لە فەرموودەدا هاتووە «هەرکەس فەرموودەیەک لە منەوە بگێڕێتەوە و بزانێت کە درۆیە، ئەوا خۆی یەکێکە لە درۆزنەکان.»

* هەرکەس بەشدار بێت لە بڵاوکردنەوەی فەرموودەیەکی درۆ -و بزانێت و باسیشی نەکات کە درۆیە- ئەوە بەشدارە لەو درۆیەدا و شایستەی سزایە وەک پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «هەرکەس درۆیەک بەدەم منەوە بکات، ئەوا با جێگەی خۆی لە دۆزەخ بۆخۆی دیاری بکات.»

* دەربارەی فەزڵ و گەورەیی کەربەلا هیچ شتێک نەهاتووە نە لە سونەتدا و نە لە هاوەڵانەوە، کەربەلا لە سەردەمی پەیامبەردا بوونی نەبووە تاکوو فەزڵ و گەورەیی بداتە پاڵ، ئەوەی دەربارەی کەربەلا هاتووە (موضوع) و هەڵبەسترا و درۆیە ڕافیزەکان هەڵیان بەستووە.

* ئەو فەرموودانەی دەربارەی مەهدی هاتوون سەحیحن، ئەو لەدایک دەبێت، نەک نادیاربێت، هیچ شتێک دەربارەی کات و شوێنی جێگیر نەبووە هەروەها ناویش نابرێت بە چاوەڕوانکراوەکە (المنتظر)، چونکە ئێمە چاوەڕوانی هیچ کەسێک ناکەین تاکوو کردەوە بکەین، هەریەک لە ئێمە و مەهدی و عیساش، کاتێک دادەبەزێت کار بە قورئان دەکەین.

* ئیبن ئەبی شەیبە لە مکحوولەوە ڕیوایەتی دەکات لە هەندێک لە هاوەڵانی پەیامبەرەوە: سونەتە دوعا و پاڕانەوە بکرێت لە کاتی دابەزینی باران و قامەت بۆ نوێژ و بەیەکگەیشتنی موسڵمانان و کافران لە جەنگدا، ئەمە ڕاسترین فەرموودەیە لەسەر وەڵامدانەوەی پاڕانەوە لەکاتی باراندا.

* ڕاسترین وتە لەسونەتدا هاتبێت دەربارەی گیرابوونی پاڕانەوە لەکاتی باران باریندا ئەوەیە کاتی دیتنی باران بڵێیت: (اللهم صيبا نافعا) پەروەردگارمان بارانێکی بەخوڕ و بەسوود بێت. پاش بارانیش دەوترێت (مطرنا بفضل الله ورحمته) بە بەخشش و میهری خودا بارانمان بەسەردا بارێنرا.

* گیرابوونی پاڕانەوە لەکاتی باران باریندا لە چەند فەرموودەیەکدا هاتووە، بەڵام لە لاوازی بەدوور نین، بەڵام بە کۆی گشتییان ئەوە دەگەیەنن کە بنەڕەتێکیان هەیە، شافیعی دەفەرمووێت: لە چەندین زاناوە وەرمگرتووە کە ئومێدی گیرابوونی پاڕانەوە هەیە لە کاتی باران باریندا.

* هیچ فەرموودەیەک دەربارەی دەستهێنان بە دەموچاودا لە پاش دوعا و پاڕانەوە لە پەیامبەری خوداوە (ﷺ) بەدروستی جێگیر نەبووە، لە فەرموودەی

عومەر و ئیبن عەباس و سائب و یەزیدەوە هاتووە و لاوازە، بەڵام ئەو کارە بە سەحیحی لە هەندێک لە تابعینەوە هاتووە.

* لە فەرموودەیەکدا پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت «في الجمعة ساعة لا يوافقها مسلم ...» دروستترین وتە دەربارەی ئەو کاتە کۆتایی ڕۆژی هەینییە پێش خۆرئاوابوون، ئەمەش وتەی ئیبن عەباس و ئەبوو هورەیرە و زۆرێک لە هاوەڵانە هەروەها وتەی (عطاء و طاوس)ە.

* هیچ فەرموودەیەکی سەحیح نەهاتووە دەربارەی چاکیی ئەو کەسەی لە ڕۆژی هەینیدا دەمرێت، بوخاری و جگە لە ئەویش گرفتیان تێدا دیوەتەوە -مەعلولە-، چونکە کاتەکان نابنە هۆی چاکیی مرۆڤەکان، بەڵکوو چاکیی مرۆڤەکان بە کردەوەکانیانەوە وابەستەیە، چونکە مرۆڤ کردەوەکان هەڵدەبژێرێت، نەک کاتەکان.

* دەربارەی شەوی هەینی، هیچ فەزڵ و گەورەیییەک جێگیر نەبووە، شەوی هەینی وەک هەموو شەوەکانی دیکە وایە، کۆمەڵێک فەرموودەی لاواز و هەڵبەستراو دەربارەی هاتووە، بەڵام دەربارەی سەڵەوات و درووود ناردن بۆ پەیامبەر چەند فەرموودەیەک بە حەسەن دانراوە.

* ڕێگری کردن لە بەڕۆژووبوونی ڕۆژی شەمە لە فەرموودەیەکدا هاتووە، بەڵام سەحیح نییە، جا کاتێکیش شەمە هاوکات بوو لەگەڵ ڕۆژی عەرەفە، یان عاشوورا، یان ڕۆژە سپییەکانی پڕبوونی مانگ، یان جگە لە ئەمانە لە ڕۆژە ڕێزدارەکان، ئەوا ئەو فەرموودەیە هیچ کار لە بەڕۆژووبوونی ئەو ڕۆژە ناکات بەهۆی لاوازیی فەرموودەکەوە.

* هیچ فەرموودەیەک نەهاتووە دەربارەی پیرۆزباییکردن بەهۆی هاتنی مانگی ڕەمەزانەوە، پیرۆزباییکردن کارێکی جوانە لە هەر بۆنە و بوونی نیعمەتێکدا بکرێت، ئەو پیرۆزبایییە بە هەر دەستەواژەیەک بێت، دروستە. تەنها ئەوە بە مەرج گیراوە کە واتایەکی باشی هەبێت.

* ئەو فەرموودەیەی دەربارەی ڕۆژوو شکاندنی پێغەمبەر هاتووە بە خورمای تەڕ مونکەرە، ئەبوو حاتەم و ئەبوو زورعە و بەزار و جگە لە ئەوانیش بە مونکەریان داناوە، فەرموودەی دروست دەربارەی خورما بەگشتی هاتووە بەبێ دیاریکردنی جۆرەکەی، واتە خورمای تەڕ وەک هەموو جۆرەکانی دیکەی خورما وایە و جیاوازی نییە.

* دروستترین زیکر و یادی خودا لە بەربانگدا بریتییە لە (ذهب الظمأ وابتلت العروق و ثبت الأجر إن شاء الله) باشترە مرۆڤی باوەڕدار گۆڕانکاری بکات لەنێوان ئەم پاڕانەوەیە و هەر پاڕانەوەیەکی دیکە کە ڕۆژووەوان دەیکات بۆ سوودی دونیا و دواڕۆژی.

* هیچ دوعا و پاڕانەوەیەکی دیاریکراو دەربارەی بەربانگ کردنەوە نەهاتووە، چجای بگاتە ئامینکردنی بەکۆمەڵ، هەروەها نە ڕووکردنە قیبلە و نە دەست بەرزکردنەوەش هیچ دەربارەیان نەهاتووە لەو کاتەدا. وا دەردەکەوێت ڕۆژووەوان دەبێت بەنهێنی بپاڕێتەوە، ئەگەر پەیامبەری خودا بە ئاشکرا پاڕانەوەی ئەنجامدابێت، ئەوا لێوەی دەگوازرایەوە، چونکە سەروەرمان زۆر بەڕۆژوو دەبوو و هاوەڵان زۆر ورد و تێکەڵ و نزیک لەگەڵیدا ژیاون، زۆر بابەتی لەوە وردتریان لێوە گواستووەتەوە.

* ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە کاتێک بەربانگی کردووەتەوە بانگی خێزان و خانەوادەکەی کردووە و پاڕاوەتەوە، ئەمە ڕاسترین گێڕانەوەیە دەربارەی پاڕانەوەی بەکۆمەڵ هاتبێت بۆ بەربانگ کردنەوە، بەڵام هیچ فەرموودەیەکی پاڵدراو بۆ لای پەیامبەر لەم بارەیەوە جێگیر نەبووە.

* لە عائیشەوە، پەیامبەری خودا پێی فەرمووە بڵێ -واتە لە شەوی قەدردا- «اللهم إنک عفو تحب العفو فاعف عني» بە مەرفووعی ڕیوات کراوە، بەڵام مەوقوفبوونی لەسەر عائیشە ڕاسترە، زیادەی وشەی (کریم) بە جێگیری نەهاتووە.

* هیچ شێوازێکی تەکبیرکردن بۆ جەژنەکان لە پەیامبەری خوداوە (ﷺ) نەهاتووە، بەڵکوو تەنها لە هاوەڵانەوە هاتووە، هیچ کێشەیەک نییە ئەگەر بە هەر شێوازێک تەکبیر بکرێت.

* دروستترین شێوازی تەکبیرکردن ئەو شێوازەیە کە عەبدولڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە سەلمانی فارسییەوە، دەڵێت: (اللهأکبر) بکەن ... (الله أکبر، اللهأکبر، اللهأکبر کبیرا...) ئەمەش سەنەدەکەی سەحیحە.

* فەرموودەی «داووا مرضاکم بالصدقة» نەخۆشەکانتان بە خێر و بەخشین چارەسەربکەن فەرموودەیەکی بەربڵاوە، بەڵام سەحیح نییە. بەیهەقی و جگە لە ئەویش لە ڕێگەی لاوازی بێکەڵکەوە ڕیوایەتیان کردووە. واتاکەی ڕاستە، بەڵام لە پەیامبەری خوداوە بە دروستی نەهاتووە.

* فەرموودەی «السقارون ... یکونون في آخر الزمان تکون تحیتهم بینهم إذا تلاقوا اللعن سەقارەکان ...» ئەوانەن لە ئاخر زەماندا پەیدا دەبن کاتێک بەیەک دەگەن سڵاوکردنیان لەعنەتکردنیانە لە یەکتری.

پێشەوا ئەحمەد و حاکم لە ئەنەسەوە گێڕاویانەتەوە و سەحیح نییە.

* فەرموودەی «من وجد سعة فلم یضح فلا یقربن مصلانا»، «هەرکەس خاوەن سامان بوو و قوربانی ئەنجام نەدا، با لەنوێژگەمان نزیک نەبێتەوە.»

پێشەوا ئەحمەد گێڕاویەتەوە و پاڵدانی بۆ وتەی پەیامبەری خودا ڕاست نییە، بۆچوونی ڕاست ئەوەیە وتەی هاوەڵان بێت، زۆرێک لە پێشەوایان بە لاوازیان داناوە و پێشەوا ئەحمەدیش بە مونکەری هەژمار کردووە.

* فەرموودەی «تفترق أمتي علی ثلاث وسبعین فرقة کلها في النار إلا واحدة» فەرموودەیەکی سەحیحە، پێشەوا ئەحمەد بەڵگەی پێ هێناوەتەوە و (ابن العربی و ضیاء و ابن کثیر) بە سەحیحیان داناوە، هیچ زانایەکی پێشین و دێرین نازانم بە لاوازی دانابێت.

* دانانی ئافرەتێک لەلایەن پێشەوا عومەرەوە وەک سەرپەرشتی بازاڕ بە ناوی (شفاء العدوية) سەنەدی گێڕانەوەکەی سەحیح نییە و فەرموودەزانان بە مونکەریان داناوە، (ابن سعيد) دەڵێت منداڵەکانی ئەو ئافرەتە گوتوویانە ئەو بابەتە بوونی نەبووە، (ابن العربی) دەڵێت: سەحیح نییە و لە هەڵبەستراوی بیدعەکارانە ئەو باسە.

* جێگیر نەبووە کە پێشەوا عومەر کچی خۆی زیندە بەچاڵ کردبێت لە نەفامیدا، ئەو چیرۆکە بنچینەیەکی نییە و ڕاست نییە، حەفسەی کچی لە سەردەمی نەفامیدا لەدایک بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ماوەتەوە تاکوو پەیامبەر لە مەدینە کردوویەتیە خێزانی.

* وا بڵاوە خودای گەورە سزای بۆ سەر فیرعەون دواخستووە بەهۆی ئەوەی فیرعەون لەگەڵ دایکیدا چاکەکار بووە، ئەمەش هیچ بنەڕەتێکی نییە و ڕاست نییە، هەروەها ناگونجێت ئەو کارە بەو جۆرە بووبێت چونکە تەواو خۆ بەگەورەزانین لەگەڵ تەواو چاکەدا کۆنابێتەوە: ﴿وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا﴾ [مريم: ٣٢]

گوێ لە مستی دایکیشم بم؛ نەشیکردووم بە ملهوڕێکی سەربزێو.

# سیاسەتی شەرعی

* ئەگەر ئوممەت هەنگاوەکانی شێواو بوو، ئەوا سەری نەخۆشە.

* دەوڵەت وەک جەستە وایە، ئەگەر سەر هەستی بە جەستەی نەکرد، ئەوا دەکەوێت و دەمرێت.

* هەرکەس بڕوانێتە هۆکاری ڕووخانی دەوڵەتەکان و جیاوازیی هۆکاری ڕووخانیان، بۆی دەردەکەوێت سەری هەر یەک لەو دەوڵەتانە هەستی بە جەستەی نەکردووە جا یان بێئاگا بووە لێیان یان بێئاگا کراوە، تا وای لێ هاتووە سەری دەوڵەتەکە بە تەواوی لە جەستەی جیابووەتەوە.

* ئوممەت لە ئەمڕۆدا خاوەنی سەرکردەیەک نییە تا سەرکردەکانی ڕۆژئاوا بانگ بکات بۆ ئیسلام و سروشتی پاک، وەک چۆن ئەوان سەرکردەکانی ئیسلام بانگ دەکەن بۆ هاوڕەگەزبازی و لادان و کوفر.

* سەرکردەکانی ڕۆژئاوا دەست وەردەدەنە وردترین و بچووکترین کاروباری کۆمەڵگاکەمان چونکە ئەوان بۆ دەستوور دەژین، نەک بۆ خۆیان. لەگەڵ ئەوەشدا نابینیت حاکمێکی موسڵمان دەست وەربداتە ئەو لادانانەی ئەوان لە فیترەتی خودایی و بەها ئەخلاقییەکاندا کردوویانە، چونکە سەرکردە موسڵمانەکان بۆ خۆیان دەژین، نەک بۆ دین.

* سەرکردەکانی ڕۆژئاوا گەلەکەیان دەکڕن بە فرۆشتنی حوکوومەتەکان بۆیان، دەسەڵاتدارانی ڕۆژهەڵات حوکوومەتەکان دەکڕن و گەلەکەیان دەفرۆشن، دادگەری ئەوەیە حوکمی خودا بکڕنەوە کە تەواو گونجاوە بۆ گەل و حوکوومەتەکان.

* ئیسلام پەکدەخەن و ڕۆژئاوابوون بەزۆر دەچەسپێنن، بە پاساوی بوونی پەستانی دەرەکی و نێودەوڵەتی، کاتێک کەسێک ململانێی کورسی و دەسەڵاتیان بکات دەستی پێوە دەگرن تا مردن ... (احفظ الله يحفظك).

* خودای گەورە لە قورئاندا وشەی (السلطان و السلطة)ی لە هەشتا جێگەدا هێناوە لە زۆرینەیاندا مەبەستی بەڵگە و بەهێزی ڕوونکردنەوەیە هەرچەندە لە کەسێکی لاوازیشەوە دەربچێت، بەڵام خەڵکی بۆ هەموو دەسەڵاتدار و خاوەن هێزێکی دادەنێن هەرچەندە نەزانیش بن.

* بوون بە سەرکردە و وەرگرتنی پۆست ئەمانەتە، ئەمانەتیش بارگرانی زیاترە لە ڕێزدارییەکەی. ئەو کەسەی پۆستێک وەردەگرێت، وا پێویستە دوعای بۆ بکرێت تا خودا یارمەتی بدات و کارەکانی بۆ ڕێک بخات، بەڵام پیرۆزبایی کردن لێی وای لێ دەکات ڕێزدارییەکەی لەبەرچاو بێت نەک بارگرانییەکەی.

* سەرکردەیی و پێشەوا بوونی ڕاستەقینە خودا لەناو خەڵکیدا دایدەنێت، نەک مرۆڤەکان درووستی بکەن، پێشەوابوونێک ئەگەر دڵی خەڵکی بەدەست نەهێنێت پێشەوایەتیەکی فێڵباز و پووچە، خودا بە ئیبراهیم دەفەرموێت: ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾ [البقرة: ١٢٤) دەتکەم بە ڕێبەری خەڵکی دنیا.

*پێشەوابوونی ئایین و دونیا بە میرات و پشتاوپشت ناگیرێت، خودا ڕێگری لە پێغەمبەر ئیبراهیم کرد لەو کارە، پشتاو پشت دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو پێشەوایەتیە بکەوێتە دەست کەسانی نەشیاوەوە: ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [البقرة: ١٢٤]

«دەتکەم بە ڕێبەری خەڵکی دنیا. گوتی: ئەدی نەوەکانم؟ گوتی: ناهەقیکاران وەبەر بەڵێنم ناکەون.»

* یەکەم جار پشتاوپشت و بەمیراتگرتنی دەسەڵات لە ڕۆم و فارسدا دەرکەوت پاشان موسڵمانان لاساییان کردنەوە لە کاتێکدا ئەو بابەتە لە شەرعەکەیاندا بوونی نەبوو، پاشان فارس و ڕۆمەکان وازیان لێ هێنا و موسڵمانانیش داوا دەکەن وازی لێبهێنن، ئەمەش شوێنکەوتنە لە چاک و خراپدا ... عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبووبەکر کاتێک موعاوییە دەسەلاتی پشتاوپشتی دایە کوڕەکەی گوتی: "هیرەقلییانە دەتانەوێت، دەسەلات بە میراتی دەدەنە کوڕەکانتان!"

* پاشاکان دوو جۆرن:

یەکەم: ئەوانەی دەسەلاتیان گرتووە بۆ خزمەت و قازانجی خەڵکی، ئەمە گوێ نادات بە وازهێنان لە دەسەڵات ئەگەر بزانێت کەسێکی دیکە باشتر دەتوانێت دەسەڵات بەڕێوەبەرێت، وەک عەزیزی میسر وازی لە دەسەڵاتەکەی هێنا بۆ یوسف، لەگەڵ ئەوەی یوسف لاواز بوو هەروەها تازە لە بەندینخانە ئازاد ببوو.

دووەم: ئەوانەی دەسەڵاتیان گرتووە بۆ خزمەت و قازانجی خودی خۆیان، ئەمە بەلایەوە گرنگ نییە خەڵکی هەمووی تێدا بچێت، بەس تەنها خۆی ڕزگاری ببێت بەسە، وەک ئەوەی فیرعەون ئەنجامی دا، ﴿قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَآءَهُمْ﴾ [الأعراف: ١٢٧] «گوتی: بەم زووە کوڕەکانیان دەکوژین.»

* گەورەترین شت کورسی پاشایەتی پێ جێگیر ببێت بێپێویستبوون و حەزنەبوونە لێی، ئەگەر پادشاکان بێ پێویست بوون لە کورسی دەسەڵاتیان و خەڵکی و ئەوانەش کە ململانێی کورسیان لەگەڵ دەکەن، کورسی دەسەڵاتیان بۆ دەپارێزن. بەڵام هەرچەندە خۆیان دەست بگرن بەو کورسییەوە، خەڵکی زیاتر دەستی لێ بەردەدەن.

* نزیکە بوتری لە هەموو مێژوودا ڕووینەداوە دەسەڵاتدارێک بەزۆر کورسی دەسەڵاتی وەرگرتبێت و بە ویستی خۆی کورسی دەسەڵاتی چۆڵ کردبێت ... ئەمە بنچینە و ڕێسایەکی مێژووییە.

* پەیوەستبوون بە کورسی دەسەڵاتەوە، هاوشێوەی وابەستبوونی مرۆڤە بە ژیانەوە، بۆیە خودا نەمانی بە لێدارنین (نزع) ناوبردووە، وەک دەفەرمووێت: ﴿وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ﴾ [آل عمران: ٢٦]

«کێش تۆ حەز کەی دەستەڵاتی لێ دەستێنیت و دادەڕنیت.»

وەک لێ سەندنەوەی ڕوح وایە، فەضیڵ دەڵێت: "هەڵکۆڵینی چیایەک بە دەرزی ئاسانترە لە هەڵکۆڵینی دەسەلات لە دڵی مرۆڤدا."

* پەند وەرگرتن زیاتر بە لێسەندنەوەی دەسەڵات دێتەجێ وەک لە پێبەخشینی دەسەڵات، بۆیە خودا سەرەتای دەسەڵاتی بە پێبەخشین (إیتاء) وەسف کردووە و کۆتاییەکەی بە لێ سەندنەوە (نزع) واتە: بەهێز ﴿تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ﴾ [آل عمران: ٢٦]

* زانایان دەڵێن گەورەترین هۆکاری سڕینەوەی تاوانی بەندە بریتییە لە دوورخستنەوەی لە دەسەڵات، چونکە قورسی پەژارە و خەمێکی زۆر گەورەیە، ئەگەر دەسەڵاتداران بیانزانیایە ئازاری لابردنیان لە کورسی دەسەڵات چەندە زۆرە، ئەوا هەر سەرەتا دەسەڵاتیان وەرنەدەگرت.

* بە ئەندازەی درێژبوونەوەی ماوەی دەسەڵات ئومێدەکان زیاد دەکات، خراپەکاریش پەیوەستە بە زۆری و درێژی ئومێدەکانی مرۆڤەوە، عامری شەعبي دەڵێت: "پێشەوا عومەر نووسراوێکی نووسی کە نابێت هیچ کاربەدەستێکم لە یەک ساڵ زیاتر بەردەوام بێت لە پۆستەکەیدا، بەڵام چوار ساڵ ئەبوو مووسا بهێڵنەوە لەسەر پۆستەکەی."

* گەورەترین هۆکاری سەرلێشێواندنی شەیتان بۆ مرۆڤەکان ئەوەیە بە ئومێد ُدرێژیان و دەستخستنی دەسەڵات و گەورەیی سەرگەردانیان دەکات: ﴿فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ﴾ [طه: ١٢٠]

«شەیتان دنەی خراپەی دا. گوتی: ئادەم! گەرەکتە داری هەرمان و نەمریت پێ بڵێم و ئەوی هەتە دوایی نەیە؟»

* هەر سەرکردەیەک دەسەڵاتی گرتە دەست لەپێناو گەورەییی خۆیدا، خۆ ئەگەر ترسی لەدەستدانی گەورەییەکەی هەبوو بەهۆی ژێردەستەکانییەوە، ئەوا هیچ شتێک ڕێگری نابێت بۆ لەناوبردنیان و هیچ باکی نییە ئەگەر تەنیا و تەنها خۆی بمێنێتەوە، وەک فیرعەون کاتێک ترسا لە مووسا: ﴿قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ﴾ [الأعراف: ١٢٧] «گوتی کوڕەکانیان دەکوژین.»

* دوو شت هەیە دەوڵەت بەهۆی ئەو دووانەوە بەهێز دەبێت:

ناسینی دوژمنە دەرەکییەکان.

پەیوەستی و گەرم و گوڕی ناوخۆیی.

﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ﴾ [الفتح: ٢٩]

«موحەممەد پێغەمبەر خودایە؛ ئەوانەش کە دەگەڵ ئەون، لە بەرانبەر دوژمنانیان توندوتیژ و لە ناوخۆدا دلۆڤانن.»

* هۆکاری داڕووخان و داڕمانی دەوڵەت بریتییە لە ناکۆکی لەسەر بابەتە لاوەکییەکان لە کاتی هەبوونی ململانێ لەسەر بابەتە مەزن و گشتییەکان: ﴿وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ [الأنفال: ٤٦] «جیاواز مەبن و دووبەرەکی مەکەن بەهۆیەوە بشکێن و لاواز ببن و هێزتان بڕوا و نەمێنێت، خۆ ڕابگرن بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕاگراندایە.»

* ئوممەت وەک یەک جەستە وایە تەنها بە یەک دڵ بەڕێوە دەچێت، بوونی دوو سەرکردە وەک بوونی جەستەیەکی دوودڵە، پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرموویت «وێنەی باوەڕداران وەک یەک جەستەیە خودا دەفەرموویت: ﴿مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٖ مِّن قَلۡبَيۡنِ فِي جَوۡفِهِۦۚ﴾ [الأحزاب: ٤]

«خوا بۆ هەناوی هیچ پیاوێک، جووتێ دڵی دانەناوە.»

* گەورەترین هۆکاری هەرەسهێنانی زۆرینەکان جیاوازی دڵەکانە، کەمێکی کۆبووەوە و یەکگرتوو بەهێزترە لە زۆرێکی ناکۆکی تێکەوتوو: ﴿وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡ﴾[الأنفال: ٤٦]

* تاکە دەستێک بە تەنها ناتوانێت گوریس گرێ بدات، خۆ ئەگەر گرێشی بدات، ئەوا ناتوانێت بەتوندی گرێی بدات. ئەگەر گوریس و کاروباری ئوممەتت دی بە شل و شێواوی، ئەوا بزانە ئەوەی گرێی داوە تەنها یەک کەس بووە.

* ئوممەت کۆنابێتەوە ئەگەر هەموویان چاویان بڕیبێتە لووتکەی هەڕەمی دەسەڵات، چونکە تەنها جێگەی یەک کەس دەبێتەوە، ئەگەر ململانێی لەسەر بکەن، ئەوا هەموویان دەکەون، دەرگا واڵا دەبێت بۆ دوژمنانیان و بێ ماندووبوون دێنە سەریان.

* ﴿تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ﴾ [آل عمران: ٢٦]

«هەر کەس بۆ خۆت مەیلت لێ بێت، دەستەڵاتی پێ دەدەیت و کێش تۆ حەز کەیت دەستەڵاتی لێ دەستێنیت.»

ئەگەر خودا لە قورئاندا گۆڕانکاری هەر بابەتێکی پاڵدابە خۆی، ئەوا ئاماژەیە بەوەی هۆکارە بەرجەستەیی و هەستپێکراوەکان زۆر لاوازن لە گۆڕینی ئەو کارەدا.

* زۆربوونی تاقم و لایەن و حیزب لە ناو ئوممەتدا، سەرۆک جێگیر دەکات و ئیسلام لاواز دەکات: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡ﴾ [الأنفال: ٤٦]

*ئوممەت شکۆی لەدەست دەدات ئەگەر دونیا مەستی بکات، پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «خودا شکۆی ئێوە لە دڵی دوژمنانتان دەردەهێنێت و لاوازی دەخاتە ناو دڵ و دەروونی ئێوەوە، واتە خۆشویستنی دونیا و ڕقلێبوونەوەی مردن.»

* گەورەترین دەردی ئەمڕۆی ئوممەت: ئەوەیە دوژمنەکانی سەرشۆڕییان بەبەردا کردووە و ناویان ناوە چاوپۆشی و لێبوردەیی، ئەگەر تاکێکی ئەم ئوممەتە بکوژرێت هیچ مەراق دایان ناگرێت، خۆ ئەگەر کەسێکی ئەوان بکوژرێت، ئەمان لەباتی ئەوانیش مەراق دایان دەگرێت.

* گەورەترین شێوەی سەرشۆڕیی ئوممەت ئەوەیە ستەمی لێ دەکرێت و دوژمنەکەی وا باوەڕی پێ دەهێنێت کە خۆی هۆکاری تووشبوونیەتی بە ستەم، ئەوکات دوژمنەکەی بە مامۆستا و پەروەردەکاری دەبینێت، نەوەک ستەمکارێکی خۆمەڵاسدەر.

* سەرشۆڕبوونی ئوممەت سزای دوورکەوتنەوەیانە لە ئایین، خودا گوێڕایەڵان شکۆدار دەکات هەرچەندە لاواز بن، سەرپێچیکارانیش سەرشۆڕ دەکات هەرچەندە بەهێز بن، ﴿ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ﴾ [آل عمران: ١١٢] لە هەر جێش بن، هەچەپۆکی و زەبوونی بووەتە بەشیان.

هەروەها دەفەرموویت: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ﴾ [المائدة: ٧٨]

چونکە فەرمانی خوایان بەجێ نەهێنا و ئەوان پیشەیان دەستدرێژی بوو.

* ئەگەر خودا تاقیکردنەوەیەکی هێنایە پێش بۆ ئوممەتێک و ئەوانیش هانایان بردە بەر موسوڵمانان و داوای سەرخستنیان کرد، بەڵام دەسەلاتدارەکان نەچوون بە هانایانەوە و پشتیان تێکردن، ئەوا بەدڵنیایی خودا سزای خۆی دادەبەزێنێتە سەر بەتواناترینی ئەوانەی دەستیان لێبەردان، خۆ ئەگەر ئەو کەسانە پێش ئەو کارەیان ستەمکار بووبن، ئەوا سزایەکی زۆر سەختتر بەبەراورد بەئەوانی دیکە دەچێژن.

* خودا پێشهاتێک بۆ وڵاتێک لە وڵاتانی موسڵمانان دەهێنێتە پێش و ناڕەحەتییەک یەخەیان دەگرێت تاکوو ئەوانی دیکە تاقی بکاتەوە و دەربکەوێت

زیندوون یان مردوو، چونکە ئوممەت هەمووی وەک یەک جەستەیە، ئەگەر ئەندامێکی بۆ ئەندامێکی دیکەی ئازاری نەدی، ئەوە یان بێهۆشە یان مردووە.

* دەوڵەتانی کوفر بەسەر کەمینە موسڵمانەکاندا ناتوانن سەربکەون تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دەوڵەتی ئیسلام پەرت و بڵاو بووبن و دەوڵەتۆچکەی بچووک بچووک و لێکجیایان لێ پەیدا بووبێت، کۆمەڵانێکی یەگرتوو هەرچەندە کەمیش بن، بەهێزترن لە زۆرێکی لێکترازاو.

* ئەم ئوممەتە وەک جەستەیەک وایە ئەگەر بریندار ببێت، هەموو بەشەکانی بەئاگا دێنەوە، ئەوەی ئازاری پێ نەگەیشت، یان بێهۆش کراوە یان لە ئەوان نییە: المؤمنون کالجسد اذا اشتکی منه عضو تدعی له سائر جسده «بڕوادار وەک جەستەیەک وایە ئەگەر بەشێکی ئازاری هەبوو، هەموو جەستەی هەست بە ئازارەکەی دەکات.»

* زۆری ئازار لە جەستەی ئوممەتدا نامەیەکی خوداییە لەپێناو بەهۆش هاتنەوەیاندا، ئەگەر جەستە مەست بوو یان نووستبوو، ئەوا ژانێکی توند بە خەبەری دەهێنێتەوە.

* ئەگەر بەشێک لە ئوممەت ئازاری هەبوو و بەشەکانی دیکە بە پەلە نەهاتن بەدەم سەرخستنیەوە، ئەوا بزانن جەستەی ئەو ئوممەتە یان مردووە، یان بێهۆش کراوە، لە فەرموودەدا هاتووە «ئوممەت وەک یەک پیاو وایە، ئەگەر چاوی ژان بکات، هەموو جەستەی ژان دەکات.»

* لە کاتە قورس و ناهەموارەکاندا تەنها ئەوانەی لەپێناو خودادا کاردەکەن دەمێننەوە، عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێت: "پەیامبەری خودا بۆ غەزای شام خۆی ئامادەکرد، لە کاتی گەرمایەکی زۆر بەتیندا، خەڵکی ڕایان دەکرد لە ڕۆمەکان، تەنها ئەوانە دەرچوون کە یەکلا بوون بۆ خودا، بەڵام دووڕووەکان مانەوە و دەرنەچوون."

* سزای خودا بەرۆکی ئوممەتێک دەگرێت کە یەکتری سەرشۆڕ بکەن، لە فەرموودەدا هاتووە: "هەرکەس موسڵمانێک پشتبەربدات لە شوێنێک کە سنوورەکانی خودای تێدا پێشێل دەکر، خودا لە شوێنێک پشتی بەردەدات کە ئەو حەزدەکات لەوێدا سەرکەوێت.»

* خودا خاتری هیچ ئوممەت و دەوڵەتێک ناگرێت، ئەگەر هەڵنەستن بە ئەرکی خۆیان، ئەوا دەیان گۆڕێت بە کەسانی دیکە، ئەمە هەڕەشەی خودا بووە بۆ هاوەڵان: ﴿إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾ [التوبة: ٣٩] «ئەگەر (بۆ جیهاد) ڕانەپەڕن و دەست بەکار نەبن، ئەوە سزایەکی زۆر بەئێشتان دەدات و کەسانێکی تر دەهێنێتە کایەوە لە ئێوە نەبن.»

* ئەگەر کەسایەتی و شەرەف مرد، ئەوا ئوممەت شایستەی لەناوچوونە، لە ئەسەرێکدا هاتووە «ئەگەر زینا لە قەومێکدا بڵاوبووەوە، ئەوا مردن زۆردەبێت تیایاندا. هەرکەس هۆکارەکانی زینا ئاسان بکات، ئەوا خودا هۆکاری لەناوچوونی ئاسان دەکات.»

* هۆکارەکانی مانەوەی ئوممەت سێ دانەن: ﴿مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [المائدة: ٥٤]

«هەر کەس لە دینی خۆی پاشگەز ببێتەوە، خوا لەمەولا کۆمەڵێکی وا دەخاتەڕوو، خۆشی بوێن؛ ئەوانیش خوایان خۆش بوێت و لە بەرانبەر خاوەن باوەڕان نەرم و نیان دەبزوونەوە و لە بەرانبەر دوژمنان، سەربڵند و توند و تیژن؛ غەزا لە ڕای خواش دەکەن.»

* زانا ئەو کەسەیە ئیسلام بەهۆی سیاسەتییەوە دەپارێزێت، نەک سیاسەت بپارێزێت بە ئیسلام.

* چاوپۆشیکردن و داشکاندن لە بابەتە بنەڕەتییەکانی ئیسلام بە بەڵگەی سیاسەتکردن، دووروویییەکی دێرینە: ﴿الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ ۞ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ۞﴾ [محمد:٢٥-٢٦] «دیارە شەیتان دنەی داون و کارەکانی بۆ خەملاندوون. چونکە ئەوانە بەو کەسانەیان گوت حەزیان لەو شتە نییە کە خوا ناردوویەتە خوارێ: ئێمە لە هەندێک کاردا بە قسەتان دەکەین.»

* ناکۆکی و ململانێی نێوان تاقمەکان ئەگەر سیاسەت دەستی تێ بخات، بابەتە بنەڕەتییەکانی خراپ دەکات و زمانی دەشێوێنێت و دادوەری ناهێلێت، چونکە ئامانجەکانیان گۆڕاوە لە چەسپاندنی هەقەوە بۆ ڕازیکردنی خەڵک.

* زۆرێک لە ململانێی حیزبەکان لەمڕۆدا، هۆکارەکانی شەرعی و دروستن، بەڵام ئامانجەکانی سیاسەتێکی پووچن، ئامانجەکان هۆکارەکانی لێڵ کردووە. ژیرەکان لەبەر ئامانجەکانی دەوەستن و نەزانەکانیش بە هۆکارەکانی فریودەخۆن.

* گەورەترین هەڵە ئەوەیە بنچینەکانی ئایین بە جۆرێک دابندرێت کە بگونجێت لەگەڵ سیاسەتدا، نەک سیاسەت لەگەڵ بنچینەکانی ئاییندا بگونجێنرێت، سیاسەت هۆکارێکە بۆ گەیاندنی هەق، خودی خۆی ئامانج نییە.

* حوکوومەتەکان ترسی گۆڕانی سیاسەتیان زیاترە لە گۆڕانی ئایینیان، بابەتە لەپێشینەکانیان دوژمنەکانیان بۆ دیاری دەکات، ئایین دژیەکی تووشدێت کاتێک دەخرێتە ناو جگە لە بابەتە گرینگترینەکانی خۆی، دوژمنەکانی سیاسەت زیاتر دەگۆڕێن لە دوژمنانی ئایین.

* هەموو زانستێک کەم و کورتی تێ دەکەوێت، بەڵام کەموکوڕیەکانیش کات و وەرزی خۆیان هەیە، لەپاش هاتنی داگیرکەران (استعمار) زۆرترین کەم و کورتی هاتبێتە ناو فیقهی ئیسلامییەوە لە بابەتی «سیاسەت و ئافرەت»دا بووە.

* دەستە و گرووپەکان کاتێک ژمارەیان کەم بێت لە بەرانبەر زۆرەکاندا، یەکگرتوو و هۆگر دەبن؛ بەڵام کاتێک ژمارەیان زۆر بوو، پەرشوبڵاو دەبن. ئەو زیانەی کەمینەیەکی یەکگرتوو دەیدات لە زۆرینەیەکی پەرشوبڵاو، زۆر زیاترە لەو زیانەی زۆرینەیەک دەیدات لە کەمینەیەکی یەکگرتوو.

* جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت لە ئەورووپا سەری هەڵدا چونکە ئایینەکەیان خراپبوو بەهۆیەوە سیاسەتەکەشیان خراپ ببوو، بەڵام جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت لە ڕۆژهەڵاتدا بەهۆی خراپی و گەندەڵی سیاسەت مەدارەکانیەوە دەرکەوت، چونکە ئایین ڕێگربوو لەوەی ئەوان لەسەر گەندەڵیی بەردەوام بن.

* ئەو کەسەی دەڵێت ئایین پەیوەندی بە سیاسەتەوە نییە، ئەوا بڕیاری پەرستشکردنی دوو خودای داوە: یەکیان لە ئاسمان و ئەوی دیکە لە زەوی: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ [الأنعام: ١٦٢] «ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ بێگومان نوێژ و (بەندایەتی) و قوربانی و ژیان و مردنم هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە.

* ئەوکەسەی دەڵێت ئیسلام دەبێت لە سیاسەت جیا بکرێتەوە، یان ئەوەیە باوەڕی بەوە نییە خودا بەدیهێنەر و دروستکاریەتی، یان باوەڕی بەوە نییە خۆی دروستکراوە، یان خۆبەگەورەزانە بەرانبەر هەق، چونکە ئەقڵ ئەوە دەسەلمێنێت کە دروستکار شارەزایە بەوەی دروستی کردووە.

* سەیرە ئەو کەسەی باوەڕی وایە خودا گەردوون بە یاسایەکی زۆر ورد بەڕێوە دەبات و لە یەکەم ڕۆژی بەدیهێنانییەوە هیچ کەموکورتییەک ڕووی تێنەکردووە، پاشان بەرنامە و یاساکانی ئەو بەدیهێنەرە بۆ ژیان ڕەت دەکاتەوە، ﴿لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ﴾ [غافر: ٥٧]

«بەڕاستی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترە لە دروستکردنی خەڵکی.»

* خودا مرۆڤ و دونیای ئەو مرۆڤەشی هێناوەتە بوون، بەڵام دەبینیت مرۆڤگەلێک بە خوا دەڵێن: ئایینەکەت مەهێنە ناو دونیاکەمانەوە! ﴿قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ﴾ [عبس: ١٧]

«دەک ئەو مرۆیە بەکوشت چێت کە هیچی دەچاواندا نییە.»

﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾ [النحل: ٤]

«بنیادەمی لە تنۆکێک بەرهەم هێنا؛ کەچی بووەتە دوژمنێکی بە ئاشکرا.»

* کاتەکانیان لەسەر کاتژمێرەکانیان ورد ڕێک دەخەن، هەرکات کەموکورتی تێکەوت، ئەوا لەسەر ڕۆیشتنی مانگ و خۆر زۆر ورد ڕێکی دەخەنەوە، چونکە ئەوانە لە یەکەم ڕۆژی دروستکردنیانەوە کەموکورتییان بەسەر نەهاتووە، پاشان دەبینیت ئەو کەسانە خۆیان بە گەورە دادەنێن لە هەمبەر خودادا بە شانازیکردن بەو وردەکارییەی ئەنجامیان داوە ... ﴿قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ﴾ [عبس: ١٧]

* خودا خۆی یاسای ژیانی مرۆڤ و دروستکردنی بەڕێوە دەبات، لە لێدانی دڵ و سووڕی خوێن و هەناسەی و تەنها فەرمانی بە مرۆڤ کردووە پارێزگارییان لێ بکات، جا کاتێک مرۆڤ یاسا بۆ دەوڵەتەکەی دادەنێت، زمانحاڵی دەڵێت: من شارەزاترم بە دونیای خۆم!

* سەرکردە زیاتر پێویستی بە ئەو کەسانەیە کە ئامۆژگاری دەکەن تا ئەوانەی کە ستایشی دەکەن و پیایدا هەڵدەدەن، چونکە خراپبوونی دەوڵەت زیاتر بەهۆی زیادەڕەوی ستایشکارانەوە ڕوودەدات نەک زیادەڕەوی ئامۆژگاری کاران.

* ترسناکترین ستایش زیادەڕەوی کردنە لە ستایشکردنی دەسەڵاتداراندا، چونکە ستایشکردنی مرۆڤ وەک سەربڕینی وایە، ستایشکردنی سەرکردە هاوشێوەی سەربڕینی ئوممەتێکە، چونکە وای لێ دەکات خۆبەگەورەزانین

لە دڵیدا بچەسپێت لەبەرانبەر گوێبیستبوون بۆ ئامۆژگارییەکان، هەروەها سنووریش ببەزێنێت لە کاتی سزادا.

* ئایینی ئیسلام زەمی ستایشکردنی سەرکردەکانی کردووە، بە شێوەیەک کە ئەو ستایشکردنە ببێتە هۆی خراپبوونی سەرکردەکان بۆ ژێردەستەکانیان، هەروەک چۆن زەمی سەرزەنشتکردنی کردووە بە جۆرێک ببێتە هۆی خراپبوونی ژێردەستەکانی لەبەرانبەریدا، یەکسان ڕانەگرتنی ئەم دوو بابەتە دەبێتە هۆی ئاژاوەی نێوان دەسەڵاتدار و ژێردەستەکانی.

* ستایشکردنی دەسەڵاتدار کە ببێتە هۆی سەرکەشبوونی، ئەم جۆرە ستایشکردنە زیانی زیاترە لە سەرزەنشتێک کە مەبەستی زیانپێگەیاندنی لەگەڵدا بێت، یەکەمیان دەبێتە هۆی داپۆشینی ستەمەکانی، دووهەمیان داپۆشینی دادوەرییەتی. ڕووخانی دەوڵەتیش زیاتر بەهۆی شاردنەوەی ستەمەکانی دەبێت، نەک شاردنەوەی دادوەرییەکانی.

* سەلەف نەیانگوتووە ڕێگریی خراپەکارییەکانی سەرکردە هەمووی دەبێت لە حاڵەتی نهێنیدا بێت، نابێت ئاشکرا بێت لە هەموو حاڵەتەکاندا، بێگومان دادگەری لەو بابەتەدا تەنها ئارەزووی سەرکردە و گومان و شوبهەی زاناکان شێواندوویەتی.

* واجبە سەرکردە بەئاشکرا ئامۆژگاری بکرێت لە کاتی بوونی ئەو خراپانەی زیانەکانیان گشتین و ئاشکران و هەموو خەڵکی دەگرنەوە، جا زیانی دیین بێت یان دونیا، بەڵام حەرامە و دروست نییە چاودێریی و جاسووسیکردن بەسەر کارە پەنهانییەکانیاندا بکرێت، تاکوو عەیبەیانی پێ هەڵبدرێتەوە.

* زیادەڕەویکردن لە ڕێگری پەنهانیدا دەبێتە هۆی زیادبوونی تاوانی ئاشکرا، هەروەها زیادەڕەویکردنی ڕێگری ئاشکرا دەبێتە هۆی زیادبوونی تاوانی نهێنی، دادوەریی و ناوەندگیری دەبێتە هۆی چارەسەرکردنی تاوان و دووڕوویی.

* ئەو کەسەی کە پێشدەخرێت بۆ وەرگرتنی پۆستی کاربەدەستی دەبێت هێز و زانستی لە خۆیدا کۆکردبێتەوە و بەرجەستەی کردبێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰهُ عَلَيۡكُمۡ وَزَادَهُۥ بَسۡطَةً فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِۖ وَٱللَّهُ يُؤۡتِي مُلۡكَهُۥ مَن يَشَآءُۚ﴾ [البقرة: ٢٤٧]

«خودا ئەوی لەسەر کردوونەتە فەرمانده؛ زانست و قەڵافەتیشی لە ئێوە پتر پێ داوە. خوا حەز بکات پاشایەتی بە هەر کەسێک بدا، دەیدا.»

بە ئەندازەی نەنگی و کەموکورتی لە هێز و زانستی سەرکردە، سیاسەت نەنگی و کەموکورتی تێدا ڕوودەدات.

* بەپێی بنچینە شەرعییەکان و تێڕوانینی عەقڵ لە کاتی دیاریکردنی سەرکردەدا دەبێت باشترینەکان هەڵبژێردرێت و پێشبخرێت؛ ئەگەر ئەوە نەدەتواندرا، دەبێت ئەو کەسە هەڵبژێردرێت کە نزیکە لە چاکەوە؛ ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە دەست نەکەوتن، ئەوا دورترین کەس لە خراپە و شەڕەوە هەڵدەبژێردرێت.

* یەکێک لە هەڵەکان ئەوەیە کە ئەو فەرموودانەی دەربارەی سەرکردە چاکەکان هاتووەن بەکار بهێندرێن بۆ سەرکردە ستەمکارەکان، ستەمکارەکان بۆ کافران و کافران بۆ موسڵمان. بەمەش ئەنجامەکان دەشێوێن، ئەمانە هەمووی دەدرێنە پاڵ دیین بە ستەم.

* سەرکردە ئەگەر خودی خۆی چاکبوو ئەوا دەتوانێت چاکسازی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ئەنجام بدات، بە جۆرێک کەسانی دیکە لە چەندین ساڵدا بۆیان ئەنجام نادرێت. ئەگەر خۆی گەندەڵ بوو، ئەوا گەندەڵی بە هەمان شێوە دەبێت، سیاسەت و چاکسازی لە گەورەترین ئامانجە نەقڵی و عەقڵییەکانن.

* ئەگەر کاروباری تەنها یەک کەس بگریتە دەست، ئەوا تۆ کاربەدەستیت. ئەو کەسەی نەتوانێت کاربەدەستییەکی بچووک بەڕێوە، ببات ناتوانێت

کاربەدەستی گەورە بەڕێوە ببات. کاروباری خودی خۆت چاک بکە، کاروباری کەسانی دیکەت بۆ چاک دەکرێت، ئەگەرنا لە هەواو ئارەزوو پارێزراو نابیت.

* بڕیاری دەسەڵاتدار ناکۆکییەکان هەڵدەگرێت و لای دەدات، ئەگەر زانا بوو بە بابەتە ناکۆکەکان. بەڵام کە نەزان بوو، پێویستی بە ئەوەیە خۆی لە نەزانییەکەی دەرباز بکات، نەک ناکۆکی لەسەر کەسانی دیکە لابدات.

* خودا ڕێگەی بە پەیامبەرەکەی نەداوە بە ویستی خۆی لە کارەکاندا بڕیار بدات، چ جای دەسەڵاتدارێک بە ویست و ئارەزووی خۆی بڕیار دەربکات: ﴿لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ﴾ [النساء: ١٠٥] «سا تۆش بەم قورئانە هەروەک خوا ڕێی پێ نیشان داویت، دادپەروەرانە داوەریی مەردم بکە.»

* ئەو سەرکردەیەی لە دەستوورەکەیدا حەڵاڵێکی چەسپاو حەرام دەکات یان حەرامێکی چەسپاو حەڵاڵ دەکات، ئەوا بەکۆدەنگ بە سەرکردەی شەرعی ناوزەند ناکرێت، خۆ ئەگەر حەڵاڵ و حەرامەکانی لە دەستووردا وەک خۆی دانا بەڵام بە کردار پێچەوانەی دەکرد، ئەوا بە سەرکردەی شەرعی هەژمار دەکرێت و هەڵەکانی بۆ ڕاست دەکرێتەوە و ململانێی لەگەڵ ناکرێت.

* دروست نییە سەرکردە ڕێگە بدات وتەی خەڵکی بۆ بگێڕنەوە، کاتێک بەخراپ باسیانکرد، چونکە دەبێت سەرکردە بۆ ئوممەت بژی نەک بۆ خودی خۆی، لە فەرموودەدا هاتووە لا يبلغن أحد منكم عن أحد فإني أحب أن أخرج سليم الصدر«با هیچ تاکێکتان وتەی کەسێکی دیکەتانم بۆ نەهێنێت، چونکە من پێم خۆشە بە دەروونێکی پاکەوە دەرچم لاتان.»

* گەورەترین هۆکاری خراپبوونی دەسەڵات ئەو دەزگا سیخوڕیانەیانن کە جیاوازی ناکەن لەنێوان سیخوڕیکردن بەسەر خراپەکارانەوە و باسکردنی دەسەڵاتدار لەلایەن خەڵکییەوە بەخراپە، هەردوو بابەتەکە بە یەک جۆر دەگوازنەوە.

* دروست نییە سەرکردەیەک لەسەر کورسی دەسەڵات بەردەوام بێت ئەگەر ژێردەستەکانی پێی ڕازی نەبوون، وەک چۆن دروست نییە پێشنوێژی کردن بۆ کەسانێک لە مزگەوتدا ئەگەر خەڵکی مزگەوتەکە ڕازی نەبوون بە پێشنوێژی ئەو کەسە، ئەو دروست نەبوونە ڕوودەکاتە پێشنوێژ و سەرکردە کە بەردەوام نەبێت لەسەر پێشەوابوونی ئەو خەڵکە نەک ڕووبکاتە نوێژخوێنان بۆئەوەی نوێژەکەیان تەواو نەکەن.

* ﴿فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ﴾ [یوسف: ٧٧] «لە پێشووشدا برایەکی ئەو دزی کرد.»

تۆمەتی دزییان دایە پاڵ یوسف، بەڵام سزای نەدان. نابێت دەسەڵاتدار سزای کەس بدات لەسەر باسکردنی بە خراپە، بێ بڵاوکردنەوەی، پەیامبەری خودا (ﷺ) بەو جۆرە بووە لە بەرانبەر ئەو کەسانەی بەخراپە باسیان کردووە.

* بازرگانی و دەسەڵات لە هەر کەسێکدا کۆبوویەوە، ئەوا بێگومان یەکیان ئەوی دیکەیان خراپ دەکات.

* ترس بیروباوەڕ دروست ناکات، بەڵکوو ترس و ناچاری لە دەروووندا دەچێنێت، کاتێک ترسەکەی ڕەویەوە هەڵدەگەڕێتەوە.

* هەرکەس بەزۆر شکۆ و هەیبەت لە دەروونی خۆیدا بچێنێت، ئەوا خەڵکی لە ڕووی خۆیدا چی پێخۆشە ئەوەی پێ دەڵێن، بەڵام لە پەنهاندا چی پێی ناخۆشە ئەوەی پێ دەڵێن. شکۆ و هەیبەت بۆ هەق دروست دەکرێت نەک بۆ خاوەنەکەی، پەیامبەری خودا کاتێک ئەو پیاوەی دیت کە ترسی لێ نیشت بە دیتنی شکۆ و هەیبەتی پەیامبەر، پێی فەرمووهون عليك أنا ابن امرأة تأكل القديد «ئارام بەرەوە، من کوڕی ژنێکم گۆشتی وشکەوە بووی دەخوارد.»

* دروستکردنی شکۆ و هەیبەت بەزۆر بۆ خودی خۆت دەبێتە هۆی ترساندنی ئامۆژگاریکار لە ئامۆژگاری کردنت، ئەمەش دەبێتە هۆی مانەوە لەسەر هەڵە و نەمانی کەسی ڕەخنەگر، زۆرکردن بۆ لادانی هەیبەت خەڵکی ڕووقایم دەکات لە ڕەخنەگرتن و جوێن پێدانی، ناوەندگیری هەردوو سوود و بەرژەوەندییەکە دەهێنێتە جێ.

* دروستکردنی هەیبەت بۆ نەفس هەرچەندە زیاتر دروستی بکەیت زیاتر خەڵکی دوور دەخاتەوە لە ڕاستکردنەوەی هەڵەکان ئەگەر ئەو کەسە ئەنجامی بدات، تا وای لێ دێت هەیبەتی زۆردەبێت و هەڵەی زۆر دەبێت و خاوەنەکەی بەرەو لەناوچون دەبات.... بەندە هەیبەتی خۆی لەپێناو خودادا وازلێ دەهێنێت و لای دەبات.

* ئەو هەیبەتەی کە لاچوونی بەسەردانایات، بە ماڵ و گەورەیی و دەسەڵات بەدەست نایەت، عوروەی کوڕی مەسعوود دەڵێت لە کاتێکدا هاوەڵدانەر بووە: کیسرا و قەیسەر و نەجاشیم بینیوە، سوێند بە خودا هیچ پادشایەکم نەدیوە بە هێندەی موحەممەد هاوەڵەکانی بەگەورەی ڕابگرن.

* بێگومان ئوممەتان گومڕا دەبن و دەوڵەتەکان لەناو دەچن، ئەگەر پیاوانی دەوڵەت و سەرکردەکان گەورەتر ڕاگیرێن لە دەستوور و یاسا، پەیامبەری خودا (ﷺ) هەرگیز تۆڵەی نە دەسەندەوە لەپێناو خۆیدا تەنها کاتێک سنوورەکانی خودا بشکێندرایە، ئەوا تۆڵەی لەو پێناوەدا دەکردەوە.

* کاتێک ئوممەت سەرکردەیان زیاتر سەردەخست لە پەروەردگار، ئەوا ئوممەتی دونیان نەک ئوممەتی دیین، ئەوە نیشانەی وازلێهێنان و لەیادکردنیانە لەلایەن خوداوە.

* ئەگەر لە ئوممەتێکدا ڕێزی سەرکردە زیاتربوو لە ڕێزی خودا و پەیامبەر و هاوەڵان، ئەو ئوممەتە ئوممەتی دونیایە نەک ئوممەتی دیین. ئوممەت ئەگەر گەورەیەکیان هەبێت، ڕێزی لێ دەگرن.

* دەرچوونی ژێر دەستەکان لە سەرکردەی موسڵمان کارێکی نادروستە، هەروەها دەرچوونی سەرکردەکان لە مافی ژێردەستەکانیان دووبارە کارێکی نادروستە، هاوتا ڕاگرتنی ئەم دوو دەرچوونە پەیوەستن بەیەکترەوە، زیادەڕەویکردن لە پاراستنی یەکیاندا دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئەوی دیکەیان.

*خەڵکی دەتوانن داوا لەسەرکردەکەیان بکەن کاروباری دونیایان بۆ چاک بکات، بەڵام پاش چاکردنی کاروباری ئایین، یەکێک لەوانەی خودا لەگەڵیان نادوێت: «پیاوێکە بەیعەتی بە پێشەوایەک داوە، بەڵام تەنها بۆ قازانجی دونیا بەیعەتی پێ داوە، ئەگەر دونیای پێ بدات ئەوا بەردەوام دەبێت، خۆ ئەگەر دونیای پێ نەدرا، ئەوا لە بەیعەتەکەی دەردەچێت.»

* ئەگەر سەرکردەکان گومانی خراپیان بە ژێردەستەکانیان برد، ئەوا زیاتر دووردەکەونەوە و بەربەست لەنێوانیاندا دادەنێن، خەڵکیش خراپەیان زیاتر دەبێت بەرانبەریان، لە فەرموودەدا هاتووە: «ئەگەر سەرکردە بە گومانی خراپ لەگەڵ خەڵکی جووڵایەوە، ئەوا خراپیان دەکات.»

* ناکۆکی نێوان سەرکردە و خەڵکی هۆکارەکەی نەبوونی دادوەری و زۆریی ستەمە، لە فەرموودەدا هاتووە: «وَمَا لَمْ تَحْكُمْ أَئِمَّتُهُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ، وَيَتَخَيَّرُوا مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَّا جَعَلَ اللَّهُ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ» «ئەگەر سەرکردەکان بە کتێبەکەی خودا حوکمیان نەکرد و خەڵکیان سەرپشک کرد لەوەی خودا دای بەزاندوە، ئەوا بێگومان خودا ناکۆکی و دووبەرەکی دەخاتە نێوانەوە.»

* فەرموودەی:إذا ابتغى الأمير الريبة في الناس أفسدهم «ئەگەر کاربەدەست بە گومانی خراپ لەگەڵ خەڵکی جووڵایەوە، ئەوا خراپیان دەکات.» واتە ئەگەر بەئاشکرا گومانی خراپی خۆی بڵێت و جاسووسیان بەسەرەوە دابنێت، ئەوا خەڵکی لە پەنهانیدا زۆر لەوە زیاتر دەکەن لەوەی دەیان ویست بە ئاشکرا ئەنجامی بدەن.

* لە فەرموودەدا هاتووە «هەرکەس پێشنوێژی بۆ کۆمەڵێک کرد و بەتایبەت بۆخۆی پاڕایەوە و بۆ ئەوان نەپاڕایەوە، ئەوا خیانەتی لێیان کردووە.»

کەسێک بە بەرپرسی پێشنوێژی دانراوە و تەنها بۆ خۆی پاڕاوەتەوە بە خیانەتکار ناوزەند کراوە جا دەبێت ئەو کەسەی بەرپرسیارییەتی دەسەڵاتی پێ درابێت و سامان بۆ خۆی زەوت بکات و بەشی خەڵکی نەدات چۆن ناوزەند بکرێت!

* مافی گەل لەسەر سەرکردە گەورەترە لە مافی دایک و باوک لەسەری: ﴿وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ [یوسف: ٩٣] «هەموو کەس و کارێکیشتانم بۆ بێنن.»

لە بنەڕتدا دەبوو یوسف سەردانی باوکی بکردایە، نەک ئەوان بهێندرێن بۆ لای یوسف، بەڵام بەو جۆرەی نەکرد، چونکە سەرقاڵ بوون بە مافی ژێردەستەکانەوە لەپێشترە.

* خیانەت و فێڵکردن لە گەل و ژێردەستەکان تاوانێکی گەورەیە، چونکە مافیان دەفەوتێنێت:ما من عبد يسترعيه الله رعية يموت وهو غاش لرعيته إلا حرم الله عليه الجنة «هەر بەندەیەک خودا بیکاتە سەرپەرشتیاری گەلێک و بمرێت لە کاتێکدا خیانەتی لێیان کردووە، ئەوا بێگومان خودا بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات.»

* ئیبراهیم داوای لە خودا کرد: ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ [البقرة: ٢٦٠] «پەروەرندەم! ئەتۆ مردووان چلۆن زیندوو دەکەیتەوە؟»

مووسا داوای لێ کرد و فەرمووی: ﴿رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ﴾ [الأعراف: ١٤٣] «گوتی: ئەی پەروەرندەی من! ئارەزووومە تۆ ببینم.»

پەیامبەری خودا چەندجار گەڕایەوە خزمەت خودا بۆ کەمکردنەوەی نوێژ، خۆ ئەگەر لەوە ئاسانتر لە سەرکردەکان داوا بکرێت ئەوا تووڕە دەبێت.

* ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ﴾ [الأحزاب: ١]

«ئەی پێغەمبەر! تۆ ترست هەر لە خودا بێت و مەچۆ سەر قسەی ئەوانەی بێباوەڕن و ئەوانەی دووڕوویی دەکەن.»

ئەمە هۆشدارییە بۆ پەیامبەر کە گوێڕایەڵی کافران و دووڕووان نەبێت، ئەگەر وتەیەکی هاوشێوەی ئەو وتەیە بە دەسەڵاتدارێکی ئەمڕۆی بڵێیت، دەبێت چۆن بڕوانێتە ئەو کەسەی ئەو قسەیە دەکات؟

* (اتق الله) وتەیەکە هەیبەتی ئەو وتەیە لەدڵدا بزر نابێت و ملکەچی بۆی لاناچێت تەنها لە کەسانێکدا نەبێت کە لە دووڕووییەوە گلاون: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ [البقرة: ٢٠٦] «کاتێک پێی بووترێت لەخوا بترسە، دەمار دەیگرێ بۆ بەدکرداری، جا ئەو دۆزەخە بەسە کە بەدترین جێگایا.»

* بە کردەوەکانیان هەڵە دەکەن و پاشان سەرزەنشتی خەڵکی دەکەن لەسەر بەرپەرچدانەوەیان. ئەگەر لەسەرەتاوە لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەروونی خۆیان بکردایە، ئەوا سەرزەنشتی کەسیان نەدەکرد.

* هیچ سەردەمێک نەبووە زیادەڕەوی نەکرابێت لە گوێڕایەڵیکردنی خەڵکی بۆ دەسەڵاتدارەکانیان، بەڵام میانڕەوی لە گوێڕایەڵییاندا دەگمەنە.

* بێگومان دەسەڵاتداران زانای هاوشێوەی (أبو حسان المنذر)یان هەر دەست دەکەوێت، (ابن حبان) دەربارەی دەڵێت: ئەو سەر بە حەجاج بوو و دەیگوت: «هەرکەس پێچەوانەی حەجاجی کوڕی یوسف بکات، ئەوا پێچەوانەی ئیسلامی کردووە.»

* جەختکردنەوە لە گوێڕایەڵبوون بۆ سەرکردە پێویستە وابەستە بکرێت بە ئەندازەی گوێڕایەڵی سەرکردەوە بۆ فەرمانەکانی خودا، وابەستەکردنی ئەو

گوێڕایەڵییەی کە لە شەرعدا هاتووە بە هەموو سەرکردەیەکەوە، ئەوا زیادەڕوییە لە گوێڕایەڵیدا و کەمتەرخەمییە لە مافی خەڵکیدا.

* چاکەخواز هۆشداری دەداتە خەڵکی لەسەر مورجیئەبوون لە بەرانبەر سەرکردەکان، وەک چۆن هۆشداری دەدات لە خەواریجبوون دژیان. پرسیار کراوە لە نضری کوڕی شومیل دەربارەی مورجیئە گوتویەتی: "دینێکی گونجاوە بۆ سەرکردەکان، دونیایانی پێ دەپارێزن و دینیانی پێ کەم دەکەنەوە.

* بە تەنها باسکردنی ئەو دەقانەی کە باس لە گوێڕایەڵی سەرکردە دەکەن سەرکردەی ستەمکار و خوێنڕێژ دروست دەکات، بەتەنیا باسکردنی مافی ژێردەستەکان دەبێتە هۆی دروستبوونی خەواریج و دەستدرێژکاران، هەروەها دادگەریی نێویان لەبەین دەچێت.

* وەلی ئەمر بریتین لە زانایان و دەسەڵاتدارەکان، دەسەڵاتی بێزانست تیاچوونە و زانستی بێدەسەڵاتیش بێئەرزشی و کەمییە. ئەو کەسەی خودا دەسەڵاتی بێت ئەوا کەمی و بێنرخی بەسەر نایات.

* ئەو کەسەی دەبێتە سەرکردە پێویستە کەسێکی زانا بێت: ﴿وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ﴾ [النساء: ٨٣]

گەر هەر لە لای پێغەمبەر و کاربەدەستەکانی خۆیان بیانگوتایە، دەیانزانی ڕاستەقینەکەی کامەیە و ئەو جۆرە دەنگوباسانە لە کوێوە سەریان هەڵداوە. هەڵێنجان پەیدا نابێت ئەگەر زانا نەبێت.

* ئەم ئوممەتە پێویستی بە هاوسەنگ کردنەوە هەیە، کۆمەڵێکیان زۆر بەرەڵڵا دەژین پێویستییان بە دیاریکردنی سنوورەکانیان هەیە، کۆمەڵێکی دیکەیان زۆر داخراو و کۆتکراو دەژین، پێویستیان بە کرانەوە هەیە ئەم هاوسەنگیەش تەنها زانایەکی بۆ خودا ژیاو دەتوانێت ئەنجامی بدات.

* هەموو حاڵەتەکانی زانایان لەبەرانبەر دەسەڵاتداراندا باس کراوە لە شەرعدا:

١- نەرمو نیانی و بەسۆزی ئەمە بەشی زۆرینەیەتی.

٢- توندی و زبری و هەموو پلەبەندییەکانی نکۆڵیکاری، ئەمەش بەتەواوی لە سەرگوزەشتەی مووسا و یوسف و حاڵی پەیامبەر (عليهم الصلاة وسلام) لەگەڵ قورەیشدا بەدەردەکەوێت.

* کەسی زانا لەنێوان دوو ئاشووب و فیتنەدایە. ئاشووبی دەسەڵاتداران و ئاشووبی شوێنکەوتووانی، هەق و ڕاستیش هیچ یەکیان نا ناسێت.

* پێ خلیسکانی زانا گەورەترە لە پێ خلیسکانی سەرکردە؛ چونکە پێ خلیسکانی سەرکردە بە مردنی بوونی نامێنێت و دەمرێت، بەڵام پێ خلیسکانی زانا بەزیندوویی دەمێنێتەوە هەرچەندە خاوەنەکەشی بمرێت.

* گەڕان بەشوێن تاوانە گەورەکانی سەرکردەدا و شاردنەوەیان، هەروەها گەڕان بەشوێن تاوانە بچووکەکانی زانایان و بڵاوکردنەوەیان تەنها لای ئەو کەسانە کۆدەبێتەوە کە خاوەن ئارەزوون. هەق پێوەری ڕاستی و دروستی خەڵکییە، خەڵکی پێوەری ڕاستی و تەواوی هەق نین.

* هەرکەس بڕوانێتە مێژووی ئیسلام، دەبینێت بۆچوونە نامۆکان و بەهێزبوونی گرووپە گومڕاکان تەنها لەو کاتانەدا بووە کە سەرکردە و دەوڵەت لاوازبوون و زانایان کەمبوون یان ڕێگرییان لێ کراوە.

* ئەگەر شکۆی زانا نەما بەشوێنیدا شکۆی سەرکردەش نامێنێت.

* ئەگەر پەتی پەیوەندی نێوان سەرکردە و زانایان ماڵ و سامان بوو، ئەوا پەت و گوریسی هەق و دادوەری شل و شێواو دەبێت.

* ئەو سامانەی کە زانایەک وەری دەگرێت لەسەر بێدەنگبوونی لە دیتنی ناهەقی حەرامترین سامانە، حەرامییەتی ئەم کارە زۆر گەورەترە لە ڕیبا و سوود، چونکە ڕیبا ستەمێکی تایبەتە، بەڵام بێدەنگبوون ستەمێکی گشتییە: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ﴾ [المائدة: ٤٢]

«بۆ درۆ، گوێ هەڵدەخەن و بە حەرام خواردن فێرن.»

* نزیکبوونەوە لە گەورە دەسەڵاتداران بابەتێکی خوازراوی دەروونە، بۆیە فیرعەون وەک گەورەترین دەسکەوت بۆ ساحیرەکانی باس دەکات: ﴿وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ [الشعراء: ٤٢]

«ئەوسا ئێوە لە نزیکانی خۆم دەبن. کۆششیان لە ناهەقیدا کرد تا نزیک ببنەوە لە دەسەڵاتدار.»

* ئەگەر سەرکردە پێچەوانەی هەقی کرد و کەسێکی شارەزاشی لێوە نزیک بوو، ئەو زانایە یان پارەی بێدەنگبوونی دەخوات لەسەر وتنی هەق، یان وتەی ناهەق دەڵێت: ﴿... إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ﴾ [الأعراف: ١١٣] «گەر ئێمە سەرکەوتین، تۆ دەبێت خەڵاتمان بکەی.»

* ئەگەر بینیت سەرکردەیەک لە کۆڕی زانایاندا بوو، بەڵام بەرەو چاکبوون نەڕۆیشت، ئەوا ئایینی ئەو زانایانەی بەرەو خراپبوون بردووە، ئەگەر زانایان لە کۆڕی سەرکردەکان دانیشتن و هەر باش نەبوون، ئەوا دیین و دونیای سەرکردەکەیان بەرەو تیاچوون بردووە.

* زانایان مەرجەعیان لای خودایە نەوەک گەل و دەسەڵات: ﴿ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا﴾ [الأحزاب: ٣٩]

«ئەو کەسانەی هەر فەرمانەکانی خودا دەگەیێنن و لەو دەترسن؛ جگە لە خوداش لە هیچ کەسی تر ناترسن. خودا حەسێبگەر بێت، بەسە.»

* ئەگەر سەرکردە فەتوای زانایانی وەرنەگرت کاتێک دژی خۆی بوو، ئەوا خەڵک کاتێکیش کە لە قازانجی ئەودا بێت وەریناگرن.

* یەکێک لە هەڵەکان لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا ئەوەیە سەرکردەکان تەنها گرنگی بە کاروباری دونیا بدەن و زانایانیش گرنگی بە کاری ئایین بدەن، ئەوکات سەرکردە هیچ گوێ نادات بە کاروباری ئایین و واگومان دەبات کاری ئەو نییە، هەروەها زانایانیش وا گومان دەبەن کاروباری دونیا کاری ئەوان نییە.

* ئەو شێواویەی لەمڕۆدا پەیدا بووە بەهۆی ئەوەوەیە سەرکردە وادەبینێت زانست کاری ئەو نییە و زانایانیش وا دەبینن دەسەڵات کاری ئەوان نییە، واتای ئەم ئایەتە دەشێوێت کە دەفەرمووێت: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾ [النساء: ٥٩] «بە فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا و کاربەدەستانی خۆتان گوێڕایەڵبن.»

* گەندەڵی لەسەر شانی گەندەڵکاران نەبێت هەڵناگیرێت، گەندەڵکارانیش لەسەر دوو قاچ نەبێت ناتوانن بووەستن: کاربەدەستی ستەمکار و زانای خراپ.

* دەوڵەتەکان بە ئارەزووەکان شکست دەهێنن، هزر و بۆچوونەکانیش بە گومان شکست دەهێنن. ئەگەر دەوڵەتێک مانەوەی بەردەوامی دەوێت، ئەوا با دەسەڵات نەدەن بە کەسانێک کە لە ئارەزوویاندا ڕۆچوون، هەروەها ئەو زانایانەش کە لە گوماندا ڕۆچوون.

* زۆرترین جۆری فێڵ کە قورسە لەسەر ئاقڵەکان لە هزری نەوە و جیلەکان دەری بهێنن ئەو فێڵانەیە کە سەرکردەیەکی ستەمکار و زانایەکی خراپەکار بەرپایی دەکەن و هەردووکیان لەسەر هەڵگەڕاندنەوەی شەریعەت کۆببنەوە و پێکهاتبن.

* «کەسی واهەیە وتەیەک دەڵێت لە تووڕەبوونی خودادا نازانێت گەیشتووەتە چ ڕادەیەک، خودا تووڕەیی خۆی لەسەر دەنووسێت» ئەمە بریتییە لە گومڕاکردنی سەرکردە بە فەتوای زانایان، (ابن عبدالبر) دەڵێت: "بێگومان بەو جۆرەیە."

* فیتنەی زانای خراپ گەورەترە لە فیتنەی دەجال، چونکە دەجال فیتنەیە بۆ خەڵکی گشتی، بەڵام زانا فیتنەیە بۆ خەڵکانی تایبەت و گشتی، پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «من لە پێشەوایانی گومڕاکار زیاتر دەترسم دەربارەی ئوممەتەکەم وەک لە دەجال.»

* گومڕایی لەناو ئوممەتدا تەنها بەهۆی سەرکردەوە بڵاو نابێتەوە ئەگەر زانایەکی خراپ پاڵپشتی کردبێت، هەروەها گومڕایی بەهۆی زاناوە بڵاو نابێتەوە ئەگەر سەرکردە پشتگیری نەکات، ئەگەرنا چەند وتەیەکی پشتگوێخراویان دەمێنێتەوە و هیچی تر، مێژوو لەسەر ئەمە شاهێدە.

* ڕۆژئاوا دەست دەکات بە پەستان خستنە سەر وڵاتان، هەر وڵاتەو بە ئەندازە و پێوەری تایبەت بە خۆی، جا بە لادانی ئەو بەشە دیینەی لە لووتکەی هەڕەمی هەر وڵاتێکدا ماوە، هەر کە جێ بەردێک چۆڵ بوو ئیدی چاو دەکەوێتە سەر ئەوەی ژێری، جا کاتێک دڵنیابوویت لە نەمانی ئەوەی کە لە ژێریدایە نامێنێت، هەرچەندە بە پلەبەندیش بێت، ئەوا وەڵامی پەستانەکان بدەرەوە، وەگەرنا دەست بگرە بەوەی کە بۆت هاتووە، چونکە بڕی ئازارهەر یەکێکە بەڵام لەنێوان هەر دوو پەستانێکدا پشوویەکی کەم هەیە! لەوانەشە چێژ لەوپشووە ببینیت بۆ خۆت ئەوسا ستەم بکەیت لە نەوەیەک کە تۆ ڕێگات خۆشکرد کە دوژمن بگاتە سەریان تاکوو تۆ دنیای خۆت بە خۆشی بژیت و ئەوان لە دینیاندا ماڵوێران بن! خراپترین جۆری وەڵامدانەوەش ئەوەیە کە کاربەدەست تۆپەکە بخاتە گۆڕەپانی فەقیهـ زاناوە، ئەوکات لە وێنەی فیقهـ و دین دەردەکەوێت، بەڵام

* ئەگەر خودا ویستی سزای کەسێک بدات، ئەوا هاوڕێیەکی بۆ دەڕەخسێنێت کە فەرمانی خراپەی پێ بکات و کارە خراپەکانی بۆ برازێنێتەوە تاکوو بەردەوامی بکات: ﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ﴾ [فصلت: ٢٥] «چەند دۆست (هاودەم)مان لە دونیا بۆ دانان کە خراپەکردنی دونیا و (بێبڕوایی) ڕۆژی دوایی بۆ ڕازاندنەوە و بەڵێنی (سزادانیان) بەسەردا درا.»

* فیرعەون دوژمنی مووسا بوو، هیچ پێویستی بە هاندان نەبوو بۆ ئەو دوژمنایەتییەی، لەگەڵ ئەوەشدا وەزیرە خراپەکانی هانیان دەدا تاکوو دۆستایەتیان بۆ فیرعەون بسەلمێنن، پێیان دەگوت: ﴿أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ [الأعراف: ١٢٧]

«چۆن تۆ لە مووسا و هۆزەکەی واز دەهێنی، وڵاتت لێ بشێوێنن.»

ئەویش زیاتر سوربوو دەیگوت ﴿سَنُقَتِّلُ أَبْنَآءَهُمْ﴾

«بەم زووە کوڕەکانیان دەکوژین.»

* خەڵکی خۆبەگەورەزانین لە دڵی سەرکردەکاندا دەچێنن، پاشانیش نایانەوێت ستەم بکەن، ستەمیش بەروبوومی خۆبەگەورەزانینە.

* سەرکردە دیکتاتۆر و لەسنووردەرچووەکان ناتوانن خۆیان دروست بکەن، بەڵکوو خەڵکی دروستیان دەکەن، خودا دەربارەی فیرعەون دەفەرمووێت: ﴿فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ﴾ [الزخرف:٥٤] «جا بەم قسانە گەلەکەی هەڵخەڵەتان و ئەوانیش گوێڕایەڵییان کرد، بێگومان ئەوان هەمیشە گەلێکی لەسنووردەرچوو بوون.»

* نەجاشی دەڵێت: "دەسەڵات لەگەڵ کوفردا دەمێنێتەوە، بەڵام لەگەڵ ستەمدا نامێنێتەوە دادوەری گەورەترین هۆکاری چەسپانی دەسەڵاتە، چونکە خودا زیاتر ستەملێکراوان بەهۆی بێهێزییانەوە سەر دەخات، تاکوو سەرخستن و تۆڵەسەندنەوەی بۆ گەورەیی زاتی خۆی."

* خودا هیچ پاشا و سەرکردەیەکی ستەمکاری لەناو نەبردووە هەرچەندە کافریش بێت، تاکوو ئاگەدارکەرەوەیەکی بۆ نەناردبێت لە عەقڵ یاخود نەقڵەوە کە ستەمکارییەکەی بۆ دەربخات، بەڵام خۆی پشتی هەڵکردووە و خۆبەگەورەزانییەکەی ڕێگەی نەداوە بگەڕێتەوە، ئەمەش دادوەری خودا لە گەردووندا دەیخوازێت.

* هەرپاشا و سەرکردەیەک شتێک بکاتە هۆکار بۆ ڕێگریکردن لە ئایینی گەلەکەی بێگومان خودا هەمان هۆکار دەکاتە هۆی لەناوچوونی یان دەیکاتە هۆی هاتنی هۆکارێکی لەناوبەری دەسەڵات و پاشایەتییەکەی. ئەمەش ڕێسایەکی بەردەوامە.

* فیرعەون دیتی مووسا بە دەریاکەی کێشا و بۆی بوو بە دوو بەشەوە، پاشان بە خۆی و سەربازەکانیەوە شوێنی کەوت لەنێوان ئەو دوو بەشەی دەریاکەدا دەرۆی کە وەک شاخی گەورە بوون. سەرکردەی ستەمکار کونی دەرزیش بە دەرگا و دەلاقەی سەرکەوتن دەبینێت.

* ئەگەر ستەمکار لە وەختی ململانێ و دژایەتیی هەقدا کەسێکی نزیک کردەوە لە خۆی، ئەوا ئەو نزیکبوونەوەیە لە بەرانبەر شتێکدایە، ساحیرەکان بە فیرعەونیان گوت: ﴿... إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ﴾ [الأعراف: ١١٣] «گەر ئێمە سەرکەوتین، تۆ دەبێت خەڵاتمان بکەیت.»

* یەکێک لە سیاسەتەکانی سەرکردەی ستەمکار بڵاوکردنەوەی حیزب و تاقمەکانە و ڕێگریکردنیانە لەوەی خەڵکی لەسەر یەک بیروباوەڕ کۆببنەوە، تاکوو ئەوان سەرقاڵ بن و دەسەڵاتی ئەم سەقامگیرببێت: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا﴾ [القصص: ٤]

«بێگومان فیرعەون لەو زەمینە باڵادەست بوو؛ خەڵکی ئەوێی کردبوونە چەند دەستەیەک.»

* جیاوازیکردنی خەڵکی و بەشەڕدانیان لە پیشەی ستەمکارانە: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ﴾ [القصص: ٤]

«بێگومان فیرعەون لەو زەمینە باڵادەست بوو؛ خەڵکی ئەوێی کردبوونە چەند دەستەیەک. هێندێکی هەر زەبوون دەکرد، کوڕەکانی سەر دەبڕین و ژنەکانی ڕادەگرتن.»

* ستەمکاران وا دەبینن دەسەڵاتیان سەقامگیر نابێت ئەگەر خەڵکی نەکەنە چەند گرووپ و تاقمێکەوە بۆئەوەی سەرقاڵ بین بەخۆیانەوە: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ﴾ [القصص: ٤]

* فیرعەون بەوانەی گوت کە باوەڕیان بە مووسا هێنابوو: ﴿ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ﴾ [طه: ٧١]

«بەر لەوە ڕێتان بدەم، ئێوە بڕواتان پێ هێنا.»

جا ئایا ڕێگەی دەدان ئەگەر داوایان بکردبا؟!

* یاسای ڕێگەدان بۆ پەرستشی خودا دادەنێن تاکوو لەو ڕێیەوە ڕێگری لێ بکەن، لە شێوەی سیستم و یاسا داناندا.

* ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ﴾ [غافر: ٢٦]

«فیرعەون وتی: لێم گەڕێن مووسا بکوژم.»

داوای ڕێگەدانی دەکرد لە گەلەکەی بۆ کوشتنی مووسا، لە کاتێکدا منداڵەکانی دەکوشتن لە ترسی دەرکەوتنی مووسا، خۆی بڕیاری دەدا ئەگەر گومانی ببردایە کەسێک پێچەوانەی دەکات و مۆڵەتی دەخواست و ڕاوێژی پێیان دەکرد ئەگەر بیزانیایە هاوبۆچوونی ئەون.

* ڕاستییەکان لە واقیعدا چەسپاون، پاشان لە زەیندا دەچەسپن پلەبەندییەکەی بەم جۆرەیە لە گەردووندا، بەڵام ئەو عەقڵانەی تەنها بۆچوونی خۆیان دەچەسپێنن شتەکان لە مێشکدا دەچەسپێنن بەبێ ئەوەی لە واقیعدا بەو جۆرە بێت، پاشان دەیانەوێت بەزۆر بیگونجێنن لەگەڵ واقیعدا.

* ئەگەر سەرکردە ستەمکار و لەڕێ دەرچووبوو، ئەوا شتێکی چاوەڕوانکراوە کە سەرکەوتن و بۆچوونی تەواو لە لاوازترین کەسیانەوە سەرهەڵبدات: ﴿إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ [النمل: ٣٤] «بەڕاستی پادشایان هەر کاتێک (بەزۆر) چوونە شارێکەوە، خراپ و وێرانی دەکەن و دەسەڵاتدارەکانی ئەو شارە ڕیسوا و سەرشۆڕ دەکەن و (کاتێک زاڵ بوون)، هەربەو جۆرە دەکەن.»

# زیندانیکردن و دوورخستنەوە

* بەندکردن بەندکردنی دڵە، یەکێک ئازاد و خۆی دەکوژێت، یەکێکیش بەندکراو و دەستبەسەرە و دڵی خۆشە.

* ئەگەر جەستە بەندکرا، ئەوا دڵ ئازاد دەبێت، چونکە جەستە خزمەتکاری دڵە و ململانێی هەوڵ و ئاگایی لە گەڵدا دەکات، زۆرترین ئەو نیعمەتانەی دران بە یوسف لە دانایی و ئەقڵ و سیاسەت، لە کاتی بەندینخانەدا بوو.

* جەستە بەند بکرێت و دڵ بە ئازادی بمێنێتەوە، باشترە لەوەی تاوانێک دڵ بەند بکات و جەستە ئازاد بێت: ﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ﴾ [یوسف: ٣٣]

«گوتی: ئەی پەروەرندەی من! زیندانەکەم پێ خۆشترە لەوەی ئەوان لێم دەخوازن.»

* گەورەترین ستەم، بەندکردنە بە ناهەق: ﴿إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ [یوسف: ٢٥]

زۆرینەی ئەو وتانەی باس لە زیندان و بەندکردن کراوە لە وەحی و سروشدا لە میانەی سەرزەنشتدا هاتوون، چونکە سزایەکی ناچارییە نەک هەڵبژێردراو.

* بەندکردن بەبێ حوکم و بڕیارێکی ئاشکرا ستەم وتاوانە، هەروەها بەندکردنی کەسێک کە خۆی هانا بێنێت لە دەست ستەمێک ئەوەیان ستەمە لەسەر ستەم.

* دیاریکردنی شەوی قەدر لەسەر ئوممەتێک هەڵگیرا، بەهۆی دەمەقاڵێی دوو تاکی ئوممەتەوە، یەکیان ستەمکار و ئەوی دیکەیان ستەملێکراو، جا دەبێت چۆن بێت کە هەزاران کەس ساڵانێکی دوورودرێژ بەستەم و بێ بڕیاری دادگا بەندکراون.

* بە سەحیحی هاتووە پیاوێک هەستاوە لەگەڵ پەیامبەر دەربارەی بەندکراوەکان پرسیاری لە پەیامبەر کردووە لە کاتێکدا لەسەر مینبەربووە گوتویەتی: "لەسەر چی هاوسێکانم بەندکراون؟" پەیامبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: «هاوسێکانی بۆ ئازاد بکەن.»

* هەموو ستەملێکراوێک بۆ ماوەیەک بێئاگا دەبێت لە نزاکردن لەو کەسەی ستەمی لێ کردووە، تەنها بەندکراو نەبێت بەردەوام شەو و ڕۆژ لە دەرگای ئاسمان دەدات تا ئەو کاتەی ئازاد دەبێت.

* گەڕان بە ئازادی نیعمەتێکی گەورەیە، تەنانەت بۆ ئەوانەش کە بەهەشت لە سینەیاندایە وەک پەیامبەران: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ﴾ [يوسف: ٥٦]

«ئا بەم جۆرە یوسفمان لەم سەرزەمینە جێ کردەوە؛ (خۆش نشینێک بوو) لە هەر جێ خۆی ویستبای لەوێ دەژیا.»

بەڵکوو تەنانەت بۆ گیانداریش نیعمەتە خودا دەربارەی هەنگ دەفەرمووێت ﴿فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ﴾ [النحل: ٦٩] «جا بەئاسانی بەو ڕێگایانەدا بڕۆ کە پەروەردیگارت بۆی دەسنیشان کردووی.»

* خودا لە قورئاندا دەرکردنی مرۆڤی لە زێد و وڵاتەکەی لەگەڵ ڕشتنی خوێنیدا بەناهەق باس کردووە، چجای بەندکردنی بە ناهەق: ﴿لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ وَلَا تُخۡرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ﴾ [البقرة: ٨٤]

«خوێنی یەکتر مەڕێژن و خۆتان هەر لە زێدی خۆتان وەدەر مەنێن.»

* دەرکردنی مرۆڤ لە زێدی خۆی چ بە بەندکردن یان دورخستنەوەی بەناهەق بێت هەردووکیان خودا لەگەڵ کوشتندا باسی کردوون چونکە زۆر قورووسە لەسەر دەروون و زۆر تاوانێکی گەورەیە لای خودا: ﴿لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ﴾ [البقرة: ٨٤]

* ڕێگری کردن لە چاکەخوازان لە بەسەربردنی ژیان لە زێدی خۆیاندا جۆرێکە لە سزای ستەمکاران بۆیان: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ﴾ [إبراهيم: ١٣] «ئەوانەی دژی خودا بوون، بە پێغەمبەرەکانیان گوت: ئێمە دیارە لەم سەرزەمینەی خۆمانتان وەدەر دەنێین.

گوتیان ﴿لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ﴾ هەستکردنیان بەتەواوی موڵک و خاوەندارییان، هەستی ماف بەخۆدانی پێدان سەبارەت بە بڕیاردان لەسەر ئەو بابەتە.

* هیچ پەیامبەرێک نەبووە لە وڵاتەکەی دەرنەکرابێت، یان هەڕەشەی بەوە لێ نەکرابێت:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا﴾ [إبراهيم: ١٣]

* ئەگەر بەندکردنی پشیلەیەک هۆکاری چوونە دۆزەخ بێت، ئەوا ئازادکردنی هۆکاری چوونە بەهەشتە، ئەمە لە ئاژەڵەکاندا بەو جۆرەیە، جا دەبێت سزای ئەو کەسەی مرۆڤێک بە ناهەق و ستەم بەند دەکات چۆن بێت و پاداشتی ئەو کەسەی ئازادی دەکات دەبێت چەند بێت.

*بەشداربوون لە ئازادکردنی ئەو بەندکراوانەی بە ستەم بەندکراون لە گەورەترین هۆکارەکانی نزیک بوونەوەیە لە خودا، چونکە منداڵەکانیان وەک هەتیو و ژنەکانیان وەک بێوەژن هەژمار دەکرێن.

* ئازادکردنی بەندییەکان واجبە لەسەر هەموو تواناداڕێک جا سەرکردە بێت یان زانا یان بازرگان، هەروەها لەسەر هەموو کەسێک کە توانای هەبێت لە گشتی و تایبەتی بەهۆی ئەو فەرمانەی لە فەرموودەدا هاتووە: فکوا العاني«بەندییەکان ئازاد بکەن.»

* ئەشکەنجەدانی بەندکراو کارێکی حەرامە تەنانەت بە ڕاگرتنی بێت لەبەر تیشکی خۆر، هیشامی کوڕی حکیم بە لای چەند دیلێکدا تێپەڕی لەبەر تیشکی خۆر ڕاگیرا بوون، گوتی پەیامبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: «إن الله يعذب الذين يعذبون الناس في الدنيا» «خودا سزای ئەوانە دەدات کە لە دونیادا سزای خەڵکی دەدەن.»

* بەئاسانگرتنی بەندکردنی ئافرەتان لە دابی ئیسلام و دابی عەرەب نییە، پەیامبەری خودا هیچ ئافرەتێکی بەند نەکردووە تەنانەت ئەو ئافرەتە جوولەکەیەش کە ژەهرخواردی کرد، هەروەها ئەو ئافرەتە سیخوڕەی کە حاتەب ناردبووی ئازادی کرد.

* ئەگەر دەسەڵاتدار مرۆڤێکی دوورخستەوە، ئەوا پێویستە لەسەری هەموو هۆکارێکی ژیانی لەو جێگەیە بۆ دەستەبەر بکات و نەفەقەی خانەوادەکەی دابین بکات، خودا ئادەمی لە بەهەشت دوور خستەوە بە وتەی ﴿اهبطوا﴾ [البقرة: ٣٦] بەڵام ژیانی بۆ دەستەبەر کرد ﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ﴾ [الأعراف: ٢٤] «تا ماوەیەک جێگا و مایەی ژیانتان لە زەوی دەبێت.»

# دووان سەبارەت بە چەند ڕووداوێك

* خۆکوشتن یەکێکە لە حەوت تاوانە لەناوبەرەکان، خۆکوشتن تاوانەکەی گەورەترە لە کوشتنی کەسانی دیکەش بە ستەم. حوکمی خودا نابێت لەپێش چاو و ناخی خەلکیدا ون بێت هەرچەند مرۆڤ بشکێنرێت یان ستەمی لێ بکرێت.

* چارەسەری خۆکوشتن ناکرێت تەنیا بە دۆزینەوەی کار وپیشە بکرێت، ئا لەم ڕوانگەیەوە کەسانێک ئیمان وباوەڕیان لە دڵی خەڵکیدا لاواز کردووە و دژایەتییان کردووە، لە بواری فێرکردن و ڕاگەیاندندا و دینیان کەم کردووەتەوە و لەبەرانبەریشدا مادەگەرایی و خاوەن مادەکانیان گەورە کردووە.

* مرۆڤی عاقڵ دەستپێشخەری ناکات بۆ خۆکوشتن مەگەر لەپێناو کارێکی مەزندا، هەرکەس سامانی لا گەورە بوو، ئەوا بۆ دەستخستی ئامادەیە لەپێناویدا خۆی بکوژێت، بە هەمان شێوە هەرکەس خودا بە گەورە ڕاگرێت، ئەوا هەنگاو دەنێت بۆ مردن لەپێناویدا، ئەویان بە خەمبارییەوە بەرە و مەرگ دەچێت، ئەمیان بەخۆشحاڵییەوە.

* وێنەی ماڵی پادشایەکی سەدەی پێشووم دیت، هەژارەکانی ئەمڕۆ ئەوەندەیان هەیە کە ئەو خاوەنی بووە، سەیرە کەسانێک لەسەر دونیا خۆیان بەکوشت دەدەن، دونیا ئەوانەی سەرەتای لەخشتەبردووە بەوەی وا دەزانن دەوڵەمەندن و بەوهۆیەوە لەڕێ دەرچوون، ئەوانەی دواتریش لەخشتە دەبات بەوەی هەژارن و لەپێناویدا خۆیان دەکوژن!

* خودا سەرگوزشتەی کافران و سەرکردەکانی ئوممەتانی پێشووی بۆ باسکردووین کە چەندە سەرکەش بوون بەرانبەر گەلەکانیان، پاشان چۆنیەتی سزادانیانی بۆ باسکردوین بۆئەوەی پەند وەرگرین. لەمڕۆدا خودا نیشانمان دەدات سەرکەشان چۆن بوون و سزایان چۆن بووە؟!

* ئەو ڕووداوانەی خودا لە ئێستادا هەڵیان دەسووڕێنێت، زۆرێک لە پێشبینی و شیکارییەکان کە بۆیان دەکرێت هەڵەیە، بەڵکوو عەقڵ سەرگەردان و وەستاوە تیایاندا، دەرچوونی ئەو ڕووداوانە لەو یاسا گەردوونییە بەردەوامەی کە هەیە نیشانەی نزیکبوونەوەی قۆناغێکی گەورەیە.

* ئەو ڕووداوانەی لە ڕۆژهەڵاتدا ڕوو دەدەن، تەبا نین لەگەڵ ڕێسای گەردوونیدا، ئەمەش تەنها بەوە لێکدەدرێتەوە کە ویستێکی خودایی خێرایە، تاکوو بەندەکان و وڵاتەکان ئامادەساز بکات بۆ ڕووداوێکی گەورە.

.* ڕووداوە گەورەکان دەرئەنجامی گەورەیان لەپاش دێت، ڕێسای گەردوون بەو جۆرە هاتووە.

* ئەگەر خودا ویستی دەرئەنجامێکی گەورە بخوڵقێنێت، ئەوا هۆکاری گەورەی بۆ دەستەبەر دەکات، سونەتی خودا لە گەردووندا بەو جۆرەیە.

* ئوممەت لە ژانێکی زۆردا دەژییێت، هەموو ژانێک لەدایکبوویەک بەدوای خۆیدا دەهێنێت، هەموو لەدایک بوویەکیش ئازار وناڵەی خۆی هەیە.

* ئەوەی دەبیندرێت لە ڕاونانی هەندێک لە سەرکردەکان و بەندکردن و کوشتنی هەندێکی دیکەیان لە ماوەی یەک ساڵدا، لە گەورەترین پەندەکانە کە قورئان هاوشێوەکانی بۆ باس کردووین، هاوشێوەکانی ئەم ڕووداوانە لە چەندەها سەدەدا نەبێت، ڕوو نادات، بەڵام خودا هەمووی لەیەک ساڵدا کۆکردەوە.

* هەرکەس سادە بڕوانێت لەو گۆڕانکاریانەی کە ڕوو دەدات لە دەوڵەتەکاندا بەبێ ئەوەی پاڵیان بداتە تووڕەیی و سۆزی خودا و ئەو تووڕەییەی لەسەر کێ دەچەسپێت و ئەو سۆزەی بۆ کێ دەستەبەر دەبێت، ئەوا ئەو کەسە بە بێئاگا وەسف دەکرێت.

* گۆڕینی ئوممەتان و دەوڵەتەکان نیشانەی دابەزینی ویستێکی نوێی خوداییە بۆ گۆڕانکارییەکی گشتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ﴾ [الرعد: ١١] «بەڕاستی (بار و حاڵی) هیچ گەلێک ناگۆڕێت، هەتا ئەوان خۆیان (بار و حاڵی) خۆیان نەگۆڕن و هەر کاتێک خوا بیەوێت هۆزێک تووشی بەڵا بن، هیچ بەرگرێک بۆی نییە.»

* قەزافی ڕێگەی دەربازبوونی لێ تەسکبوویەوە و لە هەموو کووچ و قوژبنێکی زەویدا بەدوای ڕێگەیەک دەگەڕا بۆ دەربازبوون، بە جۆرێک تەنها ناو بۆرییەکی بەدی کرد و چووە ناوی، لەکاتێکدا ئاسمان هەمووی بەڕوویدا کراوە بوو و چاوی بۆی بەرز نەکردەوە.

* خەڵکی دەست دەگرن بە موڵک و دەسەڵاتیانەوە وەک چۆن دەست دەگرن بە گیان و ژیانیانەوە، هەرکامیان دەربچێت، ئەوا ئەوی دیکەیان بەشوێنیدا دەردەچێت، بۆیە خودا وەرگرتنەوەی دەسەڵاتی بە لێسەندن ناو بردووە: ﴿وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ﴾ [آل عمران: ٢٦]

کێش تۆ حەزکەی، دەستەڵاتی لێ دەستێنیت.

* خودا فەرمان بە پەیامبەرەکەی دەکات کە حوکمی خودا بەسەر خەڵکیدا بچەسپێنێت، ئەوانەشمان بۆ باس دەکات کە پشتی تێ دەکەن. ئەوانیش سێ تاقمن: جوولەکە و گاور و دووڕووەکانن: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ [النساء: ٦٥]

«بەڵام نەخێر، سوێند بە پەروەرندەی تۆ، ئەمانە نابنە خاوەنی بڕوا، مەگین وەختێ کە لە کێشە و هەرای نێوان خۆیانا تۆ نەکەن بە قازی و داوەر.»

* خودا سوێندی بە خۆی خواردووە دەربارەی ڕوونکردنەوەی حاڵی ئەو کەسانەی پشت دەکەنە کارکردن بە شەرعی خودا: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ﴾ [النساء: ٦٥]

* هەڵگێڕانەوەی حاڵی دەوڵەتان و سەرکردەکان لە ماوەیەکی کورتدا، جێی پەند و ئامۆژگارییە بۆ هەموو ئەوانەی پلەیان لە ئەوان کەمترە و پشت دەبەستن بە پێگە و سامان و پۆستیان، وەک ئەوەی پێیان بڵێت ئەمین نەبن لە پیلانی خودا، چونکە گەورەترین پاڵپشت و قەڵای پارێزەری مرۆڤ تەنها خودایە سبحانه وتعالى.

* سزا و تۆڵەی خودا بە جۆرێک دەرکەوت لەسەر ستەمکاران و ئەوانەی دژایەتی ئاییینی خودایان دەکرد کە مرۆڤی شۆک وسەرسام کرد، یەکێک لەوانەی زۆرترین دژایەتی باڵاپۆشی دەکرد ژنی سەرۆکی تونس بوو، لە کاتێکدا خۆی بە نیقاب و پەچەوە ڕای کرد.

* سەیرە ئەم دەسەڵاتدارانە هەر بەردەوامن لەسەر دژایەتیکردنی ئایین بۆ ڕازیکردن و ڕێزداربوونیان لای ڕۆژئاوا، لە کاتێکدا دەزانن ئەوان لە سەرۆکی توونس «بن عەلی» ڕێزدارتر نین لای ڕۆژئاوا، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک هەڵهات، مەنزڵێکی لای ئەوان دەست نەکەوت.

* پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لە توونسەوە دەڵێت: "لەسەردەمی «بن علي» خۆم کردە گاور، ئەمڕۆ گەڕامەوە ناو ئیسلام و ١٦ کەسی توونسیش لەگەڵ مندا گەڕانەوە ناو ئیسلام، دەڵێت: بوون بە گاوری ڕێگە پێدراو بوو، بەڵام بانگەشە بۆ لای خودا یاساغ و قەدەغە بوو بە بەڵگەی تیرۆر."

* لەگەڵ بوونی ئەو هەموو ئاشووب و سزا خوداییانە لەسەر دەوڵەتان لە ئێستادا، کەچی دەوڵەتانێک دەبینیت زیاتر دوور دەکەونەوە لە خودا لەبری ئەوەی نزیک ببنەوە و بەرەو خودا هەنگاو بنێن، ئایا پەلەی سزای خودایانە یاخود لە بێئاگایدا دەژیین؟!

* خودا دەسەڵاتی بە (إرث) میرات ناوبردووە تا ئاماژەبێت بەوەی کە کەسی لابراو وەک مردوو هەژمار دەکرێت و ئەوەی لە دەسەڵاتدایە بە زیندوو هەژمار دەکرێت، خوداش خۆی ژیێنەر و مرێنەرە: ﴿وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَٰرِبَهَا﴾ [الأعراف: ١٣٧]

«ئەوسا ئێمە خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئەو وڵاتەمان -کە بەرەکەتمان پێ دابوو- کردە بەشی ئەوانەی چەوسابوونەوە.»

* ئەو ئایەتە دێنمەوە یادی هەموو حیزبێکی ئیسلامی دەسەڵاتدار: ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِى ٱلْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [الأنفال: ٢٦] «بیر لەو دەمە بکەنەوە کە ئێوە لەم وڵاتەدا کەمێکی بێدەستەڵات بوون؛ ترستان هەبوو خەڵکی تر دەرتان بکەن و بێ جێ و ڕێ بمێننەوە. پەنای دان و یاریدەی دان و سەرکەوتن و ڕۆزیی پاک و ڕەوای پێ دان؛ بەشکە شوکرانەبژێر بن.»

* سووریا برینەکەی خوێنی زۆرتری لەبەر دەڕوات، بەڵام برینی میسر شوێنەکەی مەترسیدارترە. پەروەرێنمان ستەمی ستەمکاران و دەسەڵاتی دەسەڵاتداران لەسەر ئەم ئوممەتە هەڵگرە.

* ڕۆژئاوا بەسیاسەتە فێڵاوییەکەی و ڕۆژهەڵاتیش بە ماڵ و سامانەکەی لەهەوڵدان و دەیانەوێت میسر جێگیر نەبێت و شام بەردەوام خوێنی لێ بچۆڕێت، تەنیا بۆئەوەی بۆ خەڵکی بسەلمێنن کە دوێنێیان لە ئەمڕۆیان باشتر بووە.

* فیرعەون یەکەم کەس بوو داوای پشتگیری لە خەڵکی دەکرد لەسەر خوێنرێژی، هەموو گەلێکیش میرات گری هەیە: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ﴾ [غافر: ٢٦]

«فیرعەون وتی: لێم گەڕێن مووسا بکوژم؛ با ئەو هاوار بۆ پەروەرندەی خۆی بەرێت؛ من دەترسم دینەکەتان بگۆڕێت و پشێوی لەم زەمینەدا بنێتەوە.»

* ماڵ و سامانی گشتی کە حوکوومەت و کەسەکان بە شێوەی حەرام و نادروست بەکاری دەهێنن، دەتواندرێت هەژاریی هەموو ئوممەتی پێ لاببرێت چجای ئەوەی ئەو سامانە لەسەر شتە ناپەسەند و شتە ئاساییەکان بەکاربهێندرێت، هەمووان بەرپرسن لەو بارەیەوە.

* گۆڕین و شێواندنی وتەی خەڵکی کاری هاوەڵدانەران بووە، پەیامبەری خودا (ﷺ) ڕیبای حەرام کرد، هاواریانکرد: "کرین و فرۆشتنی لەسەر حەرام کردوین." خودا جیاوازیی ئەو دووانەی دابەزاند: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ [البقرة: ٢٧٥]

خودا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە و ڕیبای حەرام کردووە.

* ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [الأنفال: ٦٧] «بۆ هیچ پێغەمبەرێک نییە کە دیلی (لە دوژمنان) هەبێت، هەتا کوشتاری زۆریان لێ نەکات لە زەویدا. ئێوە ماڵی دونیاتان دەوێت (بە وەرگرتنی فیدیە) خواش (پاداشتی) ڕۆژی دوایی دەوێت (بۆ ئێوە) خواداش توانا و زاڵی کار دروستە.»

کۆنگرە و کۆبوونەوەی سەرکردە عەرەبییەکان بە هێندەی بەدیلگرتنی کەسێک لەلایەن موجاهیدێکەوە کاریگەری نەبووە.

* دروستکردنی مزگەوت لە ڕۆژئاوا، نابێتە هۆی دروستیێتی دروستکردنی کەنیسە لە وڵاتانی ئیسلامیدا، خودا ژنهێنانی لە ئەوان حەڵاڵ کردووە، بەڵام بەشوودانی ئافرەتانی ئێمەی بە ئەوان بە حەرام داناوە، ئەوە حوکمی خودایە نەک دانووسان و پاداشتدانەوەی هاوشێوە.

* ئیبن عابدین زانای یەکلاکەرەوەی حەنەفی مەزهەبەکان هاوڕایی دەگوازێتەوە لەسەر حەرامیێتی کردنەوەی کەنیسە لە وڵاتانی موسڵماناندا، نابێت ئاوەڕ بدرێتەوە بەلای فەتوای ئەوانەی پێچەوانەی ئەم بابەتە فەتوادەدەن، دروست نییە ئەو فەتوایە وەرگیرێت.

* د. قەرزاوی لە ئەبووحەنیفەوە دەگێڕێتەوە کە لای دروست بووە بەڕەهایی کردنەوەی کەنیسە لە وڵاتانی موسڵماناندا، بەڵام ئەم گێڕانەوەیە هەڵەیە، ئەوەی لە ئەبووحەنیفەوە ڕیوایەت کراوە دروستکردنی کەنیسەیە لە گوندە تایبەتەکانی گاورەکاندا.

* کردنەوەی کەنیسە لە بەحرێن دژایەتیکردنی خودایە، هەندێک لە زانایان دەقی تایبەتیان هەیە ڕێگەدان بە کردنەوەی کەنیسە بە کوفر هەژمار دەکەن، پێویستە بەحرێن بەرانبەر نیعمەتی ئەمن و ئاسایشیان لەخودا نزیک ببنەوە، نەک لێی دوور بکەونەوە.

* واجبە لەسەر زانایان و سیاسەتمەداران ڕێگری بکەن لەوەی خەڵکی گۆڕەکان بەرز بکەنەوە زیاد لە ئەندازەی دیاریکراوی شەرعی. هەموو ئەو گۆڕانەی جگە لە خودا پەرستراون، هەموویان سەرەتاکەی بەوجۆرە بووە. ئەو کارە بەدەق حەرام کراوە و لە هەرچوار مەزهەبەکەشدا.

* ڤیستیڤاڵەکان وێنای شارستانیەت دەکەن"جا بەهۆی پیشەسازی و کەرەستە فۆلکلۆرییەکان بەڵام تێکەڵاوی و سەما و گۆرانی و مۆسیقا و سفوری ئەوانە هەمووی شارستانیەتی ئەورووپایە، هیچ پەیوەندی بە شارستانیەتی عەرەب و شارستانیەتی موسڵمانانەوە نییە.

* کڕینی وشتر بە چەندەها ملیۆن تەنها بۆ جوانی، نەفامییەکی تازەیە و حەرامە، زیاتر تاوانبار دەبن و پیاوەتییان لەکەدار دەبێت لە وەختێکدا کە ئافرەتان و پیاوانی شام چەند دینارێکی کەمیان دەوێت بۆ داپۆشینی نامووسیان.

* ڤیستیڤاڵ و ڕازاندنەوەی وشترەکان دوو کۆبوونەوەن، یەکەمیان:پێویستە پەندی لێ وەربگیرێت، دوهەمیان: پێویستە تێڕامانی تێدا بکرێت، بەڵام ئەو دوو نیعمەتە گۆڕدراون؛ یەکەمیان بووەتە لادان لە ڕێی خودا، دوهەمیان بووەتە خۆبەگەورەزانین، ئەمانەش سپڵەیین بەرانبەر نیعمەتەکانی خودا.

* پێشبڕکێکردنی خەڵکی بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی جا بە هۆکار و بەبێ هۆکار، بە جۆرێک بووەتە بنێشتە خۆشەی سەرزوبان، ئەمە بە یەکێک لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دادەندرێت، لە فەرموودەدا هاتووە «قیامەت بەرپا دەبێت لەو کاتەدا کە ڕۆمەکان زۆرترینی خەڵکین، مەبەست لە زۆری زوبانیانە، عەرەب هەموو ئەوانە بە ڕۆمی دادەنێت کە بە زوبانی ڕۆمی دەدوێن. ئەوانەش بە ئەعراب و دەشتەکی دادەنێن کە لە گوندا نیشتەجێن هەرجەندە عەرەبیش نەبن. ئەمڕۆ واز لە هەموو زمانەکان هێندراوە و ڕوو کراوەتە زمانی ڕۆم.

* هەندێک لە موسڵمانان کاتێک ژنەکانیان لە وادەی منداڵبوونیان نزیک دەبنەوە، دەیانبەنە وڵاتانی ڕۆژئاوا تاکوو لەوێ منداڵیان ببێت، منداڵەکە ببێتە خاوەن ڕەگەزنامەی ئەو وڵاتەی تیایدا لەدایکبووە. هۆکاری چاندنی ئەم ڕسواییە لە دڵی ئەو کەسەدا لاوازی ئیمان یاخود سەرشۆڕی سەرکردەکانە لەمڕۆدا.

* دروست نییە ئافرەت لە دەرەوەی ماڵی خۆی یان ماڵی سەرپەرشتیارەکەی شەو بمێنێتەوە و بخەوێت مەگەر هاوسەرەکەی بزانێت و ڕێگەی بدات، لە فەرموودەدا هاتووە بەدروستی: «هەر ئافرەتێک پۆشاکی لابدات لە جگە لە ماڵی خۆیدا، ئەوا پەردەی لەنێوان خۆی و خودا هەڵماڵیوە.»

* ڕێگەدان بە مانەوەی ئافرەتان لە ئوتێلەکان بێ ڕێگەدان و زانینی هاوسەر و سەرپەرشتیارەکانیانەوە کردنەوەی دەرگای خراپەیە، هۆکاری ئاسان دەستخستنی حەرام کراوەکانە و کردنەوەی دەرگای سەرشۆڕییە، بە فەتوای ڕەسمی ڕێگری لێ کراوە کەچی فەرمانی پێ دەکرێت تاکوو ئێستەش.

* خودا ئەوەی جێگیر کردووە کە زانایانی گاور و جوولەکە ساختەکاری و گۆڕینیان کردووە لە تەورات و ئینجیلدا و داویانەتە پاڵ خودا. خودا پەیامبەرەکەی لەو بابەتە بە ئاگا دەهێنێتەوە چونکە درۆکردنە بە ناو خوداوە. جا هەر بەئەقڵ گونجاوە نووسراوێک ساختە بکرێت پاشان بدرێتەپاڵ پاشایەک؟!

* سوودوەرگرتن لە پێشەنگای کتێب گرنگە بۆ فێرخوازانی زانستە شەرعییەکان، هەرچەندە هەندێکجار چەندین خراپە و تاوانی تێدا ئەنجام دەدرێت، بەڵام بوونی یەک چاکساز لەو شوێنە کە بە دانایی و هێمنی و زانستەوە مامەڵە بکات باشترە لە سەد چاکەکار کە تەنها سوودی بۆ خۆی هەبێت لە دەرەوە.

* مۆڵەت خواستنیان لەو شتانەی کە پێویست بە مۆڵەت ناکات، خۆسەپاندنێکە ستەمکاران ئەنجامیان داوە لە کاتی خۆیاندا، فیرعەون مۆڵەت خواستنی بە مەرج دانابوو بۆ باوەڕهێنان بە مووسا: ﴿ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ﴾ [طه: ٧١]

* عەقڵ و نەقڵ وادەخوازێ: ئەگەر تاوان و خراپەکاری زۆربوو پێویستە ئەو کەسانەی لێپرسینەوە دەکەن ژمارەیان زۆر بێت تاکوو ڕێگری و هاوسەنگی پارێزراو بێت، بەڵام ئێستا دەبینین خراپەکاری ئاسایی کراوە و ئەوانەی لێپرسینەوە دەکەن ڕێگریان لێ دەکرێت.

* وتەیەکم خوێندەوە کە درابووە پاڵ بەرپرسێک دەیگوت ئامۆژگاری دروست نییە بکرێت تەنها کاتێک نەبێت کە مۆڵەت بدرێت کەسەکە

ئامۆژگاری پێشکەش بکات، ئەو کەسەی بێ مۆڵەتخواستن ئامۆژگاری دەکات سنووربەزێنەرە نەک چاوەڕوانی پاداشت بێت ئەمەش تێگەیشتنی ئەوانەیە کە خۆیان لا بووەتە زانا لە کاتێکدا نەپەیوەندیان بە وەحیەوە هەیە و نەسیاسەتی شەرعی.

* ڕێگری لە ئامۆژگاری و چاکسازی دەکرێت لەگەڵ ئەوەی کەسەکە خاوەنی زانست و داناییە، تەنها کاتێک ڕێگە بە ئامۆژگاری دەدەن کە ئامۆژگاریکراو مۆڵەت بدات، ئەمە نەفامییەکی تازەیە، بابەتێکی نامۆیە و هیچ شتێک لەو بارەیەوە لە ئایینە ئاسمانییەکاندا نەزاندراوە، هەروەها لە یاسا عەقڵییە دروستەکانیشدا نەبینراوە.

* چاکسازی و لێپرسینەوە و ئامۆژگاری بە زانستەوە، پێویستی بە مۆڵەتدان نییە پاش ئەوەی لەلایەن خوداوە مۆڵەتی پێدراوە، خەلیفە ڕاشدینەکان خەڵکانێکیان دیاری کردبوو بۆ کاری لێ پرسینەوە، تاکوو خەڵکی پاڵنەدەنەوە، ئەو بەرپرسیارێتیە بفەوتێت.

* سەرکردە دەتوانێت ڕێگری لە کەسێکی دیاریکراو بکات لەوەی کاری لێپرسینەوە ئەنجام بدات بەهۆی نەگونجاوی ئەو کەسە بۆ ئەو کارە، یان قازانجی ڕێگریکردنی گەورەتر بێت لە قازانجی لێپرسینەوە، بەڵام سەرکردە بۆی دروست نییە و ناتوانێت ڕێگری بکات لە هەموو ئەو کەسانەی کاری لێپرسینەوە دەکەن و خاوەن زانست و داناییین، ئەوە ناڕەوایە.

* چاکسازی و لێپرسینەوە یەکێکە لە داواکارییە شەرعییەکان کە ناکرێت بەتەنها دیاری بکرێت بە چەند کەسێکەوە، بەڵکوو ڕوودەکاتە هەموو تاکەکان، هەرکات هۆکارەکەی هاتەجێ وەک پەیامبەر دەفەرمووێت: من رأى منكم منكرا«هەرکەس لە ئێوە خراپەیەکی دیبیت ...» هەرکات هۆکارەکەی هاتە جێ واجب دەبێت.

* کۆمەڵێک لە سەردەمی خەلیفە ڕاشدینەکاندا هەڵدەستان بە کاری لێپرسینەوە، تاکوو خەڵکی لە ئامۆژگاری دانەبڕێت، ماوەی چواردە سەدەیە نەزاندراوە مۆڵەتخواستن پێویست بووبێت بۆ ئامۆژگاریکردن لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو دەوڵەتانەدا.

* بەرزکردنەوە و گرانکردنی تێچووی حەج و عەمرە بۆ چەند هێندە بە بەربەستدانان لەسەر ڕێگەی خودا هەژمار دەکرێت، وەها گران کراوە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت بچێت بۆ گەشت بۆ ئەوپەڕی زەوی ئاسانتر و هەرزانتر دەبێت لەوەی بچێت بۆ بەجێهێنانی حەج و عەمرە.

* کۆکردنەوەی خەڵکی لەسەر تاوانێکی وەک گۆرانی بە لادان و سنووربەزاندن لە حەرەم هەژمار دەکرێت: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ [الحج: ٢٥]

«هەر کەسێکیش لەوێ دەستدرێژی بکات و لە ڕێ لادا، ئازارێکی زۆر بەژانی پێ دەچێژین.»

هەموو تاوانێک دەگرێتەوە، ئەمەش وتەی ئیبن مەسعوود و ئیبن عەباسە.

* لە گەورە ڕانەگرتنی خودایە تایبەتکردنی کەسە خراپەکان بە دروشمەکانی خوداوە: ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ﴾ [الحج: ٣٢]

«دیارە هەر کەس ئەو دروشمانەی خوا دایناوە ڕێز لێ بگرێت، نیشانەیە کە بە دڵ لە خودا دەترسێت.»

* لاوازی لە ئوممەتدا سەرهەڵدەدات کاتێک بابەتە چەسپاوەکانی ئایین بخرێنە بەر تاوتوێ و مشتومڕ، ئەمە دەرگای هەرەسی دەوڵەتەکانە.

* لەگەڵ ئەو هەموو ئاستەنگانەی بەسەر پەیامبەر و هاوەڵانیدا هاتن، پاداشتی ئایینیان نەکردە جێی وتووێژ و چاوپۆشی کردن، دانووسانیان لەگەڵ

دوژمنەکانیان دەکرد لە دووڕووان و پەیمان پێدراوان و جەنگکەران لەسەر دونیا، نەک لەسەر دیین.

* تۆمەت دانەپاڵ یەک داوێنپاک بە تاوانە گەورەکان هەژمار دەکرێت، جا دەبێت ئەوتاوانە چەند گەورە بێت کاتێک پاڵبدرێتە لای چەندان داوێنپاک، خودا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ [النور: ٢٣]

«ئەو کەسانەی بۆ ژنانی باوەڕداری داوێنپاکی دوورە ئاگا (سەربەخۆ) بوختان ڕێک دەخەن، لە دنیاش و لە دواڕۆژیش، بەر لەعنەتن؛ جەزرەبەشیان زۆر دژوارە.»

* کەسانێک هەموو ئەو دەرمانە تازانە بەکاردەهێنن کە لە بەراز و مار و حەشەراتەوە بەرهەم هاتووە، پاشان ڕەخنە لە سونەت دەگرن کە چارەسەری بە میزی وشتر داناوە. هەواو و ئارەزوو قوڕەیشی کوێر کردبوو خودایان لەبەرد بۆخۆیان تاشیبوو پاشان پێغەمبەرایەتی موحەممەدیان یان ڕەت دەکردەوە بەوەی کە مرۆڤە!

* مژدەی سەرۆکی فەڕەنسا: «ئەوەی دەوڵەتەکەی ڕێگە دەدات بەوەی ژن لەگەڵ ژن و پیاو لەگەڵ پیاو هاوسەرگیری بکات وەک بڕیار بۆ ئافرەتانی سعوودی، هەروەها کۆبوونەوەی سەرکردەی بەریتانیا لەگەڵ ئافرەتانمان سەرشۆڕی و لاوازی و بچووکییە.»

* بەشداریکردنی ئافرەتان لە ئۆلۆمپییاتی لەندن دروست نییە، دۆزینەوەی دەرچەی شەرعیش بۆی مەحاڵە، بانگەشە بۆ کردن و مۆڵەتدان پێی تاوان و ناپاکی کردنە لە ئەمانەت.

* بەرپرسێک دەربارەی بەشداریکردنی ئافرەتان لە ئۆڵمپیاتی لەندەندا

دەڵێت: "بەپێی ڕێسا شەرعییەکان، ئەو کارە بە هیچ جۆرێک دروست نییە، هەندێک لە بابەتەکانی وەک خواردنی گۆشتی بەراز ناکرێت دەرچەی شەرعیان بۆ دابنرێت."

* فەرموودەی «باشترین ڕیزی نوێژی ئافرەتان کۆتا ڕیزیانە و خراپترینیان سەرەتایانە» دەبینین لەنوێژدا لە ڕیزی پیاوان دوایان دەخەن، پاشان لە ئۆڵمپیاتدا پێشیان دەخەن بە ناوی بەپێی ڕێسا و بنەما شەرعییەکان ئەمەش جۆرێکە لە فێڵ و شێواندن.

* زۆر شت دەبیستین دەربارەی فشاری دەرەکی، هەندێکجار پۆزشیشمان بۆیان هێناوەتەوە کە دەکرێت فشاری سەربازی یان ئابووریان لەسەر بێت، تاوەکوو فشاری وەرزشیشمان بینی کە دەڵێن: یان دەبێ ئافرەتەکانتان ڕووت بن، یان نابێت بەشداری وەرزش بکەن.

* حوکمی وەرگرتنی باج لەسەر زەوییەکی ڕووت و بەخشینی زەوییەکی فراوان بە کەسێک بۆ ئەوەی لێی سوودمەند بێت لەکاتێکدا بەشی کەسانێکی زۆر دەکات کارێکی حەرامە. هەروەها باج دان بە دەوڵەت لەم حاڵەتەدا دروستە، بەڵکوو واجبە بۆئەوەی تەنانەت بەشێکی زەویەکە بۆماڵی گشتی بگەڕێندرێتەوە.

* باجدان بە دەوڵەت لەسەر بەخشینی (هاوشێوەی زەوی وزار) دروستە، ئەم بابەتە قیاس دەکرێتە سەر دروستی پەشیمانبوونەوەی باوک لەو بەخششەی دەیداتە منداڵەکانی، بەڵام باجی شتە هاوردەکان (گومرگ) و موڵکە تایبەتیەکان حەرامە، چونکە بە ئارەقی نێوچاوانە پەیدا کراوە.

* هەرکەسێک زەویەکی پێ ببەخشرێت کە زەرەر و زیان بدات لە موڵکی گشتی، ئەوا لای زۆرینەی زانایان سوودمەندبوون لێی حەرام و بەتاڵە، لەبەرئەوەی بەخشینی کاربەدەست وەکوو بڕیاری دادوەر وایە، حەقی شاراوە ناگۆڕێت، بەڵکوو کێشە دیارەکان یەکلا دەکاتەوە.

* زانایان یەکدەنگن لەسەر حەرامیێتی بەکارهێنانی زەوییەک بۆ سوودی تایبەتی تاکێک لە کاتێکدا دەبێتە هۆی زیانی گشتی، بۆیە گێڕانەوەی ئەو زەوییە بەخشراوە گەورانە بۆ موڵکی گشتی واجبە، بەمەش دەتواندرێت چارەسەری شوێنی نیشتەجێبوون بکرێت.

* هزری لیبراڵی هزرێکە دەڕوانێتە پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتدار، وەک فکری خەواریج، بەڵام ئەوان بە دونیا و ئەمان بە دین، تیژیی سیاسەت هەرچەند بەبێ دینیش بێت دەڵێن: ژیاندنەوەی هزری ڕۆژئاوایە لەو وڵاتانەی سیستەمی پاشایین بەهۆی ناردنی پارە و هاوشێوەکانییەوە، بریتییە لە ناردنی ئاسنی خام، بۆ دروستکردنی بزمار بۆ دارمەیتی پاشایەتییەکان ئەگەر ئەمان درکی پێ بکەن. ئەمە ئەگەر کەسێک بەتەنها بڕوانێتە لایەنە سیاسیەکەی، هەرچی بابەتی ئایین هەیە بەرەو ئاقارێک دەبرێت دڵ لێی دەلەرزێت، بەڵام خودا خۆی گۆڕانکاری دروست دەکات و ئەوەی ئەوان دوای دەخەن پێشی دەخات.

* ناردنی قوتابی بۆ وڵاتانی ڕۆژاوا بۆ خوێندن دراوێکە دوو ڕووی هەیە: ڕووی زانست و ڕووی بەڕۆژئاواکردن، ئەوەشی بەدەردەخرێت ڕووی زانستە، ڕووەکەی دیکەش تەنیا ئەو کەسە دەیبینێت کە بڕیارەکەی داوە.

* سەدەیەکە هەموو وڵاتێک دین بە کۆسپ وڕێگر لەبەردەم خۆیدا دەبینێت، هەڵدەستێ بەتواناسازیەکی نەخۆش بۆ ئەوەی تێڕوانینی ئایینیان بۆ بگۆڕێت، لە ئەنجامدا تێڕوانینی سیاسەتیشیان بۆ بگۆڕێ، دەرئەنجام ئایینیان لاواز دەبێت و سیاسەتیشیان دەپووکێتەوەو دەمرێت.

* کاتێک ئەمانەت بەزایەِ دەچێت. توێژینەوەیەکم خوێندەوە دەڵێت: دەکرا بەو پارەیەی تەرخان کراوە بۆ تواناسازی، کۆمەڵە زانکۆیەک بنیات بندرێت و کادیری بێگانەی پێ بهێندرێت و دەرچووی زانکۆشی پێ دامەزرێت بە مووچەیەک تا کاتی خانەنشین بوونیان.

* دەتواندرێت بەو ماڵ و سامانەی لە ناردنە دەرەوەی خەڵکانێک بەکاردەهێندرێت، ئەو زانکۆیانە بە عەرەبانە بهێندرێن بۆ وڵاتەکەمان.

* خوێندنی باڵا لە سعوودیە وا پێویست دەکات لەسەر زۆرینەی ئەکادیمییەکان کە لە دەرەوە بخوێنن، لە ناو تێکەڵاوی و سفوریدا، یان بڕیاری دەرکردنی لە زانکۆ بۆ دەردەکرێت، هەرکەس لە خودا بترسێت دان بەو یاسایەدا نانێت.

* ئافرەتێک پەیوەندی کردووە و دەڵێت: نمرەی بەرزم بەدەست هێنا لە زمانی عەرەبی و بە موعید وەرگیرامەوە، بەڵێننامەیان لێ وەرگرتم کە یان دەبێت لە دەرەوە بخوێنم یان مافی ئەوەیان هەبێت دەرم بکەن، جاران لە دەرەوە تووشی بە ڕۆژئاوایی کردن بووین، ئێستا وڵاتانی خۆمان بە ڕۆژئاواییمان دەکەن.

* وەزیری خویندنی باڵا: خویندکاران ناچار دەکات بە چوونە دەرەوە یان دەرکردن، تەنانەت بۆ ئەوانەش لە کە لە بەشی زمانی عەرەبی دەخوێنن، ئەمە پەرەپێدانی فکری ڕۆژئاوایە نەک بەڕۆژئاواکردنی زانست! وەڵامی ئەو کارەت لە بەردەست خودادا ناتوانیت بە پێنووسی وەزارەتەکەت بنووسی.

* پیاوان سەرپەرشتیکارن بەسەر ئافرەتانەوە. ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾ [النساء: ٣٤]

خودا دەسەڵاتی نەداوە بە ژن بەسەر مێردەکەیدا بەهۆی چەندین حیکمەت و دانایی کە ئەو کەسەی لە ڕەگەزی هەردوو لا بکۆڵێتەوە بۆی دەردەکەوێت، ئەمە لە دەسەڵاتی بواری هاوسەرگیریدایە جا دەبێت چۆن بێت لە دەسەڵاتی گشتیدا، چونکە ئافرەت لە کاتە قورسەکاندا لاوازی و نەرمی لە بڕیارەکانیدا بەدی دەکرێت، خۆ ئەگەر ئەو بابەتانە لە پیاوانیشدا بەدی بکرێت ڕێگری لێ دەکرێت لە دەسەڵات. پەیامبەری خودا (ﷺ) کاتێک (ابو ذر) داوای بەرپرسیارێتی کرد فەرمووی «تۆ لاوازی، ئەوە پەشیمانیت بۆ دێنێت ...» ناکرێت کەسێکی دڵ نەرم بەرپرسیارێتی گشتی پێ بسپێردرێت و بەهۆیەوە بڕیارەکانی لاواز بن، یان هێندە لاواز بێت لەکاتی جەنگدا بگرییەت، یان لە ڕووی ئابووریەوە دەوڵەت لاواز

بکات، یان بڕیارەکان بە هەست و سۆز بدات نەوەک بە ئەقڵ. ڕۆژئاواش هێندە لەو کارەیان هەیە کە لە هەژمار نایەت. ئەوان ئاژەڵیان کردووەتە میراتگری مرۆڤ و هاوسەرگیری پیاو لە پیاویان داناوە. پەیامبەر دەفەرمووێت لن یفلح قوم ولوا أمرهم امرأة «هیچ گەلێک سەرکەوتوو نابن سەرکردەکەیان ژن بێت» خودا دەفەرمووێت: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ يَقُصُّ ٱلْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ﴾ [الأنعام: ٥٧] «فەرمانڕەوایی تەنیا بۆ خوایە، حەق و ڕاستی باسی دەکات و ئەو چاکترینی بڕیاردەر و جیاکەرەوەیە.»

حیکمەتی ئەو کارەش تەنها ئەوانەی ئیمانی تەواویان هەیە هەستی پێ دەکەن: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ [المائدة: ٥٠]

دەیسا لە لای ئەو کەسانەی وا لە بڕوای خۆیاندا هیچ شک و گومانێکیان نییە، کامە فەرمان لە فەرمانی خوا چاترە؟

* بە بێ ڕاجیایی زانایان، کارکردنی ئافرەت وەک ڕاوێژکار لە هەموو بوارێکدا بە تێکەڵی لەگەڵ پیاوان، کە زۆرجار ئەو تێکەڵاوییە ڕوودەدات کارێکی حەرامە، بەڵام ئەگەر ڕاوێژکاربێت لە کاری ئافرەتاندا و بەبێ تێکەڵی ئەوکات دروستە.

* پەیامبەری خودا (ﷺ) راوێژی بە ئوم سەلەمەی هاوسەری کردووە بەڵام نەیکردووە بە ڕاوێژکاری گشتی هەموو ئوممەت لەبەر ئەوەی جارێک ڕاوێژی پێ کردووە. ئەگەر بوترێت گشتییێتی دروستە لەو کارەدا، ئەوا دەبێت پێشبڕکێ پیاوان لەگەڵ ئافرەتاندا دروست بێت، چونکە پەیامبەر لەگەڵ عائیشە پێشبڕکێی ڕاکردنیان کردووە.

* پەیامبەری خودا (ﷺ) یەک ڕۆژ ڕاوێژی بە خێزانی کرد، بەڵام ئێستا دەکرێنە ڕاوێژکاری بەردەوام و گشتی. بڕوانن پۆشاکی ئوم سلمە بەم جۆرە بووە بەردەوام پۆشیویەتی لەگەڵ ئەوەشدا کەس باسی ناکات، کاتێک بە پەیامبەری گوت دامێنی پۆشاکەکانمان چۆن بێت فەرمووی یرخی شبرا «بستێک درێژی بکەنەوە» گوتی دەردەکەوین فەرمووی: فذراعا «باڵێک درێژی بکەنەوە».

# فیقهی بانگەواز و چاکسازی و مامەڵەکردن لەگەڵ ڕاجیایان

* پێوەری باشیی ئوممەت وابەستە بە بوونی چاکسازانەوە، باشی ئوممەت کەم دەکات بەکەمکردنیان: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ [آل عمران: ١١٠)

ئێوە چاکترین کۆمەڵن لە ناو خەڵکیدا؛ فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێ لە ناڕەوا دەگرن.

* یەکەم وەسفی پەیامبەری خودا (ﷺ) لە تەورات و ئینجیلدا لێپرسینەوە و فەرمانکردنە بە چاکە: ﴿يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ [الأعراف: ١٥٧)

«لە تەورات و ئینجیلیش ناوی نووسراوە و هانەی چاکەیان دەدات و ناهێڵێ خراپە بکەن.»

ئەوەش یەکەم تایبەتمەندی شوێنکەوتووانییەتی.

* لێپرسینەوە و چاودێری، هۆکاری ئارامی و ئەمانی ئوممەتە، ئەوانەی بەو کارە هەڵدەستن پارێزەری ئوممەتن، ئای چەندە قازانجیان بۆ خەڵکی زۆرە و خەڵکی کاڵفامیش چەندە بێزاریان دەکەن. چاکسازی.

* سەوڵ لێدەری ڕزگاری کەشتی ئەم ئوممەتە چاکسازانن، ئەوان هۆکاری چەسپاوین لە کاتی بوونی شەپۆلی فیتنە و ئاشووبدا، پاراستنیان دەربازبوونە و وەلانانیان لەناوچوونە.

* چاکسازان بەرەکەتی ئوممەتن و نەیارەکانیان نەفرەت لێکراون، خودا کاتێک لەعنەت لە نەوەکانی ئیسرائیل دەکات، هۆکارەکەیمان بۆ ڕووندەکاتەوە و دەفەرمووێت: ﴿كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ [المائدة: ٧٩] «ئەوانە ڕێگریيان لە یەکتری نەدەکرد، لە هەر کارێکی بێزراوی بێشەرعی کە دەیانکرد، بێگومان زۆر بەد بوو ئەوەی کە دەیانکرد.»

* ئەو پارێزراوییەی خودا دەیدات بە ئوممەت لەوەی کە سزایان نەدات تەنها بەهۆی چاکسازانەوە دەبێت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ﴾ [هود: ١١٧]

»پەروەردگارت بەستەم خەڵکی شار و دێهاتەکان لەناو نابات، لەکاتێکدا خەڵکەکەی چاکەخواز و چاکساز بن. چاکسازی پلەیەکی بەرزترە لە چاکبوون.»

* خودا ئوممەت دەپارێزێت بەهۆی چاکسازەکانەوە نەک بەهۆی چاکەکانەوە، خودا دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ﴾ [هود: ١١٧]

* تاکە چاکسازێک لای خودا زۆر گەورەترە لە هەزاران چاکەکار، چونکە چاکساز خودا ئوممەتێکی پێ دەپارێزێت، بەڵام چاکەکار تەنها خودی خۆی دەپارێزێت.

* چاکسازی ڕەحمەتە نەک ئاشووب و فیتنە، لەفەرموودەدا هاتووە: «خودا سزای گشتی نادات بەهۆی تاوانی کەسانێکەوە، تا ئەو کاتەی خراپە دەبینن و ڕێگری لێ ناکەن، ئەگەر ئەوەیان کرد خودا گشتی و تایبەتیان سزا دەدات.»

* فەرمانکردن بە چاکە دەروازەی هێنەری خێر و چاکەیە، ڕێگرییش لە خراپە داخەری دەروازەی شەڕ و خراپەیە. ئەو دووانە دوو تای تەرازووی دادگەرین، ئەگەر یەکیان کەم بوویەوە ئەوا هەق دەشێوێت و ستەم لە دین و دونیادا دەردەکەوێت.

* ڕێگریکردن لە خراپە دەبێتە هۆی نەهێشتنی خراپەی ناوخۆیی، ئیدی ئیسلام ناشێوێت. فەرمانکردن بە چاکەش دەبێتە هۆی هێنانی هەموو خێرێکی دەرەکی، ئیدی ئیسلام کەم ناکات.

* دەوڵەت سەقامگیر دەبێت بە چەسپاندنی چاکسازان و هەرەس دەهێنێت بە جەنگکردن لە دژیان: ﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ﴾ [الحج: ٤١] «ئەوانەی ئەگەر دەسەڵاتیان پێ دان لە زەویدا، بەچاکی نوێژ بەجێدێنن وزەکات دەدەن و فەرمان دەدەن بە چاکە و ڕێگری دەکەن لە خراپە.»

* لە هەموو مێژوودا نەزاندراوە دەوڵەتێک هەبووبێت و هەرەسی هێنابێت لە کاتێکدا نوێژیان بەرپاکردبێت و زەکاتیان دابێت و چاودێری و لێپرسینەوەی تێدا هەبووبێت: ﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ﴾ [الحج: ٤١]

* خودا شارانێک دەپارێزێت هەرچەندە زۆر ستەمکاریش بن بەهۆی بوونی چاکسازان تیایاندا، هەندێک جار خودا سزای شارانێک دەدات کە ستەمیان کەمترە، بەڵام چاکسازیان تێدا نییە: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ﴾ [هود: ١١٧] «پەروەردگارت بە ستەم خەڵکی شار ودێهاتەکان لەناونابات، لەکاتێکدا خەڵکەکەی چاکخواز و چاکساز بن.»

* سزای گشتی بۆ سەر هیچ گەلێک دانابەزێت تەنها ئەو کاتە نەبێت ستەم تیایاندا بڵاوبووەتەوە و کەسی چاکسازی کەم تیادایە: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ﴾ [هود: ١١٧]

* سزای خودایی دانابەزێتە سەر دەوڵەتێک بەهۆی ئەوەی خراپەکاری تێدایە، چونکە هیچ گەلێک لە خراپەکاری پارێزراو نییە، بەڵام سزا لە کاتی نەبوونی چاکسازاندا دادەبەزێت. ئەو سزایە خێراتر دادەبەزێت ئەگەر جەنگ دژی چاکسازان بکرێت.

* گەلێک سەرکەوتوو نابێت، چاکسازانی تێدا نەبێت: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٤]

«با لەنێو ئێوەدا کۆمەڵێک ببن، فەرمان بە چاکە بدەن و ڕێ لە خراپە ببەستن؛ هەر ئەوانەش ڕزگار دەبن.»

* چاکسازی تایبەت ناکرێت بە کەسێکی دیاریکراوەوە، هەروەها کەسێکی دیاریکراویش تایبەت ناکرێت بە چاکسازییەوە، بەڵکوو ڕێگری خراپەکاری پێ دەکرێت، خراپەکاری بەهێز بەهێزانە بەرەنگاری دەبیتەوە، خراپەی لاوازیش بە نەرمی، هەق و ڕاستی بڕیاری پێ دەدرێت، نەک بۆچوونی خەڵکانێک.

* چاکسازی پێویستە لە دەوڵەتدا هەبێت، کۆمەڵێک بێت نەک کاری تاکەکەسی: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٤]

* پێویستە چاکسازان بەردەوام بوونیان هەبێت، هەرگیز مەیدان لە ئەوان چۆڵ نەبێت، چونکە ئەگەر ئەوان مەیدان چۆڵ بکەن، کەسانی دیکە شوێنیان دەگرنەوە: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ [الأعراف: ١٤٢] «مووسا بە هاروونی برای وت، تۆ لەناو گەلەکەمدا جێنشینم بە و شوێنی ڕێبازی خراپەکاران مەکەوە.»

* هەموو چاکسازییەک بۆ لابردنی ستەم نییە، بەڵکوو بۆ بەرگرتنە لە سزای گشتی تاکوو دانەبەزێت.

* مەرج نییە بەهۆی چاکسازییەوە چاکە ئەنجام بدرێت، بەڵکوو هەندێک جار گومڕاکان زیاتر پێی گومڕا دەبن بەهۆی سەرکەشییانەوە، جا بێئومێد مەبە: ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۖ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ [المائدة: ٦٨]

ئاشکرایە ئەوەی لای پەروەرێنتەوە بۆت هاتووە، لە ئەندازە لادان و خودانەناسی زۆرێک لەوان بەرزتر دەکات، تۆ لە بەر ئەو خوانەناسانە خەم مەخۆ

* مەرج نییە لە چاکسازی کردندا چاکسازەکە خۆی هەموو کردەوەکەی جێبەجێ کردبێت، لە فەرموودەدا گێڕدراوەتەوە: «فەرمان بە چاکە بکەن، ئەگەر هەمووشی جێبەجێ نەکەن، ڕێگریش بکەن لە خراپە ئەگەر خۆشتان تەواو وازتان لە هەمووی نەهێنابێت.»

* مەرج نییە بۆ چاکسازی چاکساز کەسە نزیکەکانی چاک بن، نووح ژنەکەی و کوڕەکەی ڕێنموونییان وەرنەگرت، إبراهیم باوکی و محمد - علیهم الصلاة والسلام - مامی ئەبوو لەهەب و ئەبوو تالیب: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ﴾ [القصص: ٥٦] «بەڕاستی (ئەی موحەممەد (ﷺ)) تۆ ناتوانیت ئەو کەسەی خۆشت بوێت، ڕێنموونی بکەیت.»

* چاکسازی ناچێتە سەر مەگەر بە زانست و بە کرداریش، بە زانست بەڵگەکەی دەچەسپێت و بە کردار خودی کارەکە دەچەسپێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ﴾ [الأعراف: ١٧٠] «ئەوانەش کە بە تەوراتەوە پابەندی دەکەن (کە هانیان دەدات بۆ باوەڕهێنان بە موحەممەد (ﷺ)) نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدا، بێگومان ئێمە پاداشتی چاکسازان بەزایە نادەین.»

* ئەو کەسە بە چاکساز هەژمار ناکرێت ئەگەر بە وتە چاکسازی بکات و بە کردار لەگەڵ خراپەکاراندا بێت، مووسا وەسیێتی بۆ هاروونی برای کرد و فەرمووی: ﴿وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ [الأعراف: ١٤٢] «چاکەساز بە و شوێنی ڕێبازی خراپەکاران مەکەوە.»

* ئەگەر مرۆڤ بە ئەندازەی سەرقاڵی بە چاکسازی کەسانی دیکەوە سەرقاڵی چاکسازی خودی خۆی بووبا، ئەوا خودا بارگرانی سەر ڕێگەکەی بۆ لادەبرد، لە ئەسەرێکدا هاتووە «خۆت چاک بکە، خودا خەڵکیت بۆ چاک دەکات.»

* ئەو کەسەی نەتوانێت چاکسازی دەروونی خۆی بکات، ئەوا ناتوانێت چاکسازی لە کەسانی دیکەدا بکات: ﴿أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ [البقرة: ٤٤]

«ئایا فەرمان بە مرۆڤەکان دەکەن چاکە بکەن و خۆتان فەرامۆش دەکەن، لە کاتێکدا کتێبەکە دەخوێننەوە؟ بۆ عەقڵتان بەکار ناهێنن؟»

* ناهەقی و درۆ هەرگیز ناتوانێت چۆک بە هەق و ڕاستی دابدات، بەڵکوو چۆک بە شوێنکەوتووانی دادەدات، چونکە ئەوان چاکسازی ناخی خۆیان نەکردووە، ئەگەر خۆیان چاک بکردایە، ئەوا هەق بەرزی دەکردنەوە، چونکە ئاڵا جێگیر نابێت لەسەر عەمموودێک کە خوار بووبێتەوە.

* وتەی هەق نوور و ڕۆشنایی پێوەیە، بەڵام ئەو ڕۆشناییيە خامۆش دەبێت بە نیەتی خراپیی خاوەنەکەی.

* زۆرێک لە تازە نووسەران تەنیا بۆ سەلماندنی خۆیان دەنووسن، نەک بۆ سەلماندنی ئاینیان، نییەت لەناو مرۆڤدا وەک مرەکەبی ناو پێنووسەکانە.

* وتەیەک بۆ جگە لە خودا وترابێت، تاریکی بەسەرەوەیە هەرچەندە وتەکە بەهێزیش بێت، ئەو وتەیەی بۆ خودا گوترابێت شکۆ و هەیبەتی هەیە هەرچەندە وتەیەکی لاوازیش بێت، جا دەبێت ئەو وتەیە چۆن بێت بۆ خودا گوترابێت و بەهێزیش بێت.

* زۆرجار وتەی ئەوانەی کە دەدوێن هاوشێوەی یەکترن، بەڵام شوێنەوارەکانیان لە دڵدا جیاوازە، چونکە گرنگ دەربڕینەکان نییە، بەڵکوو ئەوە گرنگە کە لەپێناویدا دەربڕدراوە، ئایا لەپێناو خودا دەربڕدراوە یان جگە لە خودا؟!

* وتەکان لەیەک دەچن، بەڵام کاریگەرییان لەسەر دەروونەکان جیاوازە، زۆرجار: ئەو وتەیەی لە نییەتپاکێکەوە گۆکراوە زۆرترین کاریگەری هەیە: ﴿وَمَا

رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾ [الأنفال: ١٧] «ئەی موحەممەد (ﷺ) کاتێک مشتێک خۆڵت ڕووبە کافران فڕێدا، ئەو کارە تەنیا تۆ نەتکرد، بەڵکوو خوا فڕێیدا (و خۆڵی کردە چاوی کافرانەوە).»

* زۆرجار بەڵگەی بەهێز دەهێندرێتەوە بەڵام ناگاتە عەقڵ و نابێتە هەرەس پێ هێنەری ناهەقی، چونکە ئەو کەسەی گوتویەتی پشتی بە وتەکەی بەستووە، نەوەک خودا: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾ [الأنفال: ١٧]

* هەمووان وتەی هەق و ڕاستی دەڵێن، بەڵام تەنها ئەوانە دەبنە جێی سوود کە لەپێناو خودادا ڕاستگۆیانە گوتراون: ﴿فَلَوْ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ [محمد: ٢١] «خۆ ئەگەر لەگەڵ خوا ڕاستیان بکردایە، ئەوە باشتر بوو بۆیان.»

* هەندێک جار خودا چاکسازی لە گەلێکدا دەکات بەهۆی یەک تاکەوە ئەگەر نییەتی پاک بێت و بەڵگەکانی بەهێز بێت: ﴿وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ۝١٤٧ فَـَٔامَنُواْ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾ [الصافات: ١٤٧-١٤٨] «ئەوسا بە پێغەمبەرییەتی ناردمان بۆ لای سەد هەزار کەس یان زیاتر_ گەلەکەش باوەڕیان هێنا، بەو هۆیەوە بەهرەمەندمان کرد لە ژیان تا ماوەیەک.»

* نییەت پاکەکان لە کاتی وەڵامدانەوەی پرسیاردا گۆڕان ڕوویان تێ ناکات، بەڵام ئەوانەی لەپێناو جگە لە خودا دەدوێن لە کاتی وەڵام دانەوەی پرسیاردا دەوەستن و ئەملاولا دەکەن، نازانن ئەندازەی وەڵامەکەیان چەند بێت پێی پارێزراو دەبن، تەنها مەبەستیان پارێزراوی خۆیانە نەک پارێزراوی ئایینیان.

* دەرکەوتن ئەوەیە هەق و ڕاستی لەسەر شانەکانت هەڵبگری تا دەربکەوێت، نەک تۆ لەسەر شانی هەق بوەستیت تا دەربکەویت، ئەو کەسەی بە ڕاستگۆیی لەپێناو خودادا کاردەکات، ئەگەر لەژێر تاریکی بەردیش بێت، خودا بەرزی دەکاتەوە تا بۆ خەڵکی دەربکەوێت کە ڕاستگۆ و نییەتپاکە.

* هەرکەس ویستی ئەنجامدانی کارێکی گرنگی هەبێت، بێگومان پێویستی بە توێشوە بۆ ئەو کارەی، توێشووی کەسی چاکسازیش نوێژ و خەڵوەت و پەرستشی پەنهانی نێوان خۆی و پەروەرێنییەتی، هەرکەس ئەو توێشووەی نەبوو، ئەوا لاوازە هەرچەندە زانست و بەڵگەشی بەهێز بێت.

* پێش ئەوەی خودا فەرمان بکات بە هەر پەیامبەرێک بە هەڵبژاردنی و بوونی بە پەیامبەر، فەرمانی پێ کردووە بە لە خواترسان و پەرستشی تایبەتی، یەکەم بانگێشتی بۆ مووسا: ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾ [طه: ١٤] «بەڕاستی هەر من خوام، هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە من، کەواتە من بپەرستە بەچاکی، نوێژ بەجێبێنە، تا منت بێتەوە یاد.»

فەرمانی بە عیسا کرد: ﴿وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ﴾ [مریم: ٣١]

»فەرمانی پێداوم بە نوێژکردن.»

فەرمانی بە پەیامبەر موحەممەد کرد: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ — قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ [المزمل: ١-٢] «ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیوە. شەو هەستە (شەونوێژ بکە) مەگەر کەمێکی نەبێ.»

پەیامبەر لە ئەشکەوتی حەڕادا چەند شەوانی زۆر لەسەر یەک پەرستشی دەکرد.

* هەرکەس دەیەوێت پەیامەکەی بگاتە ئەوپەڕی مەبەست، با دڵی کەم سەنگ و سووک بکات لە هەڵگرتنی دونیا، وەک چۆن کەسی پیادە پشتی کەم سەنگ و سووک دەکات لە قورسی شمەکەکانی.

* ئەگەر دڵی مرۆڤە خاوەن پەیامەکان پڕبوو بە شتانێکی بێئەرزش و زیادەی دونیایی، لەسەری گران دەبێت تا بەرگەی باجی ئەو پەیامەی بگرێت کە هێشتا دەرنەکەوتووە، چونکە ئەو شتانە وەک مێخ و بزمارن دڵ جێگیر دەکەن

بە زەوییەوە، خاوەن پەیامەکە دەیەوێت بڕوات، بەڵام شتە بێئەرزشەکان ڕایان دەکێشنەوە بەرەو خۆیان.

* پێویستە مرۆڤ هەندێک لە خۆشییەکانی دونیا واز لێ بهێنێت و وەک باج بیدات لەپێناو گەیاندنی پەیامە ڕاستەکەی، هەر بۆیە پەیامبەری خودا (ﷺ) وازی لە دونیا هێنا پێش ئەوەی دونیا وازی لێ بهێنێت، بەهێزترین کەس ئەو کەسەیە هیچی نەبێت لە دەستی بدات.

* پەیامبەری خودا (ﷺ) خۆی لە دونیا پاراست، تا هەرسێ دوژمنەکانی تێ بگەیەنێت «شەیتان و شەیتانە مرۆڤەکان و ئارەزووی دەروون» کە خاوەنی هیچ نییە تا لە دەستی بدات و ململانێی هێشتنەوەی بکات.

* لە دیارترینی ئەو حیکمەتانەی کە بۆچی پەیامبەری خودا ڕووی نەکردووەتە دونیا، ئەوە بوو کە دەیزانی دەبێتە بەربەست لە گەیاندنی ئەو پەیامەی بانگەشەی بۆ دەکات، هەروەها دەبووە هۆی ئەوەی دەروون غەمبار و بێزاربێت بۆ لەدەستدانی، لە کاتێکدا پەیامبەر ویستویەتی خۆی لێ دەرباز بکات، پێش ئەوەی دونیا خۆی لە ئەو دەرباز بکات.

* هەق و ڕاستی تەواو و ورد نابێت ئەگەر ئەندازەی تۆسقاڵێک ویستی دونیای تێکەڵ ببێت، چونکە بەئەندازەی ئەو ویستە ئەندازەی لادان زیاد دەکات، ئەمە بازرگانییە شاراوەکەی هەق و ڕاستییە.

* چاکسازی بە وتە بە شێوازێکی تەواو نایەتە جێ ئەگەر بە کردار لە خراپە دوورنەکەویتەوە، ئەگەر نا پەیامەکە شێواو دەبێت. مووسا وەسیەتی بۆ هاروونی برای کرد گوتی: ﴿وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ [الأعراف: ١٤٢] «کاری چاک بکە و شوێنی ڕێبازی خراپەکاران مەکەوە.»

* زانایان لاواز نابن لە ڕووبەڕووبوونەوەی نەیارانی ئیسلامدا تەنها بەهۆی تاوانیانەوە نەبێت، تاوان گومان و دوودڵی دەچێنێت، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟﴾ [آل عمران: ١٥٥] «بەڕاستی ئەوانەی پشتیان هەڵکرد لەناوتاندا لەو ڕۆژەی کە هەردوو کۆمەڵ گەیشتن بە یەک (لە ئوحوددا) بێگومان تەنیا شەیتان هەلی خلیسکاندنن بەهۆی هەندێک لەو گوناهانەی کە لەوەوبەر کردبوویان.»

* ڕەوایی پێدانی کردارەکان بە ئەنجامدانی لەلایەن کەسە گەورەکانەوە بەهێزترە لە ڕەوایی پێدانیان بە قسە، بانگەشەی زانایان تەنها بە وتە، لە کاتێکدا توانای ئەنجامدانی کرداریان هەبێت، بانگەشەیەکی ناتەواو و بەکارنەهێنانی ڕێگەی پەیامبەرانە.

* گەورەکان زیاتر بە کردەوە شوێنەوار و کاریگەری جێ دەهێڵن وەک لە وتە، چونکە کردار بەهێزتر و ڕاسترە لە وتە.

* "هیچ کەسێک هاوشێوەی ئەو پەیامەی تۆی نەهێناوە و دژایەتی نەکرابێت." ئەمە یەکەم وتە بوو پەیامبەر گوێبیستی بوو لە وەرەقەی کوڕی نەوفەلەوە کاتێک بوو بە پەیامبەر! زانین و شارەزابوون بە قورساییی ڕێگە پێش ئەوەی بیگریتە بەر زۆر گرنگە بۆئەوەی بە ئاگایانە هەنگاو بنێیت و ئارامگربیت.

* پێویستە کەسانی دڵسۆز و بۆ خودا سوڵحاو بزانن ڕێگەیان قورسە و لەوانەیە لەو پێناوەدا گیان بسپێرن و بکوژرێن، پەیامبەر بە عەمماری فەرموو: "گرۆی زیادەڕەوان دەتکوژن، پاش ٣٠ ساڵ کوژرا، زانینی کۆتایی مەنزڵ، کارەکانی دیکەی بەر لە ئەو ئاسان دەکات."

* بەربەستەکانی ڕێگەی هەق باوەڕی کەسە باوەڕدارەکان زیاتر دەکات، هەروەها دەبێتە هۆی زیادبوونی گومان و دوودڵی بۆ کەسانی دیکە: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا﴾ [آل عمران: ١٧٣]

«ئەوانەی کە خەڵکی پێیان دەوتن بەڕاستی خەڵکی (بێباوەڕ) لەشکر و کۆمەڵی زۆریان کۆکردووەتەوە لە دژتان، کەواتە بترسن لێیان. کەچی ئەوان (ئیمانداران) بەمە باوەڕیان زیاد بوو.»

* چاکسازی دەرمانە، دەرمانیش تاڵییەتی و ناخۆشی خۆی هەیە، ئەوانەش بێپێویست نیین دەربارەی کە دەزانن نەخۆشن و پێویستیانە.

* خراپە دەردە و چاکسازی دەرمانە؛ بە ئەندازەی بەهێزیی خراپە، ئازار و ناهەمواری لە چاکسازیدا دەبێت.

* بە ئەندازەی گەورەیی ئامانج لە دەروونی مرۆڤدا، گوزەرکردنی بەسەر ڕێگەکەیدا ئاسان دەبێت، خەڵکانێک لەگەڵ تووشبوونیان بە پێشهاتەکان بە تێپەڕاندنی چەند هەنگاوێکی کەم و چەند قورسایی بچووک دەگەڕێنەوە، خەڵکانێکیش هەن جێگیر و بەردەوامن لەگەڵ ئاستەنگە گەورەکاندا. هەمووان یەک ڕێگەیان هەیە، بەڵام کۆشش و ویستیان جیاوازە.

* زۆرجار نووسەر کاتێک دەنووسێت، ترسی کەسێک لەبەرچاو دەگرێت، لە ڕووکەشدا لەگەڵ هەزاران خەڵک دەدوێت، بەڵام لە ڕاستیدا پێنووسەکەی بۆ یەک کەس نووسیویەتی، هەربۆیە ڕێڕەوی نووسینی پەرتووکەکەی دەگۆڕێت و هەستیشی پێ ناکات، چونکە ئەوەی کە لێی ترساوە گۆڕاوە.

* بەڵگەکان دابڕێنە لە خاوەنەکانیان و لە زۆری و کەمی شوێنکەوتووانیان، هەروەها لە فشاری ژیان و هەوا و حەزی دەروون، خۆت و ئەو بەڵگەیە بەتەنها بمێننەوە ئەوکات خودا سێیەمتان دەبێت. بەوەش هەق لە ناهەق جیادەکەیتەوە.

* ئەو کاتەی دەتەوێت هەقێک لە زەوییەکدا بەرقەرار بکەیت، ئەوا خەڵکی لەپێش چاوت لابدە، وەک چۆن کەسی کڕنووشبەر بەرد و دڕک لە شوێنی کڕنووشەکەی لادەدات بۆئەوەی کڕنووش ببات بۆ خودا.

* هەرکەس ئەوە بنووسێت کە خەڵکی پێیان خۆشە، ئەوا بە گۆڕانی خەڵکی، ئەویش دەگۆڕێت، بەڵام هەرکەس ئەو شتە بنووسێت کە خودا پێی خۆشە ئەوا چەسپاو و دامەزراو دەبێت، چون خودا هەقە و ناگۆڕێت.

* ئەو کەسەی ترسی لە سەرزەنشت و لۆمەی خەڵکی هەبوو کاتێک دەیویست شتێک بنووسێت، ئەو کاتە دەنووسێت ئەگەر هەست بکات ستایش و دەستخۆشی لێ دەکەن، ئەمانە هۆکارن بۆ ناجێگیری خەڵکی لەسەر ئایین و دەرکەوتنی دووڕووی زۆر.

* ناتوانیت هەق بەتەواوی دەرببڕیت ئەگەر دڵت یەکلا نەبێت بۆ خودا و چۆڵ نەبێت لە دروستکراوەکان، لە کاتێک کە دەتەوێت بنووسیت و وتەیەک دەرببڕیت، چەند کەس کۆببێتەوە لە مێشکی ئەو کەسەی دەیەوێت وتەیەکی هەق بڵێت ئەمانە دەبنە هۆی لادانی کەسەکە لەو هەقە.

* هەر مرۆڤێک بێتە مێشکتەوە لەو کاتەی دەتەوێت وتەیەک بڵێیت ئەوا دەبێتە هۆی لادانی واتای وتەکانت بە ڕاست و چەپدا، بەم هۆیەوە هەق و ڕاستی لە مێشکیدا هەڵدەوەرێت وەک چۆن بای بەهێز گەڵای درەخت هەڵدەوەرێنێت، بەڵام هەرکەس خودا لە مێشکیدا بێت، ئەوا جگە لە ئەو لادەچێت لە مێشکیدا.

* وتەبێژ هەر کەسێکی لە دەروونددا لە لا گەورە بێت لە کاتی قسەکردنیدا تەنها ئەو دێتە مێشکیەوە، ئامادەبووان لە مێشکیدا نامێنێت، ئەوکات وتەکان و واتاکان لەپێناو ئەو گەورەیەدا دەوترێت، لە کاتێکدا هیچ شتێک گەورەتر نییە لە خودا!

* ئەگەر هەقت لە خۆتدا بەدی نەکرد، ئەوا بگەڕێ بەشوێن کەسێکدا کە لە دەروونددا گەورەیە و بووەتە ڕێگر لەنێوان تۆ و هەقدا، چاوەکان هەق نابینن ئەگەر دینارێکی لێ نزیک بکرێتەوە، لە کاتێکدا هەقێک دەبینێت ئەگەر چەند بارەتریش دیناری لە دوور دانرابێت.

* هەق نابینیت ئەگەر لەنێوان تۆ و ئەودا کەسێک هەبێت بە گەورەی بگریت، چونکە هەق لەپشت ئەوەوە شاراوە دەبێت، ئەگەرهەق گەورە ڕاگریت، دەتوانیت بیبینیت، ئەوکات هەموو شتەکانی دیکە لات بچووک دەبێتەوە.

* ئەگەر وتەی هەقی بێ گومان و دوودڵیت دەوێت، ئەوا خۆت لەسەر پردێک دابنێ لەنێوان دونیا و دوارۆژدا، بە جۆرێک سەیری دونیا دەکەیت لە پشتەوەیە و ناتوانی بگەڕێیتەوە بۆی و سەیری قیامەت دەکەیت لە پێشتەوە بەرەو ڕووت دێت.

* ئەگەر ئومێد یان ترست لە دڵدا بەدی دەکرد بەرانبەر کەسێک، ئەوا ئەو کەسە هەق بەرەو خۆی ڕادەکێشێت و وای لێدەکات بەشێواوی دەربچێت، مرۆڤی عاقڵ ئەو کەسەیە هەرکات لە دڵیدا ئومێد و ترسی کەسێکی بەدیکرد پێنووسەکەی فڕێ دەدات تا ئەو کاتەی ئەوەی بەسەرەوە نامێنێت.

* ترس و تەماع بەندینخانەی دڵە.

* دروسترین بیروبۆچوون ئەوەیە کە لە دڵێکەوە دەردەچێت کە ترس و تەماعی تێدا نییە.

* ئەگەر کەسێکی زانات دی لە هەق لایدابوو ئەوە یان چاوی تەماعی بەشتێکە یان ترسی لێی هەیە، چونکە دڵ ڕووگەی هەیە بەڵام ئێمە بەردەوام نایبینین.

* تەماع ڕووگەی دڵە، ئەو کەسەی زۆرترین تەماعی هەیە زۆرترین گۆڕانکاری لە بۆچوونەکانیدا ڕوو دەدات، چونکە ئەو ئاوەڕدانەوەی بەرەو دواوە لە کاتی ڕۆیشتنیدا هۆکاری ترسان یان ئومێدبوونیەتی بە کەسێک.

* بە ترس و بە تەماعەوە دڵ دەڕوات بەرەو بۆچوونەکان، ئەوەی لە خودا ترسا و ئومێدی بەو هەیە جێگیر و دامەزراو دەبێت چونکە هەقی خودا یەک

دانەیە، بەڵام ئەوەی لە جگە لە خودا ترسا و ئومێدی پێیان هەبوو دەگۆڕێت بەهۆی زۆری ئەوانەی ترس و ئومێدی پێیان هەیە.

* دڵ بە پاکی و تەواوی دەمێنێتەوە لە کاتی بڕیارەکانیدا، تا ئەو کاتەی خۆشەویستی سامان و پێگە پڕی دەکات.

* تەماع هەرچەندە کەمیش بێت، چاو کوێر دەکات لە ئاست دیتنی هەقدا، هەرچەندە ئەو هەقە گەورەش بێت، مرۆڤ ئەگەر دینارێک نزیک بکاتەوە لە چاوییەوە، ئەوا شاخێک لە پشت ئەو دینارەوە دەشاردرێتەوە و دیار نامێنێت.

* ئەگەر مرۆڤ بیری لە کارێک کردەوە و گرنگی زۆری پێدا، چاوەکانی دادەخات تاکوو کرانەوەی چاوەکانی نەبێتە هۆی سەرقاڵبوونی بیروهزری، دەترسێت چاوەکانی ببنە هۆی نەهێشتنی ئەو فکر و هزرەی. جا دەبێت ئەو کەسە چۆن بێت کە فکر و بیری سەرقاڵ کردووە بە ئوممەتەوە و چاوی بۆ ماڵ و سامان و پۆست کردووەتەوە.

* یەکلابوونەوە بۆ خودا لە ڕادەربڕیندا دەگمەنە، ئەگەر دەوڵەمەند بوو و پاشان هەژار کەوت، دەگۆڕێت. ئەگەر کاربەدەست بوو و پاشان لابرا، دەگۆڕێت. خەڵکی بە ئەندازەی بەرزونزمی پێگەیان بۆچوونەکانیان دەگۆڕێت، هەق و ڕاستی بوونی هەیە، بەڵام تەماع بەری لێ دەگرێت.

* مرۆڤ لە هەق تێناگات تاکوو نێوان هەق و سوودە تایبەتییەکانی جیانەکاتەوە، چونکە تەماع دەروون لە هەق لادەدات: ﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ﴾ [الممتحنة:٣] «نە خزمانتان و نە منداڵانتان سوودتان پێناگەیەنن لە ڕۆژی دواییدا (خوا ئێوە و خزمەکانتان لە یەک جیادەکاتەوە.)»

* ﴿أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ [الزخرف: ٥١] «ئایا پادشای میسر هی من نییە و ئەم ڕووبارانە بەژێر (کۆشکەکانی) مندا نارۆن، دەی ئایا ئێوە نایانبینن.»

کاتێک پاشایەتی و ڕووبارەکەی لەدەستدا، ئەوکات بەرچاوی ڕوون بویەوە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ [یونس: ٩٠] «هەتا ئەو کاتەی خەریک بوو بخنکێ، ئەوسا وتی بڕوام هێنا کە هیچ پەرستراوێک نییە، جگە لە ئەو (خوایە) نەبێت کە نەوەی ئیسرائیل بڕوایان پێ هێناوە.»

* هەموو پەیامبەران خۆیان لەوە بێبەری کردووە کە داوای پارە و سامان بکەن لەسەر گەیاندنی پەیامەکەیان: ﴿يَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾ [هود: ٥١] «ئەی کەلەکەم لەسەر ئەم (گەیاندنی پەیامە) داوای هیچ پاداشتێکیان لێ ناکەم.»

چونکە دەیانزانی وتەی پووچەڵ و ناهەق لەسەر زەوی سامان و پلەوپایە دەڕوێت.

* خەڵکی وتەی ئەوکەسانە پێش دەخەن کە خۆی داڕنیوە لە قازانجویستی، خودا دەفەرمووێت: ﴿ٱتَّبِعُوا مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ «شوێنی کەسانێک دەکەون کە داوای پاداشت و پارە لە ئێوە ناکەن لەسەر گەیاندنی پەیامی خوای گەورە و ئەوان هیدایەتدراون لەلایەن خوای گەورە.»

هیچ پەیامبەرێک نەبووە لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی داوای سامان و پلە و پۆستی کربێت.

* ئەو کەسەی پاداشت و کرێی لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی وەربگرێت زۆرلەخۆکاری دەکات لە گەیاندنی پەیامەکەیدا تاکوو دونیایی بپارێزێت لە ژێر پەردەی ئاییندا: ﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ﴾ [ص: ٨٦]

«بڵێ هیچ کرێ و پاداشتێک لەسەر گەیاندنی ئەم ئایینە لە ئێوە داوا ناکەم و من لەو کەسانەش نیم کە درۆ هەڵبەستم و زۆر لەخۆم بکەم.»

* ئەگەر بانگەوازکاران و چاکسازان و زانایان پشتبەستنیان بە خودا کەم بوویەوە، ئەوا بە ئایینەکەیان شتگەلێک دەکڕن بۆ سوودی خۆیان: ﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ۝٥٧ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ﴾ [الفرقان: ٥٧-٥٨] « (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ من لەسەر ئەو (گەیاندنی ئیسلام) هیچ کرێ و پاداشتێک لە ئێوە داوا ناکەم، بەڵام هەر کەس ویستی ڕێگەی پەروەردگاری بگرێت، با بیگرێت. پشت ببەستە بە خوای زیندوو، کە زاتێکە کە هەرگیز نامرێت.»

* کاتی وتنی هەق، چاوەڕوانی ستایشی خەڵکی مەکە، تاکوو شکست نەهێنیت و نەشکێیت کاتێک سەرزەنشتیان کردیت. ئەو کەسەی چاوەڕوانی سەرزەنشت بکات، بە ستایش هەڵناخەڵەتێت.

* گوێیەکانت دابخە لە چەپڵە لێدانی ستایشکاران، تا نەوەستی لە وتەی هەق کاتێک ئەوان وەستان، چونکە هەق لە منداڵدانی ڕاستییەوە دەردەچێت، هیچ پەیوەست نییە بە ستایش و سەرزەنشتەوە.

* دڵ پارە وەردەگرێت لەپێناو دەربڕینی هەقدا، وەک چۆن دەست وەری دەگرێت، ئەو پارەیەی دڵ وەری دەگرێت بریتییە لە پیاهەڵدان و ستایش. هەرکەس گرنگی بەو جۆرە پارەیە بدات، لە وتنی هەق دەوەستێت کاتێک خەڵکی وەستان لە پێدانی ئەو پارەیە.

* ستایش کردن جۆرە فیتنەیەکی تایبەتی هەیە وەک چۆن ماڵ و سامان فیتنەی تایبەتییان هەیە، مرۆڤ لە هەقەوە دەخاتە سەر ناهەقی، دڵ پارە وەردەگرێت وەک چۆن دەست وەری دەگرێت. فیتنەی ستایشکردن ترسناک ترە، چونکە دڵ وەری دەگرێت و کەسیش نایبینێت!

* چاوەڕوانبوونی وتەی ستایشکاران و سەرزەنشت کاران زۆرجار هۆکارە بۆ لادانی وتەکان لە پێکانی هەق، لەبەرانبەر ڕەزامەندی و تووڕەیی خودادا.

* سەربەخۆ نابیت تاکوو ستایشی ستایشکاران و سەرزەنشتی سەرزەنشتکاران لەهەقدا وەک یەک نەبن لەلات.

* هەرکەس دڵی وابەستە کرد بە ستایشی خەڵکییەوە، کاری هەق دەکات تاکوو خەڵکی لێی ڕازی ببن و هەڵدەگەڕێتەوە ئەگەر خەڵکی لێی تووڕە بوون.

* بە هێندەی زیادبوونی حەزی ستایشکردنی خەڵکی لە دەروونداـ نییەتپاکی و کارکردن لەپێناو خودادا کەم دەبێتەوە.

* ئەگەر مرۆڤ دڵی پڕبوو لە حەزی ستایش کردن، ئەوا لەگەڵ خەڵکیدا دەڕوات، ئەگەر حەزی پلە و پێگەی، هەبوو لەگەڵ دەسەڵاتداراندا دەڕوات، خۆ ئەگەر دڵی بە خۆشەویستی خودا پڕ بوو، لەگەڵ هەقدا دەڕوات و خەڵکیش شوێنی دەکەون.

*هەق بریتییە لە ڕێگەیەکی ڕاست، لێی لامەدە بۆئەوەی ستایشی خەڵکی بەدەست بهێنیت و دەستکەوت بەدەست بهێنیت، هەروەها لە ترسی سەرزەنشت لە ڕێبازی هەق لامەدە، ستایش وسەرزەنشت بەبێ واتا تەنها دەنگن و هوتافن، دەنگ ئاژەڵان ئاڕاستە دەکات و واتاکان عەقڵ ئاڕاستە دەکەن.

* زیاد لە پێویست ستایشی کەسە پێشەنگەکان مەکە، نەوەکا دڵی ئاوڕبداتەوە بۆ ستایشەکانت و سەرقاڵبێت لە ڕێگەکەی بەهۆی تۆوە، کەم ستایشکردن سەرخستنە و زۆر ستایشکردنیش فیتنە و ئاشووبە.

* خودا پرسیاری ڕێژەی شوێنکەوتووان لە زانایان ناکات، بەڵکوو پرسیاری گەیاندنی پەیامەکەیان لێ دەکات! ﴿مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ﴾ [المائدة: ٩٩] «نێردراوەکەی خوا هیچی لەسەر نییە جگە لە گەیاندن.»

* چاکسازان چاککردنی خەڵکییان لەسەر نییە، بەڵکوو تەنها جوان گەیاندنیان لەسەرە: ﴿مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ﴾ [المائدة: ٩٩] «نێردراوەکەی خوا هیچی لەسەر نییە، جگە لە ڕاگەیاندن، خوداش دەزانێت بەوەی دەری دەخەن و بەوەشی دەشارنەوە.»

* دەروون ئازار دەچێژێت بەهۆی زۆری خراپە و ناهەقییەکانەوە، بەڵام زۆر بیرکردنەوە لەو بابەتە ورەی مرۆڤ دەمرێنێت و تەمبەڵی لە دەروونی دەچێنێت: ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾ [فاطر: ٨] «دەی کەواتە بە خەفەتخواردن لەبەر (ئیمان نەهێنانی) ئەوان خۆت مەفەوتێنە.»

مرۆڤ تەنها کردەوەی لەسەرە نەک دەرەنجام.

* غەمباربوون لە سەر شلگیری خەڵکی لە ئاییندا کارێکی چاکە، بەڵام بەردەوامبوون لەسەر ئەو حاڵە دەبێتە هۆی بێئومێدی و دەستەوەستانبوون، بۆیە خودا ڕێگری لە پەیامبەرەکەی کردووە: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ [یونس: ٦٥] «با غەمبارت نەکات، وتەی ئەوانە چونکە بەڕاستی هێز و دەسەڵات هەمووی بۆ خوایە.»

* نەنگی لە هەقدا نییە ئەگەر خراپەکاران زیاتر دوور بکەونەوە، ئەگەر ئەوان دوورکەوتنەوەیان زیاتر بوو، ئەوا با چاکسازان چاکسازییان زیاتر بکەن، نووح دەیفەرموو: ﴿فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِىٓ إِلَّا فِرَارًا﴾ [نوح: ٦] «بەڵام بانگەوازیی من هیچ شتێکی بۆ ئەوان زیاد نەکرد، تەنیا دوورکەوتنەوە و ڕاکردن نەبێت.»

* ئەگەر خەڵکی پشتیان کردە هەق ئەوا تۆ پشتبەستنت بەخودا دەربخە: ﴿فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ﴾ [التوبة: ١٢٩] «جا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا و گوێیان پێ نەدایت، ئەوسا بڵێ من تەنیا خوام بەسە کە هیچ پەرستراوێک نییە، بێجگە لە ئەو، تەنیا پشت بەو دەبەستم، ئەویش پەروەردگاری عەرشی گەورەیە.»

* پێویستە هەق هەر ڕوون بکرێتەوە هەرچەندە خەڵکیش شوێنی نەکەون، تا لە هزر و مێشکدا بەردەوام زیندوو بمێنێتەوە، چونکە ترسناکترین بەڵگە ئەوەیە نەوەیەک پەیدا ببێت و بڵێن: ﴿مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ﴾ [المؤمنون: ٢٤] «ئێمە شتی وامان نەبیستووە لە باوباپیرە پێشووەکانمانەوە.»

* هەق پێویستی بە دووپاتکردنەوە هەیە بەبێ ئەوەی تووشی بێزاری ببیت، زۆرێک لە واتاکانی قورئان دووبارەیە، چونکە دڵ وەک درەخت وایە، وشک دەبێت و دەمرێت ئەگەر خاوەنەکەی بەردەوام ئاوی نەدات.

* ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ [البقرة: ٦] «چوونیەکە بۆ ئەوانەی ڕاستی ڕەت دەکەنەوە، چ ئاگاداریيان بکەیت یان نا. باوەڕ ناهێنن.»

لەگەڵ ئەوەشدا پەیامبەری خودا (ﷺ) بەردەوام ئاگەداری کردوونەتەوە بۆ یەک ڕۆژیش وازی لێ نەهێناون. پێویستە سەدای هەق بەردەوام لە گوێکاندا بزرنگێتەوە تاکوو لەبیرنەچێتەوە.

* خراپە ئەگەر بەدی کرا و ڕێگری لێ نەکرا، ئەوا کەسانێکی دیکە وەک شوێنکەوتنی کەسی یەکەم دووبارەی دەکەنەوە ئاپۆڕای خەڵکەکەی زیاد دەکەن، بۆیە ڕێگریکردنی واجبە، چونکە ئەو ڕێگرییە ئەگەر خراپەکە هەمووی لانەبات، ئەوا ڕێژەی شوێنکەوتووانی کەم دەکاتەوە.

* خراپەکان بە پلەبەندی دەگۆڕێن سەرەتا بە تاوان دەست پێ دەکات. پاشان لای خەڵکی دەچەسپێت، پاشان دەبێتە دیین لایان، بۆیە واجبە ڕێگری لێ بکرێت پێش ئەوەی ئەو گۆڕانەی بەسەردا بێت: ﴿وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾ [الأعراف: ٢٨] «کاتێک کردەوەیەکی زۆر بەد و ناشرینیان دەکرد و دەیانوت: لە باوباپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە و خوا فەرمانی ئەوەی پێ داوین.»

* بەروبوومی خراپە خراپکردنی ئەو کەسانەیە کە گوزەر دەکەن و دەڕۆن بەلایدا، بەڵام ئەگەر چاکەی تێکەڵ ببێت و جیای بکاتەوە ئەوا ڕێژەی خراپە کەم دەبێتەوە. بۆیە لەسەر کەسە چاکەکانە تێکەڵی خراپەکاران ببن، بۆئەوەی چاکسازییان بکەن، نەک دوورەپەرێز بن لێیان و زیاتر خراپ بن.

* زۆرێک لە خەڵکی لە کاتی بڵاوبوونەوەی باتڵ و ناهەقیدا بێدەنگی هەڵدەبژێرن لەگەڵ ئەوەی توانای ڕوونکردنەوەیان هەیە، وا دەبینن ئەوە نزمترین پلەی سەلامەتبوونە، ئەمەش هەڵەیە خودا دەفەرمووێت: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ﴾ [المائدة:٤١] «زۆر گوێقوڵاخن بۆ درۆ.»

واتە: بێدەنگیش دەبن لێی.

* شاردنەوەی هەق لەو کاتەدا کە خەڵکی پێویستیانە لە گەورەترینی ستەمەکانە، ئەو کەسەی هەق دەشارێتەوە لە حوکمدا هاوتای ئەو کەسەیە کە وتەی ناهەق دەڵێت: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾ [البقرة: ١٤٠] «کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە شایەتییەکی لە خواوە وەرگرتبێت و بیشارێتەوە.»

* گومڕایی لەناو جوولەکەدا سەری هەڵدا بەهۆی ئەوەی ئەو کەسانەی بێدەنگ دەبوون لەسەر ناهەقی، زیاتر بوون لەوانەی قسەیان دەربارەی دەکرد، ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِ﴾ [المائدة: ٤٢]

«ئەو (جوولەکانە) زۆر گوێقوڵاخی درۆن، ماڵی حەرام زۆر دەخۆن.»

درۆیان دەربارەی خودا دەبیست و بێدەنگ دەبوون.

* زۆرینە بێدەنگەکان بەردەوام پارێزراو نابن، ئەگەر شەڕ و خراپە پاڵدرایە لایان و بێدەنگ بوون، ئەوا ئەوانیش بەشدار دەبن لەو خراپەیەدا، بەهۆی بێدەنگیانەوە نەوەکانی ئیسرائیل نەفرەتیان لێ کرا: ﴿كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُ﴾ [المائدة: ٧٩] «ئەوانە ڕێگیرییان لە یەکتر نەدەکرد لە هەر کارێکی بێزراوی بێشەرعی کە دەیانکرد.»

* ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ﴾ [البقرة: ١٥٩] «بێگومان ئەوانەی دەیشارنەوە ئەوەی کە ناردوومانەتە خوارەوە لە ئایەتانی ڕۆشن و ڕێنمایی دوای ئەوەی کە ڕوونمان کردووەتەوە بۆ خەڵکی لە نامە (تەورات و ئینجیل) دا، ئەوانە خودا نەفرینیان لێ دەکات و نەفرەتکارانیش نەفرەتیان لێ دەکەن.»

ئەمە حاڵی ئەوکەسانەیە کە هەق دەشارنەوە، جا دەبێت حاڵی ناهەق و باتڵان چۆن بێت.

* خودا نەفرەتی لەوانە کردووە کە هەق دەشارنەوە، دەبێت حاڵی ئەوانە چۆن بێت کە وتەی ناهەق دەڵێن ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ﴾ [البقرة: ١٥٩]

* خراپەکاری لەناو کۆمەڵگاکاندا بڵاوبووەتەوە، بەڵام ڕەگ داناکوتێت، مەگەر لە ڕێگای بەیاساکردنیەوە، هەندێکجار زاناکان بە فەتواکانیان بە ڕەوای دادەنێن، یاخود دەیبینێت و بێدەنگ دەبێت خەڵکی وا دادەنێن ئەو بێدەنگبوونە ڕازیبوونی ئەو زانایەیە.

* بەهۆی بێدەنگی زانایانەوە خراپەکاری و ناهەقی پەرەدەسەنێت وەک چۆن بە قسەشی بڵاو دەبێتەوە، چونکە بێدەنگ بوونی دانپێدانانە: ﴿لَوۡلَا يَنۡهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ عَن قَوۡلِهِمُ ٱلۡإِثۡمَ وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾ [المائدة: ٦٣] «ئەوە بۆچی جڵەوگیری یان نەکردن خواپەرست و زاناکانیان لە گوفتاری گوناهیان حەرامخواردنیان (وەک بەرتیل) بەڕاستی شتێکی بەد بوو ئەوەی دەیانکرد.»

* ئەگەر زانایان بێدەنگ بوون لەسەر خراپەکاری ئاشکرا لە کاتێکدا توانایی ڕێگرییان هەبوو، ئەوا ئەو کارەیان هاوشێوەی پاڵپشتیکردنیانە بۆ ئەو خراپەیە بە قسە، خودا سەرزەنشتی زاناکانی جوولەکە دەکات کاتێک وتەی ناهەقیان

دەبیست و بێدەنگ دەبوون لەسەری ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِ﴾ [المائدة: ٤٢] «ئەو (جوولەکانە) زۆر گوێقوڵاخی درۆن و ماڵی حەرام زۆر دەخۆن.»

*خودا ڕێگری کردووە لە بێدەنگبوون لە ڕوونکردنەوەی هەق، وەک چۆن ڕێگری کردووە لە دەربڕینی وتەی ناهەق: ﴿لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكۡتُمُونَهُۥ﴾ [آل عمران: ١٨٧] «دەبێت ئەو نامەیە ڕوونبکەنەوە بۆ مەردوومان و نەیشارنەوە.»

* بێدەنگبوونی زانایان لەسەر هەق، ترسناکترە بۆ ئوممەت لە وتەی ناهەقی کەسی نەزان.

* بێدەنگبوونی زانایان لەسەر وتنی هەق بەشداریکردنە لە فێڵ و شێواندندا، چونکە بینینی ناهەقی و بێدەنگبوون لەسەری، دانپێدانانە لەلایەن ئەوانەوە بۆ ئەو کارە: ﴿وَلَا تَلۡبِسُواْ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ [البقرة: ٤٢] «بە زانینەوە ڕاستی لەگەڵ درۆ تێکەڵ مەکەن و ڕاستی مەشارنەوە.»

*ئەگەر زانایان بێدەنگ بوون، ئەوا هەق و ناهەق تێکەڵ دەبێت، خودا دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَلۡبِسُواْ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ [البقرة: ٤٢]

*هەموو ڕێز و شکۆیەک یان پلە و پێگەیەک کە مرۆڤ بەهۆی بێدەنگبوونی لە ڕێگریکردن خراپە بەدەستی دەهێنێت، هاوشێوەی حەرامخۆرییەکەی جوولەکەکانە، ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِ﴾ [المائدة: ٤٢] «ئەو (جوولەکانە) زۆر گوێقوڵاخی درۆن، ماڵی حەرام زۆر دەخۆن.»

* گەورەترین پەشیمانی ئەوەیە کە زانایان بێدەنگ بن لە وتنی هەق بە ئومێدی دەستخستنی پلە و پێگەیەک، دەبینیت هەموو تەمەنی دەڕوات ئەو پێگەیە بەدەست ناهێنێت و هەقیش ناڵێت.

* جادووگەرەکانی فیرعەون بانگەشەی پاڵپشتیکردنی هەقیان دەکرد خواش مامەڵەکەیانی هەڵمالّی: ﴿وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓاْ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ۝ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ [الأعراف:١١٣ -١١٤] «جادووگەران هاتن بۆ لای فیرعەون و وتیان: بێگومان ئێمە پاداشت و خەڵاتی گەورەمان دەبێت ئەگەر ئێمە سەرکەوتین (سەر مووسا)دا؟ فیرعەون وتی: بەڵێ، پاداشتی گەورەتان دەبێت و بێگومان ئێوە لە نزیکەکانی خۆم دەبن.»

ناهەقی زیاتر بە بێدەنگبوونی زاناکان ڕەگ دادەکوتێت، وەک لە ئەنجامدانی ئەو کارە لەلایەن خراپەکارانەوە.

* ﴿وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ [البقرة: ٤١]

«ئایەتەکانم بە نرخێکی کەم مەفرۆشن.»

هەر پارەیەک لە بەرانبەر وتەی ناهەقیدا وەرگیرێت هەرچەندە خاوەنەکەی لای زۆربێت هەر کەمە، بە بەراورد بەو سزایەی خودا بۆ ئەو کەسانەی داناوە کە کەمترخەمن لەو بەڵێنەدا، هەروەها لە بەرانبەر ئەو پاداشتە گەورەیەی ئەو کەسانەی بەڵێنەکەی خودا بەجێ دەهێنن.

* حەرامترین ماڵ و سامان ئەوەیە کە زاناکان وەری بگرن لەسەر بێدەنگبوونیان لە کاتی گوێبیستبوونی ناهەقیدا، ئەمە زۆر گەورەترە لە ڕیبا، چونکە ڕیبا ستەمێکی تایبەتە بەڵام ئەو بێدەنگییە ستەمێکی گشتییە: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ﴾ [المائدة: ٤٢] «ئەو (جوولەکانە) زۆر گوێقوڵاخی درۆن، ماڵی حەرام زۆر دەخۆن.»

* هیچ زانایەک هەق ناشارێتەوە لە بەرانبەر دەستکەوتێکدا نەبێت، جا یان شتێکە ئومێدی بەدەستهێنانی هەیە یان شتێکە ترسی لەدەستدانی هەیە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ [البقرة: ١٧٤]

* پەیامی خودا هەڵگرە تا دەگاتە جێ، پێویست نییە لە گەیشتنی ئەودا تۆش بگەیتە جێ.

* ئەو کەسەی بەڕاستی هەقی هەڵگرتووە هەموو ئامانجی ئەوەیە ئەو هەقە بپارێزێت و هیچی لێ ون نەبێت هەرچەندە درەنگیش بگاتە مەنزڵ، کەسانێکیش هەن هەقیان هەڵگرتووە و تەنها ئامانجیان ئەوەیە بەخێرایی خۆیان پێش بخەن، هەرچەندە نیوەی هەق و ڕاستییەکەیان لەڕێگە لێ بکەوێت.

* هەموو پەیامێک هەڵگری هەیە، هەڵگرانی پەیامەکەش ئارەزوویەکی شاراوەی تێکەڵیان هەیە لەنێوان کارکردن بۆ خودی خۆیان و کارکردن بۆ پەیامەکەیان، پەلە دەکەن لە گەیشتنیان هەرچەندە نیوەی پەیامەکەش لە ڕێگە لێیان بکەوێت.

* زۆرێک لە چاکسازان بەروبوومی چاکسازییەکەیان نەچنیوەتەوە لە دونیادا، بەڵکوو ئەوانەی پاش خۆی چێژیان لێی دیوە، چونکە پاداشتی بازرگانییەکەیان لەگەڵ خودا دواخستووە بۆ دواڕۆژ، نەک بۆ دونیا.

* گەیاندنی پەیام وەک درەختێکی ڕوێندراوە، هەندێکجار ئەو کەسەی ڕواندوویەتی بەروبوومەکەی نابینێت، لەوانەیە شوێنکەوتووانی ئەو پەیامە کۆمەڵێک بن هێشتا لەدایک نەبووبن، لە فەرموودەدا هاتووە: «هیوام وایە خودا لە پشتی ئەمان کەسانێک بهێنێتەدەر تەنها خۆی بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن.»

* لەوانەیە بەروبوومی پەیامەکان لە نەوەو و کۆمەڵێکدا دەربکەون کەهێشتا لەدایک نەبوون، پەیامبەری خودا کاتێک لە طائیف دەرکرا فەرمووی: «هیوام وایە خودا لە پشتی ئەمان کەسانێک بهێنێتە دەر تەنها خۆی بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن.»

* پەلەکردنی بانگخواز بۆ دیتنی دەرئەنجامی پەیامەکەی، گەورەترین هۆکارە بۆ لادانی لە ڕێگەی ڕاست و گەڕانی بەشوێن ڕێگەیەکی دیکەدا، لە فەرموودەدا هاتووە: «پەیامبەری وەها دێت لە ڕۆژی دوایدا هیچ شوێنکەوتوویەکی لەگەڵ نییە.» قورئان باسی سێ پەیامبەرمان بۆ دەکات بۆ شارێک نێردراون و تەنها یەک پیاو باوەڕی پێ هێناون، پەیامبەرەکان زۆرتر بوون لە شوێنکەوتووانیان.

* بەدی نەهاتنی دەرئەنجامەکان واتای هەڵەبوونی ڕێگاکە ناگەیەنن، چونکە ئەوەی پێویستە دروستی ڕێگەکەیە نەک گەیشتن بە کۆتایی ڕێگە، پەیامبەری واها هەیە لە ڕۆژی دوایدا تەنها یەک کەس شوێنکەوتوویەتی و پەیامبەری وەها دێت لە ڕۆژی دوایدا هیچ شوێنکەوتوویەکی لەگەڵدا نییە.

* نەهاتنەدی ئامانجەکان بەڵگە نییە لەسەر هەڵەبوونی ڕێگەی ئەو کەسەی لەسەر ڕێگایەکە، ئەگەر بەو جۆرە بووبا، ئەوا پەیامبەرانێک نەدەهاتن لە ڕۆژی دوایدا شوێنکەوتوویان نەبووبێت، ئەوان دەرچەی وەحی خودان و حیکمەتی تەواویان لەو ڕێگەیەدا هەیە، ئەگەر هۆکارەکان دروست بوون، ئەوا لادان لەو ڕێگەیە بۆ گەڕان بەشوێن دەرئەنجامدا هەڵەیەکە ئەو نووسەر و بانگخوازانە تێی کەوتوون کە دەگەڕێن بۆ ڕێگەیەکی دیکە بۆ دەستخستنی شوێنکەوتوو، جیاوازی ناکەن لەنێوان چەسپاندنی هەق و بەدەستهێنانی زۆری شوێنکەوتووان، بەکارهێنان و گۆڕینی شیوازەکانی بانگەواز لە کاتی نەبوونی شوێنکەوتوودا ڕێگە پێدراوە، بەڵام بەبێ گۆڕینی بنەڕەتیی هەق و ڕاستییەکان، نووح گۆڕانکاری لە شێوازی بانگەوازیدا بەکار دەهێنا، بەڵام هەق و ڕاستی لەلای جێگیر بوو. نووح شێوازی بانگەوازی دەگۆڕی، بەڵام کەمی و سەرکەشی خەڵکەکان کاری تێنەدەکرد بەهۆیەوە لابدات: ﴿... دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا﴾ [نوح: ٥] «گەلەکەی خۆمم (بەپەنهانی) بانگ کرد بە شەو و بە ڕۆژ.»

﴿أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا﴾ [نوح: ٩] «دەمێک بۆم ئاشکرا دەکردن و دەمێک بۆم پەنهان دەکردن بە پەنهانکردنێکی تەواو.»

جێگیری نووح لەسەر ئەو هەقەی لەسەری بوو، هەرچەندە شوێنکەوتووی کەم بوو لەگەڵ بەردەوامی ئەو ماوە زۆرەی بەڵگەیەک بوو بۆ بانگەوازکاران بۆ بیرلێکردنەوە و پەند وەرگرتن و بێئومێد نەبوون.

* خەڵکی شکۆ و هەیبەتیان هەیە، بەڵام کاتێک شکۆی خودا لە دڵدا جێگیر بوو شکۆی خەڵکی نامێنێت و دەڕوات.

* شکۆ و هەیبەتی خەڵکی زۆرترین هۆکارە کە ڕێگری لە مرۆڤ دەکات وتەی هەق بڵێت، لە فەرموودەدا هاتووە: «با شکۆی خەڵکی نەبێتە ڕێگری کەسێکتان لەوەی وتەی هەق بڵێن، ئەگەر هەقی بینی یان بیستی. شکۆی خودا شکۆی خەڵکی ناهێڵێت.»

* کەسانی ڕاجیا شکۆ و هەیبەتێکیان هەیە دەوری دڵ دەدات دەبێتە ڕێگر لە دەربڕینی هەق، جا کاتێک کە دەوری دڵی دا، یادی گەورەیی خودا هەموو گەورەیەکی دیکە بچووک دەکاتەوە لە دڵدا: ﴿ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ﴾ [آل عمران: ١٧٥] «تەنیا شەیتانە کە دۆست و (برادەرانی) خۆی دەترسێنێت جا ئەوە لێیان مەترسن و لەمن بترسن.»

* زۆرێک لە خاوەن هەقەکان لە وتنی هەق دەترسن لەوەی پێگەیان بەهۆی زمانی ناهەقانەوە لەدەست بدەن: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ [یونس: ٦٥] «با وتەی ئەوانە غەمبارت نەکات، بەڕاستی هێز و دەسەڵات هەمووی بۆ خوایە.»

* ئای چەندە قورسە وتنی هەق ئەگەر بزانیت خەڵکی پێیان ناخۆشە و وەری ناگرن، چەندە ئاسانە ئەگەر بزانیت خودا خۆشی دەوێت و وەری دەگرێت هەرچەندە خەڵکی وەری نەگرن.

* وتەی هەقت لەسەر قورس نەبێت کاتێک خودا ئەو وتەیەی خۆش دەوێت و پێی ڕازییە.

* تەنها یەک ڕۆژ سەرخستنی هەق لەو کاتەی خەڵکی لێی دووردەکەونەوە، گەورەترە لە سەرخستنی بۆ ماوەی ساڵێک کە خەڵکی ڕوویان تێ کردووە و وەری دەگرن.

* کاتژمێرێک ئارامگرتن لەسەر هەق کاتێک بەتەنهای، گەورەترە لە ساڵێک لەسەر هەقبوون کە خەڵکیت لەگەڵدا بێت و بەتەنها نەبێت.

* ترسان لە هێزی ئەوانەی پێچەوانەی هەقن، گەورەترین هۆکارە کە شەیتان پەرەی پێ دەدات بۆ ترساندن و شکست پێهێنانی خاوەن هەقەکان: ﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ﴾ [آل عمران: ١٧٥]

بەڕاستی ئەوەی ئێوە (سارد دەکاتەوە) تەنها شەیتانە کە دۆست و (برادەرانی) خۆی دەترسێنێ جا ئێوە لێیان مەترسن وە لە من بترسن.

* هەق بەبێ هێز لاوازە، هێزیش بەبێ هەق ستەمە.

* هەق چەکێکە پێویستە بەهێزەوە بهاوێژرێت، تاکوو نێچیرەکان بپێکێت و بچەسپێت: ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾ [الأنبياء: ١٨] «واز لەوە بێنە بەڵکوو حەق دەدەین بەسەر بەتاڵ و ناحەقدا، بەهۆیەوە (بەتاڵ) تێکدەشکێت، ئینجا دەست بەجێ بەتاڵ دەفەوتێت و لەناو دەچێت.»

* هەق هەرچەندە بەهێز بێت، ناتوانێت نێچیر بپێکێت مەگەر بە هێز و جێگیری هاوێژەرەکەیەوە نەبێت: ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾ [الأنبياء: ١٨]

* هەق هەرچەندە بەهێز بێت، پێویستی بە متمانەی خاوەنەکەیەتی تاکوو کاریگەری هەبێت، خودا دەفەرموویت: ﴿فخذها بقوة﴾ «جا تۆش مووسا! زۆر بەهێز و بەتوندی ئەو (ئەلواح)انەی تەوڕات بگرە.»

هەروەها دەفەرموویت: ﴿خذوا ما آتیناكم بقوة﴾ «پێمان وتن: ئەو فەرمان و بڕیارانەی پێمانداون، توند بیانگرن و کاریان پێ بکەن.»

هەروەها دەفەرموویت: ﴿خذ الكتاب بقوة﴾ «بە هەرچی تواناتە ئەو نامەی تەوراتە بگرە و کار و ڕەفتاری پێ بکە.»

* هەرچەندە بڕوابوونت بە هەق زۆر بەهێزبێت، بەڵام زۆری نەیارانی هەق لاوازت دەکات لەدەست گرتن بە هەقەوە، بۆیە پێویستە ئارامگر و جێگیر و دامەزراو بن: ﴿فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ﴾ [الروم: ٦٠] «جا دان بە خۆتدا بگرە بێگومان، بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، با ئەوانەی بێباوەڕن لە (ئایینی) ڕاست لات نەدەن و بێزارت نەکەن.»

* هەندێک جار ئەوانەی لەسەر ناهەقی و باتڵن بەهێزن و خاوەن هەقەکان لاوازن، چونکە یەکەمیان باوەڕی تەواویان بە باتڵەکەیان هەیە، دووەمیان گومانی لە تەواوی هەقەکەیان هەیە. ورەبەرزی کەسەکان کاریگەری دەخەنە سەر بیروباوەڕیان.

* خودا فەرمانی بە ئارامگری و جێگیربوون لەسەر هەق کردووە، نەک بۆ ئەوەی کەسی جێگیر بوو ببێتە ڕەمز، بەڵکوو بۆ دەرکەوتنی ئیسلامە: ﴿وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾ [طه: ١٣٢] «سەرەنجامی چاک بۆ پارێزکاران و خواناسانە.»

سەرەنجام بۆ هیچ کەسێک بەدیاری کراوی نییە.

* جێگیریی نووح لەسەر هەق لەگەڵ ئەوەدا کە شوێنکەوتووانی زۆر کەم بوون، بەردەوامی بۆ ئەو ماوە درێژە، جێی بیرکردنەوە و ڕاستکردنەوە و بێئومێدنەبوونە بۆ بانگخوازان.

* یەقین ئەگەر لە کەسێکدا ڕەگی داکوتی، دەتوانێت بەرانبەر هەموو مرۆڤایەتی بوەستێتەوە، بە جێگیری و بێباکی لێیان، نووح بە گەلەکەی گوت: ﴿فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ﴾ [یونس: ٧١]

«ئێوەش کاروبڕیاری خۆتان کۆکەنەوە لەگەڵ هاوبەشەکانتاندا، ئینجا با کار و بڕیارەکانتان شاراوە نەبێت بەلاتانەوە (بەڵکوو ئاشکرا بێت) پاشان پەلامارم بدەن و ماوەم مەدەن.»

* خەڵکی زیاتر کەسی پێقایم و چەسپاو کاریان تێ دەکات، هەرچەندە لەسەر ناهەقیش بێت، زیاتر لە کەسانی گوماندار و ناجێگیر هەرچەندە لەسەر هەقیش بێت.

* ئەو کەسەی متمانەی بە بۆچوونی خۆی هەیە هەرچەندە خراپیش بێت شوێنەواری زیاتر و بەهێزترە لەو کەسەی متمانەی بە خۆی نییە هەرچەندە لەسەر هەقە، جێگیربوون کاریگەری دەخاتە سەر شوێنکەوتووان زیاتر لەوانەی جێگیر نین. پێشەوا عومەر پەنای گرتووە بەخودا لە بەهێزی کەسانی خراپ و تەمبەڵی و هەوڵنەدانی کەسانی چاک.

* شکستی دەروونی دەبێتە هۆی چاندنی گومان بەرانبەر هەق، متمانەی دەروون دەبێتە هۆی جێگیربوون هەرچەندە لەسەر ناهەقیش بێت، ئەگەر متمانەی دەروون و هەق کۆبوونەوە ئەوا جێگیربوونێکە شکستی بەدوادا نایات.

* هەندێکجار چاکسازان هەست بە شکست و سەرکەوتنی خراپەکاران دەکەن بەسەریانەوە، بەڵام ئەم هەستە مرۆڤە ڕاستگۆکان ناگۆڕێت و تووشی لادانیان ناکات ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ﴾ [القمر: ١٠]

«جا نووح هاواری کردە پەروەردگاری و (وتی) بەڕاستی من شکستم خواردووە (بێ دەسەڵاتم) دەی تۆ یارمەتیم بدە.»

* وتەی خراپەکاران و گاڵتەپێکردنەکانیان هەندێکجار شکست لە دەروونی خاوەن هەقەکاندا دروست دەکات، ئەگەر شکۆمەندی کەسێک هاتە دەروونتەوە، ئەوا شکۆمەندی خودا بهێنە خەیاڵت تاکوو جگە لە ئەوت لا کەم بێت: ﴿وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ [یونس: ٦٥] «با غەمبارت نەکات وتەی ئەوانە چونکە بەڕاستی هێز و دەسەڵات هەمووی بۆ خوایە.»

* شوێنکەوتنی هەق لە کاتی بەهێزی و ڕووتێکردنی خەڵکیدا بۆی کارێکی ئاسانە، بەڵام بەردەوامی لە کاتی لاوازی و پشتێکردنی خەڵکی کارێکی قورسە، ئەمە بۆ هەڵبژێراوەکانە: ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَـٰتَلَ﴾ [الحديد: ١٠]

«یەکسان نین ئەوانەتان کە لە پێش گرتنی (مەککە)دا ماڵیان بەخشی و جەنگاون (لەگەڵ ئەوانەی لەدوای فەتح ئەو کارانە بکەن.)

* پەیامەکان دەشێوێن ئەگەر خاوەنەکانیان لە جگە لە خودا بترسن: ﴿ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَـٰلَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا﴾ [الأحزاب: ٣٩] «کەسانێک کە پەیامەکانی خوا ڕادەگەیەنن و لە خوا دەترسن و بێجگە لە خوا لە کەسی تر ناترسن»

* کەسی دڵسۆز و خوداویست. ناوەستێت لە گەیاندنی هەق ئەگەر سەرزەنشت کرا، چونکە ئەو لە سەرەتادا بۆ ستایشکردن ئەو کارەی نەکردووە.

* چاکسازان بێگومان تووشی تاقیکردنەوە دەبن: ﴿وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ [لقمان: ١٧] «فەرمان بە چاکە بکە و ڕێگری بکە لە خراپە خۆگر و بەئارا بە لەسەر هەر بەڵا و ناخۆشییەک کە تووشت دێت.»

فەرمانی ئارامگرتنی پێ کرد، چونکە بێگومان تاقی دەکرێتەوە.

* چاکسازی و تووشبوون بە ئاشووب و نارەحەتی، دووانەن؛ هەموو چاکسازییەک بە فیتنە و ئازاروە وابەستەیە: ﴿وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ [لقمان: ١٧]

* ئەگەر خودا زیرەکی و پاکی پێکەوە بە هەرکەس دا، ئەوا تاقیکردنەوەی سەختی لە گەڵدا بۆ دەهێنێتە پێش.

* لە تەواوی مێژوودا هیچ کەسێک نەبووە خودا کردبێتییە جێی سوود و قازانج بۆ خەڵکی و تووشی بەڵا و تاقیکردنەوە نەهاتبێت، جا بە ڕێژەی کەم یان زۆر. تاقیکردنەوە دەرگایەکە دەبێت هەموو ڕاستگۆیەک پیایدا گوزەر بکات.

* ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا﴾ [الطلاق:٢] «هەر کەسێک لەخواترس بێت، خودا دەرووی لێ دەکاتەوە.»

هەر دەبێت ڕاستگۆیان بکەونە تەنگانەوە، بۆیە خودا دەروو و دەرچەی دەربازبوونی داناوە، لە سەرەتاوە نەی پاراستوون لەوەی نەچنە ناو ئەو تەنگانەیەوە.

* ئەو کەسەی بووەتە پێشرەوی هەق، زیاتر تووشی تاقیکردنەوە و بەڵا دێت وەک لە خەڵکانی دیکە، هاوشێوەی سەر بۆ جەستە کە زۆرترین پێکان و بەڵا ڕوو لە ئەو دەکات.

* پێشرەوی و سەرکردەیی بەدەست نایەت لە هەقدا، مەگەر بە ئارامگری لەسەر بەڵا و تاقیکردنەوەکانی ئەو ڕێگایە: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْ﴾ [السجدة:٢٤]

«لەناو ئەواندا پێشەوایانێکمان دانا ڕێنموونی (خەڵک)یان دەکرد بە فەرمانی ئێمە کاتێک ئارامیان گرت.»

* پەیامی هەق پاک نابێتەوە مەگەر بە بوونی دژەکانی، هەروەها خاوەنەکەشی پاک نابێتەوە بە بەڵا و تاقیکردنەوە نەبێت.

* زۆرێک لەوانەی واز لە ڕێگەی هەق دەهێنن بەڵا هاتووەتە ڕێیان و گۆڕیونی، پارێزراوبوونی خۆیان پێش پارێزراوبوونی هەق خستووە، پاشان لە ڕێگە نوێیەکەیان ناو دەبەن بە ڕاستکردنەوە و پێداچوونەوە.

* دڵخۆشبوونی خەڵکانێک کە پارێزراو بوون لەو بەڵایەی دابەزیوەتە سەر خەڵکانێکی دیکە کە فەرمانی خوایان بەجێهێناوە، ئەم دڵخۆشیە نیشانەی دووڕووییانە ﴿وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُواْ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمْ فَرِحُونَ﴾ [التوبة: ٥٠] «ئەگەر نارەحەتی و تێشکانت تووش بێت (بەکەشخەوە) دەڵێن بەڕاستی ئێمە کاری خۆمان کرد لەمەوپێش جا ڕوو وەردەگێڕن بەخۆشحاڵی و شادمانییەوە.»

* دڵخۆشی لە کاتی گوێڕایەڵیدا بۆ فەرمانەکانی خودا دێتە جێ و هەموو بەڵاکانی دونیا بچووک دەبنەوە لەگەڵ ئەودا. پارێزراوبوون لە بەڵا و تاقیکردنەوە واتای دروستیی ڕێبازی کەسەکە ناگەیەنێت، بەڵکوو زۆرجار نیشانەیە لەسەر پێچەوانەبوونی ئەو بابەتە.

* هەرچەندە مرۆڤ تەواو دڵنیا بێت لە بۆچوونەکانی، هەر دەبێت ترسی نەیارەکانی لەدڵدا هەبێت، ساحیرەکان سیحرەکانیان لەبەردەم مووسا فڕێدا: ﴿فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِۦ خِيفَةً﴾ [طه: ٦٧]

«مووسا ئەوسا لە دڵی خۆیا کەمێک ترسا.» پێویستە لەو کاتەدا یاریدەدەرێک هەبێت بڵێت: ﴿لَا تَخَفْ﴾ [طه: ٦٨] «هیچ ترسێکت نەبێت.»

* هاوڕێ ئەو کەسەیە لە کاتە تەنگانەکاندا ئاگادارت دەکاتەوە و چەسپاوت دەکات، دوژمنیشت ئەو کەسەیە دڵئارامت دەکاتەوە و بێهۆشت دەکات.

* بازنەی دۆستان گەورە بکەوە کاتێک دوژمنەکان بەهێزدەبن.

* هەر چاکەیەک بەرانبەر مرۆڤ دەکرێت لەلایەن خەڵکییەوە، پێویست دەکات لەبەرانبەریدا شتێک ببەخشێت، هەرچەندە لە داهاتووشدا بێت، بۆیە پێویستە لەسەر زانایان خۆیان بپارێزن لە بەخشینی ئەو کەسانەی ڕێگەی خودایان ناوێت. کەس ناتوانێت ڕێ لە دەروونی بگرێت، لە دانی باجی ناهەقی

تەنها پەیامبەران و هاوشێوەکانیان نەبێت لە زانایان. فیرعەون بەو چاکە کۆنەی داوای لە مووسا کرد واز لەو هەقەی بهێنێت، خودا لەسەر زمانی فیرعەون کاتێک لەگەڵ مووسا دەدوێت دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ﴾ [الشعراء: ١٨] «ئایا ئێمە پێمان نەگەیاندی لەناو (ماڵی) خۆماندا بە منداڵی و تۆ چەند ساڵێک بە منداڵی لەگەڵ ئێمە نەمایتەوە؟»

چل ساڵ بەخێوی کرد، بەڵام مووسا پشتی کردە ئەوەی پاداشتەکەی بەبێدەنگبوون لەهەق بداتەوە، چجای چوونە ناو ڕیزی پووچەڵ و باتڵانەوە.

* دڵی زانایان بە پاکی دەمێنێتەوە ئەگەر دیاری و بەخششی دەسەڵاتداران لێڵی نەکات، ئیبن عەینییە دەڵێت: "دەزانن خودا تێگەیشتنی لە قورئان پێ دابووم، بەڵام کاتێک پارەیەکم لە ئەبوو جەعفەری بەرمەکی وەرگرت، خودا ئەو تێگەیشتنەی لێ وەرگرتمەوە."

* هەموو دیارییەک لە بەرانبەریدا دەبێت شتێک بدەیت، شتێک وەرمەگرە لە بەرانبەریدا کە ئایین لە دەست بدەیت، بەلقیس گوتی: ﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ [النمل: ٣٥]

«ئەوا من دیارییەکیان بۆ دەنێرم؛ چاوەڕێم کە ڕاسپاردەکان بە چییەوە دەگەڕێنەوە.»

سولیمان فەرمووی: ﴿ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ﴾ [النمل: ٣٧]

«بە (دیارییەکەوە) بگەڕێرەوە بۆ لایان، سوێن بە خوا بە لەشکرێکەوە بۆیان دێین.»

* فیرعەون گوتی ﴿أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ﴾ [الشعراء: ١٨] «ئایا ئێمە پێمان نەگەیاندی لەناو (ماڵی) خۆماندا بەمنداڵی و تۆ چەند ساڵێک لە تەمەنت لەناو ئێمەدا نەمایتەوە؟»

لای سەیر بوو مووسا ئاسایی مامەڵەی نەکرد، بۆیە ویستی یادی مووسا بهێنێتەوە نەوەک لەیادی چووبێت.

* ترسی سەرشۆڕکردنی دۆستەکانت هەبێت وەک لە دوژمنایەتی دوژمنە دوورەکانت، چونکە سەرشۆڕکردنت لەلایەن نزیکەکانتەوە زۆر قورسترە لەسەر دەروون، لە فەرموودەدا هاتووە: «بەردەوام کۆمەڵێک لە ئوممەتەکەم لەسەر هەق دەمێننەوە، ئەوانەی دەیانەوێت سەرشۆڕیان بکەن، ناتوانن زیانیان لێ بدەن.»

* سەرشۆڕکردنت لەلایەن نزیکەکانەوە زۆر قورسترە لە دوژمنایەتی دوورەکان، چونکە نزیکەکان ئومێدی سەرخستنیان لێ دەکەیت، بەڵام دوورەکان چاوەڕوانی دوژمنایەتییان لێ دەکەیت، پەیامبەر (ﷺ) دەفەرموویت: «بەردەوام کۆمەڵێک لە ئوممەتەکەم لەسەر هەق دەمێننەوە، ئەوانەی دەیانەوێت سەرشۆڕیان بکەن ناتوانن زیانیان پێ بگەیەنن.»

* ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ﴾ [التغابن: ١٤] «ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بەڕاستی هەندێک لە ژنان ومنداڵانتان دوژمنی ئێوەن، جا خۆتانیان لێ بپارێزن.»

ئەمە دەربارەی خێزان و منداڵە کە نزیکترین کەسانن بۆ مرۆڤ، جا دەبێت چۆن بێت دەربارەی هاوڕێ و کەسانی دوور.

* گەڕان بەشوێن پارێزراوبووونتدا بنەمایەکی هەڵەیە، بەڵکوو کاری دروست گەڕانە بەشوێن پارێزراویی ئامانجەکاندا. خۆ ئەگەر کەسەکە پارێزراو بوو پاش ئەوە، ئەوا لە نیعمەت و بەخششی خوداوەیە. خۆئەگەر پارێزراو نەبوو، ئەوا تاقیکردنەوەیە بۆی.

* بەروبوومی دەستگرتن بە ئایینەوە پارێزراوبوون نییە لە دونیادا، بەڵکوو پارێزراوبوونە لە دوارۆژدا. ئەگەر پارێزراو بوون لە دونیادا بە ئەندازەی دەستگرتن بووبا بە ئایینەوە، ئەوا زەکریا بە مشار نەدەبڕدرا و یەحیای کوڕی نە دەکوژرا. هەروەها یوسف بەند نەدەکرا و موحەممەدیش دەرنەدەکرا و لێی نەدەدرا و گەمارۆ نەدەدرا، لەکاتێکدا ئەمانە هەموویان پەیامبەری ڕێزداری خودا بوون.

* بەروبوومی دەستگرتن بە ئایینەوە پارێزراوبوون نییە لە دونیادا، بەڵکوو پارێزراوبوونە لە دوارۆژدا، ئەگەر پارێزراوبوون لە دونیادا بە ئەندازەی دەستگرتن بووبا بە ئایینەوە، ئەوا ئەو کەسەی جیهاد دەکات بە ماڵ و سامان و گیانی خۆی. دەبوو دورترین کەس بێت لە لەدەستدانی سامان و گیانی.

* زۆرێک لەوانەی خۆیان پاڵدەدەنە زانست خۆیان بەدوور دەگرن لە ڕوونکردنەوەی هەق بۆ پاراستنی خۆیان، نەک بۆ پاراستنی هەق، لە کاتە قورس و ناهەموارەکاندا زۆرێک پەیڕەوی ڕێگەی پارێزراوی دەکەن، بەڵام کۆمەڵێکی هەڵبژێردراو دەیانەوێت پەیڕەوەکەیان پارێزراو بێت، خوداش بەو کۆمەڵەیە ئایین دەپارێزێت و میللەت سەردەخات.

* بۆچوونەکانیان دەگۆڕن بۆ دەستخستنی پارێزراوییان نەک بۆ دەستخستنی هەق: ﴿يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡ﴾ [العنكبوت: ١٠] «دەڵێن باوەڕمان بە خوا هێناوە ئینجا کاتێک سزا بدرێت لەپێناوی خوادا (لەلایەن کافرانەوە) ئازار و سزای خەڵکی وەکوو ئازار و سزای خوا دادەنێت. ئەگەر لەلایەن پەروەردگارتەوە سەرکەوتنێک بێت، دڵنیابە ئەوان دەڵێن: خۆ ئێمە لەگەڵ ئێوەدا بووین.»

* ئەوانەی زۆرترین دوودڵی و ناجێگیرییان هەیە، ئەوانەن کە بەشوێن پارستنی خۆیاندا دەگەڕێن بەر لە پاراستنی بنەماکانیان: ﴿سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَا﴾ [النساء: ٩١]

«لەمەولا کەسانێکی تر دەبینن کە دەیانەوێت لە ئێوە ئەمین بن و لە هۆزەکەی خۆشیان ئەمین بن، هەر کاتێک بانگکرابن بۆ بێباوەڕیو بتپەرستی، گەڕاونەتەوە بۆی.»

* کردارەکان جیاواز دەبن ئەگەر مەبەست و ئامانجەکان جیاواز بوون، ئەو کەسەی ئامانجی ئایینە وەک ئەو کەسە نییە کە ئامانجی بەدەستهێنانی دونیایە.

* ئەوانەی لەسەر هەقن خەسارەتمەند نابن، بەڵکوو تاقی دەکرێنەوە و ئازار دەدرێن تاکوو شایستەی سەرکەوتن دەبن: ﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَىٰ مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ﴾ [الأنعام: ٣٤] «سوێند بە خوا بێگومان پێغەمبەرانی پێش تۆش (ئەی موحەممەد (ﷺ)) باوەڕیان پێ نەکراوە، بەڵام ئارامیان گرت لەسەر ئەو باوەڕپێنەکردنەیان و ئەزیەت و ئازار دران تا یارمەتی و سەرخستنی ئێمەیان بۆ هات و فەرمانەکانی (بەڵێنەکانی) خوا بە هیچ کەسێک ناگۆڕدرێت.»

* ئەی چاکساز، بزانە خودا دەیەوێت ئایینەکەی بەهۆی تۆوە بپارێزێت، نەک دونیات بپارێزیت بەهۆی ئایینی خوداوە. ئەگەر شتێکی دونیات لەدەست دا لەپێناو دینەکەت، ئەوا بزانە هاتنەجێی بەشێکە لەو بەڵێنەت کە لەگەڵ خودا بەستووتە، خودا خودی خۆتی کڕیوەتەوە لە خۆت.

* ئایینی خودا دەرکەوتووە و پارێزراوە لە گۆڕین، هەرکەس پلە و پایە و دەسەڵاتی بۆ خزمەت دیین بەکارهێنا، خودا پلەوپایە و دەسەڵاتی دەپارێزێت و لەسەر ئایین بەردەوامی دەکات. ئەو کەسەی ئایین بەکار بهێنێت بۆ پارستنی پلە و پایە و دەسەڵاتی، خودا پلە و پایە و دەسەڵاتی لێ دەفەوتێنێت و سەرگەردانی دەکات، ئەمە مەبەستی وتەی پەیامبەرە (ﷺ) «خودا بپارێزە، خودا دەتپارێزێت.» پاداشتەکان هاوشێوەی کردارەکانن.

* چاکساز چاکسازی دەکات بۆ هێنانەدی هەق، نەک بۆ ڕازیکردنی خەڵکی.

* قەبووڵبوون و خۆشویسترانی مرۆڤ لە ئاسمانەوە دادەبەزێت و لە زەوییەوە بەرز نابێتەوە. ئەوەی لە ئاسمانە یەکێکە، ئەوانەی لەسەر زەوین چەندەها گەلن، یەکێکیان ڕازی بکەیت ئەوی دیکەت لێ دەڕەنجێت. خودا ڕازی بکە، دروستکراوەکانی لێت ڕازی دەبن.

* ویستی دەستخستنی خۆشەویستی خەڵکی وا لە مرۆڤ دەکات لابدات لە هەق لەپێناویاندا: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ وَإِذٗا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلٗا﴾ [الإسراء: ٧٣] «بەڕاستی نزیک بوو ئەوانە لات دەبن لەوەی کە نیگامان کرد بۆت، بۆئەوەی جگە لە قورئان شتێک بە ناوی ئێمەوە هەڵبەستیت (ئەگەر گوێڕایەڵیان بوویتایە) ئەوە لەو کاتەدا دەیانکردیت بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان.»

* داوای ڕازیبوونی خەڵکی مەکە لە هەقدا، تاکوو بەرگری لە تووڕەبوونی نەکەیت ئەگەر تووڕە بوو.

* بەردەوام یادکردنی شکستەکان و لاوازییەکان لە دەروونداا ترس و شکست دەچێنێت، وای لێ دەکات سەرکەوتن و خاڵە بەهێزییەکانی لەبیر بچێتەوە: ﴿وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ [آل عمران: ١٣٩] «سست و دڵ لاواز مەبن، هەر ئێوە بەرز و بڵندترن ئەگەر بڕوادار بن.

* ئەوەندە سەرقاڵی یادکردنی شکست و کەوتنەکانت مەبە بەجۆرێک هێز و سەرکەتنەکانت لەیاد بکەیت، تا دەروونت لاواز و شکستخواردوو نەبێت: ﴿إِن تَكُونُواْ تَأۡلَمُونَ فَإِنَّهُمۡ يَأۡلَمُونَ﴾ [النساء: ١٠٤] «ئەگەر ئێوە ئێش و ئازارتان پێ بکات، بێگومان ئەوانیش ئێش و ئازاریان پێ دەگات.»

﴿إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥ﴾ [آل عمران: ١٤٠] «ئەگەر ئێوە

زام و برینتان تووش بوو، ئەوە  بێگومان ئەوانیش زام و برینیان تووش بووە بە وێنەی زامی ئێوە.»

* ئەو کەسانەی ڕێگەی هەقیان گرتووەتە بەر، بێگومان پارێزراو نابن لە ڕێگر و خاوکەرەوەکانی سەر ئەو ڕێبازەیان، تەنانەت پەیامبەرانیش پارێزراو نەبوون: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ﴾ [التوبة: ٥٨] «هەندێک کەس لەوانە ڕەخنە و توانجت لێ دەگرن لە دابەشکردنی خێرەکاندا.»

ڕەخنە لە پەیامبەر گیراوە، بێگومان ڕەخنە لە شوێنکەوتووەکانیشی دەگیرێت، سەرئەنجام هەق جێگیر دەبێت و ئەوانی دیکە نامێنن.

*هەموو کەس ئامانجێکی هەیە، ئامانجی زۆرێک لە خەڵکی دانانی تەگەرە و بەربەستی سەر ڕێگایە، جا تۆ ئامانجی ئەوان مەهێنە دی و سەرقاڵ ببیت لە ئامانجەکەی خۆت.

* نیشانەی ڕێنمایی نەکردن و تەوفیق نەدانی خودا بۆ هەکدێك مرۆڤ ئەوەیە کە خودا لە بەردی بونیاتنان و چاکسازیەوە کردویەتیە بەردی ڕێگری ڕێگەی ڕاستگۆیان.

* تەنیا خودا دەزانێت مووسا چەندە ترساوە لەوکاتەدا کە فیرعەون بەدوایانەوە بوو لەلای دەریاکەدا: ﴿لا تخاف دركا ولا تخشى﴾ «نە بترسە لە لەشکرەکەی فیرعەون پێت بگات، نە خەمی نوقمبوونیشت هەبێت.»

ئەو ترسەی کە هەیبوو بە هیچ جۆرێک دەری نەخست بۆ شوێنکەوتووانی، چونکە ئەو پێشەوا و سەرمەشقیانە: ﴿قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ﴾ [الشعراء: ٦٢]

«مووسا وتی نەخێر پێتان ناگەن بێگومان من پەروەردگارم لەگەڵە بەزوویی ڕێگای (ڕزگاربوونم) نیشان دەدات.»

* ناوبانگ فیتنەیە بۆ خاوەنەکەی، وا دەکات گرنگی بە چاودێری خەڵکی بدات و چاودێری خودا لای کەم دەکاتەوە.

* مرۆڤی عاقڵ ئەو کەسەیە بەئاگابێت لە کاریگەریی شوێنکەوتووانی لەسەری، وەک چۆن دەترسێت لە کاریگەری دوژمنەکانی. زۆرێک لە خەڵکی پاشکۆن لە بەرگی شوێنکەوتوودا.

* ئەو کەسەی بەرەو خودا دەڕوات، کاریگەر نابێت بەوانەی لە پشتیەوە دەڕۆن، ئەگەر زۆر بوون، سپاسگوازاری خودا دەکات. خۆ ئەگەر کەم بوون، ئارام دەگرێت.

* ئاوڕ مەدەرەوە بەرەو دواوە بۆئەوەی زۆری شوێنکەوتووانت ببینیت، بەڵکوو سەیری پێش خۆت بکە بۆئەوەی ڕێگەکەت تەواو بێت و هەڵە نەکەیت.

* ئاوڕدانەوە بۆ لای شوێنکەوتووان فیتنەیەکە ئەقڵ دەوەستێنێت لە بیرکردنەوە و تێڕامان، دەبێتە هۆی ستەم کردن لە خودیش: ﴿فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ۝ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ﴾ [الكهف: ٣٤-٣٥] «جا بە هاوڕێ (ئیمانداره هەژارەکەی) وت، لەکڵتێکدا کە قسەی لەگەڵ دەکرد، من ماڵ و سامانم لەتۆ زۆرترە و کوڕ و خزمەتکاریشم زیاترە. هەروەها چووە ناو باخەکەیەوە لەکاتێکدا کە ستەمکار بوو لە نەفسی خۆیدا.»

* فیتنەی شوێنکەوتووان دەبێتە هۆی چاندنی ستەم لە نەفسدا: ﴿فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ۝ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ﴾ [الكهف: ٣٤-٣٥]

* مرۆڤی ڕاستگۆ زیانی پێ ناگات هەرچەند شوێنکەوتووانی هەڵبگەڕێنەوە و لابدەن، هەروەها کەوتنی کەسانی بەردەمی کاری تێ ناکات کە شوێنکەوتەن و خەڵکی شوێنیان کەوتوون، چونکە ئەو چاوی بڕیوەتە ئاسمان نەک ئەوان.

* شوێنکەوتووان وەک سێبەرن بۆت، بەدرێژی ئەو سێبەرە سەرکەش مەبە و بە کورتییەکەی بێئومێد مەبە، چونکە خۆت خۆتی، بەڵام ئەوان کاریگەری دەرەکی کاریان تێ دەکات.

* هەموو چاکسازێک کەسانێک دەبنە دوژمنی، هەرچەندێک ئەو مرۆڤە پلەی بەرز بێتەوە ئەوانیش ڕێژەیان زۆر دەبێت، ئەمە تەنانەت بۆ پەیامبەرانیش وا بووە، ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾ [الأنعام: ١١٢] «هەر بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێک دوژمنمان داناوە، لە شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە کە بەنهێنی بەیەکتری ڕادەگەیەنن.»

* هەموو خاوەن هەقێک کەسانێک دەبنە دوژمنی، هەرچەندە پلەی بەرز بێتەوە، ئەوانیش ڕێژەیان زۆر دەبێت، ئەمە تەنانەت بۆ پەیامبەرانیش بو شێوەیە بووە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾ [الأنعام: ١١٢] «هەر بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێک دوژمنێکیان داناوە لە شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە کە بەنهێنی بەیەکتری ڕادەگەیەنن.»

* ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ﴾ [الأنعام: ١١٢]

ئەگەر زانایان پەیامی پەیامبەرانیان بە میرات وەرگرت ئەوا دوژمنایەتییەکانیشیان بە میرات بۆ دێت، ئەگەر بەو چەشنە نەبوو، ئەوا با پەیامەکەی بپشکنێت چونکە بێگومان کەموکوڕی تێدا بەرجەستە بووە.

* هەموو پەیامێک کەسانێک دەبنە دوژمنیی، دوژمنایەتیەکەیان درێژە دەکێشێت، بەڵام دواجار تەواو دەبێت و نامێنێت، ئارام گرتن گەورەترین هۆکاری لادانیەتی: ﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا﴾ [الأنعام: ٣٤]

»سوێند بە خوا بێگومان پێغەمبەرانی پێش تۆش (ئەی موحەممەد (ﷺ))

باوەڕیان پێ نەکراوە، بەڵام ئارامیان گرت لەسەر ئەو باوەڕپێنەکردنەیان و ئەزیەت و ئازار دران تا یارمەتی و سەرخستنی ئێمەیان بۆ هات.»

* هیچ کەس بێ دوژمن نابێت تەنانەت پەیامبەرانیش، جا مرۆڤ دەبێت بە ئاگابێت بەرانبەر دوژمنەکانی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ [الفرقان: ٣١]

«هەر واش بووە، ئێمە بۆ هەر پێغەمبەرێک دوژمنمان -لە تاوانباران- بۆ دانان.»

* دوژمن هەر بوونی دەبێت، خودا دوژمنی بۆ خۆی چەسپاندووە، تاکوو کەس لەو چەسپاوییە ڕانەکات، بەڵکوو جێگیر بێت و ئارام بگرێت: ﴿لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ﴾ [الممتحنة: ١]

«مەبنە دۆستی دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان.»

* خودا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ [الحج: ٣٨] «بەدڵنیایی خوای گەورە بەرگری لە باوەڕداران دەکات و دەیانپارێزێت لە نەخشە و پلانی کافران.»

واتە: بێگومان هێرشی دوژمنان و پیلانیان هەر ڕوودەدات، خودا بەرگری خۆی بۆ باوەڕداران چەسپاندووە، بەڵام تاقینەکردنەوەیانی نەچەسپاندووە، بۆیە هەر دەبێت تاقی بکرێنەوە.

* پەیامی هەق تەواو و پاک دەرناکەوێت ئەگەر دوژمنی نەبێت، خاوەنەکەشی تەواو و پاک نابێتەوە بە تاقیکردنەوە و تووشهاتنی بەڵا نەبێت.

* چاکسازان تەنها لەسەر شانی فێڵبازان بەرزدەبنەوە: ﴿وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ﴾ [الأنبياء: ٧٠] «ئەوانە ویستییان پیلان بگێڕن دژی ئیبراهیم ئینجا ئێمەش ئەوانمان بە ڕەنجەڕۆترین خەڵک گێڕا.»

* زۆرجار مرۆڤ دوژمنەکەی بەرزی دەکاتەوە بەهۆی بڵاو کردنەوەی تەنها یەک وتەی دوژمنەکەی لە لای خەڵکی، بەو هۆیەوە خەڵکی دەگەڕێن بەشوێن وتەکانی دیکەیدا.

* خودا فێڵبازان کوێر دەکات لە دیتنی هەق، فێڵ و پیلان بۆ هەق دادەنێن و خۆیان تێی دەکەون، خودا بە فێڵ و پیلانەکەیان خاوەن هەقەکان بەرز دەکاتەوە: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾ [یوسف: ٥٢)

«بەڕاستی خواش پیلانی ناپاکان بەپایان ناگەیەنێت.»

* خەڵکان هەموویان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ڕقیان لە کەسی شێت نییە و دوژمنایەتیشی ناکەن، بەڵام هەرکات ئەو شێتە ئاقڵ بوویەوە، ئەوا دژایەتی بەرانبەری دەست پێ دەکات، هەرچەندە ئەقڵی زیاد ببێت دوژمنەکانی زیاد دەبن، ئەو کەسەی دوژمنی نییە ئەوا هۆکارەکەی لەدەست داوە یان پەکی خستووە.

* ئەندازەی عەقڵت جۆری دوژمنەکانت دیاری دەکات.

* بوونی چەند تۆمەتێکی دژیەک بۆ چاکسازێک نیشانەی ناڕاستی هەموو تۆمەتەکانە، بە پەیامبەر (ﷺ) وتراوە، شاعر و شێت و ساحیر ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلًا﴾ [الإسراء: ٤٨]

«سەرنج بدەن چۆن تۆ دەکەن بە نموونە (تاوێک دەڵێن: جادووگەر، دەمێک دەڵێن: شاعیر ... هتد) سەرەنجام خۆیان گومڕا کردووە و ناتوانن ڕێگە و ڕێبازێکی چاک و دروست بگرنە بەر»

* دڵخۆشبوونی دوژمنان بە نارەحەتییەکانیان، هێزی مەچەکی پێشەنگ و سەرمەشقەکان دەشکێنێت، گاریگەری دەخاتە سەر پەیامەکەیان، بۆیە پێویستە بەئاگا بێت بەرانبەر هۆکارەکانی، لە فەرموودەدا هاتووە: «پەنا بگرن بە خودا لە دڵپێخۆشبوونی دوژمنان، پەیامبەران پەنایان گرتووە لێی.»

* ئەو کەسەی هەموو ئامانجی ئەوەیە بە تۆوە سەرقاڵ ببێت، تۆ پێوەی سەرقاڵ مەبە، چونکە ڕاستگۆکان بەهەقەوە سەرقاڵن، نەک بە خەڵکەوە.

* ئەگەر خەڵکی سەرقاڵ بوون پێتەوە، ئەوا تۆ سەرقاڵ مەبە بە ئەوانەوە، بەڵکوو دەست بگرە بە هەقەوە، چونکە هەق دەمێنێتەوە و خەڵکی نامێنن و دەرۆن: ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ [الأعراف: ١٩٩]

«چاو بپۆشە و فەرمان بە کاری چاک بدە و واز بێنە لەو نەزانانە.»

* ئەوانەی ڕێگری ڕێگەی چاکسازین بە گەورەترین ڕێگر هەژمار دەکرێن بەهۆی ڕێزداری و گەورەیی ئەو ڕێگەیەوە: ﴿وَلَا تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ [الأعراف: ٨٦] «لەسەر هەموو ڕێگایەک دامەنیشن (ڕێگە مەگرن) هەڕەشە بکەن و بەرهەڵستی ڕێگەی خوا بکەن لەو کەسەی باوەڕی پێ هێنابێت و بتانەوێت ڕێگای خوا بەلاری و چەوتی بخەنە ڕوو.

* وتەکان ستەمیان لێ دەکرێت وەک چۆن کەسەکان ستەمیان بەرانبەر دەکرێت، بەڵکوو زیاتریش، چۆن ڕێگەی خەڵکی ڕێگر و جەردەی هەیە ئامۆژگارییەکانیش ڕێگریان هەیە، ڕێگری لێ دەکەن لە بڵاوبوونەوەی وتەکانی و گەیشتنی بە خەڵکی، ئەوان دەبنە کۆسپ بۆ دواخستنی قازانجی خەڵکی.

* زۆرێک لەوانەی ئامۆژگاریکارن ئامۆژگارییەکانیان لە باوەڕی تەواو و دڵپاکییەوە دەردەچێت، بێئاگان لەوەی ڕێگرانی ئامۆژگاری شارەزا و بەئاگان چی دەکەن و پیلانیان چییە.

* ئازاری چاکسازان زۆر دەدەن تاکوو ئەوانیش لەبەرانبەردا ئازاریان بدەنەوە، دەیانەوێت بەبەرگری کردن لە خۆی سەرقاڵی بکەن لە گەیاندنی پەیامەکەی: ﴿وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ [الأحزاب:

٤٨] «گوێڕایەڵی کافران ودووڕووان مەکە، گوێ مەدە بە ئازاردانی ئەوان (بۆ تۆ) و پشت هەر بە خوا ببەستە.»

* ئەگەر چاکسازان سەرقاڵ بوون بە بەرگری کردن لە ڕێگەی هەق، ئەوا دووڕووان هێرشیان بۆ دێنن تاکوو سەرقاڵی بەرگری کردن بن لە خودی خۆیان، هەرکەس خۆی تەرخان بکات بۆ بەرگری لە هەق، خودا بەرگری لێ دەکات پێویست ناکات ئەو کەسە بەرگری لە خۆی بکات.

* پێویستە ئامۆژگاریکار سەرقاڵی ڕێگرەکانی سەر ڕێگەی نەبێت و زمانی لە ئەواندا بەکار نەهێنێت، نەوەکا بەهۆیەوە دوور بکەوێتەوە لە ئامانجەکەی بەوەی سەرقاڵ بێت بە ئامانجی ئەوانەوە، ئەوان تەنها ئامانجیان ئەوەیە کە سەرقاڵی بکەن لە ڕێبازەکەی، ئەویش تاکە ئامانجی گەیاندنی هەقە.

* پێویستە ئامۆژگاریکار سەرقاڵی ڕێگرەکانی سەر ڕێگەی نەبێت و کاتیان پێوە نەکوژێت، بەو هۆیەوە دوور بکەوێتەوە لە ئامانجەکەی بەوەی سەرقاڵ بێت بە ئامانجی ئەوانەوە، ئەوان تەنها ئامنجیان ئەوەیە کە سەرقاڵی بکەن لە ڕێبازەکەی، ئەویش تاکە ئامانجی گەیاندنی هەقە.

* گەورەترین چارەسەر بۆ ئەو ستەمانەی لە مرۆڤ دەکرێت و درۆ هەڵبەست نەکا بۆ خۆی بۆ پەیامەکەی، پشتگوێ خستن و بیرلێ نەکردنەوەیە لە درۆهەڵبەستان، ئەو کارە زۆر باشترە بۆ دڵی و بۆ کاتەکانی: ﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ [الأنعام: ١١٢] «دە لێیان گەڕێ بە خۆیان و ئەو درۆیانەوەی کە هەڵیدەبەستن.»

* خۆشەویستی خودا بۆ بەندەکەی وا لەو بەندەیە ناکات کەس دوژمنایەتی نەکات، بەڵکوو هەندێکجار دوژمنی زیاد دەکات، خودا دەربارەی مووسا دەفەرمووێت: ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي﴾ [طه: ٣٩]

«لەلایەن خۆمەوە جۆرە خۆشەویستییەکم پێ دایت.»

لەگەڵ ئەوەشدا پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «ڕەحمەتی خودا لە مووسا بێت! زۆر لەمە زیاتر ئازاری درا لەلایەن شوێنکەوتووانییەوە و ئارامی گرت.»

* خۆڕاگر بە بەرانبەر بەوانەی توند و وشکن بەرانبەرت، بێگومان ڕۆژێک دێت هەست دەکەن کە هەق بە تۆیە، هەندێک لەوانەی لەگەڵ پەیامبەردا (ﷺ) دەچوون بۆ غەزا و جەنگ، هەر ئەوانە بوون لەوەو پێش تۆمەتیان دەخستە پاڵی و دەیان گوت شێت و ساحیرە.

* بیستنی وتە و گوفتاری ناخۆشی دوژمنان هەر ڕوودەدات، تەنانەت پەیامبەران و هاوەڵانیان پارێزراو نەبوون لێی: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا﴾ [آل عمران: ١٨٦] « سوێند بێت بێگومان دەبیستن لەوانەی کە نامەیان پێ دراوە لەپێش ئێوە، هەروەها لەوانەی هەوبەشیان بۆ خودا داناوە (ئازار و) قسەی ناخۆشی زۆر جار.

* گەورەترین هۆکار مرۆڤ دامەزراو و ئارامگر بکات لەسەر ئازاری نەیارەکانی بەرپاکردنی نوێژەکانە لەکاتی خۆیدا، ﴿فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ﴾ [ق: ٣٩] «کەواتە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) خۆگر بە بەرانبەر ئەو (قسە نابەجێیانە)ی کە دەڵێن، بە ستایشی پەروەردگارت تەسبیحات بکە پێش هەڵهاتنی خۆر و پێش ئاوابوونیشی.»

* ئەگەر وتەی هەقت گوت و بەهۆیەوە ئازار درای، ترسای لەوەی بەرپەرچدانەوەت لەپێناو خۆتدا بێت و بۆ سەرخستنی خۆت بێت، ئەوا بێدەنگ ببە، چونکە بێدەنگییەکی تەواو کە بۆ خودا بێت، باشترە لە وتەیەک نیوەی بۆ خودا بێت و نیوەی بۆ خۆت بێت.

* دڵتەنگبوون بەهۆی ئازاری ناحەزان و دوژمنان بابەتێکی سروشتییە، مووسا فەرمووی ﴿وَيَضِيقُ صَدْرِى ...﴾ [الشعراء: ١٣]

«دڵم تەنگ دەبێت...»

خودا دەربارەی محمد دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ ...﴾ [الحجر: ٩٧]

«سوێند بێت، بێگومان ئێمە دەزانین کە بەڕاستی تۆ دڵت تەنگ دەبێت.»

چارەسەری ئەمەش: ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ [النساء: ٨١]

«وازیان لێ بێنە و پشت بە خوا ببەستە، خوا بەسە پشتیوانت بێت.»

* ئەگەر بەدرۆ خرایتەوە لەسەر هەقێک، ئەوا ئەو کەسانەت بێتەوە یاد کە وەک تۆن یان لەتۆ باشتر بوون و بەدرۆخراونەتەوە: ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ‎— وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ﴾ [الحج:٤٢ -٤٣]

»ئەگەر (بێباوەڕان) تۆ بە درۆزن دەزانن و باوەڕت پێ ناکەن، ئەوە بێگومان پێش ئەوان باوەڕیان نەکردووە (بە پێغەمبەرانیان) گەلی نووح، عاد، سەموود، گەلی ئیبراهیم و گەلی لووط.»

* بەشێک لە ڕێزگرتنت بۆ خۆت ئەوەیە کە گوێ هەڵنەخەیت بۆ شتێک کە دەبێتە مایەی ئەزیەت و ئازار بۆت، خۆشت خەریک نەکەیت بە وەڵامدانەوەی، هەر وەک چۆن بەشێک لە ڕێزگرتنی پێیەکانت ئەوەیە هەر شتێک ببێتە مایەی ئازار بۆیان لەسەر ڕێگا لایبدەی: ﴿وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ مَرُّواْ كِرَامًا﴾ [الفرقان: ٧٢]

«هەر کات بە لای کاری نالەباردا ڕادەبوورن، مەردانە خۆی لێ لا دەدەن.»

* لە مەترسیدارترین دەردە شاراوەکانی نەفسی مرۆڤ ئەوەیە وا گومان ببات کە ئەو کارەی خۆی ناتوانێت ئەنجامی بدات ئەگەرکەسێک هەستێت بە ئەنجامدانی، ئەوە بە کەم دانانە بۆی، یان وابزانێت کەسێک کە هەستا بە گوتنی حەق و سوپاس و ستایش کرا، ئەوە ناو و ناوبانگی کەسی بێدەنگی فەوتاندووە، جا هەرکات کەسی بوێر هەستێت بە گوتنی حەق ئەم جۆرە کەسە

زیاتر دڵی گران دەبێت، تا وای لێدێت نەفسە لاواز و بێدەنگەکان لە گوتنی حەق دەکەونە زەمی کەسانی حەق بێژ، چونکە وا دەزانێت قسە گوتن پێی خۆبەری کردنە لێیان، جا وێنەی بەرچاوی خەڵکی ڕاجیاوازییە لە دەرخستنی حەق، کەچی لەناخیدا مەبەستی سەرخستنی نەفسی خۆیەتی. (العلماء وقصور الرسالة الطريفي).

* بێگومان خودا پیلانی ناهەقان کاتێک بەرانبەر بە خاوەن هەقەکانی دەگێڕن دەخاتەوە سەر خۆیان: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُواْ فِيهَا وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ [الأنعام: ١٢٣] «بەو شێوەیە لە هەموو شارێکدا گەورەترینی تاوەنبارانیمان کرد (بەدەسەڵاتدار) بۆئەوەی پیلان و فێڵ بکەن لەو شارانەدا و فێڵ و پیلان نەکەن (لە کەس) بێجگە لە خۆیان، بەڵام هەست ناکەن.

* مرۆڤ ناوەستێت لە دەمەقاڵێ و ململانێ، هەرچەندە هەموو نیشانە گەورەکانی قیامەتیش ببینێت، بە جۆرێکە تا قیامەت بەرپا دەبێت ئەو هەر دەمەقاڵێ دەکات: ﴿مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ﴾ [يس: ٤٩]

«تەنیا چاوەڕێی گرمەیەک دەکەن کە تووشیان دەبێت، لەکاتێکدا دەمەقاڵێ دەکەن.»

* (اختلاف العلماء رحمة) جیاوازی زانایان ڕەحمەتە، بەڵام ئەگەر فیتنەی ماڵ و سامان و پۆستی تێدا نەبێت. ئەگەر نا ئەوە سزایە نەک ڕەحمەت.

* هەموو جیاوازییەک ڕەحمەت نییە هەندێک جیاوازی سەر دەکێشێت بەرەو کوفر، بۆیە پێویستە بە هۆکارە شەرعییەکان بەری بگیرێت، خودا دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُواْ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ﴾ [البقرة: ٢٥٣] «دووبەرەکییان تێکەوت ئینجا هی وایان هەبوو بڕوای هێنا و هی وایان بوو بێبڕوا بوو.»

* خودا لە قورئاندا باسی سەرگوزەشتەی هاوەڵانی شەممەمان بۆ دەکات کە چۆن شایستەی سزا و تۆڵەی خودا بوون بەو فێڵەیان کە ئەنجامیاندا، ئەگەر ئەو بابەتە ئێستا ڕووی بدایە، ئەوا ئەو کەسەی ئەو بیرۆکەیەی پێ وتن دەبوو بە کەسێکی موجتەهید و ئەو ناکۆکییەش بە ڕەحمەت هەژمار دەکرا.

* دەمەقاڵێ کردن لە بابەتە لاوەکییەکاندا کە هێشتا بابەتە سەرەکییەکان چەسپاو نین لایان، سەردەکێشێت بۆ سنووربەزاندن. هەر بابەتێک ناکۆکی تێدا بێت، بنەڕەتێکی هەیە لەوەو پێش بۆ ئەو بنەڕەتەش بنەڕەتێکی دیکە هەیە، جا کەوابوو لەو بابەتانەوە دەست پێ بکەن کە جێی کۆدەنگین هەرچەندە دووریش بێت.

* هەموو کەسێک دەتوانێت گفتوگۆی لەگەڵدا بکەیت، تەنها نووسەرێکی بە کرێ گیراو نەبێت، چونکە ئەوەی لە هەگبەیدایە خۆی خاوەنی نییە، ناتوانێت دەربارەی وەڵام بداتەوە.

* ڕەخنە لەلایەنێک مەگرە بۆئەوەی لایەنێکی دیکە ڕازی بکەیت، بەڵکوو دادوەر بە لەگەڵ هەردوو لایەندا بۆ ڕازیکردنی خودا.

* قورسترین وتە بۆ وەڵامدانەوە ئەو وتەیەیە کە لە هەموو وتەکان کۆنتر و بێئەرزشترە، چونکە تەنیا بە لاسایی ملی بۆ دراوە لای شوێنکەوتووانی، ئەو وتانە بە مێشکی کەسانی ژێردا نایات چجای ئەوەی لەوەو پێش خۆی ئامادە بکات بۆ وەڵامەکەی.

* قورسترین وتە بۆ وەڵامدانەوە، ئەو وتەیەیە کە لە هەموو وتەکان کۆنتر و بێئەرزشترە، چونکە وتەیەک پەکخرابێت، ناتواندرێت پەکبخرێت.

* زۆرینەی ناکۆکییەکان بەهۆی نەزانینی بەڵگەوە نییە، بەڵکوو لە چەسپاندن و دانانیاندا بەدی دەکرێت.

* زۆرێک لە نووسەرەکان بنەماکانیان ڕاستە بەڵام پراکتیک و چەسپاندنیان هەڵەیە، کاتێک بڵێیت جێبەجێکارییەکان گونجاو نییە، بەڵگە بە دروستی بنەڕەتەکانیان دەهێننەوە، ئەم جۆرە مرۆڤانە زۆر گرانە باوەڕپێهێنان و گەڕانەوەیان.

* ناکۆکییەکان پێگە و ئەندازەی خۆیان هەیە، ئەگەر بینیت لە پێگەی خۆیاندا نەمابوون، یان ئەندازەیەکی زیاتریان پێ درابوو ئەوا بزانە لە پشتیەوە نەزانی یان ئیرەیی هەیە.

* وتەیەک ئەگەر لە خودی خۆیدا دروست بێت، دەبێتە نادروست، ئەگەر لەناو سیستمێکی هەڵەدا بوو.

* بەڵگەکانی قورئان دوو جۆرن: جێگیرەکان بەڵگەن بۆ باوەڕداران، ئەوانەش کە چەند واتایەک هەڵدەگرن بەڵگەن بۆ ئەوانەی دڵیان چەوتی و لادانی تیادایە: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ﴾ [آل عمران: ٧] «ئینجا ئەوانەی کە لە دڵیاندا لادان و چەوتی هەیە، دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە لە قورئاندا موتەشابیهن (هاوشێوەن) بۆ تێکدانی بیروباوەڕی موسڵمانان و بۆ ڕاڤەکردنی بە ئارەزووی ناپاکی خۆیان.»

* ئەو کەسەی پێچەوانەتە لە بابەتێکی ئیجتهادیدا، ئەوا پێچەوانەی تێگەیشتنەکانت دەکات، نەک دژایەتی حوکمی خودا بکات.

* مرۆڤ تاکوو زانستی فراوان بێت، زیاتر پۆزشی بەرانبەرەکانی وەردەگرێت کە پێچەوانەی ئەون، خۆ ئەگەر زانستی کەم بوو، پۆزش وەرگرتنی کەم دەبێت.

* ئەگەر کەسێکی لە خۆت ژیرتر پێچەوانەت بوو، ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو تۆ بە کوێر دادەنێت، بەڵکوو خودا بەسەر تۆدا بەرزی کردووەتەوە، زیاتر لەوە دەبینێت کەتۆ دەی بینیت: ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ

دَرَجَٰتٍ﴾ [المجادلة: ١١] «خوداش پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە لە ئێوە کە بڕوایان هێناوە، هەروەها ئەوانەی کە زانستیان پێ بەخشراوە چەند پلەیەک پلەیان بەرز دەکاتەوە.»

* دوژمنایەتی کردنت لەلایەن ناهەقانەوە ئەوە ناگەیەنێت تۆ لەسەر هەقێکی تەواو بیت، بەڵکوو ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ لە ناهەقییەکی هاوشێوەی ئەوان نییە، هەق بە خودی خۆی دەناسرێتەوە، نەک بە دوژمنایەتیکردنیدا.

* لەو شتانەی بۆچوونەکان لاواز دەکەن لە کاتێکدا خۆیان بەهێزن، خستنەڕوویانە بە مەبەستی تووڕەکردنی دوژمن یان تۆڵەکردنەوە لێی، نەک بە مەبەستی دەرخستنی هەق، جا ئەو مەبەستە کاردەکاتە سەر شێواز و ئەندازەی ئەو هەقە و بە شێواوی دەچێتە دڵەوە.

* باتڵ و ناهەقی بە مردوویی لەدایک دەبن، بەڵام بە بەرپرچدانەوەیان زیندوو دەبنەوە، لە ئەسەرێکدا هاتووە: «باتڵ و ناهەقی بە بەرپەرچنەدانەوەی لەناوببەن، هەقیش بە باسکردنی زیندوو بکەنەوە.»

* وەڵامدانەوەی هەندێک خراپە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانەوەی، باسنەکردن و وازهێنان لێی دەبێتە هۆی مردن و پووکانەوەی، هەندێک خراپە دروست دەکرێت بۆئەوەی بەرپەرچ بدرێتەوە و گەورە ببێت، لە ئەسەرێکدا پێشەوا عومەر دەڵێت: "خودا کۆمەڵە بەندەیەکی هەیە خراپەکان بە وازلێهێنانیان دەمرێنن، چاکەکان بە باسکردنیان زیندوو دەکەنەوە.»

* وتە پەککەوتووەکان پێویست بە پەکخستن ناکات، ئەگەر وازی لێ هێندرا، ئەوا خۆی دەمرێت و دەپووکێتەوە؛ ئەگەر بەرپرچ و وەڵامی درایەوە، ئەوا دەژیێتەوە.

* ئەندازەی خراپەکان چەندە بوو، دەبێت بە هەمان ئەندازەش بەرپەرچ بدرێتەوە، وەڵامی وتەیەکی مردوو مەدەرەوە ببیتە هۆی سەرهەڵدانەوەی، تۆ وا گومان ببەیت تاوانت لەسەر خۆت لاداوە بەوەی بێدەنگ نەبوویت لەسەری، بەڵام لەکاتێکدا تۆ تاوانی سەرهەڵدانەو بڵاوبوونەوەی لە ئەستۆ دەگریت و لەسەر شانی تۆ بڵاو دەبێتەوە.

* ناکۆکییەکان ئەندازە و پلەیان هەیە، تەواو تێگەیشتن لە ئایین و سیاسەت ئەوەیە سەرقاڵ ببیت بە ڕێگریکردن لە خراپە گەورەکانەوە، بچووکەکانیش بە نەرمونیانی چارەسەر بکەیت و فەرامۆشیان نەکەیت.

* هەموو هەڵەیەک گونجاو نییە تۆ ڕاستی بکەیتەوە، هەندێک ڕاست کردنەوە لەگەڵ ئەو کەسەدا ناگونجێت کە بارێکی قورسی هەڵگرتووە، چونکە ئەگەر بوەستێت بۆ ڕاستکردنەوەی لە ڕۆیشتن دەکەوێت بۆ تەواوکردنی ئامانجێکی گەورەتر دوا. بەلادا ڕۆیشتن و ڕاست نەکردنەوەی ئەو هەڵەیە واتای ڕازیبوون بەو هەڵەیە ناگەیەنێت.

* ئەگەر بۆ دەمەقاڵێ کردن لەگەڵ هەموو نەزانێک بوەستیت، ئەوا ناگەیتە ئامانجەکەت، بەڵکوو پشتێکردنیان بە نەرمی دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی شەڕیان، هەروەها باشترە بۆ پاراستنی کاتەکانت: ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَـٰهِلِينَ﴾ [الأعراف: ١٩٩]

«چاو بپۆشە و فەرمان بە کاری چاک بدە و لەو نەزانانە واز بێنە.»

* وتەی هەقت لا قورس نەبێت، چونکە خودا پێی خۆشە و لێی ڕازییە.

* وتەی هەق لەوانەیە زۆرێک لە هاوڕێکانت لێ دابڕێنێت، بەڵام خودات بۆ دەهێڵێتەوە، خوداش بەسە پاڵپشتت بێت.

* قورسترین جۆری فیتنە ئەوەیە مرۆڤ خەڵک بانگ بکات بۆ هەق کاتێک خەڵکی دەیانەوێت، پاشان پشتی تێ بکەن و بەتەنها بمێنێتەوە، ئەوکات ڕوون دەبێتەوە کێ دونیای ویستووە و کێ دوارۆژ.

* لەکاتی گەیاندنی هەقدا ڕامەکە لە دوژمنایەتی هیچ کەس، نەوەک بکەویتە ناو دوژمنایەتی خوداوە.

* هەقێک مەڵێ لەکاتێکدا کە نەتوانی لەسەری جێگیر ببیت، دواتر پۆزشی لێ بهێنیتەوە، چونکە پۆزش هێنانەوە لە وتەی هەق گەورەترە لە دەربڕینی وتەی ناهەق.

* دژایەتی هیچ دوژمنێک مەکە تاکوو نەزانیت کێ دڵخۆشە بە شکستخواردنی، چونکە هەندێک جار شکست هێنانت بە دوژمنێکت دەبێتە هۆی بەهێزبوونی دوژمنێکی زۆر لەو ترسناکتر.

* زۆر جار کەسانی ژیر دەبینن چەندان دوژمن لە بەرانبەر حەقدا وەستاون، کەچی بێئاگان لەوەی کە خۆیان لەگەڵ کەسانێک وەستاون کە زیاتر دوژمنی حەقن. جا بۆیە عیلم و زانست شتێکە و کارجێی و حیکمەت شتانێکی دیکەیە.

* بێحیکمەتییە کە دژایەتی خراپەکارێک بکەیت لە کاتێکدا کە ململانێی لەگەڵ یەکێکی زۆر خراپتردا هەیە، چونکە ئەوە یارمەتیدانی خراپترینەکەیانە لە دژی خراپەکەیان.

* ئەگەر ناکۆکی گەورە بەدی کرا، پێویستە ئەو کەسانەی ناکۆکی بچووکیان لەنێواندایە یەک بگرن، هیچ کەس ناکۆکی بچووک زیندوو ناکاتەوە لە کاتی هەبوونی ناکۆکی گەورەدا، تەنها ئەوانە نەبێت کە ناکۆکی گەورە و بچووک جیاناکەنەوە، یان لەپێناو ئارەزووی خۆیان دەجەنگن، نەک لەپێناو خودادا.

* ناکرێت دووکەس دژایەتی یەکتری بکەن لە کاتێکدا هەردووکیان لەسەر دیوارێک وەستاون، بەڵکوو دەبێت یەکتری بگرن تا پارێزراوبن، هەروەها نابێت لە کاتی تەنگەژەکاندا ناکۆکییە لاوەکییەکان زیندوو بکرێنەوە و بابەتە بنەڕەتییەکان فەرامۆش بکرێن.

* ناگونجێت ناکۆکییەکی لاوەکی گەڵ براکەت بهێنیتە پێش لەوکاتەدا کە کەسێک لەگەڵ هەردووکتان لە بابەتە بنەڕەتییەکاندا جیاواز و ناکۆکە.

* سەرقاڵبوون بەو بابەتانەی ناکۆکییەکی لاوەکییان لەسەرە لە کاتی لاوازی و نەچەسپانی بابەتە سەرەکییەکان دەبێتە هۆی لەدەستدانی بابەتە سەرەکییەکان، هەر بۆیە پەیامبەر (ﷺ) دەستی کرد بە چەسپاندنی بابەتە سەرەکییەکان، پاشان دەستی کرد بە جێبەجێکردنی بابەتە لاوەکییەکان لەسەری و بەو شێوەیە پەیامەکەی ڕەگی داکوتا.

* ئەو کەسەی ئاو دەفرۆشێت تا ڕووتی و ڕەجاڵی خۆی پێ داپۆشێت لەکاتێکدا هاتووەتە سەر لێواری مەرگ بەهۆی تینوێتیەوە، وەک ئەو کەسە وایە کە هەموو هەوڵی خۆی لە بابەتە ناکۆکەکاند بەگەڕ دەخات، بابەتە کۆدەنگییەکانی لە پێش و پاشی گڕدابێت و پشتگوێی خستبێت، خۆ ئەگەر لەبەریشیدا بوەستیت دەڵێت: ئایا کارێکی ناهەقم کردووە!

* خەریکبوونی نووسەر بە بابەتە خیلافییەکان و هەڵچوونی لەو بابەتانەدا و بەگژداچوونی نەیارانی لەسەر بابەتە لاوەکییەکان، لەهەمان کاتدا بێدەنگبوونی لەو بابەتانەی کە کۆدەنگی زانایانی لەسەرە و بێدەنگبوونی لە بەرانبەر ئەو کەسانەی کە دەرچوون لە کۆدەنگی زانایان، نیشانەی بوونی هەواوئارەزووە لە بەرگی هەقدا.

* سەرقاڵبوونی مرۆڤ بە دژایەتیکردنی کەسانێک کە پێچەوانەی هەقن و وازهێنان لەوانەی زیاتر و زۆرتر پێچەوانەن، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسە هەقێکی شاردووەتەوە لەپێناو ویستی خۆیدا.

* بەڕاستی شوێنکەوتنی هەواوئارەزووە کاتێک کەسێک سکاڵای ئەوە بکات کە خەڵک ئاسۆی بیرکردنەوەیان تەسکە لە بابەتە خیلافییەکاندا، بەڵام خۆی فراوانتر مامەڵە بکات لەگەڵ کەسانێکدا کە نکۆڵی بابەتە بڕاوە و کۆڕاییەکان دەکەن.

* ژیری نییە ئەگەر سەرقاڵ بیت بە دژایەتیکردنی هەموو دوژمنەکان، بەڵکوو ئاشتەوای لەگەڵ لاوازەکان دەکەیت تاکوو سەرقاڵی بەهێزەکان ببیت، پەیامبەر دژایەتی جوولەکەی نەکرد تا ئەو کاتەی هاوەڵدانەرانی لاواز کرد، هەروەها بەرەنگاری دووڕووان نەبوویەوە تاکوو جوولەکەی دەرکرد.

* سیاسەتی شەرعی بەو جۆرەیە کە جیاوازی دەکات لەنێوان ئەوانەی تاوانێکی تازە دادەمەزرێنن، لەگەڵ ئەوانەی بە هێواش و لەسەرخۆیی خراپەی کەسانێک لادەدات کە پێشتر ئەنجامیان داوە. یەکەمیان کارەکەی بێزراوە و دووەمیشیان دەدرێتە دەست مەبەستی خۆی.

* هەندێک جار کەسانێک کە لە ئایینیان ڕازی نیین لەگەڵ چاکسازێک بەشداری کارێکی چاکە دەکەن بۆ هۆگرییان، یان بۆ ڕێگری لە دوژمنایەتی زیاتر. دووڕووان لەگەڵ پەیامبەردا دادەنیشتن و هەندێک جار لە جیهادیشدا بەشدارییان دەکرد.

* هەنگاوی کەسە چاکەکان بەرەو لای کەسە خراپەکان خراپە، هەنگاوی کەسە خراپەکان بەرەو چاکەکان چاکەیە. لەسەر یەکەمیان قورس دەکرێت، لەگەڵ دووەمیان نەرمی دەنوێنرێت، چونکە ڕووکردنە چاکەیە، هەرچەندە هێشتا خێری یەکەمیان گەورەترە.

* ئەگەر دوو کۆمەڵ ناکۆک بوون، بڕوانە و بزانە کامیان لە هەقەوە نزیکترە و لە ناهەقەوە دوورترە، ئەوا ئەویان سەربخە، چونکە هەموو شەرعەکان بۆ ئەوە هاتوون چاکە و خێرەکان تەواو بکەن و نزیکیان بکەنەوە، هەروەها خراپەکان دوور بخاتەوە و کەمیان بکاتەوە.

* یەکێک لە حیکمەت و دانایی ئیسلام و سیاسەتەکانی ئەوەیە دژایەتی کۆمەڵێک نەکات کە دوژمنێکی گەورەتر و ترسناکتر لەوان لەبەردەمیدا هەبێت، دوژمنایەتییەکان پلەیان هەیە وەک چۆن دۆستایەتییەکان پلەیان هەیە.

* لە حیکمەت و داناییە، ڕەق و توندبوون بەرانبەر ئەو دەوڵەتەی لەسەر هەق بوون پاشان دوور کەوتونەوە لە هەق، هەروەها نەرم و نیان بوون لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی لە هەق دوورن و پاشان نزیک دەبنەوە لە هەق، هەرچەندە یەکەمیان لە هەق نزیکتر بێت هەتا دووەمیان.

* دەوڵەتە ستەمکارەکان ئەگەر ڕوو بکەنە هەق و چاکە، ئەوا نەرم و نیان دەبین بەرانبەریان بە ئومێدی بەردەوامبوونیان لەسەر چاکە، دەوڵەتە دادوەرەکانیش ئەگەر ڕوویان کردە خراپە، ڕەق دەبین بەرانبەریان بۆ بەئاگا هێنانەوەیان. ئەمە سیاسەتی پەیامبەران بووە لەگەڵ دوژمنەکانیان.

* ئەو کەسەی دوورە لە هەقەوە دڵخۆش دەبین بە نزیک بوونەوەی ئەو هەنگاوەی، هەروەها نەرم دەبین بەرانبەری بە ئومێدی هەڵهێنانی هەنگاوێکی دیکەی هاوشێوەی، ئەوەش کە لە هەقەوە نزیکە، توند و تووڕە دەبین بەرانبەری، کاتێک هەنگاوێک لە هەق دووردەکەوێتەوە، بۆئەوەی هەنگاوی هاوشێوەی دووبارە نەکاتەوە.

* زۆرجار مرۆڤ زانستی پێ دەدرێت، بەڵام حیکمەت و دانایی لێ وەردەگیرێتەوە، حیکمەت ئەوەیە لەنێوان دوو خراپەدا بزانیت کامیان خراپە و شەڕی زیاترە خۆتی لێ بپارێزیت، هەروەها بزانیت لەنێوان دوو چاکەدا کامیان گەورەتر و باشترە تاکوو لێی نزیک ببیتەوە، هەروەها سەیری ڕووداوەکان نەکەیت بەبێ هەڵسەنگاندن بۆ هۆکارەکانی ڕووداوەکە.

* لە تەواوی ئەقڵ و دانایی ئەوەیە بڕوانیت کە خەڵکی چۆن لە وتەکانت تێ دەگەن، نەک چۆن لەسەر زوبانت دێتەدەر. چەند ناهەقی و باتڵ هەیە لەسەر وتەی هەق بنیات نراوە.

* ناکرێت بەردەوام ناوەڕاستی گۆپاڵ و گۆچان بگیرێت، بەڵکوو هەندێکجار پێویستە بشکێندرێت یان پێی بشکێنیت.

* گفتوگۆ سوود بە زۆرێک لە ئەقڵە خۆبەگەورەزانەکان و ستەمکارەکان ناگەیەنێت، ﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ﴾ [طه: ٥٦]

«ئێمە هەموو نیشانەکانمان نیشان دا؛ ئەو هەر بڕوای پێ نەکرد و گوێی پێ نەدا.»

بێگومان پێویستی بە جێگیری و چەسپاوی و ئارامگری هەیە.

* بێدەنگبوونی چاکسازێک لە ناوهێنانی ناهەقکاران واتای ڕازیبوونی ئەو بەوان ناگەیەنێت، بەڵکوو هەندێکجار بێدەنگ دەبێت لە ناوهێنانیان تاکوو لەوە زیاتر لە هەق دوور نەکەونەوە، بۆیە پەیامبەری خودا باسی دووڕووی کردووە و ناوی دووڕووانی نەبردووە.

* ئەوانەی لایانداوە ژمارەیان زۆرە، بە هەڵماڵینی فکر و باوەڕیان ڕاستەوخۆ تاکەکانیان هەڵدەماڵدرێن، گەڕان بەشوێن هەڵماڵینی تاکەکان سەرقاڵت نەکات لە گەڕان و هەڵماڵینی فکر و باوەڕیان، هەڵماڵینی بەڕەی ژێر پێیان لەپێشترە لە هەوڵدان بۆ دەرهێنانی پێڵاوەکانی پێیان.

* زانستی بەرپەرچدانەوەی نەزانان زانستێکی تازەیە، لای زانایانی پێشوو بوونی نەبووە، چونکە نەزانەکانیان نووسینیان نەزانیوە، بەڵام نەزانەکانی ئێستا هەموو شتێک دەنووسن! بۆیە نەزانینی وەها دەبینین لەوە پێش شتی وەها نەخوێندراوەتەوە.

* گفتوگۆ کردن لەگەڵ زانایان لە بابەتە قورسەکاندا ئاسانترە لە گفتوگۆ کردن لەگەڵ نەزانەکان لە بابەتە سادە و ئاشکراکاندا.

* گفتوگۆ کردن لەگەڵ زانایان ئاسانترە لە گفتوگۆ کردن لەگەڵ نەزانەکاندا. چونکە زانست دەرگای هەیە دەچیتە ناوەوە و لێوەی دەردەچیت، بەڵام نەزانی وەک زەویەکی بیابانی کاکی بە کاکی وایە، نەزانی موخڵیس و دڵسۆز بەبێ دیوار و دەرگا تیایدا نیشتەجێ بووە.

* قورسترین حاڵەت مشتومڕکردنە لەگەڵ نەزانێک کە دڵسۆزە بۆ نەزانییەکەی خۆی.

* ئەگەر نەزان دڵسۆز بوو بۆ نەزانییەکەی، زانا بە زانایی خۆیەوە سەرگەردان دەکات.

* جێگیرکردنی بەڵگە لەسەر شتە ڕوون و بەرچاوەکان زۆر سەختە، هەڵکەندنی زەوی بۆ چەسپاندنی بوونی ئاو تیایدا ئاسانترە لە جێگیرکردنی خۆر کە ئەوە خۆرە لای ئەو کەسەی باوەڕی بە بابەتەکە نییە.

* لە هەرە کارە قورسەکان ئەوەیە بەرپەرچی نەزانێک بدەیتەوە کە تەواو سوورە لەسەر نەزانییەکەی و نەزانییەکەشی چەسپاوە، بەرپەرچدانەوەی لە دوو لایەنەوە قورسە:

لەو لایەنەی کە نەزانییەکی چەسپاوی هەیە.

لەلایەن خودی خۆشیەوە.

هەرکەس پێگەی خۆی بەسەر نەزاندا بەرز نەکردەوە، ئەوا نەزانەکان پێگەی نەزانییان بەسەر ئەودا بەرز دەکەنەوە.

* ڕەق دژایەتیکردنی کەسانی نەزان، وا پێویست دەکات لەسەر کەسانی دڵسۆز کە زیاتر بەرانبەریان نەرم بن، لە فەرموودەدا هاتووە: «پەیامبەرێک گەلەکەی ئازاریان داوە و لێیانداوە و خوێنی لە دەموچاوی سڕیوەتەوە و فەرموویەتی: خودایە لێیان خۆش ببە چونکە ئەوان نەزانن.»

* خراپترین نەزان ئەو کەسە نییە کە نازانێت و ناشزانێت کە نازانێت، بەڵکوو خراپترین نەزانن ئەوەیە کە نازانێت و واها گومان دەبات لە زاناکان باشتر دەزانێت.

* گەورەترین بەڵا و فیتنەی ئەقڵ ئەوەیە نەزانین و خۆبەگەورەزانینیش تیایدا کۆ ببێتەوە، ئەوکات حەزی دەرکەوتن و گەورەبوون تیایدا دەردەکەوێت، بەڵام هیچ شتێکی نییە خۆی پێی دەربخات تەنها دەرخستنی نەزانییەکەی نەبێت لە شێوەی زانستدا.

دەشتەکییەک بە کوڕەکەی دەڵێت: بۆ دەتبینم بێدەنگیت کاتێک خەڵکی قسە دەکەن؟ گوتی: من ئەوە نازانم کە ئەوان دەیزانن، دەڵێت: ئەگەر گوتیان: نەخێر، تۆ بڵێ: بەڵێ، خۆ ئەگەر گوتیان: بەڵێ، ئەوا تۆ بڵێ: نەخێر، پێچەوانەیان بکە و ئاوا بێئاگا دامەنیشە هەست بەبوونت نەکەن.

# حەز و ئارەزوو و شوێنەوارەکانی لەسەر بۆچوون و هزرەکان

* کەسانی خاوەن ئارەزوو ڕوونکردنەوە و بەڵگەکان سوودیان پێ ناگەیەنن تا ئەوکاتەی هەواو ئارەزووی وەلا نەنێت: ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ﴾ [البقرة: ٨٧] «جا هەر کاتێک پێغەمبەرێکتان بۆ بهاتایە بەجۆرێک کە ڕێکیی ئارەزووتان نەبووایە، لووتبەرز بوون و خۆتن بەگەورە گرتووە، جا دەستەیەکتان (لە پێغەمبەران) بە درۆ زانیوە و دەستەیەکتان کوشتووە.»

* تەماع و ئارەزووی نەفس هەندێکجار دەبنە ڕێگر لە ملکەچی دەربڕین بۆ خودا، لەگەڵ ئەوەی دانی پێدا دەنێت لە ئەقڵیدا، بەڵام خۆی بە گەورە دەزانێت لە بەرانبەری، وەک فیرعەون کاتێک پەردە و بەربەستەکان لەسەر دڵی لا چوون کە خەریک بوو دەخنکا.

* ئەو ڕاستیانەی لە دەروونداا شاراوەن ئارەزوو دەیان نێژێت، بەڵام دەردەچێت ئەگەر بجووڵێنرێت. نەجووڵاندنی، ستەمە لە دەروون و خۆبەگەورەزانینە: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ [النمل: ١٤]

«هەرچەند لە دڵی خۆیاندا هەموویان بە ڕاست دەزانی، بەڵام خۆبەزلزانی و ناهەقی، بوونە هۆی حاشاکردنیان.»

* توندوتیژبوون لەگەڵ ئەو بڕوادارانەی کە پێچەوانەن و نەرمبوون لەگەڵ کافران شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووە: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ﴾ [الفتح:٢٩] «موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئەو باوەڕدارانەشی کە

لەگەڵیدان بەرانبەر بێباوەڕان توندوتیژن و لەنێوان خۆیاندا بەبەزەیین.»

* هەرکەس کافران سەربخات و دژایەتی و جەنگ بکات لەگەڵ بیدعەکاراندا، ئەوا ڕاستگۆ نییە، بەڵکوو شەڕی لەگەڵ بیدعەدا بۆ هەوا و ئارەزووی خۆیەتی، نەک بۆ سەرخستنی هەق.

* هەرکەس لە بابەتە لاوەکییەکاندا ناکۆکی دەرخست، ئەگەر دییتت لە کاتی گفتوگۆ کردن لە بابەتە کۆدەنگییەکاندا ملکەچ نەبوو بۆ کۆدەنگی ئوممەت، ئەم کەسە ناکرێت لە بابەتی ڕەحمەتبوونی خیلاف و ڕاجیایی مناقەشەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵکوو هەوا و ئارەزووی پێش خستووە.

* زۆرێک لەوانەی پێچەوانەی هەق دەکەن لە سەرەتادا داوای بەڵگە دەکەن، بەڵام کاتێک بەڵگەیان بۆ دێت دەست دەکەن بە لێکدانەوەی، بۆ هەموو پلەیەک شێوازێکی گونجاویان لە وەرنەگرتن و پەرپەرچدانەوەی هەق لایە، خودا دەفەرموویێت: ﴿وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦ﴾ [البقرة: ٨٩] «ئەوان (جوولەکەکان) لەوەوپێش داوای زاڵبوونیان دەکرد لە خوا بەسەر ئەوانەی کە بێبڕوا بوون، کەچی کاتێک ئەو (پێغەمبەر)ەی دەیانناسی بۆیان هات بێبڕوا بوون پێی.»

ئەوانەی سەرسەختانە لە بەرانبەر هەق دەوەستنەوە، نابێت بە هیچ جۆرێک وازیان لێ بهێندرێت، بەڵکوو دەبێت دەربخرێن بۆ خەڵکی تاکوو هەق دەربکەوێت بۆ ئەو کەسانەی فریویان خواردووە پێیان، چونکە ئەو جۆرە کەسانە هەرکات گۆڕەپانیان چۆڵ بوو لە شوێنکەتووان، بەناچاری شوێن هەق دەکەون، هیچ نەبێت دەستی گرتووەتەوە لە بەتاڵ و ناهەقییەکەی، چونکە خاوەن هەوا و ئارەزوو، هەوا و ئارەزووەکەی نامێنێت بە نەمانی ئەوەی هەوڵی بۆ داوە.

* ئەگەر بینیت کەسانێک بە بەڵگەیەکی لاواز خۆیان دەپاراست لە هەق، ئەوا بزانە لەژێر ئەو پەردەیەدا خۆبەگەورەزانیەکی شاراوە هەیە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ

يُجَـٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَـٰنٍ أَتَىٰهُمْ إِن فِي صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَـٰلِغِيهِ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ [غافر: ٥٦] «بەڕاستی ئەوانەی دەمەقاڵێ و کێشە دەکەن دەربارەی نیشانەکانی خودا، بەبێ ئەوەی بەڵگەیان بۆ هاتبێت، هیچ لە دڵیاندا نییە جگە لە خۆبەزلزانی. هەرگیز ئەوان بە مەبەستیان ناگەن، کەواتا پەنا بە خودا بگرە، بەڕاستی هەر ئەو بیسەری بینایە.»

* خاوەن هەوا و ئارەزوو بەوەدا دەناسرێتەوە کە نەرم و نیانە بەرانبەری ئەوانەی بابەتە بنەڕەتییەکان هەڵدەوەشێننەوە، پاشان توندوتیژ دەبن بەرانبەر ئەوانەی لە بابەتە گوماناوی و لاوەکییەکان پێچەوانەیان دەبن، پاشان بە کەم تێگەیشتوو و توندڕەو وەسفیان دەکات.

* بابەتە موتەشابیهـ و لێکچووەکانی قورئان و سوننەت وەردەگرن و موحکەم و جێگیرەکان وەلا دەنێن، تاکوو ئەوەی لەگەڵ هەواوئارەزوویان دەگونجێت جێگیری بکەن: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَـٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ﴾ [آل عمران: ٧] «ئەوانەی لە دڵیاندا لادان و چەوتی هەیە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە لە قورئاندا موتەشابیهن (هاوشێوەن) بۆ تێکدانی بروباوەڕی موسڵمانان و ڕاڤەکردنی بە ئارەزووی ناپاکی خۆیان.»

* هەندێک کەس بۆچوونی هەڵە دروست دەکەن نەک بەهۆی بەهێزی ئەو بۆ چوونە لایان، بەڵکوو دەروون لاواز و دۆڕاوەکان تەنها دەیانەوێت بەرز ببنەوە هەموو ڕێگەیەک دەگرنە بەر لەپێناو دەستخستنی بەرزیدا.

* لەگەڵ بوونی هەواوئارەزودا هەموو حەرامەکان ئاسان حەڵاڵ دەکرێت: ﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا﴾ [الكهف: ٢٨] «دڵیمان لە یادی خۆمان بێئاگا کردووە و شوێنی هەواوئارەزووی خۆی کەوتووە و هەموو کارەکانی خراپ و لەسنوور دەرچووە.»

کاتێک هەواوئارەزوو بوونی هەبوو، ئایین شل دەبێتەوە، هەروەک چۆن گرێ شل دەبێتەوە، جا بەشوێنیدا بابەت بابەت دیین شل دەبێتەوە.

* هەموو تاقمە لادەرەکان تەنانەت ئەوانەش کە لە بیروباوەڕدا لادانیان هەیە، دەبینیت هەموویان بەڵگە بە قورئان و سوننەت دەهێننەوە لەسەر گومڕاییان. کەواتە خاوەن هەواوئارەزووەکان دەستەوەستان نابن لە هێنانەوەی بەڵگە و لادانی واتاکان تاکوو بیگونجێنن لەگەڵ ئارەزوویان.

* هەرکەس یەک حوکمی خودا ڕەت بکاتەوە بە هەواوئارەزوو، ئەوا بوێر دەبێت لەسەر ڕەتکردنەوەی حوکمی دیکەی هاوشێوەشی، چونکە هەواوئارەزوو نەخۆشی دڵە و دەگوازرێتەوە بۆ هەموو ئەوانەی دەست لە بۆچوونەکان دەدەن، لە فکر و بۆچوونەکاندا بڵاو دەبێتەوە وەک بڵاو بوونەوەی نەخۆشی بە هەموو جەستەدا.

* خاوەن هەواوئارەزوو ئەگەر نەی توانی بەرپەرچی بەڵگەیەک بداتەوە، دەیگۆڕێت و لایدەدات: ﴿يَسْمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ [البقرة: ٧٥] «فەرموودەی خوایان دەبیست (لە تەورات) کەچی لە پاش تێگەیشتنی دەستکارییان دەکرد و دەشیانزانی کارێکی ناڕەوایە.»

* کاتێک بەشوێن حوکمێکدا دەگەڕێیت کە گونجاو بێت لەگەڵ هەواوئارەزووتدا، ئەوا خۆی ڕاستەوخۆ لەدڵتدا جێگیر دەبێت، جا ئەوکات بەڵگەی زۆر ئاسانی لە ئەقڵ و قیاس هەندێک جار لە لە شەرعیش بۆ دەهێندرێتەوە، تەنانەت شەیتانیش بەڵگەی ئارەزووەکانی هێنایەوە.

* شەیتان ڕێگە و پاساوێکی دۆزییەوە بۆ کوفرەکەی، جا ئایا کەسانی دیکەی جگە لە ئەو ناتوانن ڕێگە و پاساوێک بدۆزنەوە بۆ گومڕاییان؟ ڕێگە دۆزینەوە و بەهانە لەگەڵ خەڵکی بەکار دێت، بەڵام بەهانەهێنانەوە لەگەڵ خودا ناکرێت و وەرگیراو نییە.

* ئەو کەسەی هەق وەرنەگرێت، بێتوانا نابێت لە پەیداکردنی پاساو و هۆکار بۆ بەرپەرچدانەوەی، هاوەڵدانەران دەیان زانی پەیامبەر نانووسێت، بەڵام بە

نووسەر هەژماريان دەكرد: ﴿وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ [الفرقان: ٥]

«گوتیان: ئەمانە چیرۆکی پێشینانن؛ هەموو بەیانی و ئێواران بۆی دەڵێن و لە بەری دەنووسێتەوە.»

* گەورەترین بەڵای عەقڵ ئەوەیە بەبێ تێڕامان بڕوانێتە بەڵگەکان، ئەوکات پێگەی بەڵگەکان لای هەواوئارەزووی بێسەنگ دەبێت و چۆنی بوێت ئاوەها دەیانجووڵێنێت. خۆ ئەگەر تێڕامانی تێدا بکردایە، ئەوا زۆر لای قورس دەبوو و نەی دەتوانی بەگوێرەی هەواوئارەزووی بیانجووڵێنێت تەنها بە پێداگری و خۆبەگەورەزانین نەبووبا.

* ئەگەر دەروونە نەخۆشەکان شتێکیان خۆش ویست، ئامادەکاری بۆ ئەقڵ دەکەن تا دای بڕێژن، ئەگەر ڕازی بوو، تەواوە؛ ئەگەرنا دیکتاتۆرانە بۆچوونی خۆی سەردەخات.

* هەندێک لەوانەی زیادەڕەوی دەکەن لە وردەکارییەکانی شەریعەتدا بابەتە نامۆ و دەگمەنەکان لە دەروونیاندا زیندوو دەکەنەوە، وا گومان دەبات بابەتێکی تازە و شاراوەی دۆزیوەتەوە لە ئیسلامدا، لە کاتێکدا شەریعەت خۆی بەویستەوە ئەو بابەتەی فەرامۆش کردووە کە ئەو دۆزیویەتیەوە، بەڵگەکان لار دەکەنەوە و بابەتە نامۆ و دەگمەنەکان دەچەسپێنن و دەیانکەنە بنەڕەت.

* ئەگەر هەموو ئەو بابەتانە لە پەرتووکێکدا کۆ بکرێتەوە کە گرووپ و تاقمەکان حەڵاڵیان کردووە کە خۆیان لەبنەڕەتدا حەرام بوون، ئەوا پەرتووکێکی ئیسلامی لێ پەیدا دەبێت بەبێ بوونی ئیسلام. بەڵام دەبینیت خەڵکانێک ئەو پەرتووکە لە دڵیاندا هەڵدەگرن.

* ئەگەر بینیت کەسانێک بە ناوی لێکۆڵینەوە و بەدواگەڕان بۆ دۆزینەوەی هەق بەشوێن بابەتە ناکۆکەکاندا دەگەڕان بۆ حەڵاڵکردنی ئەو بابەتانەی ڕێی

تێ دەچێت حەڵاڵ بکرێن، ئەو کەسە خاوەن هەواوئارەزووە ئەگەر هیچ پێناخۆشبوونێکی لە ناخیدا بەدی نەکرد کاتێک حەرامکراوە بنەڕەتییەکان پێشێل دەکرا.

* هەڵبژاردن و بەدواداچوونی بابەتێک و وازهێنان لە بابەتانێک کە گرنگتر و لەپێشترن، نیشانەی هەواوئارەزووە: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ﴾ [آل عمران: ٧] «ئەوانەی لە دڵیاندا لادان و چەوتی هەیە، دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە لە قورئاندا موتەشابیهـ و هاوشێوەن.»

(التتبع): واتە وەگرتنی بابەتێک لەناو کۆمەڵە بابەتێکدا.

* هەرکات نەفس بە لای وتەیەکدا چوو، ئەوا هەڵدەستێت بە هێنانەوەی پاڵپشت بۆی لە بەڵگە و هاوڕێ بەڵگەکان تا تای تەرازووەکەی قورس بێت. ئەگەر دەروونی بە لای وتەیەکی دیکەدا بڕوات، ئەوا هەمان کاری پێشوو دووبارە دەکاتەوە. لەگەڵ هەواوئارەزوەکانی دەجووڵێت و هەستی پێ ناکات.

* ئەو کەسانەی پارێزراوی و جێگیربوونیان هەیە لەسەر ئایین و فکریان ئەوانەن کە بەتەواوی فکری پێچەوانەکانیان دەزانن، وەک چۆن فکری هاوبیرەکانیان دەزانن، ئەو کات ڕێگەی لێ ناشێوێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ [الأنعام: ٥٥]

«ئێمە ئاوا نیشانەکانی خۆمانیان تەواو بۆ شی دەکەینەوە و دەمانەوێت ڕێبازی تاوانباران ڕوون ببێتەوە.»

* کەسێک زانا بێت و بیەوێت خەڵک فێر بکات، بەڵام شارەزا نەبێت بە دەرچەی دوژمنان و هەوڵی داخستنی نەدات لە فێرخوازانی، وەکوو ئەوە وایە خانوێکی گڵ خاوێن بکاتەوە لەکاتێک ئاو لە دەرگاکانییەوە دزە دەکاتە ناوییەوە. ئێمە چاک دەزانین دونیامان ڕێک بخەین، کەچی لە ڕێکخستنی دینمان خۆمان بێئاگا دەکەین.

* حوکمی خودا وەسف دەکەن بە بۆچوونەکان (الآراء)، تاکوو لەسەریان ئاسان بێت لەبەرانبەری بوەستنەوە و ڕەتی بکەنەوە: ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ﴾ [هود: ٥٣] «ئێمەش واز لە پەرستراوەکانمان ناهێنین لەبەر قسەی تۆ.»

وایان نیشاندا بۆچوون و وتەی هود بێت، لەکاتێکدا دەیان زانی کە وتەی خودا و سروشی ئەوە.

* قورسە لەسەریان دژایەتی ئایین بکەن بەو ناو و فۆڕمەوە کە هەیەتی، هەرچی لە ئامانجیاندا بێت، دای دەبڕن لە ناوەکەی و بە عورف و تەقالیدی کۆمەڵگای دادەنێن و پاشان بە ئامانجی دەگرن. جەستەی تەندروست لە بەرکەوتنی سەری دەرزییەک ڕادەکات، بەڵام بڕینی دەستی شەلەل بوو هیچ ئازارێک بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت.

* بەڵگە لاواز و بێئەرزشەکان ئەگەر خۆبەگەورەزانی لەگەڵدا بوو، ئەوا دەبێتە بەڵگەی بەهێز لای خاوەنەکەی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٌ﴾ [غافر: ٥٦] «بەڕاستی ئەو کەسانەی دەمەقاڵێ و کێشە دەکەن دەربارەی نیشانەکانی خودا، بەبێ ئەەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێت، هیچ لە دڵیاندا نییە جگە لە خۆبەزلزانی.»

* وا گومان دەبەن موسڵمانن، بەڵام دەبینیت لێکدانەوەی تایبەت بە خۆیاننیان بۆ دەقەکان هەیە: ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡ﴾ [آل عمران: ١٦٧] «بۆئەوەی دووڕووەکان ئاشکرا بکات، پێیان وترا وەرن بجەنگن لەڕێی خوادا یان بەرگری (لە وڵاتی خۆتان) بکەن، وتیان: ئەگەر بمانزانییایە جەنگ دەبێت، شوێنتان دەکەوتین.»

* هەندێک خراپە لەلایەن خراپەکارانەوە بە بچووکی دەهێندرێتە پێش، تاکوو سەیری کاردانەوەی چاکسازان بکەن و تاقییان بکەنەوە و ئامادەکاری بکەن بۆ پاش ئەوە: ﴿وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ [النمل: ٣٥]

«ئەوا من دیارییەکیان بۆ دەنێرم؛ چاوەڕێم کە ڕاسپاردەکان بە چییەوە دەگەڕێنەوە.»

* کۆمەڵانێک حەرامەکان دەخەنە ناو حەڵاڵەکانەوە، جا کاتێک چاکسازان ڕێگرییان لێ بکەن لە ئەنجامدانی ئەو حەرامە، دەڵێت: حەڵاڵیان حەرام کردووە!

* لێکدانەوەی وتەی کەسێک بە شێوازێک کە ئەو واتایە هەڵناگرێت پیشە و کاری هاوەڵدانەران بووە، پەیامبەری خودا (ﷺ) ڕیبا و سووی حەرام کرد، ئەوان جاڕیان دەدا و دەیانگوت کڕین و فرۆشتنی لێ حەرام کردوون، خوداش ئەم ئایەتەی دابەزاندوو جیای کردەوە: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ [البقرة: ٢٧٥

«خوا ڕێی داوە بە کڕین و فرۆشتن، بەڵام سوودی قەدەغە کردووە.»

* مووسا خەڵکی بانگ دەکرد بەرە و بیروباوەڕێکی پاک، فیرعەونیش خەڵکی بانگ دەکرد بۆ بازاڕی ماددەگەرایی، تاکوو دڵەکان لابدات لە مووسا: ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ [الزخرف: ٥١]

«فیرعەون بۆ ژێردەستانی جاڕی کێشا و گوتی: گەلۆ! ئاخۆ هەموو هەردی میسر و ئەو چۆمانەی بە بەرمندا فڕکەیانە، موڵکی من نین؟ ئێوە خۆتان نەتاندیوە؟»

* سەرکردە ستەمکارەکان لەناو شوێنکەوتووانیاندا کەسانێک گەورە دەکەن پاشان فکر و بۆچوونەکانی خۆیان لە مێشکیاندا دەچێنن، پاشان بە ئاوی ناوبانگ و دەرکەوتن ئاوی دەدەن: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا﴾ [الإسراء: ٧٣]

«بەڕاستی نزیک بوو ئەوانە لات دەن لەوەی کە نیگامان کرد بۆت، بۆئەوەی جگە لە قورئان شتێک بە ناوی ئێمە هەڵبەستیت (ئەگەر گوێڕایەڵیان بوویتایە)، ئەوا لەو کاتەدا دەیانکردیت بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان.»

* ئەو کەسەی دژی هەقە و نایەوێت وەری بگرێت، هەندێکجار بەڵگە دەهێنێتەوە لە کاتێکدا لای خۆشی باوەڕپێکەر نییە، فیرعەون خۆی ساحیرەکانی هێنا، بەڵام کاتێک مووسا بەسەریاندا سەرکەوت، سەرزەنشتی دەکردن بە وتەی: ﴿لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ﴾ [طه: ٧١] «بێگومان ئەو مووسا گەورەتانە کە فێری جادووی کردوون.»

* گەلەکەی ئیبراهیم تا ئەوکاتەی ئیبراهیم (علیه السلام) هاوبۆچوونیان بوو بە گەورە ڕایان دەگرت، کاتێک پێچەوانەی کردن، خۆیان بەگەورە زانی و تەنانەت بە گومانەوە ناویان دەبرد، تاکوو دەری بخەن کە نایناسن و دان بە زانستەکەیدا نەنێن: ﴿قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ﴾ [الأنبياء: ٦٠] «چەند کەسێک وتیان گوێمان لە لاوێک بوو باسی ئەوانی (بتەکانی بە خراپە) دەکرد، پێی دەڵێن ئیبراهیم.»

* ئامادەنەبوون بۆ گفتوگۆ کردن و پشبەستن بە وەسفی کەسانی دیکە بە کۆنەپەرستی و دواکەوتووی ڕێبازی سەردەمی نەفامی بووە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ [الأنعام: ٢٥] کاتێک بێن بۆ لات دەمەدەمێ و بەبەریکانێت دەکەن، ئەوانەی بێباوەڕن دەڵێن: ئەم قورئانە هیچ نییە بێجگە لە ئەفسانەی پێشینان.»

* هەندێک کەس بانگەشەی ڕێزگرتن لە ناکۆکییە فیقهی و لاوەکییەکاندا دەکەن لە کاتێکدا باوەڕیان بە بابەتە بنەڕەتییەکان نییە، بێگومان ڕێزی ئەو کەسە دەگیرێت لە بابەتە ناکۆکییە لاوەکییەکاندا کە بابەتە بنەڕەتییەکان دەچەسپێنێت.

* ئەو کەسەی باوەڕی لاوازە، ئەگەر نەیتوانی بەڵگە بهێنێتەوە، ئەوا دەست دەکات بە تۆمەت هەڵبەستن.

* ترسناکترین دوژمنی هەق ئەو کەسەیە لەپشت هەقەوە خۆی حەشار دەدات بۆئەوەی بگاتە ناهەقی و باتڵ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُۥ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِى قَلْبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ﴾ [البقرة: ٢٠٤] «هەندێک کەس هەن قسە و گوفتار و دەم پاراوییان لەبارەی ژیانی ئەم دونیایەوە سەرسامت دەکات، خواش بە شایەت دەگرێت و دەڵێت: دڵ و زمانم یەکسانن، لەکاتێکدا ئەو سەرسەختترین کەسە لە هەموو جۆرە دوژمنایەتییێکدا.»

* ئەوان سەرقاڵن بە خودی بانگخواز و شوێنکەوتووانییەوە لەبری پەیامەکەی: ﴿فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ﴾ [هود: ٢٧]

جا پیاو ماقوڵهکان وتیان ئهوانهی کهبڕوایان نههێنا بوو لهگهلهکهی (نووح) ئێمهتۆ نابینین جگهلهئادهمی یهکی وهک خۆمان وهنابینین تۆ هیچ کهسێ شوێنت کهوتبێ جگهلهوانهی کهههژارو پهستهکانمانن بێ ئاوهزا و ساویلکهن و ڕواڵهت بینن.

* تەنها خاوەن هەواوئارەزووەکان سەرقاڵ دەبن بەڕەخنە گرتن لە کەسەکان وەک لە ڕەخنە گرتن لە فکرو بۆچوونەکان.

* ئەگەر ڕەخنە گرتن لە کەسەکان زیاتر بوو لە ڕەخنەگرتن لە فکر و بۆچوونەکان ئەوا نیشانەی ئەوەیە هەواوئارەزوو تێکەڵی ئەو ڕەخنەیە بووە، پەیامبەری خودا (ﷺ) زیاتر باسی دووڕووی کردووە لەوەی باسی کەسە دووڕووەکان بکات لەکاتێکدا ئەوان خراپەیان دەردەخست.

* ترسناکترین جۆری ململانێ ئەوەیە ململانێی نێوان هەق و ناهەق بکرێتە ململانێی تاکەکان یان حیزبەکان لەگەڵ یەکتری بەو هۆیەوە ڕاستیەکان بشێوێت ﴿ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ﴾ [التوبة: ٤٨] «بەڕاستی دەستیان دابوویە ئاژاوە (پشێوی) لەمەوپێش و جۆرەها پلان و فرمان و پیلانیان بۆ (لاوازکردن)ت بەکارهێنا.

* دژایەتی حیزبێکی خەیاڵی دەکەن، تاکوو حیزبایەتییەکی ڕاستی و حەقیقی دروست بکەن.

* نووسراو و هەڵە و بیروباوەڕی کەسانێک نامێنێت بە نەمانی ئەم سێ شتە: ترس و تەماع و ئیرەیی.

# چاکسازی و فێڵ و پیلانی خراپەکاران

* گەورەترین سیفەتێک کە هەموو دوژمنانی هەق لەسەری کۆکن، ئەوەیە کە سەرقاڵن بە وتەی کەسەکانەوە لە پەیامەکانیان و گاڵتەیان پێ دەکەن: ﴿يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ [يس: ٣٠] «پەژارە بۆ بەندەکان! نێردراوێکیان بۆ نەهاتووە گاڵتەیان پێ نەکردبێت.»

* گاڵتەپێکردن و سووکایەتی کردن لە قورئاندا ستایش نەکراوە، تەنها لە حاڵەتی بەرانبەر و تۆڵەدا نەبێت: ﴿إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسۡخَرُ مِنكُمۡ كَمَا تَسۡخَرُونَ﴾ [هود: ٣٨] «ئەگەر ئێوە ئێستا گاڵتە و لاقرتێ بە ئێمە دەکەن ئەوە بێگومان ئێمەش لاقرتێ بە ئێوە دەکەین هەرچۆن ئێوە لاقرتێ بە ئێمە دەکەن.»

* گاڵتەکردن و سووکایەتی شایستەی ڕاستگۆیان نییە، بەڵکوو نیعمەتێکە خودا بیروباوەڕی دووڕووەکانی پێ دەردەخات: ﴿قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ﴾ [التوبة: ٦٤] «بڵێ گاڵەتە و لاقرتێ بکەن، بەڕاستی خودا دەرخەر و ئاشکراکاری ئەوەیە کە مەترسی لێ دەکەن.»

* واز لە هەق مەهێنە بەهۆی ئەوەی گاڵتەت پێ دەکەن لەسەر دەستگرتنت بە هەقەوە، لە نیشانەکانی هەق ئەوەیە ناهەقان گاڵتە بە خاوەن هەقەکان دەکەن: ﴿وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ [الحجر: ١١] «هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتووە مەگەر گاڵتە و لاقرتێیان پێ کردووە.»

* هیچ پەیامبەرێک پارێزراو نەبووە لە گاڵتەپێکەران، هەرکەس پەیامەکەی پارێزراو بێت لە گاڵتە پێکەران، ئەوا با بزانێت کەموکوڕییەک هەیە لە خۆیدا، یان پەیامەکەی هاوشێوەی ڕێبازی پەیامبەران نییە: ﴿وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا

كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ [الحجر: ١١] «هیچ پێغەمبەرێكیان بۆ نەهاتووە مەگەر گاڵتە و لاقرتێیان پێ كردووە.»

✱ زۆرێک لەوانەی هەقی ئاشكرا ڕەت دەكەنەوە، گاڵتەچییەكانن، چونكە چێژی گاڵتەكەیان لە چێژی واتاكان دایان دەڕنێت: ﴿بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ (١٢) وَإِذَا ذُكِّرُواْ لَا يَذْكُرُونَ﴾ [الصافات: ١٢-١٣] «بەڵام (سەیرە) تۆ سەرت سوڕماوە (چۆن باوەڕ ناهێنن) كەچی ئەوان گاڵتە دەكەن (بە تۆ كە دەڵێن زیندووبوونەوە هەیە)، كاتێكیش ئامۆژگاری بكرێن، ئامۆژگاری وەرناگرن.»

✱ گاڵتەكردن لە كاتی گفتوگۆ و تاوتوێدا خاوەنەكەی ناگەیەنێت بە هیچ شتێک، بەڵكوو تەنها دەبێتە ڕێگر لە تێڕامانی ڕاستییەكان: ﴿فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ﴾ [المؤمنون: ١١٠] «كەچی ئێوە گاڵتەتان پێ دەكردن، هەتا گەیشتە ڕادەیەک یادی منیان لەبیر بردنەوە و ئێوە بەردەوام بەوان پێدەكەنن.»

✱ گاڵتەپێكردن ڕێگایەكە خاوەنەكەی بەرەو گومڕابوون دەبات و بەردەوامی دەكات لەسەر گومڕاییەكەی. گاڵتەكردن چێژێكی هەیە كە ڕێگری دەكات لە تێڕامان: ﴿ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ [البقرة: ١٥] «خودا گاڵتەیان پێ دەكات و بەرەڵایان دەكات تا لە سەركەشیی خۆیان سەرلێشێواو بن.»

✱ پەیامبەران بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی ڕادەگەیەنن بۆ خەڵكی، كەسانێک بەرانبەریان دەوەستنەوە بە زمانی گاڵتەكردن و بەكەم زانین، هەركات ئەو شێوازە بەدیكرا، دەبینیت ئەقڵ لە تێڕامانی خودی بەڵگەكان لادەدات بۆ لای شتانێكی دوور لە بەڵگەكان.

✱ گاڵتەكردن لە كاتی وتووێژدا چەكێكی لاوازە، چونكە گاڵتەكردن جۆرە مەستیبوونێک تووشی خاوەنەكەی دەكات كە هەست بە سەركەوتن دەكات و

چاوی تەنها ئەوە دەبینێت، جا کاتێک ئەو مەستییەی لادەچێت لە شکست و دۆڕان بەئاگا دێتەوە.

* خودا لە قورئاندا گاڵتەکردنی وەک ڕێبازی ئەوانە هێناوە کە بێتوانان لە هێنانی بەڵگە و بەڵگەیان بەدەستەوە نییە، گاڵتەکردن دروست نییە تەنها لە کاتی بەرپەرچدانەوەیەکی هاوشێوەدا نەبێت: ﴿إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ﴾ [هود: ٣٨] «ئەگەر ئێوە ئێستا گاڵتە و لاقرتێ بە ئێمە دەکەن ئەوە بێگومان ئێمەش لاقرتێ بە ئێوە دەکەین هەرچۆن ئێوە لاقرتێ بە ئێمە دەکەن.»

* گاڵتە و سووکایەتی پێکردن لە کاتی وتووێژدا بەربەست و پەردەیەکە، نەزانان نەزانی خۆیانی لەپێش چاوی خەڵکی پێ دادەپۆشن: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ [البقرة: ٦٧]

«وتیان: ئایا گاڵتەمان پێ دەکەیت؟ وتی: پەنا دەگرم بە خوا کە لە نەفامان بم.»

* نەزان گاڵتە بەکاردەهێنێت بۆ شاردنەوەی نەزانییەکەی، بەڵام کەسی زانا خۆی لێ دەپارێزێت بەهۆی زانستەکەیەوە: ﴿قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ [البقرة: ٦٧]

* لاوازترینی خەڵکی ئەوانەن کە متمانەیان بە بۆچوونەکانی خۆیان نییە، بە گاڵتەکردن دژ بە بەڵگەکان دەوستنەوە، خودا دەربارەی دوژمنەکانی پەیامبەر دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا﴾ [الفرقان: ٤١] «ئەی موحەممەد (ﷺ) کاتێک تۆ ببینن، بەس گاڵتەت پێ دەکەن و دەڵێن ئا ئەمەیە خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەر؟»

گاڵتەکردن پەناگەی لاوازانە.

* گاڵتە کردن توێشووی مانەوە و بەردەوامی هەموو ئەو کەسانەیە کە بەڵگەیان کەم و لاوازە.

* ئەو کەسەی گاڵتە دەکات بە حەقێک دەکات ئەو کارە دەکاتە هۆکاری لابردنی غەم و پەژارەی سەر دڵی، بەڵام هەق و ڕاستی ناگۆڕێت: ﴿وَإِذَا مَرُّوا بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ۝٣٠ وَإِذَا انْقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمُ انْقَلَبُوا فَكِهِينَ ۝٣١ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا إِنَّ هَؤُلَاءِ لَضَالُّونَ ۝٣٢﴾ [المطففين: ٣٠ -٣٢]

«کاتێک بە لایاندا بڕۆیشتنایە چاویان لێ دادەگرتن. کاتێکیش بگەڕانایەتەوە بۆ لای ماڵ و منداڵیان، بە پێکەنین و گاڵتەکردن (بە موسڵمانان)ەوە دەگەڕانەوە.»

* ئەوانەی کە گاڵتەیان بە هەق کردووە، زۆرترین ئاخ و حەسرەت هەڵدەکێشن، چونکە گاڵتەکردن چێژێکی زۆر خێرای هەیە، زوو دەڕوات و پاشان پەشیمانی و پەژارە دایان دەگرێت: ﴿يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ [یس: ٣٠] «پەژارە بۆ بەندەکان! نێردراوێکیان بۆ نەهاتووە گاڵتەیان پێ نەکردبێت.»

* هەندێک لە ئەقڵەکان گەڕییان هەیە وەک گەڕی جستە، چێژ لە بەرپەرچدانەوە دەبینن وەک چۆن ئەو کەسەی تووشی گەڕی هاتووە چێژ لە خوراندن دەبینێت، بەڵام هەرچەندە زیاتر بیخورێنێت، گەڕییەکەی زیاد دەکات. چارەسەرەکەیشی تەنها وازلێیهێنانە.

* گەورەترین و ترسناکترین شت لەسەر ئوممەت ئەوەیە کە ئامۆژگاریکار لە لای ئامۆژگاریکراوان ناشرین دەکەن بۆئەوەی گومانیان لا دروست ببێت باوەڕیان پێ نەهێنن و بەوهۆیەوە ئوممەت تیابچێت: ﴿وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ [الأعراف: ١٢٧] «ئەشرافەکانی گەلی فیرعەون وتیان ئایا واز لە مووسا و هۆزەکەی دەهێنیت بۆ ئەوەی لە وڵاتدا خراپەکاری بکەن.»

* خەڵکانێک فکر و بیروباوەڕەکان بە کەسەکانەوە دەبەستنەوە، جا هەق لە خەڵکی دەشێوێنن بەهۆی ئەوەوە کە خۆیان خاوەن هەقەکان ناشرین دەکەن و دەیانشێوێنن لەپێش چاوی خەڵکی: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ [البقرة: ١٣]

«کاتێ پێیان بوترێت: باوەڕ بهێنن وەک چۆن خەڵک باوەڕیان هێناوە. دەڵێن: ئایا باوەڕ بهێنین وەک ئەو گێلانەی باوەڕیان هێناوە؟»

* پەیڕەوکارانی ناهەقی زیاتر گرنگی دەدەن بە ناشرین کردن و بێزراوکردنی هەق لای خەڵکی وەک لە چاککردنی ناهەقییەکانی خۆیان، چونکە شێواندنی هەق ئاسانترە لە چاککردنی ناهەقی. خەڵکی شوێنی ناهەقی دەکەون، نەک بەهۆی باوەڕبوونیان پێی، بەڵکوو بۆ ڕاکردنیان لە هەق و ڕاستی.

* بیروباوەڕی هەق و هەڵگرانی دەشێوێنن، تاکوو ناهەقی و باتڵەکەیان جوان بکەن، عەرەب لە سەردەمی نەفامیدا ئەگەر هاوسەرگیرییان لەگەڵ کچێکی ناشرین بکردایە، لە کاتی ئاهەنگی هاوسەرگیرییاندا بوکیان دەخستە نێوان دوو کەنیزەکی ڕەش پێستەوە.

* خراپەکاران زۆر سوورن لە سەر شێواندنی وێنای چاکسازان، چونکە شکست پێهێنانی خودی چاکسازان زۆر ئاسانترە لە شکست پێهێنانی بەڵگەکانیان، ئەوکات خەڵکی لە هەموو وتەکانیان دوور دەکەوێتەوە: ﴿وَقَالُواْ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ﴾ [الأعراف: ١٣٢] «دەیان وت (بە مووسا) هەر موعجیزەیەکمان بۆ بهێنیت بۆئەوەی جادوومان لێ بکەیت پێی، ئەوە ئێمە باوەڕت پێ ناهێنین.»

* بێباوەڕان ناتوانن دژایەتی خودی ئیسلام بکەن، بۆیە لەژێر پەردەی ڕەخنەگرتن لە هەڵسوکەوتی موسوڵمانان دژایەتی ئیسلام دەکەن. هەروەک دووڕووەکان هەمان ڕێگایان دەگرتە بەر لە سەردەمی پەیامبەردا (ﷺ)

* هەر فکرەیێک بتەوێت بیشێوێنیت، ئەوا هەوڵبدە هەموو لایەنە توندەکانی لە حاڵەتە جیاوازەکاندا کۆبکەیتەوە، جا بە یەک جار هەمووی بۆ عەقڵی خەڵکی باس بکە، ئەمە دووبارە بکەوە لە چەندین وێنای جیاوازدا، دەبینیت پۆلێک لە عەقڵی خەڵکی وازدێنن لەو فکرەیە و شوێن تۆ دەکەون.

* فیرعەون وەها گەلەکەی باوەڕ پێهێنابوو کە مووسا ساحیرە، تاکوو کەسایەتی مووسای پێ بشێوێنێت، تا بەهۆیەوە دەرگای گوێگرتنی خەڵکی لەسەر مووسا دابخات: ﴿وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾ [الأعراف: ١٣٢]

«دەیان وت (بە مووسا) هەر موعجیزەیەکمان بۆ بهێنیت بۆئەوەی جادوومان لێ بکەیت پێی، ئەوە ئێمە باوەڕت پێ ناهێنین.»

* شێواندنی کەسایەتی چاکسازان ڕێبازی ستەمکارانە، ئەو کاتەی بەڵگەیان پێ نەمێنێت، ئیبن عەباس دەڵێت: "گەلی شوعەیب لە ڕێگاوبانەکان دادەنیشتن، دەیانگوت: شوعەیب درۆزنە، تووشی لادان و فیتنەتان نەکات لە ئایینەکەتاندا."

* چاکسازان بەڵگەکان دەردەخەن و ستەمکاران خەڵکی گشتی هاندەدەن تا شوێنکەوتووانیان زیاد بکەن: ﴿فَأَرۡسَلَ فِرۡعَوۡنُ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ۝٥٣ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرۡذِمَةٞ قَلِيلُونَ ۝٥٤ وَإِنَّهُمۡ لَنَا لَغَآئِظُونَ ۝٥٥﴾[الشعراء: ٥٣--٥٥]

«ئەوسا فیرعەون پیاوانی کۆکەرەوەی نارد بە شارەکاندا بۆ کۆکردنەوەی لەشکر و هێز. فیرعەون وتی بەڕاستی ئەوانە (مووسا و شوێنکەوتووانی) کۆمەڵێکی کەمی بێنرخن. هەروەها بەڕاستی ئەوانە ڕقی ئێمە هەڵدەسێنن بە وتار و کرداریان.»

* گەورەترین دەرمان بۆ مرۆڤێک کە ستەمی لێ بکرێت و درۆی بۆ هەڵبەسترێت و پەیامەکەی بشێوێندرێت، تەنها پشتگوێخستنی ئەو کەسانەیە، ئەوە باشترین کارە بۆ دڵی و پاراستنی کاتەکانی: ﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ [الأنعام: ١١٢] «دە لێیان گەڕێ بە خۆیان و ئەو درۆیانەوە کە هەڵی دەبەستن.»

* تۆمەتبارکردنی چاکسازان بەوەی دەیانەوێت دەرکەون و ببنە پێشەوا و سەرکردە، ئەمە تۆمەتی نەفامانە بۆ پەیامبەران، گەلی نووح بە نووحتان دەگوت: ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ﴾ [المؤمنون: ٢٤] «ئەم (نووح)ە تەنیا کەسێکە وەک ئێوە، دەیەوێت خۆی بکاتە گەورە بەسەرتانەوە.»

واتە: تەنها ویستیان ئەوەیە ببنە گەورە بەسەرتانەوە.

* تۆمەت دەدەنە پاڵ چاکسازان بەوەی دەیانەوێت ببنە سەرکردە و گەورە. ئەمە تۆمەتێک بووە بۆ پەیامبەرانیش هەڵبەستراوە، دەربارەی مووسا وتویانە: ﴿وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ [یونس: ٧٨] «تا بۆ هەردووکتان (مووسا و هاروون) بێت گەورەیی (سەرۆکی) لە زەویدا.»

دەربارەی نووح دەیانگوت: ﴿يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ﴾ [المؤمنون: ٢٤]

«ئەم (نووح) تەنیا کەسێکە وەک ئێوە، دەیەوێت خۆی بکاتە گەورە بەسەرتانەوە.»

* ستەمکاران دڵیان وابەستەی دەسەڵاتە، وا گومان دەبەن چاکسازان ململانێیان لەگەڵ دەکەن لەسەر دەسەڵات، دەربارەی مووسا دەیانگوت: ﴿وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ [یونس: ٧٨]

* ئەگەر مرۆڤ دڵی پڕ بوو لە خۆشەویستی بۆ دەسەڵات، وا گومان دەبەن چاکسازان ململانێیان لەگەڵ دەکەن لەسەر دەسەڵات، دەربارەی نووح دەیانگوت: ﴿يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ﴾ [المؤمنون: ٢٤)

* چاکسازان دژی سەرکردە ناهەقەکان دەوەستنەوە، ئەوانیش دژایەتییەکە دەکەن بە دژایەتی خاک و نیشتمان و گەل، مووسا بانگێشتی فیرعەونی دەکرد بۆ باوەڕهێنان بە بیروباوەڕی ڕاست و وازهێنان لە ستەم، فیرعەون ئەو کارەی کردە دژایەتی نیشتمان:

﴿قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ [طه: ٥٧] «فیرعەون وتی: هاتوویت بۆ ناومان بۆئەوەی دەرمانکەیت لە خاکەکەمان بە جادووگەرییەکەت ئەی مووسا.

﴿يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ﴾ [الأعراف: ١١٠]

«دەیەوێت لە خاک و وەڵاتی خۆتان دەرتانکات، جا ئێوە فەرمان و ڕاتان چییە لەبارەیەوە؟»

﴿قَالُوٓاْ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ﴾ [طه: ٦٣] «وتیان بەڕاستی ئەمانە دوو جادووگەرن کە دەیانەوێت دەرتانپەڕێنن لە خاک و وڵاتەکەتان بە جادووەکەیان و ڕێباز و نەریتە هەرە باشەکەتان لەناوبەرن.»

* جەنگ لەگەڵ چاکسازان دەکەن بۆ پاراستنی دەسەڵاتیان وخۆیان دەشارنەوە لەپشت جەنگی پاراستنی بیروباوەڕەوە: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ﴾ [غافر: ٢٦] «بەڕاستی من دەترسم کە ئایینەکەتان بگۆڕێت.»

هەروەها پاراستنی نیشتیمان: ﴿أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ﴾ [غافر: ٢٦] «یا لە زەویدا ئاژاوە بنێتەوە.»

* فیرعەون ساحیرەکانی لە سەرانسەری میسر کۆکردەوە یەک یەک تا شکست بە مووسا بهێنن، کاتێک پێچەوانەی جوڵانەوە بە شانەی نستوو هەژماری کردن کە پلانیان گێڕاوە و ئەو کارەیان بە سەرکردایەتی مووسا کردووە ﴿إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ﴾ [طه: ٧١] «بێگومان ئەوە (مووسا) گەورەکەتانە فێری جادووی کردوون.»

* بێگومان ئەو ئوممەتانە تیاچوون کە چاکسازەکانیان بە هۆکاری فیتنە و دووبەرەکی وەسف کردووە: ﴿وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ﴾ [الشعراء: ٢٠٨] «هیچ شارێکمان لەناونەبردووە دڵنیابە ترسێنەرێکیان هەبووە.»

* چاکسازان بە هۆکاری دواکەوتنی ئوممەت و نەهامەتیی ئوممەت تۆمەتبار دەکەن: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ﴾ [الأعراف: ١٣١] «بەڵام کاتێک تووشی بەڵا و خراپە بوونایە، (دەیانوت) بەهۆی شوومی مووسا و شوێنکەوتووانییەوەیە.»

* هەموو پەیامبەران بە توندڕەو لە بیروباوەڕدا وەسف کراون لەلایەن دوژمنەکانیانەوە، واتە هەموو دوژمنەکانیان لەلایەنێکی دیکەدا بوون، ئەویش داڕنران و بەرەڵڵایی بووە، بەڵام جیاواز بوون لە ئەندازە و جۆری لادان و بەرەڵڵابوونیان.

* وەها سەیری چاکسازان دەکەن کە مێشکیان پڕە لە بۆچوونی خەیاڵی و بێبنەمای هاندەر و ورووژێنەر: ﴿إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [الأنفال: ٤٩] «بیر بکەوە هەر کاتێک دووڕووەکان و ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندا بوو، دەیانوت ئەوانە (موسڵمانەکان) ئایینەکەیان فریوداون، هەر کەسێک پشت بە خوا ببەستێت، ئەوە بەڕاستی خوا بەدەسەڵاتی کار دروستە.»

* یەکێک لەو ڕێگەیانەی هەقی پێ ناشرین دەکرێت و دەشێوێندرێت تۆمەت بارکردنی خاوەنەکانیانە بەوەی شتی نوێ و تازەیان داهێناوە، تا خەڵکی لێی ڕابکەن، گەلی نووح و مووسا بەو جۆرە مامەڵەیان دەکرد و دەیانگوت: ﴿مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ﴾ [المؤمنون: ٢٤] «ئێمە شتی وامان نەبیستووە لە باوباپیرە پێشووەکانمانەوە.»

* لە لای ستەمکاران پێوەرەکان پێچەوانە دەبنەوە، وای لێدێت چاکسازی دەبێتە گەندەڵی و گەندەڵیش دەبێتە چاکسازی: ﴿وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ [الأعراف: ١٢٧] «ئەشرافەکانی گەلی فیرعەون ئایا واز لە مووسا و هۆزەکەی دەینی بۆئەوەی لە وڵاتدا (خاکی میسر) خراپەکاری بکەن.»

* ستەمکاران چاکسازان تۆمەت بار دەکەن بە درۆکردن لە کاتێکدا کە خۆیان بەڕاستی ئەو کارە دەکەن، فیرعەون تۆمەتی دەدایە پاڵ مووسا بەوەی ساحیرە، پاشان خۆی ساحیرەکانی کۆ کردەوە لە دژی مووسا: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ﴾ [یونس: ٧٩] «ئینجا فیرعەون فەرمانی دا، وتی: ئادەی هەرچی جادووگەری زانا و شارەزایە بیهێنن و بۆم کۆ بکەنەوە.»

* فیرعەون تا ئەو کاتەی سیحر لە بەرژەوەندیدا بوو، بەدوایدا دەگەڕا: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ﴾ [یونس: ٧٩]

جا کاتێک فیرعەون بینی بووەتە بەڵگەی مووسا، ئەوکات سیحر لای بوو بە درۆ و هەڵبەستراو: ﴿قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى﴾ [القصص: ٣٦]

وتیان ئەمە (تۆ هێناوتە مووسا) تەنیا جادوویەکی دەستهەڵبەستە.»

# ئاکار و ڕەوشتی چاکسازان و ئامانج و ئامڕاز و شێوازیان

* زۆرجار کە ناکۆکی دەست پێ دەکات، سەرەتا هەمووان بۆ سەرخستنی هەق هەوڵدەدەن، پاشان دەگۆڕێت بۆ سەرخستنی خودی خۆیان، هەمووان بەو جۆرەن تەنها کەسە ڕاستگۆ و دەروونپاکەکان نەبێت.

* زۆرجار مرۆڤ سەرخستنی خودی خۆی و سەرخستنی هەق تێکەڵ بە یەک دەکات، تا ئەو مرۆڤە دەمارگیری دەیگرێت و نەفس و خودی خۆی سەردەخات وا گومان دەبات هەقی سەرخستەوە.

* زۆرجار کەسەکان خودی خۆیان سەردەخەن بە ناوی سەرخستنی هەقەوە، تەنها زانا نییەتپاکەکان دەتوانن جیاکاری لەنێوان ئەم دووانەدا بکەن و نەزانەکانیش تووشی دێن.

* نووسەرەکان بە پەنهانی و بێ ئەوەی هەست بکەن خودی خۆیان سەردەخەن لەژێر پەردەی سەرخستنی هەقدا، ستەم دەکات و سنوور دەبەزێنێت، وا گومان دەبەن لەپێناو سەرخستنی ئایینی خودا ئەو کارە دەکەن، لەکاتێکدا بۆ سەرخستنی خودی خۆیان ئەو کارە دەکەن.

* هەرکەس ئایینی خودا سەربخات، خودا شکۆمەندی دەکات و سەری دەخات هەرچەند لە پاش ماوەیەکیش بێت، هەر کەس خودی خۆی یان دەسەڵاتەکەی سەربخات، خودا سەرشۆڕ و سەرکزی دەکات هەرچەندە لە پاش چەندساڵێکیش بێت: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ﴾ [الحج: ٤٠] «بێگومان خوا یارمەتی کەسانێک دەدات (سەریان دەخات) کە یارمەتی (دینی) خوا دەدەن.»

* مرۆڤی ژیر لە کاتی تووڕەییدا بەرپەرچ ناداتەوە، چونکە لەو کاتەدا سەرخستنی نەفس لەژێر پەردەی سەرخستنی هەقدا خۆی حەشار دەدات. لە فەرموودەیەکدا پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «إذا غضب أحدكم فليسكت»، «ئەگەر کەسێکتان تووڕە بوو، با بێدەنگ بێت.»

* نووسەر بڕیار دەدات لەسەر واتا جیاوازەکانی ناو هزر و مێشکی، وەک چۆن دادوەر بڕیار دەدات لەسەر کەسانی داواکراوی بەردەمی. تاوتوێ و دیبەیت جۆرێکە لە دادوەری و بڕیاردان جا کەواتە با نووسەر هیچ شتێک نەنووسێت لە کاتێکدا کە تووڕەیە.

* ئەو کەسەی دڵسۆزە بۆ خودا، پەشیمان نابێتەوە لەو وتەیەی کە وتویەتی و بەهۆیەوە بۆتە جێی ڕەخنەی خەڵکی، جا بەو ڕەخنەگرتنەی ئەوان هیچ شتێک نادۆڕێنێت، چونکە ئەو بازرگانی لەگەڵ خودادا کردووە و سەرکەوتوو بووە، خەڵک بەشێک نین لەو بازرگانییە.

* گەورەترین ڕێگر لە بەردەم کەسی چاکساز لە گەیشتنی بەو پەڕی شکۆ و دامەزراوی، بریتییە لە ترسان لە وتە و ڕەخنەی خەڵکی: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ [يونس: ٦٥]

«قسەیان خەمگینت نەکا؛ هەموو دەستەڵات بە خوایە.»

* ترسان لە ڕەخنە و ئازاردان لەلایەن خەڵکییەوە، مرۆڤ بێبەش دەکات لە ورد بیرکردنەوە و هەڵێنجاندنی حوکمەکان، چونکە ترس بەندکەری دڵە: ﴿لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِى صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ [الحشر: ١٣]

بێگومان دڵیان لە ئێوە پتر دەترسێت تا لە خوا؛ چونکە ئەوان کەسانێکی وان تێناگەن.

* تەنها ئەوانە لە ڕەخنە دەترسن کە خراپە و شەڕی شاراوەیان هەیە، یان خێر و چاکەیەکی هەیە و دەیەوێت دەری بخات، یەکەمیان دووڕووە و دووەمیان متمانەی تەواوی نییە.

* بەخشش و فەزڵی خودا لەگەڵ شوێنکەوتووانی هەقدا بەجۆرێکە کە کاریگەر نابن بە ڕەخنە و لۆمەی خەڵکی، پاشگەزنابنەوە و داشکانیش ناکەن: ﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾ [المائدة: ٥٤]

«لە تەشەری سەرکۆنەکەران ناترسن. ئەمە زێدە خەڵاتێکە لە خوداوە بە هەر کەسێک خۆی حەز بکات پێی دەبەخشێت.»

* ترسان لە ڕەخنەو و ڕەتکردنەوەی هەق، تەنانەت لە ناو پەیامبەرانیشدا بوونی هەبووە، مووسا فەرمووی ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴾ [الشعراء: ١٢]

بەڕاستی من دەترسم بڕوام پێ نەکەن.

خودا پێی فەرموو ﴿قَالَ كَلَّا فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ [الشعراء: ١٥] «نەخێر، سا هەردووکتان بە موعجیزەکانمانەوە بڕۆن.»

واتە: ئەو هەستەت ڕاتنەگرێت لە گەیاندنی پەیامەکەت.

* هەندێک لە ڕەخنەکان بەمەبەستی شکاندنی ورە و شکست پێهێنانە، بۆیە پێویست ناکات ئاوڕی بەلادا بدرێتەوە، پەیامبەری خودا بەو کەسەی فەرموو کە وتەی خەڵکییان بۆ گواستووەتەوە کاتێک بە خراپ باسیان کردووە: «وازمان لێ بهێنە دەربارەی ئەوان، مووسا زۆر لەوە زیاتر ئازاری چێشتووە و ئارامی گرتووە.»

* نەرمونیانی لە باسکردنی بابەتەکان و حوکمەکاندا ئەوە ناگەیەنێت لاواز بیت و داشکاندن تیایدا وەربگریت، هیچ کەس بە ئەندازەی پەیامبەران بەسۆز نەبوون بەرانبەر ئوممەتەکەیان، لەگەڵ ئەوەشدا بابەتانێکی جێگیریان هێناوە و هیچ داشکاندنیان تیایدا نەکردووە.

* ئامۆژگاری گەورەترین شتە بکرێتە دیاری، یەکێک لە ڕێگەکانی گەورەدانانی دیاری ئەوەیە دیاریەکە بڕازێنیتەوە و بپێچرێتەوە بە پێچەرێکی شایستە، جوانکاری ئامۆژگارییش بریتییە لە نەرمونیانی و بەسۆزبوون بەرانبەر ئەو کەسەی ئامۆژگاری دەکەیت.

* بانگەواز تەواو شوێنی خۆی ناگرێت تەنها بەڕەوشتی بەرز نەبێت، خودا هەموو ڕەوشتە جوانەکانی لە پەیامبەرەکەیدا تەواو کرد، پێش ئەوەی فەرمانی گەیاندنی پەیامەکەی پێ بکات، چونکە گەورەترین ڕێگر لەبەردەم ئامۆژگاریکاران ئاکار و ڕەوشتیانە، بەرهەم و شوێنەواری بانگەوازیان کەم دەکات، بە ئەندازەی کەمکردنی ڕەوشت و ئاکاریان.

* هەق لە خودی خۆیدا گەورە و مەزنە، بەڵام ئەقڵەکان و زوبانەکان بچووکی دەکەنەوە، کەسی نەرمونیان هەرچەند لەسەر ناهەقیش بێت، دەبینیت پەیامەکەی بەهۆی نەرمونیانییەکەیەوە بەسەر کەسانی خاوەن هەقی ڕووندا سەردەکەوێت. نەرمونیانی وتەکان دەڕازێنێتەوە، هەرچەندە ناهەقیش بن ما كان الرفق في شيءإلا زانه «نەرمونیانی لەهەر شتێکدا بووبێت هەر جوانی کردووە.»

* بەهێزیی بەڵگە بەس نییە بۆ ملکەچبوونی خەڵکی، بەڵکوو پێویستی بە نەرمونیانی هەیە، بەڵگەی پەیامبەر (ﷺ) قورئان بوو و جبریل پاڵپشتی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا پێی گوترا: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ﴾ [آل عمران: ١٥٩]

«ئەگەر تۆ بەدخوو و قسەڕەق و دڵڕەق بوویتایە، ئەوە هەموو بڵاوەیان دەکرد لە دەورت.»

* باوەڕبوونت بە بۆچوونەکانت ئەوە ناگەیەنێت بە ڕەقی بیگەیەنیت، خۆ بۆچوونەکانت لە وەحی و سروش ڕاستر نین و لە کوشتن ڕەقتر نین، لەگەڵ

ئەوەشدا ئیبراهیم بە کورەکەی فەرموو: ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ﴾ [الصافات: ١٠٢]

«(ئیبراهیم) وتی ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم بەڕاستی من لە خەودا بینیم کە سەرت دەبڕم جا سەرنج بدە، دەڵێی چی و ڕات چییە؟»

* نەرمونیانی زۆر گرینگە، بەڵام واز لە هەق مەهێنە بۆئەوەی خۆشیان بوێیت، پەیامبەر (ﷺ) فەرمووی: «يقال للرجل: ما أعقله وما أظرفه وما أجلده!وما في قلبه مثقال حبة خردل من إيمان» «بە پیاوی وەها دەوترێت: ئای چەندە ئاقڵە، چەندە زیرەکە، چەند بەهێزە، کەچی تۆسقاڵێک ئیمان لەدڵیدا نییە.»

* نەرمونیانی و مامەڵە ڕەقی هەردووکیان حاڵەتی تایبەت بە خۆیان هەیە، خودا بە مووسا و هارون دەفەرموێت ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا﴾ [طه: ٤٤] «جا قسەی لەگەڵ بکەن بەنەرمونیانی.»

جا کاتێک سەرکەشی و خۆبەگەورەزانینی فیرعەون دەرکەوت، کارەکە قورسکرا لەسەری: ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰفِرۡعَوۡنُ مَثۡبُورٗا﴾ [الإسراء: ١٠٢] «من دڵنیا بەڕاستی ئەی فیرعەون کە تۆ تیادەچیت و لەناودەبردرێیت ئەگەر هەر ئاوا بیربکەیتەوە.»

* نەرمونیانی و مامەڵە ڕەقی تەنها پەیوەست نین بە ئەندازەی هەڵە و خراپەوە، بەڵکوو پەیوەستیشن بەو کەسانەی ئەنجامی دەدەن، پەیامبەر نەرمونیان بوو لەگەڵ ئەو کەسەی میزی لە مزگەوتەکەیدا کرد و توووند بوو لەگەڵ ئەو کەسەی تفی لە ناو مزگەوتەکەی کرد، لەگەڵ ئەوەی میزکردن کارێکی خراپتربوو، بەڵام بکەرەکەی نەزان بوو.

* گەورەترین فیتنە و ئاشووب بۆ زانایانی ڕاستگۆ ئەوەیە بابەتە ناپێویستەکان سەرقاڵیان بکات لە بابەتە پێویست و گرینگەکان. بەتایبەت ئەگەر بابەتە ناپێویستەکان هاوتابێت لەگەڵ هەواوئارەزوو و سەلامەتیدا.

* زۆرێک لە هەڵەی زانایان و پێشەوایان سەرقاڵبوونیانە بەو بابەتانەی ناپێویستن لە بابەتانێک کە پێویست و گرینگن، جا کاتێک کە ویسترا چاکبکرێن بەڵگە بە فەزڵ و گەورەیی بابەتە لاوەکیەکان دەهێننەوە، لەکاتێکدا ناکۆکی لەسەر فەزڵ و گەورەیی ئەو بابەتە نییە.

* چاکسازان زۆرێکیان سەرقاڵی ڕێگرین لە خراپە بەڵام بە گوێرە و ویستی لە پێشینەی کاربەدەستان، نەوەک بە گوێرە و ویستی لەپێشینەی بابەتەکان لە ئاییندا، ئەمانە ڕوو دەکەنە چەسپاندنی هەق بەڵام لە ئاڕاستەیەکی هەڵەوە.

* ڕێگری مەکە لەهەڵەیەکی بچووک لە کاتێکدا ڕێگریت لە هەڵەی گەورە فەرامۆش کردووە......ئەو کارەش لەپێناو کەسێکدا بکەیت کە ئەوەی لێ خواستوی، یان بەڕێی ئەوانەدا بڕۆیت کە پێوانەکانیان لێ شێواوە، خودا چەندان پێوانەی لەنێوان تۆ و خەڵکیدا داناوە پێویستە کار بەو پێوانانە بکەیت.

* هەق بوونی شتگەلێک لە خودی خۆیاندا واتای ئەوە ناگەیەنێت کە دەبێت مرۆڤ پێوەی سەرقاڵ ببیت.

* لە گەورەترین و ئاشکراترین هەڵەکان ئەوەیە، بابەتە لەپێشینەکانی ئایین بەپێی سیاسەت ڕێک بخرێت، نەک سیاسەت ڕێک بخەیت بە گوێرەی بابەتە لەپێشینەکانی ئایین، سیاسەت هۆکارێکە بۆ چەسپاندنی هەق نەک خودی خۆی ئامانجی سەرەکی بێت.

* مرۆڤی ڕاستگۆ هەرکات خودا ویستی ئەوکاتە هەق دەردەخات، نەوەک چاوەڕوانی ویستی خەڵکی و ڕووداو و سیاسەت بکات بەگوێرەی ئەوان هەق دەربخات.

* ترسناکترین مەبەستی تەماشاکارانی فکر و بیروباوەڕەکان، ئەوەیە مێشکیان سەرقاڵ ببێت بە ویست و کێشەی تاکە کەسییەوە، وەها نیشانی

بدەن بابەتێکی گشتییە و کێشەی هەموو کۆمەڵگایە، بەو هۆیەوە بابەتگەلێک زیندوو دەکەنەوە کە لە هزری خەڵکیدا بیرچوونەتەوە.

* هیچ یاسا و شەریعەتێک لە شەریعەتی خودا باشتر نییە، هیچ کەسیش باشتر و بەتواناتر نییە لە پەیامبەران، کەچی دەبینیت بە پلەبەندی بابەتەکانیان بۆ هاتووە ئەمەش هۆکاری کەمی نییە لە پەیامەکەدا، بەڵکوو هۆی لاوازی ئەقڵەکانە، چونکە ئەوەی بە خێرایی وەرگیرێت، بەخێرایی وازی لێ دەهێندرێت.

* هاوارکردن لە ناو خەڵکیدا بەبێ بەڵگە خەڵکانێکی زۆر بەخێرایی کۆدەکاتەوە، بەڵام چەندە خێرە بەرەوڕووی بڕۆن ئاوا دەگەڕێنەوە، بەڵام بانگکردنی خەڵکی بە شێنەیی و لەسەرخۆیی بە دەرخستنی بەڵگەوە هەرچەندە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی بەلاوازی ڕووی تێ بکەن و بەرەو ڕووی بڕۆن بەڵام وادەکات بەردەوام ببن هەرچەندە ژمارەشیان کەمیش بێت، بانگەوازیی پەیامبەران هەر بەم جۆرە بووە.

* داشکاندن ناکرێت بۆ ئەو کەسانەی لەسەر ناهەقین، بەڵکوو لەگەڵیدا ڕێ دەکرێت تاکوو چاک دەبێت، چونکە ئەگەر داشکاندان لە هەندێک بابەت بکەیت، هەمووی لەدەست دەدەیت.

* ئەگەر بە بەشێکی کەم لە هەق دەست پێبکەیت و بەرەو بەرزی بڕۆی، باشترە لەوەی لەسەرەوە دەست پێ بکەیت و داڕمێیت و سەرەوە و خوارەوەش بشێوێنیت.

* چاکسازی دەوڵەت و کۆمەڵگا لادەرەکان لەلایەن لاوازەکانەوە لە خوارەوە بە پلەبەندی ئەنجامی دەدەن تاکوو دەگەنە لوتکەی هەڕەمەکە، چونکە کەم جار چاکسازی بە پێچەوانەوە دەکرێت، بەو جۆرە لە قورئاندا هاتووە و مێژووش بۆی تۆمار کردووین.

* پێویستە خاوەن پەیامەکان ژیانێکی هاوشێوەی خەڵکی بژین، هەرچەندە ژیانیان نزیک بێت لە خەڵکییەوە، وتەکانیان زیاتر دەچسپێت، خودا دەربارەی پەیامبەرەکەی دەفەرمووێت: ﴿يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ﴾ [المؤمنون: ٣٣] «لەوە دەخوات کە ئێوە لێی دەخۆن و لەوە دەخواتەوە کە ئێوە لێی دەخۆنەوە.»

* ئەگەر زانایان هەنگاوێک لە خەڵکی گشتیی دوورکەوتنەوە، ئەوانیش بەهەمان ئەندازە لێی دوور دەکەونەوە. هەر بۆیە پەیامبەری خودا (ﷺ) لەگەڵ بچووک و گەورە و ئازاد و کۆیلە و دەوڵەمەند و هەژاردا ژیانی بەسەر دەبرد.

* ناکرێت بەهۆی ڕێگری لە خراپەوە، تۆمەت بخرێتە پاڵ نییەتەکان و نییەتەکان بخوێندرێنەوە، خالیدی کوڕی وەلید دەڵێت: چەند نوێژخوێن هەیە بە زوبانی شتێک دەڵێت کە لە دڵیدا بوونی نییە، پەیامبەری خوداش (ﷺ) فەرمووی «من فەرمانم پێ نەکراوە دڵی خەڵکی بپشکنم.»

* بانگەوازی هەندێک لە خەڵکی دروستە، بەڵام خۆی خراپی دەکات بە زیادەڕەوی کردن تیایدا بەو هۆیەوە خەڵکانێک لێی دوور دەکەونەوە و وازی لێ دەهێنن، یان خۆی زۆر شلڕەوی تێدا دەکات لە گەیاندنیدا بە خەڵکی و بەو هۆیەوە لەناو دەچێت.

* بانگخوازەکان ئەگەر تەنها باسی مژدەکان بکەن بەبێ باسکردنی سزاکان یان بە پێچەوانەوە، ئەوا بابزانن پێچەوانەی بانگەواز و ڕێبازی هەموو پەیامبەران کاریان کردووە: ﴿مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ﴾ [فصلت: ٤٣] «ئەی پێغەمبەر (ﷺ) شتێک بە تۆ ناوتریت کە بە پێغەمبەرانی پێش تۆ نەوترابێت، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ خاوەنی لێبوردن و لێخۆشبوونە بۆ باوەڕداران و تۆڵەسێنەری بەئازار و ئێشە لە بێباوەڕان.»

* ئەگەر کەسانێک لە پەیڕەوی بانگەوازییاندا لێپرسینەوەیان لە سەر خراپە لابردبوو، ئەوا بانگەوازەکەیان بە کەمخێر هەژمار دەکرێت: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ [آل عمران: ١٠٤] «دەبێت لەناو ئێوەدا کۆمەڵێک ببێت، بانگەواز بکەن بۆ چاکە، فەرمان بدەن بە هەموو چاکەیەک و بەرگری بکەن لە هەموو خراپەیەک.»

* ئاشووب و تاقیکردنەوە زیاتر بەرۆکی ڕێگریکار لە خراپە دەگرێت وەک لە فەرماندەر بە چاکە، بۆیە هەندێک لە چاکسازان واز لە ڕێگری لە خراپە دەهێنن، تەنها فەرمان بە چاکە دەکەن تاکوو پارێزراو بن، بەمەش پەیامەکەیان دەشێوێت.

* شەریعەت لەسەر دوو بەشە: کردن و نەکردن. مرۆڤ حەز دەکات کردەوە بکات نەک کۆمەڵە کردەوەیەک نەکات، چونکە وازهێنان وازهێنانە لە ئارەزووەکان و کردن کردنی ئەو کارانەیە کە دەروون دەیخوازێت و پێی خۆشە ئەنجامی بدات، هەندێک لە بانگخوازان شلگیری دەکەن لە ڕێگرییەکاندا و بەپێی ویستی خەڵکی دەڵێن: حەرامە و دروست نییە. زۆر ئاسان و شلگیرانە دەیڵێن، بەڵام بە گڕوتینێکی زۆرەوە باسی فەرمان پێکراوەکان دەکەن تەنانەت ئەگەر سونەتیش بێت، تاکوو خەڵک بە لای خۆیدا کۆ بکەنەوە لەسەر حسابی ئایینەکەیان، ئەگەر کەسێک بە ئەمین دابندرێت لەسەر ماڵ و سامانێک، ئەوا لە ئەمانەتپارێزی نییە، ئەگەر تەنیا هەواڵی قازانجیان پێ بدەیت و زیانەکانیان لێ بشارێتەوە هەرچەندە پێشیان ناخۆشبێت. جا بزانە پاراستنی ئایینی خەڵکی گرنگترە لە پاراستنی ماڵ و سامانیان. لە کاتی کێشانی چاکە و خراپەکانیشدا لە ڕۆژی دوایدا، جیاکردنەوە بەپێی سەرکەوتنە، خەڵکی بەو هۆیەوە بانگخوازی ڕاستگۆ و فێلباز جیادەکاتەوە لە یەکتری، وەک چۆن بازرگانی فێڵباز و ڕاستگۆ بە قازانجیاندا جیادەکەنەوە.

* ئیسلام یاسا و ڕێکخەری ئوممەتە، لابردنی لە دەروونداا زۆر سەختە. چونکە هاوتای سروشتی مرۆڤ دابەزیوە، بەڵام ڕاگەیاندن وەها دەری دەخات کە ئیسلام تەنها ئاکار و ڕەوشت و پەروەردەیە و لە هەوڵدان ئەو جۆرە بانگخوازانە دەربخەن تا لایەنە گەورەکەی ئیسلام بشارنەوە.

* چاکسازی بەتەواوی نایەتە جێ لەسەر خراپەکاران تەنها بە ڕوانینی بۆ هەموو لایەنەکانی نەبێت لە کات و شوێن و ئەندازە و جۆر و شوێنەواری کاریگەریەکانی. چاکسازی دەرمانە، ئەگەر چارەسەری هەموو نەخۆشەکان بە یەک جۆر دەرمان بکرێت، ئەوا زۆریان دەمرن.

* لە تەواو هێنانەجێی هەق نییە تەنها هەق ئەنجام بدەیت و بەس. بەڵکوو هێنانەجێی هەق بەوە دەبێت هەق ئەنجام بدەیت لە شوێنی دیاری کراوی خۆیدا، چونکە هەموو پۆشاکێک گونجاو نییە هەموو خەڵکی خۆیانی پێ برازێننەوە، هەروەها هەموو وتە باشەکانیش گونجاو نیین بۆ هەموو ڕووداوێک بگوترێن.

* بانگەوازی پەیامبەران و چاکسازییان بە نهێنی و ئاشکرا بووە بەگوێرەی بەرژەوەندیی بابەتەکە، هەرچی باسکردن و ئاشکراکردنی تاوان لەلایەن تاوانبارانەوە، لە بانگەوازی پەیامبەران نەبووە هەمووی بە نهێنی ڕێگریان لێ بکات و بە ئاشکرا ڕێگری نەکات.

* ئەگەر بە ئاشکرا ئامۆژگاری کەسێک کرا لەسەر تاوانێکی کە بەنهێنی ئەنجامی داوە و ئەو کارە بووە هۆی ئەوەی تاوانەکە بە ئاشکرا ئەنجام بدات، ئەو کەسی ئامۆژگاریکار تاوانی خۆی و ئەویشی لە ئەستۆدا دەبێت: ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا﴾ [النساء: ٦٣] «کەواتە ڕوویان لێ وەرگێڕە و ئامۆژگارییان بکە بڵێ پێیان دەربارەی خۆیان وتەیەکی ڕەوان و کاریگەر.»

* هەرکەس تاوانی بە پەنهانی کرد کە هەرچەندە گەورەش بێت، ئەوا نابێت بە ئاشکرا ئامۆژگاری بکرێت نەوەک بەو هۆیەوە لە ڕقدا ئەنجامی بدات: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلَۢا بَلِيغًا﴾ [النساء: ٦٣] «ئەوانە کەسانێکن خوا دەزانێت چی لە دڵیاندا هەیە، کەواتە ڕوویان لێ وەرگێڕە و ئامۆژگارییان بکە بڵێ پێیان دەربارەی خۆیان وتەیەکی ڕەوان و کاریگەر.»

* بەکارهێنانی ئامۆژگاری بە شێوەی ئاشکرا و نهێنی لە چاکسازیدا ڕێبازی پەیامبەران بووە، بەگوێرەی حاڵ و پێویستی گۆڕیویانە. نووح فەرمووی: ﴿ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا (٨) ثُمَّ إِنِّيٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا﴾ [نوح: ٨-٩] «لەپاشان بەئاشکرا بانگم کردن. ئینجا (دەمێک) بۆم ئاشکرا دەکردن (دەمێک) بۆم پەنهان دەکردن بە پەنهانکردنێکی تەواو.»

* ئەگەر خراپە بەئاشکرا ئەنجامدرا، ئەوا بە ئاشکرا ڕێگری لێ دەکرێت، پاراستنی شکۆی ئایین گەورەترە لە پاراستنی شکۆی خەڵکی.

* ئازادی تاکەکەسی نابێت بقۆزرێتەوە بۆ ئەنجامدانی تاوان بە ئاشکرا، ئوممەت وەک کەشتییەک وایە، ئەگەر خراپەکار خۆی لە کەشتییەکەوە فڕێ بداتە ناو ئاوەوە بێ مەترسیترە لە کونکردنی کەشتییەکە، چونکە تاوانێکی بچووک کە گشتی بێت گەورەترە لە تاوانێکی گەورەی تاکەکەسی.

* ئەگەر کەسێک ئامۆژگارییەکی زۆری کرد لەسەر خراپەیەک کە پێویستی بە ئەوەندە ئامۆژگاری کردن نەبوو، ئەوا ئەو کارە بەهۆی نەزانیی یان ئارەزوویەکی شاراوە لە دەروونی ئامۆژگاریکاردا ڕووی داوە. ئەمەش وادەکات کەسی ئامۆژگاریکراو ئامۆژگارییەکە وەرنەگرێت و گومانی خراپ ببات بە ئامۆژگاریکار و خراپەکەی خۆی سەربخات.

* ئەو کەسەی ڕاهاتبێت لەسەر دیتنی خراپە و ڕێگری لێ نەکات و پێی ناخۆش نەبێت تەنانەت لە دڵیشدا، ئەوا ئەو کەسە بێئیمانە یان ئیمانی لاوازە هەرچەندە خواپەرستیش بێت، لە فەرموودەدا هاتووە: «ئەگەر نەیتوانی، با بەدڵی پێی ناخۆش بێت، ئەوەش لاوازترین ئیمانە.»

* ئەگەر نەت توانی خراپەیەک بگۆڕی، ئەوا هاونشینی مەکە، چاکساز کردارەکانی دەبنە پشتگیری وەک چۆن بە وتە پشتگیری دەکات، خودا ڕێگری لە پەیامبەر کرد بچێتە ناو مزگەوتی ضرارەوە لە کاتێکدا مزگەوت بوو ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا﴾ [التوبة: ١٠٨] «هەرگیز نوێژی تێدا نەکەی.»

* بەربەستێک لە بەربەستەکانی بەردەم کەسی چاکسازی خودا ویستدا، ئەوانەن کە لە ڕاست و چەپیی دان لە گرووپە جیاوازەکان کە بەژداری دەکەن لە ئامۆژگاریەکانیدا، جا بە هۆیانەوە وێنایەک بۆ کەسایەتی چاکساز دادەنرێت بە پێوەری کەسانی چواردەوری، وەک چۆن وێنای گەشتیارێک دەکرێت بە کەسانی هاوەڵی لە گەشتەکەیدا.

* یەکەم سیفەتی پەیامبەر لە پەرتووکەکانی پێشودا بریتی بووە لە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە: ﴿يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ [الأعراف: ١٥٧] «ئەو کەسەی کە (نامەدارەکان) دەیبینن بە نووسراوەیی لایانە لە تەورات و ئینجیلدا کە فەرمانیان پێ دەکات بە چاکە و ڕێگرییان لێ دەکات لە خراپە.»

بۆیە خاوەن پەرتووکەکان و دووڕووەکان ڕەقیان لێی بوو.

* تەنها ئەوانە ڕقیان لە فەرمانکردن بە چاکەیە کە وازیان لە چاکە هێناوە و ڕەقیان لێیەتی، ئەوانەش ڕقیان لە ڕێگرییە لە خراپە کە خۆیان خراپە ئەنجام دەدەن و خۆشیان دەوێت، خودا هەردووکیان لە وەسفی دووڕوواندا باس کردووە.

* تەنها ئەوانە دژایەتی چاکسازان دەکەن کە خراپەیەکیان هەیە و دەترسن لە دەستی بدەن.

* «دەزگای فەرمانکردن بە چاکە» هێز و پێگەی خۆیان هەیە خودا بەهۆی ئەوانەوە چەندین فیتنە و شەڕی لاداوە، ئەوانەی لە دەرەوەن بێتوانا بوون لە زیانگەیاندن پێیان، بەڵام ترسی ئەوە هەیە لە ناوخۆدا تووشی فیتنە بکرێن.

* ڕەتکردنەوەی ئامۆژگاری تاوانێکی گەورەیە، هەندێک جار تاوانی ڕەتکردنەوەکە گەورەترە لە تاوانی ئامۆژگاریکراو، ئیبن مەسعوود دەڵێت: "گەورەترین تاوان ئەوەیە مرۆڤ بە براکەی بڵێت: لەخوا بترسە، ئەویش بڵێت: تۆ خۆت لەخوا بترسە، تۆ فەرمانم پێ دەکەیت؟"

* گەورەترین شت کە ڕێگای ئامۆژگاری دەگرێت، ئەوەیە کە ئامۆژگاریکراو گومانی خراپ بە کەسی ئامۆژگاریکار ببات.

* ئەگەر کەسی ئامۆژگاریکراو گومانی خراپی بە کەسی ئامۆژگاریکار برد، ئەوا ئەو ئامۆژگارییە لە چاکسازییەوە دەبێتە فیتنە بۆی.

* ئەگەر ئامۆژگاریکراوان ئامۆژگارییان پێ ناخۆش بوو، ئەوا دەستپێشخەری دەکەن بۆ هاتنی سزا بۆیان، کۆتا وتەی سالح پێش ئەوەی سزا بۆ قەومەکەی دابەزێت: ﴿يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ [الأعراف: ٧٩] «ئەی گەلەکەم سوێند بە خوا بەڕاستی پەیامی پەروەردگارم پێ ڕاگەیاندن و ئامۆژگاریم کردن و دڵسۆزبووم بۆتان، بەڵام ئێوە ئامۆژگار و دڵسۆزانتان خۆش ناوێت.»

* هەڵبژاردنی ئەو کەسەی کاری لێپرسینەوە «فەرمان کردن بە چاکە» دەکات وەک هەڵبژاردنی سەرکردەیە، ئەگەر مەرجەکانی تێدا بێتە جێ کە خودا دایناوە، ئەوا بە هیچ جۆرێک لە کارەکەی دوور ناخرێتەوە و پەک ناخرێت،

خەلیفە موعتەضد پرسیاری لە کەسێک کرد کە داندرابوو بۆ فەرمان کردن بە چاکە: کێ تۆی هەڵبژاردووە بۆ ئەم کارە؟ گوتی: ئەوانەی تۆیان هەڵبژاردووە.

* یەکەم هەنگاوی خراپەکاری لە ئوممەتاندا دەربڕینی ئەو خراپەیە بووە بە وتە پاشان ئەنجامدانی پاشان پاراستنی پاشان دژایەتیکردنی ئەو چاکسازانەی کە دژیان دەوەستنەوە. ئەمە ئاخر هەنگاوی دژایەتییە، جا یان ئەو گەلە دەگەڕێتەوە یان هەرەس دەهێنێت!

* سزای پەکخستنی ئامۆژگاری و چاکسازی «فەرمان دەکەن بە چاکە و ڕێگری دەکەن لە خراپە، یاخود خودا سزایەکتان بهێنێتە سەر، پاشان بپاڕێنەوە و دواکەتان وەرنەگرێت.»

* خودا سزای خۆی بۆ سەر ئوممەتان دادەبەزێنێت بەپێی جەنگکردنیان لەگەڵ فەرمانکاران بە چاکە و ڕێگری کاران لە خراپە، ﴿وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِٱلْقِسْطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ [آل عمران: ٢١] «پێغەمبەران بەناڕەوا دەکوژن ئەو کەسانە دەکوژن کە فرمان دەدەن بە داد لە خەڵکی ئەوە موژدەیان بدەرێ بە سزای پڕ لە ئازار.»

# بەڵگە و هەواوئارەزوو

* جیاکاری نێوان مرۆڤ و ئاژەڵەکان بە تێگەیشتن و شوێنکەوتنی بەڵگەکان پەیدا دەبێت، نەک بەتەنها گوێبیستبوون بۆ بەڵگەکان، چونکە هەمووان دەبیستن: ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ [الفرقان:٤٤] «ئایا وا دەزانی زۆربەی ئەوانەی دەبیستن یا تێدەگەن، ئەوانە هەر وەک ئاژەڵن بەڵکوو ئەوان گومڕاتریشن.»

* مرۆڤ هەرچەند زیاتر ڕێگەی هەقی لا ڕوون بێت، زیاتر بەڵگەی لەسەر دەچەسپێت، بە هەمان شێوە تا بەڵگەکان ڕوونتر بێت لای مرۆڤە شلگیرەکان، دابەزینی سزا بۆیان خێراتر و توندتر دەبێت، خۆ ئەگەر بەڵگەکان لە مێشکی کەسێکدا لاواز بوو یان تێگەیشتنی بۆی لاواز بوو، ئەوا دابەزینی سزا بۆی لاواز دەبێت. ئەگەر بەڵگە و ڕوونکردنەوەکان بوونیان نەبوو، ئەوا سزاش بوونی نامێنێت، بۆیە خودا دەفەرموویێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ [الإسراء: ١٥] «ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین بۆیان.»

* هەق بە بەڵگە دەچەسپێت نەک بە هێز: ﴿وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ﴾ [الأنفال: ٧ ] «بەڵام خوا دەیەوێت وتەکانی خۆی بە ڕاست دەرچێت و حەق دەرکەوێت.»

هێز دەبێتە هۆی پارێزگاری و شوورا بۆ هەق، نەک چێنەری تۆوی هەق.

* هێز هەق دروست ناکات، بەڵکوو هەق دەتوانێت هێز دروست بکات.

* ئەو کەسەی قورئان بەس نەبوو ببێتە بەڵگەی هەق بۆی، ئەوا عەقڵیشی تەنیا سەرگەردانی بۆ زیاد دەکات: ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ [العنكبوت: ٥١] « ئایا بۆ ئەوان بەس نییە کە ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا.»

*چرووکیی دەروون تەنانەت لە بەڵگەشدا بوونی هەیە. کەسانێک بۆچوونی خۆیان بە بەهێز دەبینن هەرچەندە لە ڕاستیشدا لاواز بێت. هەروەها بۆچوونی کەسانی دیکەش بە لاواز دەبینێت، هەرچەندە بەهێزیش بێت: ﴿وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ﴾ [النساء: ١٢٨] «هەرچەندە چرووکی و ڕەزیلی تێکەڵاوی دەروونەکان کراوە.»

* هەر بەڵگەیەکی ئیلاهی کە مرۆڤ بوەستێت لە باوەڕهێنان پێی، دەبینی هەر ئەو مرۆڤە باوەڕ بە بەڵگەیەکی لاوازتر دەهێنێت ئەگەر بێت و لە بەرژەوەندیی خۆی بێت، ئەمەش چرووکی بیر و فکرە: ﴿وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ﴾ [النساء: ١٢٨]

«ئەمە هەواوئارەزوویەکە لە بەرگی بەڵگەدا.»

* ناکرێت بەڵگەکانت خاوەن پێگە و هێز بن بەهۆی ئەوەی خۆت کەسێکی خاوەن پێگە و هێزی.

* بەتەنها هەبوونی بەڵگە بەس نییە، چونکە ئەوانەی بەرد و ئەستێرە و مانگا و مشک دەپەرستن بەڵگەی ئەقڵی و گوفتاریشیان هەیە بۆ ئەو کارەیان کە بە بەڵگەی بەهێزی دەخەملێنن، بەڵام گرینگ ئەوەیە بزانیت وەحی و سرووش دەربارەی ئەو بەڵگەیە چۆن بڕیاری داوە.

*وتەی درۆ و چەواشەکاری هەرچەندە زۆریش بێت لە بەرانبەر بەڵگەی هەقدا خۆی ناگرێت: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ

وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ [التوبة: ٣٢] «دەیانەوێت ڕووناکی (ئایینی) خوا بکوژێننەوە بە فووی دەمیان. خوداش نایەوێت بێجگە لە ڕووناکی خۆی تەواو بکات و سەرکەوێت، هەرچەندە بێباوەڕان پێیان ناخۆش بێت.»

* خەڵکی لەگەڵ بەڵگەکان بە جۆرێک مامەلە دەکەن، هاوشێوەی پیشەوەر لەگەڵ مادده خامەکان، بەو جۆرەی بیانەوێت بەڵگەکان بەکاری دەهێنن، هەرکەس جۆری موادە خامەکەی و بنچینەکەی بزانێت، ئەوکات بەهای ئەو ئاگرە دەزانێت کە مقدەکەی پێ شل دەکاتەوە، جا موادەکە هەر جۆر و شێوازێک بێت.

* لەنێوان مێشک و هزرەکاندا دووریی هەیە وەک چۆن لەنێوان جەستەکاندا بوونی هەیە، ئەگەر لە یەک نزیک نەبنەوە، گوێبیستی یەکتری نابن، بەڵگەکەت دەرمەخە بۆ ئەقڵێک کە لە بۆچوونی ئەودا بە بەڵگە هەژمار ناکرێت، ئەو کەسەی هزری لە تۆ دوورە لە حەرامییێتی تێکەڵاوی تێناگات لەکاتێکدا زینا بە حەڵاڵ دەزانێت.

* زۆرترین موناقەشەکان بۆ ڕوونکردنەوەی بەڵگەکان نین، بەڵکوو بۆ چەسپاندنی بەڵگەکانن، بەڵگەکان ڕوونن، سەرکەشی تەنها لە تێگەیشتن و واتای بەڵگەکەدایە، ئەبوو یوسف دەڵێت: "جێگیرکردنی بەڵگە لەسەر نەزان ئاسانە، بەڵام وەهای لێ بکەیت داننانی پێدا بنێت، ئەوە کارێکی ئەستەمە.

* ﴿وَمَا نُرِيهِم مِّنۡ ءَايَةٍ إِلَّا هِيَ أَكۡبَرُ مِنۡ أُخۡتِهَا﴾ [الزخرف: ٤٨] «هیچ بەڵگەیەکمان نیشان نەداون مەگەر ئەو بەڵگەیە گەورەتر بوو لە هاوتاکەی.»

لە کاتی مناقەشە و سەلماندنی بەڵگەدا، وا باشە بەڵگە بەهێزەکان دوا بخرێت و بە بەڵگە لاوازەکان دەست پێ بکرێت، تاوەکوو کەسانی پێچەوانە هەموو شوبهە و گومانەکانیان دەربخەن، جا ئەوکات بە ڵگە بەهێزەکان دەهێندرێت.

* هەندێک جار بەڵگەی بەهێز لە کەسێکی گومڕا و نەزانەوە دەردەچێت، بزانە ئەو کەسە خاوەنی ئەو بەڵگەیە نییە، بەڵکوو شەیتان پێی ڕاگەیاندووە: ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡ﴾ [الأنعام: ١٢١] «بێگومان شەیتانەکان بەنهێنی شت بە دۆستانیان دەڵێن بۆئەوەی موجادەلە و دەمەدەمێتان لەگەڵ بکەن.»

بۆیە سونەتە (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) بڵێیت لە کاتی مناقەشە کردن لەگەڵیاندا.

* هەندێک لە بۆچوونە باتڵەکان بە بەڵگە ڕەت دەکرێنەوە، هەندێکیشیان تەنها خۆ پەنادانی بە خودا لە شەیتان بەسە، چونکە لە بەشێک لە وەحی و سرووشی شەیتانن هەژماردەکرێن: ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡ﴾ [الأنعام: ١٢١]

* هەر بەڵگەیەک کە ئەستەم بوو بتوانیت بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە، ئەوە بێدەنگبوون لێی باشترە لە باسکردنی، بەڵگەی مەریەم بەهێز بوو بەڵام تێگەیاندن و ڕوونکردنەوەی قورس بوو بۆ مێشکەکان: ﴿إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمًا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيًّا﴾ [مريم: ٢٦] «بەڕاستی من قسەکردنم لەسەر خۆم نەزر کردووە بۆ (خوای) میهرەبان، لەبەرئەوە ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ کەسێکدا ناکەم.»

* موناقەشە لەگەڵ خاوەن باتڵەکان مەکە هەرچەندە بەڵگەشت لابێت، تا ئەو کاتەی توانای تەواو بەکارهێنانی بەڵگەکانت دەبێت، ئەم کارەش لە ترسانمان نییە لە هەق، بەڵکوو ترسمان لە تۆیە، هەندێک جار مرۆڤ بە گۆچان دەکوژرێت لە کاتێکدا کوژراوەکە شمشێری بەدەستەوەیە، بەڵام نازانێت جوان بەکاری بهێنێت.

* کاتێک بتەوێت لادان و گومڕایی گرووپە لادەرەکان ئاشکرا بکەیت، ئەوا زیاتر پێویستت بە بەڵگەی نەقڵییە وەک لە بەڵگەی ئەقڵی، تەنها مەزهەبی ڕافیزەکان نەبێت کە تەنها ئەقڵ بەسە بۆ ڕەتدانەوەیان!

* مادەگەرکان هێزی بەڵگە و هەقیان لە پێشچاو ونە، کافرانی قورەیش وا گومانیان دەبرد هەر کە پەیامبەر وەفاتی کرد، پەیامەکەی بە کۆتا دێت، چونکە منداڵی کوڕی نییە تا بەردەوام بێت لەسەر ڕێبازەکەیی، بە دوابڕاو وەسفیان دەکرد. بەڵام خودا ناوی پەیامبەری بەزیندووی هێشتەوە و ئەوانیش ناویان سڕایەوە لەگەڵ ئەوەی چەندان وەچە و نەوەیان هەبوو.

* هەواوئارەزوو مرۆڤ کوێر دەکات لە دیتنی بەڵگە و هەق، هەرچەندە ئەو بەڵگەیە بەهێز بێت، ئەوا لە دەروونی ئەو کەسەی هەواوئارەزووی تێکەڵ بووە بە لاواز دەیبینن: ﴿قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ﴾ [هود: ٥٣] «وتیان ئەی هوود تۆ هیچ بەڵگەیەکی ڕوونت بۆ نەهێناوین، بۆیە ئێمەش واز لە پەرستراوەکانمان ناهێنین لەبەر قسەی تۆ.»

* ئەگەر کەسانی پێچەوانە باوەڕیان بە بەڵگەکانت نەهێنا و نەهاتنە سەر ڕێگەی هەق، ئەو کارەیان ئەوە ناگەیەنێت وتەکانت هەڵەیە. هەندێک لە پەیامبەران هیچ کەس باوەڕیان پێی نەهێناوە، شێوازی بانگەوازییان گۆڕیوە، بەڵام بنچینە و ڕێبازی هەقیان نەگۆڕیوە بۆ دەسخستنی شوێنکەوتوو.

* گەورەترین بەڵگەکانی گەردوون بەڵگەی چەسپاندنی بوونی خودایە، کەچی خەڵکی ناکۆکییان تێ کەوت و دانیان پێدا نەنا، تۆ ئەی مرۆڤ ناتوانیت بەڵگەکانت بچەسپێنیت وەک چۆن خودا بەڵگەکانی چەسپاندووە، ئەگەر هەق لە لات چەسپی، ئەوا با نەیارەکانت نەبنە ڕێگر بۆت.

* باوەڕ نەهێنانی خەڵکی بەو هەقەی بانگەشەی بۆ دەکەیت، وات لێ نەکات گومان و لادانت بۆ دروست بکات و لابدەیت لە هەق، هەندێک لە خەڵکی

ڕەتکردنەوە و باوەڕنەهێنانیان تەنها بەهۆی سەرکەشی و مل هوڕییانەوەیە لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا تۆ بەڵگەت بەهێزتر نییە لە پەیامبەران: ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ [آل عمران: ١٨٤] «جا ئەگەر باوەڕیان پێ نەکردی، ئەوا بێگومان بڕوا نەکراوە بە پێغەمبەرانی لەپێش تۆوە هێناویان بە بەڵگە ڕوونەکان.»

* بەڵگەی گومڕاکان دووبارە و سواوە، بەڵام شێوەی دەربڕینەکانی دەگۆڕن و تازەی دەکەنەوە، هەمان هەڵەی ئوممەتانی پێشوو دووبارە دەکەنەوە: ﴿كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ تَشَٰبَهَتْ قُلُوبُهُمْ قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ [البقرة: ١١٨] «ئەوانەی کە لەپێش ئەمانیشدا بوون هەمان شتیان دەوت، دڵ و دەروونیان لە یەک دەچێت، بێگومان نیشانەی زۆرمان باسکردووە بۆ کەسانێک کە بەشوێن دڵنیاییدا دەگەڕێن.

* ئەقڵ هیچ بەڵگەیەکی نوێیی نەهێناوە بۆ ڕەتکردنەوەی وەحی و سرووشی خودا، هەموو بەڵگە تازەکان بەڵگەی گەلی: نووح، عاد، سەموود، ئیبراهیم، لووط، مووسا، عیسا و موحەممەد بوون، بەس تەنها شێوازی دەربڕینەکەیان گۆڕیوە.

* بەڵگەی هیچ کەسێکم نەبینیوە هێنابێتی بۆ چەسپاندنی ناهەقییەک کە لەوەو پێش بوونی نەبووبێت، تەنها ئەوەیە شێوازی دەربڕین و زمانیان جیاوازە، ئەمەش دەکەنە هۆکار بۆ گۆڕینی ئەو هەڵەیەی کە دەیانەوێت بیچەسپێنن.

* دەوترێت زۆرینەی خەڵکی و کۆمەڵگاکان ئەو کارە دەکەن! جیاوازی ئەم وتەیە و بەڵگەی گەلانی پێشوو چییە کە لە بەرانبەر پەیامبەرانیان بەکاریان هێناوە، خودا بۆمانی ڕوونکردووەتەوە و دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ [هود: ١٧] «بەڵام زۆرینەی خەڵکی بڕوا ناهێنن.»

* دەڵێن: زۆرینەی خەڵکی ئەو کارە دەکەن. هەق بە ژمارەی شوێنکەوتووانی ناناسرێت، لە هەموو کاتێکدا زۆرینە بۆچوونێکی جیاوازی هەبووە لە بۆچوونی سەردەمی دوای خۆی، جا ئایا هەق هەڵدەگەڕێتەوە بۆ دەستخستنی شوێنکەوتووان؟!

* هەق سەربەخۆیە. لە هەر شوێنێک زۆرینە بەدی کرا، مەرج نییە هەق بەدی بکرێت، ئەگەر سەردەم و سەدەکان لەدەست مرۆڤێکدا وەک پەرتووک بوونایە، هەر پەڕەیەک سەدەیەک بووایە و مرۆڤ هەڵی دابایەوە، دەبینێت هەموو سەردەمێک زۆرینە بوونی هەبووە، جا ئایا هەق هەڵدەگەڕێتەوە بە هەڵگێڕانەوەی دەستی؟!

* ژمارە زۆری دوژمنان و کەسانی نەیار هیچ کاریگەریەک ناخاتە سەرهەق، تەنها لای دەروون لاوازەکان و ئارەزووبازەکان نەبێت: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا۟ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا﴾ [الفرقان: ٥٠] «سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە بە چەند جۆر ئەم (ئیشانە)مان گۆڕی لەنێوانیاندا، تا بیربکەنەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی، جگە لە سپڵەیی (بێباوەڕی) هیچیان ناوێت.»

* هەق دروشمێک نییە زۆرینە جێبەجێی بکەن، خودا هەرکات بە زۆرینە ئوممەتێکی لە قورئاندا باس کردبێت، ئەوا گومڕایی داوەتە پاڵیان. خودا نزیکەی حەفتا جار لە قورئاندا ئەو بابەتە دووبارە کردووەتەوە.

* مانۆڕی سەربازی تەنها بە زۆری ژمارە نایەتە جێ، بەڵکوو بە بەهێزی ئیمان و بەڵگە و سەلماندن دەبێت: ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا﴾ [التوبة: ٢٥] «لە ڕۆژی حونەینیشدا (یارمەتیدان) کە بە زۆری خۆتاندا دەنازن، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو بۆتان.»

* ئەگەر بۆچوونی زۆرینە لە پێش بووبا، ئەوا دەبوو بۆچوونی گەلی لووط لە بۆچوونی لووط لەپێشتربێت و فیرعەون لە مووسا لەپێشتر بووبا، و ئەبوو جەهل

لە پەیامبەر لە پێشتر بووبا. ڕەچاوی زۆرینە دەکرێت، بەڵام ئەگەر پێچەوانەی هەق بوو ئەوکات هیچ بەها و ئەرزشێکی بۆ داناندرێت.

* هەندێک لە خەڵکی لە هەق ڕادەکەن بەهۆی کەمی شوێنکەوتووانییەوە، هەروەها فریو دەخۆن بە زۆری ژمارەی ناهەقان، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی پەیامبەرانی لەسەر هەق چەسپاندووە هەرچەندە تەنها بوون، هەروەها ئەبووبکری چەسپاند وەک تاکە شوێنکەوتوو بۆ تاکە پەیامبەرێک.

* ژمارە زۆری ئەوانەی خراپە ئەنجام دەدەن نابنە هۆی گۆڕینی ئەو خراپەیە بۆ چاکە، هەروەها وازهێنانی خەڵکی لە هەق نابێتە هۆی گۆڕانی بۆ ناهەق، هەق هەقە هەرچەندە خەڵکیش وازی لێ بهێنن، ناهەقیش ناهەقییە هەرچەندە خەڵکی ئەنجامی بدەن.

* ﴿وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ﴾ [الأنعام: ١١٦] «ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی زۆربەی ئەوانە بیت کە لەسەر زەویدان، لە ڕێگای خوا گومڕات دەکەن.»

سەرسامبوون بە زۆرینە و پەیوەستکردنی بە هەقەوە هەڵەیەکە هەموو ئوممەتانی پێشووی پێ گومڕا بوون، زمانی ژمارەکان زۆرجار بەکاردێت وەک چۆن نەفامەکان بەکاریان دەهێنا.

* بەڵگەی دروستی بۆ شتێک دەهێننەوە بەوەی خەڵکی لایان قورس و گران بووە سەرەتا لێی دوورکەوتوونەتەوە پاشان هۆگری بوون و کردوویانە، نازانن پەیامبەران کاتێک نێردراون گەلەکانیان هۆگری تاوان بوون لە شیرک و هاوڕەگەزبازی و زینا و ڕیبا.

# فیتنەی شوێنکەوتووان، لاساییکردنەوەی زۆرینە و خاوەن هێزەکان

* ئەگەر بەندکردنی جەستە بە کۆت و زنجیر بێت، ئەوا بەندکردنی ئەقڵ بریتییە لە تەقلید و شوێنکەوتنی کوێرانە.

* شوێنکەوتنی تاکەکان و کەسەکان زۆرجار دەمارگیری و سۆز پەرەی پێ دەدات، بۆیە زۆرینەی پەشیمانییە: ﴿إِذۡ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ﴾ [البقرة: ١٦٦] «کاتێک کە پێشەواکان یەخە هەڵدەتەکێنن لەوانەی (لە دنیادا) دوایان کەوتوون و سزایان (بە چاوی خۆیان) بینی و هەموو پەیوەندییەکیان پچڕایەوە.»

* هیچ کەسێک لە پلەیەکدا ڕامەگرە کە گوێڕایەڵی بکەیت بەبێ بوونی بەڵگە و زانست، ئەوە خوایەتییەکە تەنها بۆ خودا ئەنجام دەدرێت: ﴿وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ [آل عمران: ٦٤] «هەندێکمان هەندێکمان بە پەروەردگار دادەنێین.»

ئەم ئایەتە لە گوێڕایەڵی کوێرانەی خەڵکی بۆ گەورەکانیان دابەزیوە.

* شوێن بۆچوونی هیچ کەسێک مەکەوە لەبەرئەوەی کە ئەو کەسەت خۆش دەوێت، هەروەها پێچەوانەی بۆچوونی هیچ کەس مەکە لەبەرئەوەی ڕەقت لێیەتی، خۆشەویستی تاکەکان و ڕەقلێبوونیان سۆزێکە چاوەکان کوێر دەکات لە هەڵبژاردنی خودی هەقدا.

* خودا هەرتاکێک ڕادەستی ئەقڵی خۆیان دەکات، تا لەسرووش و وەحی تێ بگات، لە ڕۆژی قیامەتیشدا تەنها لەگەڵ ئەقڵ و سرووشدا دەمێنێتەوە، ڕادەستکردنی بۆ هیچ کەسێکی دیکە لێت وەرناگیرێت: ﴿قَالَ لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ﴾ [ق: ٢٨] «خوا دەفەرمووێت: لەلای مندا دەمەقاڵێ و مشتومڕ مەکەن، چونکە بێگومان پێشتر هەڕەشەم (لەبارەیەوە) ناردووە بۆتان.»

* لەژێر سێبەری هیچ کەس مەمێنەوە، چونکە ئەگەر بڕوات سێبەرەکەشی دەڕوات، بەڵکوو لەژێر سێبەری زاتێکدا بمێنەوە کە سێبەرەکەی لاناچێت و ناڕوات.

* فکر و بۆچوونەکان سێبەری خاوەنەکەیانن، بە گۆڕانیان دەگۆڕێن، لە ژێر سێبەری هیچ کەس مەمێنەرەوە ئەگەر ئەو گۆڕا تۆش دەگۆڕێیت.

* لایەنگری بۆ حیزب و شوێنکەوتنی گرووپ و تاقمەکان وا لە مرۆڤ دەکات ئامادەکاری نەمێنێت بۆ دۆزینەوەی وەڵامێکی مەزن و گونجاو بۆ پرسیارە هەرە گەورەکە ﴿وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ [القصص: ٦٥]

«ڕۆژێک دێت خوا بانگیان دەکات و پێیان دەفەرمووێت: ئەوە وەڵامی پێغەمبەرانتان چۆن دایەوە؟»

* ﴿وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ [القصص: ٦٥)

«ڕۆژێک دێت خوا بانگیان دەکات و پێیان دەفەرمووێت: ئەوە وەڵامی پێغەمبەرانتان چۆن دایەوە؟»

﴿وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ -- رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا﴾ [الأحزاب: ٦٧-٦٨] «دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە بە گوێی سەران و گەورەکانمان کرد، ئیتر لە ڕێگای ڕاست گومڕایان کردین. ئەی پەروەردگارمان دوو بەرابەر سزایان بدە و بەر نەفرینی گەورەی خۆتیان بخەیت.»

لاوازترین بەڵگە ئەوەیە بەندە لە لای خودا بوەستێندرێت و خوداش پرسیاری لێ بکات دەربارەی فەرمانەکان و نەهیەکانی لە قورئان و سوننەتدا، پاشان دان بەوەدابنێت کە دیویەتی، بەڵام هەموو بەڵگەکەی ئەوە بێت: گۆمەڵگا وایان گوت و خەڵکی بەو جۆرە بوون.

* تەنها کاتت بەفیڕۆ داوە ئەگەر ئایین لە پیاوانێک وەربگریت کە لە ڕۆژی دوایدا پرسیارت دەربارەیان لێ نەکرێت: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ [القصص: ٦٥]

ئەو کارەساتە گەورەتر دەبێت کاتێک لەناکاو دەبینیت پەرتووکێکت خوێندووە، بەڵام تاقیکردنەوەکەت لەو پەرتووکەدا نەبێت: ﴿فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ [القصص: ٦٦] «ئینجا لەو ڕۆژەدا هەواڵەکانیان (بەڵگەکانیان) لەبیردەچێتەوە، ئەوسا پرسیاریش لە یەکتری ناکەن.»

* زۆرێک لە ئەقڵەکان وەک پۆلە باڵندەن لەپشت کاریگەربوون، بە ڕووداوەکانەوە گوزەر دەکەن، زۆر کەمیان خاوەن کۆنترۆڵی ئەقڵی خۆیانن، بە ئاشکرایی لە قورئاندا هاتووە زۆرینەی دۆزەخییەکان ئەوانەن کە بەبێ بەڵگە شوێنی خەڵکی کەوتوون.

* ئەو کەسەی ئەقڵی پەکبخات لە گەڕان و وەرگرتنی هەق، ئەوا زیاتر سیفەتەکانی لە ئاژەڵەوە نزیک بووەتەوە بە بەرانبەر بە سیفەتی مرۆڤەکانی دیکە: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [الأنفال: ٢٢] «بەڕاستی خراپترینی هەموو گیانلەبەران لەلای خوا ئەو کەڕ و لاڵانەن کە بیرناکەنەوە و ژیر نابن.»

* هەرکەس بۆچوونەکانی بە خەڵکییەوە ببەستێتەوە ئەوا ئەوان چۆن سووڕانەوە، ئەویش دەسووڕێتەوە، چونکە ئەوان جێگیر نیین، هەرکەسیش دڵی وابەستەبێت بە خوداوە، جێگیر و دامەزراو دەبێت لە هەموو کاتەکانیدا لە دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەیدا.

* ئەگەر ڕێی تێ بچووایە شەیتان لە ڕاگەیاندنەوە دەربکەوتایە و خەڵکی توانای ئەوەیان هەبووایە ببینن، ئەوا زۆرترین خەڵک سەیری ئەو کەناڵەیان دەکرد و شوێنی دەکەوتن، هەمان کاریان دووبارە دەکردەوە تا بگەن بەوەی ئەو پێی گەیشتووە. فیتنەی شوێنکەوتن کوێرت دەکات لە دیتنی هەق.

* زۆرینەی ئەو کەسانەی شوێنی هەق دەکەون لاوە تازە پێگەیشتووەکانن، بەڵام گەورەکان سەرکەش و سوورن لەسەر ئەوەی وەریان گرتووە: ﴿فَمَا آمَنَ لِمُوسَىٰ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِنْ قَوْمِهِ عَلَىٰ خَوْفٍ مِنْ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أَنْ يَفْتِنَهُمْ﴾ [یونس: ٨٣] «جا (لەسەرەتاوە) بڕوای بە مووسا نەهێنا چەند گەنجێک نەبێت لە گەلەکەی بەهۆی ترس وبیمیان لە فیرعەون و پیاوماقوول و گەورەکانیان نەوەک بیانگێڕێتەوە بۆ بێدینی.»

* زۆرێک لە خەڵکی شوێن ئەو کەسە دەکەون کە سەرکەوتوو بووە بەبێ بیستنی بەڵگەکانی: ﴿وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ السَّحَرَةَ إِن كَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ ﴿٤٠﴾﴾ [الشعراء: ٣٩—٤٠] «پاشان بە خەڵکی وترا: ئایا (بۆ دیتنی ئەم دیمەن و شانۆیە) کۆنابنەوە؟! بۆئەوەی شوێنی جادووگەران بکەوین ئەگەر ئەوانسەرکەوتن و بردیانەوە.»

شکستخواردن لە ماڵ و ساماندا جێی پەند نییە.

* مرۆڤی ژێر نارِوانێتە زۆری شوێنکەوتوان و پەیڕاوکاران پێش ئەوەی بڕوانێتە حەقیقەتی ڕێبەرەکان، شەیتان شوێنکەوتووانی زۆر زیاترن لە پەیامبەران، شوێنکەوتنی یەک کەس بۆ هەق زۆر باشترە لە شوێنکەوتنی خەڵکانی هەموو سەر زەوی بۆ ناهەقی.

* بەراوردکردنی زۆریی شوێنکەوتووان و ماڵ و سامان بە کەسانی دیکە دەبێتە هۆی دروستبوونی خۆبەگەورە زانینێکی سەرکەشانە: ﴿وَكَانَ لَهُ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَاحِبِهِ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَنَا أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴿٣٤﴾ وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ

نَفۡسِهِۦ﴿٣٥﴾ [الكهف: ٣٤-٣٥] «هەروەها (خاوەنی ئەو دوو باخە) ماڵ و سامانی زۆری هەبوو (لە ئاڵتوون و زیو و شتی تر) جا بە هاوڕێ (ئیمانداره هەژار)ەکەی وت، لەکاتێکدا کە قسەی لەگەڵدا دەکرد: من ماڵ وسامانم لە تۆ زیاترە و کوڕ و خزماەتکاریشم زیاترە. چووە ناو باخەکەیەوە، لەکاتێکدا ستەمکار بوو لە خۆی.»

* زۆری و کەمی شوێنکەوتووان هەق جێگیر ناکات و ناهەقیش لەناو نابات، شوێنکەوتنی خەڵکی بەدەست خودایە، ئایینی نووح هەمان ئایینی موحەممەد بووە، نووح ٩٥٠ ساڵ بانگەوازی بۆ کرد، بەڵام کەمینەیەک شوێنی کەوتن، موحەممەدیش ٢٣ساڵ بانگەوازی کرد و ئوممەتێک شوێنی کەوت.

* چاکسازان شانازی و ئاوات دەخوازن بە زۆری شوێنکەوتوانیانەوە لە ڕۆژی دوایدا، بەڵام گومڕایان خەسارەت مەندن بە زۆری شوێنکەوتوانیان و سزا دەدرێن بە ئەندازەی شوێنکەوتوانیان. ئەوکات خۆزگە دەخوازن شوێنکەوتوانیان کەم بووبا، جا کەوابوو شوێنکەوتووان یان هۆکاری سزان یان نیعمەتن.

* ژمارەی شوێنکەوتووانی چاکسازان پاش مردنیان زۆرترن وەک لە کاتی ژیانیاندا، چونکە بە مردنیان گومانەکانی دەوریان دەمرن، لەو پڕوپاگەندانەی ناحەزانیان بۆیان هەڵدەبەستن کە دەڵێن ماڵ و سامان و شکۆ و دەسەڵاتیان ویستووە.

# دامەزراوی و میانڕەوی و زیادەڕەوی

دامەزراوی و جێگیری هۆکاری پارێزراوییە بۆ بەندە هەرکات مەرگی لە ناکاو بەرۆکی بگرێت. وا دەکات مرۆڤ بەردەوام ئامادە بێت، چونکە مرۆڤ نازانێت کەی قیامەتی بەرپا دەبێت، خودا بە پەیامبەرەکەی دەفەرموێت: ﴿فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ﴾ [هود: ١١٢] «ئەی موحەممەد (ﷺ) دامەزراو بە بەو شێوازەی کە فەرمانت پێ کراوە لەلایەن خوای گەورەوە، ئەوانەشی کە تەوبەیان کرد و لەگەڵ تۆدا بۆ لای خوای گەورە گەڕاونەتەوە، با ئەوانیش دامەزراو بن.»

* خودا بە پەیامبەرەکەی (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ﴾ [هود: ١١٢] «ئەی موحەممەد ئەی موحەممەد (ﷺ) دامەزراو بە بەو شێوازەی کە فەرمانت پێ کراوە لەلایەن خوای گەورەوە.»

دامەزراو بە، بەو شێوەیەی خودا فەرمانی پێ کردووی، نەک بەو جۆرەی کە خۆت دەتەوێت لە کاتێکدا کە ئەو پەیامبەر بووە، ئەگەر بۆ کەسێک دروست بووایە دامەزارویەکەی بە ویستی خۆی بووایە، ئەوا بۆ موحەممەد (ﷺ) دروست دەبوو.

* ناوەندگیری لە قورئاندا بریتییە لە: ﴿فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ﴾ [هود: ١١٢]

لای ڕاست نەگریت و زیادەڕەوی تێدا بکەیت: ﴿وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ﴾ [طه: ٨١] «زیادەڕەوی تیا مەکەن»

بە لای چەپیشدا نەڕۆیت و ڕوو بکەیتە دوژمنان: ﴿وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ﴾ [هود: ١١٣] «پاڵ مەدەن بەوانەوە کە ستەمیان کردووە، چونکە دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن»

* ئەقڵەکان ناتوانن وێنای ناوەندگیری بکێشن، بەڵکوو پەروەردگار بڕیاری لەسەر ئەو بابەتە داوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَـٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ [البقرة: ١٤٣] «بەم شێوازە ئێوەمان گێڕاوە بە ئوممەتێکی میانڕەو.»

هەرکەس لە وەحی و سرووشی خوداوە دوور بوو، لەسەریەتی بەرەو وەحی هەنگاو بنێت، نەک وەحی بە لای خۆیدا ڕاکێشێت.

* ناوەندگیری بابەتێکی جێگیرە و خەڵکی لێی نزیک و دوور دەکەونەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَـٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ [البقرة: ١٤٣] «بەم شێوازە ئێوەمان گێڕاوە بە ئوممەتێکی میانڕەو. بۆئەاەی ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا ببنە شاهێد بەسەر خەڵکییەوە.»

نیشانەی ناوەندگیرییان بوونی پەیامبەریانە: «وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا» «بۆ ئەوەی پێغەمبەری خواش (ﷺ) شایەت بێت بەسەر ئێوەوە.»

* ناوەندگیری ڕێگەیەکە پەیامبەر (ﷺ) کێشاویەتی، پاشان فەرمانی بە خەڵکی کردووە بەسەر ئەو ڕێگەیەدا بڕۆن، نەک بەدوایدا بگەڕێن: ﴿وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ [الأنعام: ١٥٣] «فەرمانی داوە کە بێگومان ئەمە ڕێکای ڕاستی منە کە ڕاست و دروستە کەواتە شوێنی بکەون و شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون، چونکە دوورتان دەخەنەوە و لاتان دەدەن لە ڕێگەی خوا.

فەرمانی داوە کە بێگومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کە ڕاست و دروستە کەواتە شوێنی بکەون و شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون چونکە دوورتان دەخەنەوە و لاتان دەدەن لەڕێگەی خوا.

* ناوەندگیری ڕێگەیەکە خودا دیاری کردووە بۆ خەڵکی، ناوەندگیری بە شێوازێک ڕوونە پێویست بە گەڕان ناکات بۆ دۆزینەوەی لەناو ڕێگەکاندا:

﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا﴾ [البقرة: ١٤٣] «بەم شێوازە ئێوەمان گێڕاوە بە ئوممەتێکی مامناوەند.»

خودا دایناوە و کۆتایی پێ هێناوە، گەڕان بۆی لەنێوان ڕێچکەکاندا بوونی گومانە.

* زۆرێک لەوانەی بەشوێن ناوەندگیریدا دەگەڕێن، دەچن لەناو گرووپ و تاقمەکاندا دەگەڕێن، نەک لەناو بەڵگەکاندا. ئەگەر هێز و جەماوەری گرووپەکان گۆڕا، ئەوا ئەوانیش دەگۆڕێن؛ خۆ ئەگەر ئەوان وابەستی بەڵگەکان بوونایە، بە جێگیری دەمانەوە.

* دابەشکردنی هەق و پارچەپارچەکردنی بریتی نییە لە ناوەندگیری، بەڵکوو ناوەندگیری وەرگرتنی هەموو بەشەکانی هەقە بەیەکەوە: ﴿... وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ١٥٠ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗا﴾ [النساء: ١٥٠-١٥١] «بەڕاستی ئەوانەی بێباوەڕن بە خوا و پێغەمبەرەکانی، دەیانەوێت جیاوازی بخەنە نێوان خوا و پێغەمبەرەکانییەوە، دەڵێن: باوەڕ بە هەندێکیان دەهێنین وبە هەندێکی تریان ناهێنین و دەیانەوێت لەنێوانیاندا ڕێگەیەک بدەنە بەر. ئا ئەوانە بەڕاستی بێباوەڕی تەواون.»

* دروستکردنی نێوەندگیرییەک لە ئیسلامدا بە مەبەستی ڕاکردن لە حەرامێکی بڕاوەیی وەکوو کەسێک وایە کە نێوەندییەک لەنێوان خورما و توێکڵەکەیدا دابنێت، نە حوکمی ناوەوەی خورماکە وەربگرێت و نە دەرەوەی لە کاتێکدا ئەوەی ئەم حوکمەی داناوە دەزانێت کە ئەو کەسەی خورماکە دەخوات ئەویش دەخوات.

* نێوەندگیری، مەشخەڵەکانی لە وەحییەوە سەرچاوەی گرتووە، ناکرێت هەرکەسێک دوو فکر بێنێت و بڵێت من نێوەندگیری لەنێوان ئەم دوو فکرە دەکەم، جا ئەو کەسە بەردەوام بارگەی بپێچێتەوە بەدوای مەنزڵی ڕایە جیاوازەکان بکەوێت، ئەمە نێوەندگیری خۆیەتی نەوەک ئیسلام.

* وا گومان دەبەن ناوەندگیری ئەوەیە لەنێوان هەق و باتڵدا بوەستن و بەمە پارێزراو دەبن لە ڕەخنەی هەموو لایەنەکان: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُوا۟ قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوٓا۟ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ أُرْكِسُوا۟ فِيهَا﴾ [النساء: ٩١] «دەیانەوێت لە ئێوە ئەمین بن و لە هۆزەکەی خۆشیان ئەمین بن، هەر کاتێک بانگکرابن بۆ بێباوەڕی و بتپەرستی، گەڕاونەتەوە بۆی.»

* ناوەندگیری ئەوە ناگەیەنێت لەنێوان دوولایەندا بوەستیت، بەڵکوو هەندێجار هەرسێکتان لە لای ڕاست یان چەپ دەبن. ناوەندگیری ئەوەیە بەردەم خۆت ببینیت مثل ما أنا عليه اليوم وأصحابي «هاوشێوەی ئەوەی ئەمڕۆ من و هاوەڵانم لەسەری دەڕۆین».

* ناوەندگیری ئەوەیە خودا لێت ڕازی ببێت، نەک کۆبوونەوەی لایەن و گرووپەکان لە دەورت.

* کەسانی شلڕەو بە ئەندازەی دوورییان لە ناوەندگیرییەوە کەسانی ناوەندگیر بە زیادەڕەوو و توندڕەو وەسف دەکەن. توندڕەوەکانیش بە ئەندازەی دوورییان لە ناوەندگیریەوە کەسانی ناوەندگیر بە شلڕەو وەسف دەکەن. ناوەندگیری بە ئەستەم دەبیندرێت لەلای ئەو کەسانەی دوورن لێیەوە.

* ئەو کەسەی ئەقڵ و چاوی لەناو بازنەی ئازادیخوازی و لەدەستدەرچووندا بسوورێتەوە، ئەوا بێگومان ناوەندگیری بە توندڕەوی و زیادەرەوی وەسف دەکات، پێچەوانەی ئەمانیش بەپێچەوانەوە وەسفیان دەکەن.

* توندڕەوی و شلڕەوی دوو دەرگان بۆ دەرچوون لە ئایین، زۆرێک لە دەوڵەتەکان بەهۆی شلگیرییەوە شکان و هەرەسیان بەسەر هاتووە، نەک بەهۆی توندڕەویەوە. بەڵکوو لە توندڕەوی هەڵاتوون و بەشلگیری شکستیان هێناوە.

* سەرقاڵبوون بە ڕەخنەگرتن لە توندڕەوان، شلڕەوی لە دڵدا دەچێنێت، هەروەها سەرقاڵبوون بە ڕەخنەگرتن لە شلڕەوان، توندڕەوی دەچێنێت. دادگەرییش ناسینی هەقە لە هەرکوێیەک بێت، هەروەها ڕەخنەگرتنە لە هەردوو لا بە شێوازێکی یەکسان.

* زێدەڕەوی لە ئێستادا بوونی هەیە، بەڵام زۆر دەوروژێنرێت و لە بۆسەدا دەبن بۆی تاوەکوو گشت دید و تێڕوانینەکان بە ترس و تۆقاندنەوە سەیری بکەن، جا دارِنران لە سایەی ئەمەوە ڕوو بدات، چونکە کەسی ترساو لە شتێک، تەنانەت هەست بە برینی دەستیشی ناکات تاوەکوو هێور دەبێتەوە.

* بنچینە و ئەسڵ وایە کاتێک زێدەڕەوی کرا لە خستنەڕووی هەر بابەتێک، بێگومان مافی لایەنێکی دیکە پێشێل دەکرێت و نێوەندگیری دەشێوێت، هەروەکوو چۆن زێدەڕەوی کرا لە خستنەڕووی بابەتی «لێ بوردەیی» کاتێک ڕۆژئاوا ویستی هێرش بکاتە سەر ڕۆژهەڵات، کاتێکیش جەنگی ڕۆژئاوا تەواو بوو، ئەم بابەتە فەرامۆش کرا.

* زۆرجار نەفس وێنای توندڕەویی بەرانبەری دەکات، بۆئەوەی ڕێ بە خۆی بدات تاوەکوو شلگیری بکات، زۆرجاریش وێنای شلڕەوی بەرانبەری دەکات، تاوەکوو ڕێ بە توندڕەوی خۆی بدات. شلڕەوی و توندڕەوی بە پێوەری دووربوون لە حەق دیاری دەکرێت، نەوەک بە دووری لە تۆوە.

# عەقڵ و نەقڵ و کارتێکەرەکان

* هەر پێنج هەستەوەرەکەی مرۆڤ لەناو ئاژەڵدا زۆر بە شێوەیەکی بەهێزتر بوونیان هەیە، بەڵام بە یەک شت مرۆڤ پێش دەکەوێت ئەویش بریتییە لە ئەقڵ، خۆئەگەر مرۆڤ پەکی بخات، ئەوا ئاژەڵەکان پێشی دەکەون: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ﴾ [الأعراف: ١٧٩] «ئەوانە وەک ئاژەڵ وان، بگرە خراپتر و گومڕاترن لە ئاژەڵ.»

* تەنها خاوەنداری و ئەوەی کە خاوەن عەقڵیت، ئەوە ناگەیەنێت کە بیردەکەیتەوە و تێدەگەیت: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ﴾ [الأعراف: ١٧٩] «سوێند بە خوا بەڕاستی دروستمان کردووە بۆ دۆزەخ زۆرێک لە جنۆکە و ئادەمی، دڵیان هەیە بەڵام پێی تێناگەن (لە ڕاستی) و چاویان هەیە (هەقی) پێ نابینن و گوێیان هەیە (هەقی پێ) نابیستن.»

* عەقڵ گۆزەیەکە پێویستە پڕبکرێت، ئەگەر دەستپێشخەری نەکەی بۆ پڕکردنی بە شتی خێر و چاکە، بێگومان شەیتان دەستپێشخەری دەکات لە پڕکردنی بە خراپە و شەڕ.

* ئەقڵ گۆزەیەکە هیچت پێ نادات تەنها ئەوە نەبێت کە خۆت پێی دەدەیت. ئەو کەسەی دەیەوێت هەقی پێ بدرێت، با بە وەحی و سرووش پڕی بکات.

* عەقڵ دەستاڕی زانینە، ناکرێت شتانێکی پێ بهاڕدرێت کە سوودیان نییە، چ جای بە بادانی لە هەوادا. زۆرجار دەنگی جیرەی ژێر دەستاڕی هەندێک لە ئەقڵەکان دەبیستین، بەڵام نابینین هیچ بەروبووم و هاڕاوەیەکیان لێوە پەیدابووبێت.

* ئەقڵ گەشت دەکات و دەڕوات بە ناو فکردا وەک چۆن پێیەکان بەزەویدا گەشت دەکەن، جا هەندێک جار پێش دەکەون و هەندێک جار دەکەون. ئەگەر خودا یارمەتی و پشتیوانی خۆی لە ئەقڵە تەواو شارەزاکان بگرێتەوە، ئەوا دەکەونە ناو چاڵی گومڕاییەوە، وەک چۆن پێی مرۆڤەکانیش دەترازێن و دەکەون بە زەویدا.

* ئەقڵەکان بابەتە سەرەتاییەکان جوان لێکدەدەنەوە، بەڵام وێڵ و سەرگەردانن لە دەرەنجام و کۆتاییەکاندا.

* ئاقڵترین مرۆڤ ئەو کەسەیە دوورترین ڕوانینی هەبێت بۆ ئامانج و مەبەستەکان، بە ئەندازەی نزیک ڕوانین بۆ ئامانجەکان ئەقڵ کەم دەبێت، شێتەکان ئامانجێکیان هەیە دەیانەوێت پەرداخێک ئاو هەڵبگرن و بیخۆنەوە، بەڵام نازانن لە کوێ دای بنێنەوە کاتێک کە هەڵیان گرت و تەواو بوون لە خواردنەوەی.

* هەر دەبێت عەقڵ ڕۆژێک لە ڕۆژان خاوەنەکەی تووشی بۆچوونێکی هەڵە بکات، تاکوو خودا بۆی بسەلمێنێت ئەو ئەقڵەی پێشڕەوی ئەو مرۆڤەی دەکرد دژی خودا بووە، ئەگەر ویستبای ئاوا دەیهێشتەوە و ئەگەر بیەوێت یارمەتی دەدات.

* ئەقڵ چەند سەیرە لەو کاتەدا کە خاوەنەکەی گومڕا دەبێت بەهۆی هەواوئارەزوو و سەرکەشی و خۆبەگەورەزانینەوە. کافرانی قورەیش خوایەکیان لە بەرد بۆ خۆیان تاشیبوو، جا کاتێک پەیامبەری خودا (ﷺ) ڕێگری ئەو کارەی لێ کردن ڕەتیان دەکردەوە و دەیانوت ئەو تەنها مرۆڤێکە!

* هیچ شتێک هێندەی ئەقڵ سەرکەش نییە لە بەرانبەر خاوەنەکەیدا، دۆزەخ بە چاوی خۆی دەبینێت پاشان داوا لە خودا دەکات: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا﴾ [الأنعام: ٢٧] «ئەگەر بیانبینیت

کاتێک کە لەسەر قەراغی دۆزەخ وەستێندراون کە دەڵێن خۆزگە دەگەڕێنراینەوە بۆ دونیا و بەڵگەکانی پەروەردگارمان بە درۆ نەدەزانی.»

پاشان ئەگەر بگێڕدرێنەوە: ﴿وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ﴾ [الأنعام: ٢٨] «ئەگەر بگەڕێندرێنەوە بۆ دونیا، بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی کە لێیان قەدەغە کرابوو.»

* مرۆڤ هێندە ئەقڵی بە گەورە و پیرۆز دەزانێت بەجۆرێک کە دەیگەیەنێتە ئاستی پارێزراوبوونی تەواو لە هەڵە، لە کاتێکدا زۆرینەی وتەکانی ئەمڕۆی دەربارەی ڕابردووی بریتییە لە «خۆزگە و بریا ئەو کارەم کردبا و ئەو وتەیەم گوتبا» ئەقڵی ئەمڕۆی دەپەرستێت و جوێن بە ئەقڵی دوێنێی دەدات، لە کاتێکدا هەردووکیان یەک ئەقڵ بوون.

* خودا هێز وتوانای ئەقڵی مرۆڤی زیاتر داناوە لە هێزی جەستەی، بیر دەکاتەوە و تێ دەفکرێت بە ئەندازەیەک کە دەستەکان و پێیەکان ناتوانن پێی بگەن، تاکوو ئەو مرۆڤە خودی خۆی هەست بە لاوازییەکەی بکات، خۆی بە گەورە نەزانێت لەئاست بەدیهێنەردا.

* نەخۆشیی ئەقڵ ترسناکترە لە نەخۆشی جەستە، هەروەها بڵاوبونەوەشی زۆر خێراترە: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ﴾ [التوبة: ١٢٥] «بەڵام ئەوانەی لەنێو دڵیاندا (ناپاکی) هەیە

بەڵام ئەوانەی لەنێو دڵیاندا نەخۆشی (ناپاکی) هەیە ئەوە سورەتەکە بۆیان زیاد دەکات سەرەڕای پیسی و ناپاکی خۆیان پیسی و ناپاکی تر ئەو (ناپاکانە) دەمرن لەکاتێکدا کە بێبڕوان.

* مرۆڤ ئەو زانستە وەردەگرێت کە حەزی پێی هەیە، وەک چۆن دەست ئەو خواردنانە دەگرێت کە مرۆڤ حەزی بۆیان هەیە، ئەقڵەکان نەخۆش

دەکەون وەک چۆن جەستە نەخۆش دەکەوێت، چونکە هەموو ئەو شتانەی نەفس و دەستی مرۆڤ پێی خۆشە و وەری دەگرێت سوود بەخش نیین.

* هەموو ئەوانەی خۆشت ویستوون بەهۆی جگە لە عەقڵەوە جا بەهۆی خزمایەتی یان چاکە یان جوانی یان پێگەیان ئەوا پێویستە بەری پێ بگیرێت پێش چەسپاندنی باوەڕ بەو شتە، چونکە نەفس پێشخستنی ئەقڵ و پێشخستنی سۆز و عاتیفە تێکەڵ دەکات.

* هەر کەس بە عاتیفە و سۆزی ئاوی ئەقڵی بدات، ئەوا بۆچوونەکانی لە شوێنی خۆی نابێت؛ ئەگەر عاتیفە و سۆزی گۆڕا، بۆچوونەکانیشی دەگۆڕێت، وا دەزانێت زانستی زیاد بووە، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها عاتیفە و سۆزی کەم بووەتەوە، زانست و زانیاریی زیادی نەکردووە و نەگۆڕاوە.

* پاککردنەوەی دەروون پێش ڕاستکردنەوەی ئەقڵە، چونکە ئەقڵ ڕاسترەوە، ئەگەر نەفسی وازی لێ بهێنێت و هەواو ئارەزووی تێکەڵ نەکات، بۆیە خودا زۆرجار ستایشی ئەقڵ دەکات و سەرکۆنە و سەرزەنشتی نەفس باس دەکات.

* ئەقڵ و دەروون ململانێ دەکەن، ئەگەر مرۆڤ ئەقڵی بەسەر دەروونیدا سەرکەوت، ڕێگەی ڕاست دەدۆزێتەوە؛ خۆ ئەگەر نەفس و دەروونی سەرکەوت بەسەر ئەقڵیدا، ئەوا سەرگەردانی دەکات.

* ئیسلام ئەقڵی پەک نەخستووە بۆ نەقڵ، بەڵکوو وەک ڕۆشنایی دایناوە بۆ چاو، هەرکەس بەتەنها بە هۆی چاوەکانیەوە ڕێ بکات بەبێ ڕۆشنایی، ئەوا بێگومان لادەدات و دەکەوێت.

* ئیسلام ڕێزی لە ئەقڵ گرتووە و بە گەورەی داناوە، بەشێک لەو ڕێزەش ئەوەیە ڕێگری لێ بکات لە چوونە نێو ئەو بابەتانەی باش نایان زانێت، تا هەڵە

و خلیسکانی زۆر نەبێت و بەهۆیەوە شکۆی نەمێنێت، هەر بۆیە وەحی هاتووە ئارامی بکاتەوە و بی پارێزێت.

* سروش لەگەڵ ئەقڵدا وەک نوور و ڕۆشناییە بۆ چاو، ئەگەر زانستی بە سرووش زیاد بوو، دەتوانێت ئاسان ڕێ بکات؛ ئەگەر کەم بوو، گومڕا و سەرلێشێواو دەبێت: ﴿أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ [الملك: ٢٢] «ئایا کەسێک بڕوا و بەدەمدا بکەوێت، زیاتر ڕێنیشاندراوە یان کەسێک کە بە ڕێکییەوە لەسەر ڕاستە ڕێ دەڕوات؟

* ئەقڵ لەگەڵ وەحیدا هاوشێوەی چاوە لەگەڵ خۆر، وەحی ڕێگە ڕۆشن دەکات، ئەقڵیش پێشڕەوی دەکات تا بڕوات، ڕێکردنی بێ نوور وێڵبوونە، هەروەها سرووشیش بەبێ تێڕامان کەمتەرخەمییە: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [النحل: ٤٤] «قورئانیشمان بۆ تۆ نارد بۆ ئەوەی ڕوونی بکەیتەوە بۆ خەڵکی ئەوەی بۆیان نێردراوەتە خوارەوە بەڵکوو بیربکەنەوە و تێبگەن.»

* ئەقڵ وەک چاوە و نەقڵیش وەک نوور و ڕۆشنایی، چاو ئەگەر ڕووبەڕووی ڕۆشنایی ببێتەوە، دەسووتێت. خۆ ئەگەر بیکاتە مەشخەڵێک بۆ خۆی، ئەوا سوودی لێ دەبینێت. بەهەمان شێوەی ئەقڵ لەبەرانبەر نەقڵدا، ئەقڵ بۆ ئەوە دروست کراوە لە پشت نەقڵەوە بڕوات، نەک بەرانبەری بوەستێتەوە.

* قورئان وەک ڕۆشناییە و ئەقڵیش وەک چاو، هەندێکجار مرۆڤ کەمێک چاوی لە تاریکیدا هەست دەکات و دەڕوات، هەندێک جار کەسی خودا نەناس و مولحید تێڕامان دەکات و ڕێگە دەپێکێت، بەڵام بێگومان لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام نامێننەوە و هەر دەبێت هەردووکیان بکەون.

* ئەقڵ ناتوانێت لە هەموو شتێک تێبگات، وەک چاو ناتوانێت تەواو بڕوانێتە خۆر کاتێک بەتینە، چونکە ئەو کارە لەسەروو توانای چاوەوەیە، خوداش چەندان حیکمەتی شاراوەی هەیە، پێویستە ئەقڵ بەڕوویدا دابخرێت، وەک چۆن چاو لە تیشکی خۆر دادەخرێت.

* ئەقڵ دەزگایەکی هەستەوەرە و سنووردارە، وەک چۆن گوێیەکان توانای بیستنی چرپەیان نییە و هەروەها توانای بیستنی دەنگی زۆر بەرزیان نییە، بە هەمان شێوە چاوەکان توانای دیتنی شتە زۆر وردەکانیان نییە و ناشتوانێت بڕوانێتە تەواوی تیشکی خۆر، دەبینیت ئەقڵ بابەتە پەنهانەکانی لا شێواوە لە بابەتە بەرجەستەکانیشدا سەرگەردانە.

* بە کۆبوونەوەی ئەقڵ و نەقڵ حەقیقەتە شەرعییەکان دەردەکەوێت و دەزاندرێت؛ ئەگەر ناکۆکییان تێدابوو، ئەوا نەقڵ پێش ئەقڵ دەخرێت، چونکە نەقڵ زانستی خودایە و تەواو و بێکەموکوڕییە، بەڵام ئەقڵ زانستی مرۆڤە کە کەموکورتی تیادایە.

* پەرتووکە ئەقڵییەکان ئەقڵ دەکەنەوە و دڵ دادەخەن، بەڵام پەرتووکە نەقڵییەکان ئەقڵ و دڵیش دەکەنەوە.

* خودا مرۆڤی دروست کردووە بەبێ ئەوەی مۆڵەتی لێ وەرگرێت، جا چۆن ئەو کەسەی بۆ بوونی خۆی مۆڵەتی لێ وەرنەگیراوە بۆ کەسانی دیکە مۆڵەتی لێ وەردەگیرێت سەبارەت بە شەرعی خودا و حوکم و بڕیارەکانی خودا.

* دەروونی مرۆڤ تێکشکان و تەنگی بەسەردا دێت و ئەقڵیش ناتوانێت هیچ هۆکارێک بدۆزێتەوە بۆ ئەو کارە، خودا زانستی ناو ناخی خۆی لێ پەنهان و شاراوە کردووە، تا بۆی دەرکەوێت لە کسانی دیکەی جگە لە خۆیدا زۆر نەزانترە: ﴿وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ﴾ [الذاريات: ٢١] «لە خودی خۆشتاندا (بەڵگەی زۆر هەیە) دەی ئایا بۆ وردنابنەوە و سەرنج نادەن.»

* کەسانێکم دیتووە دەگەڕان بە شوێن پێنووسەکانیاندا، لەکاتێکدا بە دەستیانەوە بووە، کەچی بەردەوام بۆی گەڕاوە تا کەسێک بەئاگای هێناوەتەوە کە پێنووسەکە لە دەستیاندایە. دەبێت ئەوە چۆن ئەقڵێک بێت بۆ شتێک بگەڕێت کە ناو دەستیدایە، لەگەڵ هەموو ئەمانەش مناقەشەی هۆکاری نەبینینی خودا

دەکات: ﴿وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَكۡثَرَ شَيۡءٖ جَدَلٗا﴾ [الكهف: ٥٤] «هەمیشە ئادەمی لە هەموو شتێک زیاتر موجادەلە دەکات.»

* کەسێک هاتە لام ڕەخنەی لە حیکمەتی حوکمە شەرعییەکانی خودا دەگرت، پاشان کە ڕۆیشت نەعلەکانی منی بە هەڵە لەپێ کرد و ڕۆیشت، گوتم: ئەو بەرپێی خۆی نابینێت، کەچی ڕەخنە لە حیکمەتی خودا دەگرێت لە بابەتە شاراوە و غەیبییەکاندا.

* ئەقڵ بە بڕوای خۆی بۆچوونێک هەڵدەبژێرێت و بۆچوونی کەسانی دیکەش بە گێلی وەسف دەکات، پاش ماوەیەک دەبینیت واز لە بۆچوونەکەی خۆی دەهێنێت بۆ ئەو بۆچوونە کە بە گێلانە وەسفی دەکرد، ئەو ئەقڵە بڕیاری گێلی بەسەر خۆیدا چەسپاندووە، جا چۆن ئەو ئەقڵە گونجاوە دژایەتی خودا بکات لە حوکمەکانیدا.

* نابینیت دوو ئەقڵ وەک یەک بن لە هەموو شتێکدا هەرچەند لە ڕەچەڵەک و زانست و تەمەن و ژینگەشدا یەکسان بن، ئەوان نەیانتوانیوە ڕێگری شتە بەرجەستەکان بکەن کە دەیبینن، جا دەبێت چۆن ڕێگری ئەو شتانە بکەن کە پەنهانن لێیان، بۆیە خودا بەگشتی ئەو بابەتەی باس کرد.

* مرۆڤ زۆر لاوازە تەنانەت لاوازیەکەی بەجۆرێکە بە هەوڵدان نەبێت ناتوانێت لە شتەکانی دەوروبەری خۆشی تێ بگات، تەنانەت نازانێت چی لە پشت خۆیەوە هەیە، تاکوو ئاوڕی بۆ نەداتەوە، ناشزانێت گیرفانی چی تیادایە تاکوو، نەیهێنێتە دەرەوە و سەیری نەکات. هەروەها ناتوانێت هەستی شیرینی و تاڵی خواردنەکانی بکات تەنها بە چەشتنیان نەبێت، بەهەستەوەرەکانیان تاقی کردنەوە دەکەن تا شتەکانیان لە گەردووندا بۆ دەربکەوێت، پاشان دژایەتی خودا دەکەن لە بابەتە پەنهانییەکان و ئاسماندا.

* ئەقڵ وندەبێت لە زەویدا لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو هێما و ڕێیەرانەدا، لە کاتێکدا دەتوانێت ببینێت و ببیستێت، دەشیەوێت چارەسەری بابەتە پەنهان و غەیبیەکان بکات بە پێچەوانەی ویستی خوداوە، لە کاتێکدا هیچ ڕێبەرێکی نییە پەنهانەکانی پێ بناسێنێت.

* مرۆڤ لە تاریکایی شەودا تیر دەهاوێت و تەنانەت شوێن تیرەکەشی نابینێت، ئەقڵیش لە تاریکایی پەنهانیدا بۆچوونەکانی فڕێ دەدات، کەچی بانگەشەی پێکانی هەق دەکات هەرچەندە پێچەوانەی فەرمانی خوداش بێت!

* هەموو ئوممەتێک بە بۆچوون و ئەقڵی خۆیان پێچەوانەی وەحی و سرووشیان کردووە، هەر ئوممەتێکیش ئەقڵ و بۆچوونیان جیاوازە لە ئوممەتەکانی دیکە، بەڵام وەحی و هەق یەک شتە و ناگۆڕێت، ئەقڵەکان تەنها لەسەر ئەوە کۆدەبنەوە.

* هەموو ئوممەتە سەرکەشەکان بە ئەقڵ و بۆچوونیان دژایەتی وەحییان کردووە، بە چەندان بەڵگەی ئەقڵی جیاواز لە کاتێکدا وەحی یەک شتە ئەوان چەندان جۆر ئەقڵی جیاوازن، دەبینیت ئەو هەموو ئەقڵە جیاوازانە دژایەتی وەحی دەکەن، دەبێت کام ئەقڵەیان دروست و ڕاست بێت؟!

* ئەندازەی زانستی مرۆڤ بە ئەندازەی قەبارەیەتی لە گەردووندا، ئەگەر ئەو نەتوانێت تەواو دەستی درێژ بکات لە گەردووندا، بەهەمان شێوە ناتوانێت ئەقڵی وەها بەگەڕبخات و سنووری پێ ببەزێنێت، کەواتە ئەگەر خودا فەرمانی پێ کرد، با ملکەچ بێت بۆ ئەو فەرمانە هەرچەندە حیکمەتەکەشی نەزانێت.

* دژایەتی وەحی دەکەن بە بۆچوونەکانیان، خۆ ئەگەر بتەوێت هەموویان لەسەر یەک بۆچوون کۆ بکەیتەوە، لەسەری کۆ نابنەوە: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا﴾ [النساء: ٨٢]

«خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بووایە جگە لە خوا، بێگومان جیاوازی زۆریان تێدا دەبینی.»

* هەموو ڕووداوە گەردوونییەکان بەڵگەن لەسەر ڕاستییێتی وەحی، بەڵام تەمەنی مرۆڤ کورتە بۆ دیتنی هەموویان، زۆرجار مرۆڤ لە کۆتایی ڕووداوێک لەدایک دەبێت و لە سەرەتای ڕووداوێکی دیکەدا دەمرێت، بەو هۆیەوە حیکمەتەکانی خودا نابینێت و باوەڕی پێ ناهێنێت و دژایەتی دەکات.

* مرۆڤ تاکوو تەمەنی زیاتر بێت، بۆچوونەکانی دەگۆڕێت، هەموو تاکێک بەو تەمەنە کەمەی خۆی بڕیار لەسەر شەرعی خودا دەدات، بەڵام زەمەن و کات هیچ کارناکاتە سەر زانستی خودا، چونکە ناوەڕۆکی شتەکان دەزانێت، لەبەرئەوەی خۆی بەدیهێناون.

* ﴿بَلْ كَذَّبُواْ بِمَا لَمْ يُحِيطُواْ بِعِلْمِهِۦ﴾ [یونس:٣٩] «ئەوە واز لێ بێنە بەڵکوو ئەوان بڕوایان بە قورئان نەهێنا و بە درۆیان دانا کە هیچ زانیارییان دەربارەی نەبوو.

کافرانی قورەیش موحەممەدیان بە درۆ خستەوە کاتێک باسی شەوڕەوی بۆ کردن. تەنها بە ئەوەندەی گوتی لە شەوێکدا چۆووەتە ئەقسا و گەڕاوەتەوە بۆ مککە، تۆمەتی شێت بوونیان دایە پاڵ، بەڵام لە ژیانی ئەمڕۆدا دەبینیت تەنها دواکەوتووەکان دان بەوەدا نانێن کە گەشتێکی لەو جۆرە شتێکی زۆر ئاساییە، خەڵکانی هەر سەردەمێک تۆمەتی شێتی و دواکەوتوویی دەدەنە پاڵ کەسانی دواتر بە ئەندازەی ئەو هەقە کەمەی دەی بینن، هەقیش بە پەرژینێکی دیواری درێژ چواردەور دراوە. ئەقڵەکان لە کونی دیوارەکانەوە سەیری هەق دەکەن، هەمووان بەس تەنها ئەو بەشەی خۆیان کە دیتوویانە بە دروست و ڕاستی دەزانن، جگە لەئەوەش بە درۆ دەخەنەوە، بەڵام وەحی لە ئاسمانەوە هەواڵی ئەودیوو پەرژینەکەی هەمووی پێ ڕاگەیاندووین.

* بڕیاری مرۆڤ دەگۆڕێت لە کاتی گۆڕینی ژینگەکەیدا، چونکە کاریگەر دەبێت بەو ژینگەیەی دیکە کە دیتویەتی لەگەڵ ئەوەی ژینگەکانی دونیا هەموویان لە یەکتری دەچن، جا چۆن بڕیار لەسەر شتانێک دەدات کە هاوشێوەی نییە وەک سیفاتەکانی خودا و ڕۆژی دوای.

* ئەستەمە مرۆڤ بتوانێت حوکم بدات لەسەر شتێک کە لەوەوپێش هاوشێوەی نەبووبێت لە مێشکیدا، چونکە ئەقڵ وێنای شتەکان دەکات، بۆیە خودا خۆی بە مرۆڤ ناساندووە و فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ [الشورى: ١١] «هیچ شتێک بە وێنەی خوا نییە، ناتوانرێت وێنای خودا دیاری بکرێت تاکوو ببینرێت.»

* وەحی هاتووە تاکوو ئەقڵ ڕێک بخات، بەڵام نەفس ئەقڵ بانگ دەکات سنوور ببەزێنێت، نەقڵ زانستی بەدیهێنەرە. ئەقڵیش زانستی بەدیهێندراوەکانیەتی، جا دەبێت کەمیان ڕێبەر بن بۆ کامیان؟!

* ئەقڵ هاتووە تا دەروونی مرۆڤ ڕێک بخات، وەحییش هاتووە ئەقڵی مرۆڤ ڕێک بخات، شێواندنی ئەم یاسایە شێواندنی دین و دونیایە.

* یاسایەکی گەردوونییە: ئەوەی جێگیر بێت سوودی لێ نابیندرێت تەنها بە گواستنەوەی نەبێت وەک بەرد، ئەوەشی بنچینەکەی گۆڕاوە بە جێگیرکردن و سنووردارکردنی سوودی لێ دەبیندرێت وەک ئەقڵ و ئاو.

* خودا ئەقڵی بە مرۆڤ بەخشیوە تاکوو پێشڕەوی بکات و پێی بڕوات، نەک دژایەتی خودای پێ بکات، ئەگەر ڕێی پێ کرد و لەو ڕێیەدا شتانێکی دیت کە بە ویستی خودا نەبوون، ئەوا با ئەقڵی بە درۆ بخاتەوە و پەروەردگاری بە ڕاست دابنێت، چونکە ئەقڵ تراویلکە و سەرابی هەیە وەک چۆن چاوەکان هەست بە تراویلکە و سەراب دەکەن.

* لە بەرزییەوە زۆر بە ڕوونی لادانەکانی سەر ڕێگە دەبیندرێت، لە کاتێکدا ئەوانەی لەسەر ڕێگاکەن نایبینن نموونەی هەرە بەرز بۆ خودایە، خودا لادانەکان دەبینێت کە لە فکر و باوەڕدا دروست بوون، خاوەنەکانیان بە ئاگا دەهێنێتەوە لە کاتێکدا ئەوان لەسەر زەوی تەنها بە ئەندازەی چاویان دەتوانن ببینن و بانگەشە دەکەن دەڵێن: لەسەر ڕێگە ڕاستەکەین.

* خودا توانای ئەقڵی زیاتر و بەرزتر داناوە لە توانای جەستە، مرۆڤ ئەو ئەندازەیەی بە بینین و تێڕامان دەتوانێت پێی بگات بە دەست و قاچ ناتوانێت بیانگاتێ، تاکوو بە خودی خۆی لاوازی و بێدەسەڵاتی بۆ دەرکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا خۆبەگەورەزانە بەرانبەر بەدیهێنەری. خۆ ئەگەر خودا وایبکردایە هەموو ئەو شتانەی ئەقڵ پێی دەگات دەست و قاچ پێی بگەیشتایە ئەوا سنووری ئەقڵی بچووک دەکردەوە، یاخود هێزی دەست و قاچ زیاد دەکرا، تاکوو گەڵ ئەقڵدا هاوتا دەبوو، ئەوکات هیچ کەس دانی نەدەنا بە شایستەبوونی پەروەردگارێتی خوادا.

* ئەگەر مرۆڤ تەنها باوەڕ بەوە بهێنێت کە خۆی دەیبینێت هەرچەندە پێچەوانەی فەرمانی پەروەردگاریش بێت، سوودی ناردنی پەیامبەران و دەبەزاندنی پەرتووکەکان چی دەبوو ئەگەر تەنها ئەقڵ بەس بووایە؟!

* ئەقڵ شتە دژیەکەکان دەبینێت و سەرگەردان دەبێت تیایاندا، هەندێک جار لە دینیش دەردەچێت، بێئاگا لەوەی ئەو دژیەکییانە تەنها لای ئەو وایە، نەک لە ڕاستیدا بەو جۆرە بێت، چونکە زۆرجار لە بابەتە غەیبی و پەنهانییەکاندا دەرئەنجامەکان پێچەوانە دەبنەوە.

* ئەگەر مرۆڤ ئاگەدار بکرێتەوە لە بەرزیدا لە ترسناکی ڕێگەکەی، ئەوا بەهۆی کەمی توانای بینینیەوە دەوەستێت، بە هەمان شێوە ئەقڵ ناتوانێت ڕێگەیەکی دوور ببینێت بەهۆی کەم تواناییەوە، خوداش تەواوی بەرزێتی هەیە.

* زۆر سەرم سوڕدەمێنێت بەوەی لە کاتی نووسیندا ئەقڵ و گوێ و چاو و دەست هەمووی کۆ دەبێتەوە، بەڵام هێشتا نووسەر پێویستی بە دەفتەرێکە هێڵی تێدا کێشرابێت بۆئەوەی ڕێنمووی بکات و دێڕەکانی خوار نەبێت، جا چۆن دەتوانێت تەنها بەهۆی ئەقڵییەوە بە ڕێگەیەکدا تێبپەڕێت کە سەرەتاکەی لای خۆیەتی و کۆتاییەکەی لای خودایە و لەو ڕێگە درێژەدا تووشی لادان نەبێت، بەبێ ئەوەی خودا هێڵی بۆ بکێشێت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ﴾ [الأنعام: ١٥٣] «فەرمانی داوە کە بێگومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کە ڕاست و دروستە. کەواتە شوێنی بکەون و شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون، چونکە دوورتان دەخەنەوە و لاتان دەدەن لە ڕێگەی خوا.»

* ئەقڵ شتە بینراوەکان و پەنهانەکان تێکەڵ دەکات، دەرئەنجامی هەق تێکەڵ بە ناهەق دەکات و ناهەق تێکەڵ بە هەق دەکات، ئەقڵ وەک ڕووبارێک دەڕوانێتە شتە پەنهانەکان و دەیەوێت مەلەی تێدا بکات، لە کاتێکدا وەک دەریایی شەپۆلدار وایە.

* حوکمەکانی خودا ڕێگەی تێڕامان و بیرکردنەوە بۆ مرۆڤ کورت دەکەنەوە، ئەقڵ تێڕامانی دەوێت، نەفسیش هیچ ناکۆکییەک لەنێوان ئەقڵ و نەقڵدا نادۆزێتەوە، بەڵکوو ناکۆکی لەگەڵ هەواوئارەزوویدایە کە لەژێر پەردەی ئەقڵ خۆی حەشارداوە و بە ناوی ئەقڵەوە قسە دەکات.

* ئەگەر واز لە ئەقڵ بهێندرێت و هیچ شتێک کاری تێ نەکات، ئەوا خۆی بەرەو خودا دەڕوات، بەڵام هەواوئارەزوو ڕێڕەوەکەی دەگۆڕێت، وای لێ دەکات ڕقی لەو ڕێگەیە بێت، تاکوو بناغەیەک بۆ ئارەزووەکانی نەفس بکێشێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ [ص: ٢٦] «شوێن هەواوئارەزوو مەکەوە لە ڕێگای خوا لات نەدات.»

* ئەگەر بەڵگە و ئەقڵ بێ کارتێکەرە دەرەکییەکان کۆببنەوە، دەرئەنجامێکی وەک ڕۆژی ڕوناکیان لێ پەیدا دەبێت، بەڵام ئەقڵەکان کاتێک دەچن بۆ بەڵگەکان هەواوئارەزووەکانیان کاریان تێ دەکات و دەبینیت دەرئەنجامێکی شێواویان لێ پەیدا دەبێت.

* ئەگەر مرۆڤ خاوەن دڵێکی بێ هەواوئارەزوو بووبا، ئەوا هەرگیز بە حوکمی خودا بێباوەڕ نەدەبوو، بەڵکوو دڵی ڕێنموویکاری دەبوو، بەڵام هەواوئارەزووی بەرەو گومڕایی کەمەرکێشی دەکات تا بێباوەڕ بێت بە هەقێکی ڕوون و ئاشکرا و ئارەزوواتی تێربکات: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ﴾ [الزخرف: ١٥] «بەڕاستی مرۆڤی (کافر) پێنەزان و سپڵە ئاشکرایە.»

* ئەقڵ تەرازوو و کێشانەیە، ناکرێت شتێکی پێ بکێشرێت، لە کاتێکدا هەواوئارەزوو پارسەنگی کردووە، کەواتە هەردوو تای تەرازووەکەت خاڵی بکە لە کارتێکەرەکان و هەواوئارەزوو، تا دەرئەنجامەکان بە دروستی دەربچن.

* ئەگەر مرۆڤ خاوەن دڵێکی بێ هەواوئارەزوو بووبا، ئەوا هەرگیز بە هیچ بەشێکی شەریعەتی خودا کافر و بێباوەڕ نەدەبوو، بەڵکوو دڵی ڕێنموویکاری دەبێت و هەواوئارەزووی بەرەو گومڕایی کەمەرکێشی دەکات، تا کافر و بێباوەڕ بێت بە جۆرێک وەهای لێ دەکات باوەڕ بەوەش نەکات کە چاوەکانی دەیبینێت: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ﴾ [الزخرف: ١٥]

«بەڕاستی مرۆڤی (کافر) پێنەزان و سپڵە ئاشکرایە.»

* ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾ [النحل: ٤]

«ئادەمی دروست کرد لە دڵۆپە ئاوێک کەچی بۆتە دوژمنێکی ئاشکرا.»

مرۆڤ ئەوە سەرەتای دروست کردن و کۆتاییيەکەیەتی، لە چ قۆناغێکدا شایستەی ئەوەیە دژایەتی خودا و بڕیارەکانی خودا بکات. ئەمە سپڵەیی مرۆڤە.

* ئەقڵ ڕاسترەوە ئەگەر شێواندنی نەفس نەبووبا، بۆیە وەحی هاتووە بۆ پاراستنی ئەقڵ لە نەفس.

# هزر و بۆچوون و کارتێکەرەکان

* خودا دوو چاوی بە مرۆڤ بەخشیوە، تاکوو پێی ببینێت. هەروەها زمان و دوو لێوی بۆ فەراهەم هێناوە، تاکوو ئەوەی دەیبینێت بتوانێت دەریببڕێت: ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ --وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ﴾ [البلد: ٨-٩]

«ئایا دوو چاومان نەداوەتێ؟ هەروەها دوو لێومان پێ نەداوە؟»

لێسەندنەوەی ئەو دوو نیعمەتە لە مرۆڤ بەناهەق نەهێشتنی مرۆڤبوونیەتی.

* هەرچی گونجاو و ڕێک بێت لەگەڵ قورئاندا ئەوە بە زانست و هەق هەژمار دەکرێت، هەرچیشی پێچەوانەی بێت، نەزانی و ئارەزووە: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ [الجاثية: ١٨] «لەپاشان تۆمان خستە سەر شەریعەتێک لەبارەی ئایینەوە، تۆش شوێنی بکەوە و شوێن هەواوئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن.»

* ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا﴾ [النساء: ١٧٤]

«ناردمانەخوارەوە بۆتان ڕووناکییەکی ئاشکرا (واتا قورئان).»

﴿قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ﴾ [المائدة: ١٥]

«بێگومان بۆتان هاتووە لەلایەن خواوە ڕووناکییەک.»

﴿وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾ [الأعراف: ١٥٧] «پەیڕەوی ئەو نوورەیان کردبێت (کە قورئانە) کە لەگەڵیدا نێردراوەتە خوارەوە.»

ئەمە بریتییە لە ڕووناکی. زۆرێک لە هزرەکان شقارتە دادەگیرسێنن و بە ڕۆشنگەری ناوی دەبەن.

*«بیرکردنەوە» زانستێک نییە بەتەنها و سەربەخۆ سوودی لێ ببیندرێت، بەڵکوو تەنها ڕوونکردنەوەی شتە زاندراوەکانە، ئەو کەسەی زانستی کەم بێت بەچی بیردەکاتەوە؟! زۆرجار هۆکاری گومڕایی مرۆڤ ئەوەیە زۆر بیربکاتەوە لە کاتێکدا خاوەنی زانستێکی کەمە.

* ڕۆشنبیری و هزر بەتەنها مرۆڤ دەرباز ناکات لەوەی بە وەسفی نەزان لە شەرعدا هەژمار بکرێت، چونکە زۆرێک لە کافرانی قوڕەیش خاوەن هزر و ڕۆشنبیرییەکی گونجاو بوون بۆ سەردەمی خۆیان، هاوشێوەی ئەبوو جەهل کونیەیی لە پێشدا ئەبوو حەکەم بووە کە بەهۆی فکر و بۆچوونییەوە ئەو نازناوەی هەبووە، وا گومانی برد هزر و ڕۆشنبیرییەکەی بەسە بۆ ڕەتدانەوەی حوکمی خودا، بۆیە پیامبەری خودا (ﷺ) ناوی برد بە (أبو جهل).

* بیرکردنەوە بریتییە لە جووڵەی بوونی زانست، ئەگەر زانست زیاد بوو و تێڕامان زیاد بوو، ئەوا کۆمەڵە هزرێکی سوودبەخش پەیدا دەبێت، خۆئەگەر کەسێک بەبێ زانست بیرکربکاتەوە، ئەوا بەهۆی ئەو کارەیەوە زیانێکی زۆر پەیدا دەبێت.

* ئێستا پێنووس وەک زوبانی لێ هاتووە هەموو کەس خاوەنیەتی، لە ڕابردوودا نووسراوەکان شکۆ و ڕێزیان هەبوو، بەڵام لە ئەمڕۆدا کاتێک زانست بێنرخ بووە، دەگوترێت: "وا دەنووسرێت"، وەک چۆن لەوەو پێش وتراوە دەگوترێت: "وا دەگوترێت".

* دەبینیت کەسانێکی قۆز و شیکپۆش لە ناوەڕاستی شەقامێکدا دەوەستن تاکوو وێنەیەکی بێئەرزش بگرن، بە هەمان شێوە هەندێک لە ئەقڵەکان کۆمەڵە هزر و بۆچوونێک دەهێنن کە لە ڕێگەدا کەوتوون، پاشان خاوەنەکەی بە چەندان شێوە دووبارەی دەکاتەوە تاکوو دەبێتە کەسێکی ڕۆشنبیر و موفەکیر.

* نەفس ئەو زانستە وەردەگرێت کە پێی خۆشە وەک چۆن دەستەکان ئەو خواردنانە وەردەگرن کە خوازراوە لایان، جا کاتێک ئەقڵ پڕ بوو بەو جۆرە لە هەوا ئارەزوو، دەڵێت: "ئەوە بۆچوون و هزرە." دەبینیت هەواوئارەزووی هەڵدەگێڕێتەوە و بە هزر هەژماری دەکات.

* هەندێک جار کەسانێک بیردەکەنەوە و وا گومان دەبەن ڕۆشنبیر و موفەکیرن. فکر دەرگایەک نییە تۆ بیکەیتەوە، هەندێک جار بۆت واڵا کراوە، بەڵام تۆ جگە لەو دەرگایەت دەوێت: ﴿ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا﴾ [الكهف: ١٠٤]

«لە ژیانی دنیادا واشیان گومان دەبرد کە بەڕاستی ئەوان کارێکی زۆر چاک دەکەن.»

* زۆرێک لە خەڵکی سەرەتای فکر و بۆچوونەکان دەزانن، بەڵام کەمینەیەکیان سەرئەنجام و کۆتاییەکانیان دەزانن. فکرەکان بە کۆتاییەکانیان دەردەکەون، نەک بە سەرەتاکانیان، تاڵی کۆتاییەکانیان شیرینی سەرەتاکەیان لەناو دەبات.

* هەندێک جار خودا مرۆڤ لەناو دەبات بەهۆی فکر و بۆچوون و ئەقڵییەوە، هەرچەندە بیرکردنەوەشی زۆر بێت: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ-- فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ--ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ﴾ [المدثر: ١٨-١٩-٢٠] «چونکە بیری کردەوە هەڵیسەنگاند قسەکەی خۆی. دەک بەکوشت چێت، چۆن هەڵیسەنگاند. دووبارە بەکوشت چێت، چۆنی لێکداوەتەوە.»

بیرکردنەوەیەکی درێژ بووە هۆی دەرکردنی بۆچوونێکی لەناوبەر.

* زۆرێک لە خەڵکی بۆچوونی خۆیان تەواو دەرناخەن تەنها لە کاتە تەنگەژەکاندا نەبێت، خوداش ئەو کاتە سەختانە دەهێنێتە پێش، تاکوو ناخیان

دەربکەوێت: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَاْ أَخْبَارَكُمْ﴾ [محمد: ٣١] «سوێند بە خوا تاقییان دەکەینەوە تا دەری بخەین و دیاربێت موجاهیدان و خۆڕاگرانتان و تا هەواڵتان چییە، ئاشکرای کەن.»

* بنەڕەت و بنچینەی هەموو فکرە تازەکان لە کۆن و لە پێشتردا بوونی هەبووە، وەک بنەڕەتی ماددە خامەکان، بەڵام ئەقڵ تەنها دایدەڕێژێت و تێکەڵی دەکات لەگەڵ شتانی دیکەدا و دەیکاتە داهێنان، کەوابوو ئەقڵ ئەو شتانەی بوونیان هەیە دایان دەڕێژێت، نەک شتانێک پەیدا بکات.

* خودا بنچینەی زانستی بەدیهێناوە وەک چۆن بنچینەی مادە خامەکانی بەدیهێناوە. لای خودا زاندراوە ئەقڵ ناتوانێت لە شێوازی خۆی دەربچێت، هەرچەندە هەوڵ بدات، بۆیە دەفەرموویت: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ [الإسراء: ٨٥] «ئێوە تەنیا کەمێک لە زانیاریتان پێ بەخشراوە.»

* بیروباوەڕ و فکرە خراپەکان شاراوەن لە دەروونددا، تەنها لە شێوەی هەستدان یان قسەی دەروونن، لەوانەیە بۆچوون بن و ترسیان لە دەربڕینی هەبێت، هەرکات پاڵپشتیان پەیدا کرد، ئەوکات لە دەمەوە دێنە دەر، گەورەترین پاڵپشت بۆیان پاڵپشتی دەسەڵاتدارە خراپەکانە بۆیان.

* شەڕ و خراپەکان لە دەرووندا شاراوەن، جا کاتێک کەسەکان دڵنیا و ئەمین بوون لە سزانەدانیان لەلایەن سەرکردەوە، ئەوکات شەڕ و خراپەیان دەردەبڕن، بیشری مەریسی پێشەوایەک بوو لە گومڕاییدا، بەڵام بێدەنگ بوو تا ئەو کاتەی هارووونە ڕەشید مرد و مەئموون هاتە شوێنی.

* پیاوێک چووە بەهەشتەوە بە لابردنی درەختێک لەسەر ڕێگەی خەڵکی، جا دەبێت چۆن بێت بۆ ئەو کەسەی بیروباوەڕە خراپ و گومانە خراپەکان لە مێشک و دەروونی خەڵکیدا لادەبات، لە فەرموودەدا هاتووە: «پیاوێک چووە بەهەشتەوە بە هۆی درەختێکەوە کە لەسەر ڕێگەی خەڵکی بوو لای برد.»

* فێربوونی فکرە تازەپەیدابووەکان لەگەڵ هەبوونی زانستدا هۆکاری پارێزراوین، هەروەها فێربوونیان واجبە بۆ پاراستنی موسڵمانان، حوزەیفە دەڵێت: "خەڵکی پرسیاری خێر و چاکەیان لە پەیامبەر دەکرد، منیش پرسیاری شەڕ و پێشهاتە خراپەکانم دەکرد لەترسی ئەوەی تێیان بکەوم."

* ئەو فکرە باتڵ و ناهەقانەی لەسەر هەواوئارەزوو بنیات دەندرێن بریتین لە خۆفرۆشی و کۆیلایەتی، هەندێک لە خەڵکی خۆیان فرۆشتووە و بوونەتە کۆیلەی ئەو فکرانە بە شوێنکەوتنیان، لەکاتێکدا وا گومان دەبەن کە ئازادن: ﴿بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ [البقرة: ٩٠]

«شتێکی زۆر خراپ بوو کە خۆیانیان پێ فرۆشت (ئەو خراپەش) بێبڕواییيان بوو بەو قورئانەی کە خوا ناردوويەتييە خوارەوە.»

* ئەگەر فکر و بیروباوەڕە خراپەکان خەڵکیان تووشی پەرکەل و فێ بکردایە وەک چۆن خواردنە خراپەکان تووشی فێیان دەکەن، ئەوکات ژیرەکان پێویستیان بە ماندوبوون نەدەبوو لەکاتی مشتومڕدا، سەیرە خەڵکی خۆیان دەپارێزن لە نەخۆشی جەستە و کۆمەڵانێکیش تووشی بەڵا بوون بە هۆی ئەقڵیانەوە.

* زۆرینەی فکر و بیروباوەڕە پووچەکان بەشێکی هەقیان تیادایە، ئەقڵگەلێک ئەو هەقە گەورە دەکەن، چونکە لەگەڵ هەواوئارەزوویان دەگونجێت، ناکۆکییەکە لەسەر ئەندازە و قەبارەی ئەو هەقەیە نەک لەسەر بوونی.

* شەپۆلی فکرەکان وەک شەپۆلی نەخۆشین بۆ جەستە، تا سەر و بەردەوام نامێنن، دەوری ئوممەت دەدەن و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ سروشتە دروستەکەیان: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾ [الروم: ٣٠] «ئەو ئایینە پاکە، ئەو فیترەتە پاکەیە کە خوای گەورە خەڵکی خستووەتە سەری، هیچ گۆڕانێک بەسەر دروستکراوی خوای گەورە نایەت.»

* فکر و زانست بۆشاییان هەیە وەک بۆشایی هەوا و ژینگە، هەمووان دەتوانن ئەو ژینگەیەی هەیانە پڕی بکەن لە پیسی و ژەهر، بەڵام هەر دەبێت ئەو ژینگەیە بگەڕێتەوە بۆ سەرەتای پێش پیسبوونی، ژینگەی پاک بناسە بەهۆیەوە ژینگەی پیس دەناسیتەوە.

* بیروباوەڕکان هاوشێوەی یەکترن، لە ڕێگەی زەواج و داوێنپیسی و هاوڕەگەزبازییەوە یەک دەگرن: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾ [یس: ٣٦]

«بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەموو جووتەکانی دروستکردووە لە هەموو ئەوانەی زەوی ئەیڕوێنێت و لە خۆیان و لە هەرچییەک کە نایزانن.»

قورئانی پیرۆز بەرەنگاری گشت فکرە چەوتەکان بووەتەوە.

* هەر ماڵێک بە پەلە و خێرا بنیاتنرابێت، ئەوا لاوازە و زوو دەڕووخێت. هەر بیروباوەڕێک بە یەک جار دەربکەوێت و بەپلەبەندی قۆناغەکانی تێنەپەڕاندبێت، بزانە ئەوە سەرەتای بەرەو ئاوابوون و لەناوچوونیەتی، هەر کەسێک ببێتە سەرکردە بێ ئەوەی قۆناغەکان ببڕێت ئەوا بەرەو لەناوچوون دەڕوات، وەک چۆن ئەو نەیزەکانەی دەکەون دیارترن لەوانەی کە جێگیرن.

* شوێن خاڵە وردەکانی فکرەکان دەکەون وەک چۆن منداڵ بۆ فێربوونی نووسین شوێن خاڵە کێشراوەکانی مامۆستاکەی دەکەوێت، هیچ شتێک دەربارەی فکرەکانیان نازانن تەنها لە کاتی وەستانیان لە کۆتا خاڵدا نەبێت:

"نقطتموا لهم وهم خطوا على

نقط لكم كمعلم الصبيان."

* بۆچوونە نامۆکان لە دەرووندا شاراوەن، فیترەت و ئایین و ترسان لە خەڵکی هۆکارن بۆ دەرنەکەوتن و بەند بوونیان، خۆئەگەر سروشت بە ئارەزوو لاچوو،

هەروەها ئایین بە لەڕێدەرچوون لاچوو و ترسیش بە پارێزرابوونی خاوەنەکەی لەلایەن سەرکردەوە لاچوو، ئەوکات دەبینیت بۆچوونە نامۆ و ناپەسەندەکان دەردەکەون.

* هەموو شەپۆلێکی فکری کە خەڵکی ڕووی تێ دەکەن، دەبینیت کەسێک لەوەو پێش دایمەزراندوە، هەمووان وا گومان دەبەن پێشەنگ و سەرمەشق بن لە کاتێکدا خۆیان شوێنکەوتووی کەسانی دیکەن، بە دەوری خەڵکیدا دەسووڕێنەوە بەرەو هەر کوێیەک بسووڕێنەوە، بەو مەرجەی پاشکۆ بن بۆ ئەوان.

* دەگونجێت جەستە تووشی نەخۆشییە شاراوەکان ببێت و هیچ دەرکەوتەیەکی نەبێت تا هەموو جەستەی دەگرێتەوە و دەیکوژێت، ئەوا ئەقڵیش هاوشێوەی ئەو نەخۆشییانەی هەیە پێویستە بزاندرێت تاکوو بۆچوونەکانی خراپ نەکات و دینی لەناو بەرێت.

* هەڵەشەبوون و خەمخۆری خاوەن فکرە چەوتەکان لە فکریان و خۆشەویستیان بۆی، ئەوە بەلاڕێدا بردنە لەلایەن خوداوە بۆیان: ﴿أَرۡسَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمۡ أَزّٗا﴾ [مريم: ٨٣] «ئێمە شەیتانەکانمان زاڵ کردووە بەسەر بێباوەڕان تا چاک هانیان دەدەن بۆ کوفر و تاوان.»

واتە: هانیان دەدەن و سووریان دەکەن لەسەر فکرەکانیان.

* خەریکە بڵێین شەیتانە جن و مرۆڤەکان لە هیچ شتێکدا یاریدەی یەکتری نەبوون بەهێندەی یاریدەی یەکتری لەسەر دروستکردنی فکرە چەوتەکان، هەر ئەمەش نهێنی بەهێزبوونی باتڵ و ناهەقانە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ﴾ [الأنعام: ١١٢] «هەر بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێک دوژمنێکمان داناوە لە شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە کە بە نهێنی بە یەکتری ڕادەگەیەنن.»

* بیرکردنەوەی بە کۆمەڵ وادەکات ئەقڵ ئازادی لەدەست بدات و ڕەچاوی ئەوانی تر بکات، بۆیە خودا فەرمان دەکات بەتەنیا بیربکەنەوە: ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍۚ﴾ [سبأ: ٤٦] «بڵێ تەنیا بە یەک ش ئامۆژگاریتان دەکەم، کە دوو دوو و یەک یەک لەبەر خوا هەڵسن، پاشان بیربکەنەوە، هاوڕێکەتان (پێغەمبەر (ﷺ)) شێت نییە.»

* پەرتووکەکان وەک هاوڕێن. پێویستە خوێنەر خۆی بپارێزێت لە پەرتووکگەلێک وەک چۆن خۆی دەپارێزێت لە هاوڕێیەتی کەسانێک، خوێنەر کاریگەر دەبێت بە پەرتووکی خراپ وەک چۆن خەڵکی کاریگەر دەبن بە هاوڕێی خراپ.

* ڕێگری کردن لە کەسانی سەرەتایی لە خوێندنەوەی پەرتووکە لادەرەکان، هۆکاری ترسانی ئیسلام نییە، بەڵکوو ترسی لەڕێدەرچوونی خوێنەرەکانە. ئەقڵە بەهێزەکان بە ئاسانی دەتوانن بەسەر ئەقڵە لاوازەکاندا سەربکەون وەک چۆن جەستە بەهێزەکان بەسەر جەستە لاوازەکاندا سەردەکەون.

* زۆرێک لە وانەی تووشی لادانی فکری بوون ئەوانەن کە خوێنەری پەرتووکە لادەرەکانن لەکاتێکدا زۆر لە خۆیان دڵنیا بوون لەوەی گۆڕانیان بەسەردا نایات، بەڵکوو تەنها بۆ زانیاری زیاتر دەیخوێننەوە، لە شتانێک ئەمین مەبە تووشی بیت کە خودا هۆشداری بە پەیامبەرەکەی داوە دەربارەیان: ﴿وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ [المائدة: ٤٩] «وریابە لێیان لەوەی بتترازێنن لە هەندێک لەوەی خوا ناردوویەتییە خوارەوە.»

* ئەو گۆڕان و دەستکاریکردنەی بەسەر تەورات و ئینجیلدا هاتووە، خودا داویەتە پاڵ زانا و ڕاهیبەکانیان، ئەوانیش بەو شێوە گۆڕاوەی کە گۆڕییان دایانەوە پاڵ خودا، خوداش پەیامبەرەکەی لەو بابەتە ئاگەدار دەکاتەوە چونکە درۆ هەڵبەستنە بە ناوی خوداوە. ئایا ئەقڵی هیچ کەس ئەوە قبووڵ دەکات کە بڕیارێکی ساختە بە ناوی پاشایەکەوە بڵاو بکرێتەوە و بدرێتە پاڵ ئەو.

* پەیامبەری خودا تەوراتێکی بەدەست عومەرەوە دیت فەرمووی: «أمتهوكون! لقد جئتكم بها بيضاء نقية والذي نفسي بيده! لو أن موسى حي لاتبعني» «ئەوە لە دوودڵیدان، سوێندبێت بە ئایینێکی تەواو ڕاست و ڕۆشنەوە هاتووم بۆ لاتان. سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر مووسا زیندوو بووبا، ئەوا شوێنم دەکەوت.»

* ڕێگری لە پەرتووکە سیاسییە لادەرەکان و پەرتووکە توندڕەوەکان دەکەن لەترسی گاریگەربوونی خەڵکی پێیان، بەڵام دەبینیت ئەو پەرتووکانەی لادەرە عەقیدەییان تیادایە ڕێگەیان پێ دەدرێت بڵاوبکرێنەوە، دەڵێن خەڵکی بە ئەقڵی خۆیان دەتوان جیایان بکەنەوە! ئەمەیان جیادەکەنەوە، بەڵام ئەوەیان جیا ناکەنەوە!

* فرۆشتنی پەرتووکە کوفری و ئیلحادییەکان زۆر ترسناکتر و گەورەترە لە فرۆشتنی چەک بۆ کوشتار، پاراستنی باوەڕی خەڵکی لەپێشترە لە پاراستنی خەڵکی: ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ﴾ [البقرة: ٢١٧)

«هەوڵدان بۆ پەشیمانکردنەوەی موسڵمان گەورەترە لە (پیاو) کوشتن.»

(فیتنة) لەم ئایەتەدا بەواتای کوفر دێت بە کۆدەنگی موسڵمانان.

* نووسەری بەکرێگیراو هیچ هزرێک بەرهەم ناهێنێت، نە نیشتیمان دەپارێزێت و نە دۆستایەتی دروست دەکات و نە دوژمن دەترسێنێت، کاتێک بترسێندرێت یان دەسکەوتی بدرێتێ دەنووسێت، خۆ ئەگەر ترسی نەما و تێر بوو نانووسێت.

* هەموو کەسێک دەتواندرێت گفتوگۆ و مناقەشەی لەگەڵدا بکرێت، تەنها نووسەرێکی بەکرێگیراو نەبێت، چونکە ئەوەی لە هەگبەیدایە خۆی خاوەنی نییە و ناتوانێت وەڵام بداتەوە.

* بەکرێگیراوەکان ناتوانن شکست بە هەق بهێنن، قورەیش دوو هەزار حەبەشی بەکرێ گرت بۆ جەنگ، بەڵام هەر شکستیان هێنا: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ﴾ [الأنفال: ٣٦]

«بەڕاستی ئەوانەی کە بێباوەڕن ماڵ و سامانیان خەرج دەکەن بۆئەوی بەرهەڵستیی ڕێگەی خودا بکەن، جا لەمەودوا (ماڵ و سامانیان) بەخت دەکەن و دەیبەخشن، لەپاشان دەبێت بە داخ و پەژارە بۆیان و پاشان ژێردەکەون.»

* ماڵ و سامان هۆکارێکە دەتوانیت مرۆڤانێک و بۆچوونەکانیانی پێ بکڕیتەوە، بەڵام ئەمە تەنها لای مرۆڤەکان دەخوات نەک لای خودا: ﴿وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ﴾ [الزمر: ٤٧] «بەڕاستی ئەگەر هی ئەو کەسانە بووایە، ستەمیان کرد هەموو ئەوەی لەسەر زەویدایە، ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت لەبرێتی خۆیاندا دەیاندا بۆ ڕزگاربوونیان لە سزای خراپی ڕۆژی قیامەت.»

* دەست هۆکارە بۆ تۆقەکردن، هەرکەس تۆقەی لەگەڵ ئەقڵ و دڵەکان پێ کرد، ئەوا شکۆی بەدەست هێناوە؛ بەڵام ئەوکەسەی تۆقەی لەگەڵ گیرفاندا پێ دەکات، سەرشۆڕ و زەلیل بووە.

* ئەو کەسەی باوەڕ و بۆچوونە سەرەکییەکانی بۆ پارە دەگۆڕێت، ئەوە بێگومان دووڕووی لە دڵیدا هەیە: ﴿فَإِنْ أُعْطُوا۟ مِنْهَا رَضُوا۟ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا۟ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ﴾ [التوبة: ٥٨] «خۆ ئەگەر لەو خێر و سەدەقەیان پێ بدرێت، ڕازی دەبن؛ ئەگەر پێیان نەدرێت لێی، ئەو کاتە تووڕە و ناڕازی دەبن.»

* بتپەرستی سەردەمی نەفامی بتپەرستی بەرد و دار بووە، بەڵام بتپەرستی ئێستا بتپەرستی فکر و بۆچوونەکانە.

* فیتنە و تاقیکردنەوەی ئەمڕۆ بەهۆی فکر و بۆچوونەکانەوە هاوشێوەی فیتنەی قوڕەیشە بە بت و بەردەکان، نەقڵیان وازلێهێناوە و هەموو شتێک لە ئەقڵ دەخوازن، ئەبوو ڕەجا دەڵێت: "ئێمە بت و بەردمان دەپەرست، ئەگەر بەردێکی باشترمان بدیبا، ئەوەی خۆمان فڕێ دەدا و باشەکەمان دەپەرست. خۆ ئەگەر بەردمان دەست نەکەوتایە، گڵمان کۆ دەکردەوە و پاشان مەڕێکمان دەهێنا لەسەری دەمان دۆشی پاشان تەوافمان بەدەوردا دەکرد. لە سنوورێکدا کۆتایی بە فکر و بۆچوونەکانیان ناهێنن، بەو شێوەیە دەسووڕێنەوە و پاشان دەگەڕێنەوە.

* ئەو کەسەی لەسەر فکر و بۆچوونەکان یاری بکات و هەر ڕۆژێک فکرێکی هەبێت، ئەوا هیچ ڕەگێکی داچەسپاوی نییە لە زەوی زانستدا، چونکە با بەزۆری پووش و پەلاشی زەوی هەڵدەداتەوە.

* سەرهەڵدانی فکر و بیروباوەڕە پووچ و ناهەقەکان بەهۆی ئەوەوەیە خەڵکی دەربارەی هەق نازانن و گومانی خراپ بە خاوەن هەقەکانیش دەبەن.

* بنەڕەتی لادانی فکر و بیروباوەڕەکان ئەوەیە کە لەسەر گومان هەڵچندراون، نەک لەسەر ڕاستی و هەق: ﴿وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا﴾ [النجم: ٢٨] «لەکاتێکدا هیچ زانیارییەکیان دەربارەی نییە، تەنیا دوای گومان دەکەون. بەڕاستی گومان هیچ سوودێکی نییە لە زانینی هەق و ڕاستیدا.

* زۆرێک لە فکر و بیروباوەڕەکان لەسەر گومان هەڵدەچندرێن، بەڵام لە شێوەی یەقین و دڵنیاییدا دایاندەڕێژن، چونکە ئەو بیروباوەڕە خوازراوە وای لێدەکات ببێتە یەقین لای لای ئەو دەروونە: ﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا﴾ [یونس: ٣٦] «زۆربەیان شوێن هیچ ناکەون جگە لە گومان، بەڕاستی گومان لەئاست حەقدا هیچ سوودێک (بە خاوەنەکەی) ناگەیەنێت.»

* ئەگەر مرۆڤ بڕوانێتە ژیانی پەیامبەران و شوێنکەوتووانیان، ئاواتەخواز دەبێت تاکێک بووبا لە ئەوان، بەڵام کاتێک دەبینێت ئەوەی بەسەردێت کە بەسەر ئەوان هاتوون، ناتوانێت ئارام بگرێت لەسەریان. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە نەفس دان بە هەقدا دەنێت بەڵام ئارام ناگرێت لەسەری، پاشان ئەگەر وازی لێ بهێنێت بەڵگە بۆ وازهێنانەکەی دەهێنێتەوە، پاشان دەیکاتە ڕێباز بۆ خۆی، بەم جۆرە زۆرینەی ڕێبازە چەوتەکان دامەزراون.

* هەموو ئەو بابەتە ناکۆکانەی ناحەزانی پەیامبەران دژایەتی پەیامبەرانیان پێ کردووە لەسەر لێکدانەوە ئەقڵییەکانیان وەستاوە، پاشان بانگەشەی تێنەگەیشتن و گونجاونەبوونی وەحییان دەکرد و لەگەڵ سەردەم و قازانجیاندا.

* زۆرێک لە لادانە ئەقڵییەکان کاتێک ویستویانە بیروباوەڕێک دابمەزرێنن، لەسەر نموونەی کەموکورت دایانمەزراندووە: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ--قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ [یس: ٧٨-٧٩] «نموونە لە دژی ئێمە دەهێنێتەوە و دروستکردنی خۆی لەبیردەکات، دەڵێت: کێ ئێسکە ڕزیوەکان زیندوو دەکاتەوە؟ بڵێ: ئەو زاتەی یەکەمجار بەدییهێنا، زیندووی دەکاتەوە.»

* هەندێک لە قوتابخانە فکرییەکان دامەزراندنیان بەوتەیەکی خاوەنەکەیان دەستی پێ کردووە کاتێک بەخێرایی دەری بڕیوە بەبێ بیرکردنەوە، پاشان خەڵکانێک بەرپەرچی ئەو وتەیەیان داوەتەوە، ئەویش دەمارگیری بۆ سەرخستنی خۆی گرتوویەتی و مناقەشەی لەسەر کردووە، پاشان ملی بەڵگەکانی بۆ شکاندووە تا دایمەزراندووە و پاشان خەڵکی شوێنی کەوتوون.

* هەر شتێک لە مێشکتدا ئامادەبێت لە کاتی دانانی فکر و بۆچوونێک کاریگەری دەخاتە سەر حوکم و بڕیارەکانت، دەبینیت زۆرێک لە خاوەن فکرەکان کاتێک فکرەکەیان دەخرێتە ناو تای تەرازوویەک، شتانێک پەیوەست

بوون پێیەوە هیچ پەیوەندییان نییە بەو فکرەیەوە بەڵام کاری تێ کردووە و کێشی زیاد کردوون.

* هەموو فکر و بۆچوونێک دەتوانیت بە بیرکردنەوە لێی وا بکەی باوەڕ بە خۆت بهێنیت دەربارەیان، غاندی دەڵێت: "دایکم دوو ساڵ شیری پێداوم و داوام لێ دەکات بەدرێژایی تەمەنم خزمەتی بکەم، بەپێچەوانەی مانگاوە بەردەوام شیرم پێ دەدات بەبێ ئەوەی چاکەی لەگەڵ بکەم." بۆیە مانگای پەرستووە، ئەوان دین و دونیایان بەستووەتەوە بەوەی کام دوو شیردانە گەورەترە و بابەتەکانی دیکەی فەرامۆش کردووە، زۆرێک لەوانەی ئەقڵیان بەکارناهێنن، بە بابەتە لاوەکییەکانەوە سەرقاڵ دەبن و واز لە بابەتە سەرەکییەکان دەهێنن.

* دڵخۆشی و دڵئارامی دەروونیت دەربارەی بۆچوونەکانت واتای ڕاستی و دروستی بۆچوونەکانت ناگەیەنن: ﴿فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٨١] «بەجێهێڵراوان (لە مەدینەدا) دڵخۆش بوون بە دانیشتن و بەجێمانیان لە پێغەمبەری خوا.»

بەڵکوو لەوانەیە بتگەیەنێتە ئاستی پێکەنین هێندە دڵخۆش بیت بە باتڵ و پوچەڵیەکەت ﴿فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلًا وَلْيَبْكُواْ كَثِيرًا﴾ [التوبة: ٨٢] «دەی با کەم پێبکەنن و زۆر بگرین."

* هەندێکجار مرۆڤ بەهۆی بۆچوونەکانییەوە دەگاتە پلەی بێمێشکی، لە کاتێکدا وا گومان دەبات لە گەورەترین ئاستی ئەقڵدایە. ئارامی دەروونت بە بۆچوونەکانت نایانکات بە هەق: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ﴾ [البقرة: ١٣]

«ئاگادار بن کە هەر ئەوانە خۆیان کەم عەقڵ و گێل و نەفامن، بەڵام بۆ خۆیان نازانن.»

* هەندێک جار بۆچوونێک بە چاک و باش دەبینیت لەکاتێکدا گومڕاییە، گومانی ڕێنمووی پێ دەبەیت، کەچی سەرلێ شێواوییە، خودا دەفەرمووێت: ﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا﴾ [فاطر: ٨]

«دەی ئایا کەسێک کە کردەوەی خراپی خۆی بۆ جوان کراوە، بە چاک و جوانی دەیبینێت.»

* هەندێک جار مرۆڤ دەم وەردەدات لە بۆچوونێکی پووچ و ناهەق و دەمارگیری بۆی دەبێت، جا دڵ وابەستبوونی لەسەر ئەو بۆچوونە بەڵگە نییە لەسەر هەقبوونی. هەرچەند تێکۆشان بکات لە خۆشویستنی ئەو بۆچوونەیدا، هێشتا ناگات بە نەوەکانی ئیسرائیل لە خۆشویستنیان بۆ گوێرەکەکە: ﴿وَأُشْرِبُواْ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ﴾ [البقرة: ٩٣] «بەهۆی بێباوەڕییانەوە دڵیان ئاودرابوو بە خۆشەویستی گوێرەکەکە.»

* حەز و ئارەزوو و بۆچوونی نەفس و خوازراوبوونی شتێک لە ناخدا هۆکار نیین شتەکان بکەن بە هەق، بەڵکوو هەندێکجار دەبێتە تێکدانی گەردوون: ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾ [المؤمنون: ٧١] «ئەگەر هەق و ڕاستی شوێن هەواوئارەزووی ئەوان بکەوتایە، ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەی تێیاندایە، دەشێوان و تێکدەچوون بەسەریەکدا.»

* بۆچوونەکان نابنە هەق بەتەنها بەسەرسام بوون و باوەڕبوون پێیان ﴿ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾ [الكهف: ١٠٤] «لە ژیانی دونیادا واشیان گومان دەبرد کە بەڕاستی ئەوان کارێکی زۆر چاک دەکەن.»

خودا چەندان حوکمی هەیە کە پێچەوانەن لەگەڵ ئەو ئەقڵە کەمەی ئێمەدا.

* شەڕ و خراپە وا ناخوازێت ئەوکەسەی باوەڕی پێی بێت باوەڕی بە خراپیەکەی بێت، زۆرجار بەرگری لە خراپە دەکەن و جەنگی لەسەر دەکەن، وا گومان دەبەن کە خێر و چاکەیە: ﴿تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ﴾ [النحل: ٦٣] «سوێند بە خوا بەڕاستی پێغەمبەرانمان لەپێش تۆ ناردووە بۆ سەر گەلانی زۆر، جا شەیتان کردەوەی (بەد)یانی بۆ ڕازاندنەوە، بۆیە ئەمڕۆ (شەیتان) پشتیوانیانە.»

* گومڕایی مرۆڤ ئەوە لەخۆناگرێت کە خۆی بزانێت لەسەر گومڕاییە، بەدڵبوون و پەسەندکردنی بۆچوونێک بۆچوونەکە ناکات بە هەق: ﴿إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ [الأعراف: ٣٠]

«بەڕاستی ئەوانە شەیتانەکانیان کرد بە دۆست و پشتیوانی خۆیان لەجیاتی خوا، واش گومان دەبەن کە ڕێنموونی کراون.»

* باوەڕبوون بە فکر و بۆچوونێک و بانگەشە بۆکردنی بە دڵسۆزی ئەوە ناگەیەنێت خاوەنەکەی لەسەر هەقە: ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ [الزخرف: ٣٧]

«بێگومان ئەوانە (شەیتانەکان) لە ڕێگای ڕاست بەرگرییان دەکەن واش دەزانن بەبێگومان هەر ئەوانن ڕێنووین.»

دەربازبووان تەنیا ئەوانەن کە خودا دەربازیان دەکات.

* دڵئارامی و دڵخۆشبوونی مرۆڤ بە بۆچوونێک نایکات بە هەق، هەندێک جار مرۆڤ کافر دەبێت بە دڵخۆشی زۆر، هەندێکیش بەزۆرلێکردن باوەڕ دەهێنن: ﴿وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ [النحل: ١٠٦]

«بەڵام کەسێک دڵی خۆش و شادمان بێت، بە بێباوەڕی ئەوە بەر خەشم و قینی خوا کەوتوون.»

* نەفس پێوەرێکی ورد نییە بۆ پێوانی هەق و باتڵ، چونکە دەروونەکان جیاواز شتەکان دەپێون، لە کاتێکدا پێوەر و تەرازووی تەواو و دروست نابێت بگۆڕێت کاتێک شتگەلێکی هاوشێوەی پێ سەنگ بکرێت هەرچەندە ژمارە شتەکانیش زۆر بێت، بۆیە وەحی و سرووش هاتووە بۆ ڕێکخستنیان.

* دەروون باتڵ و ناهەقی دەڕازێنێتەوە تا واگومان دەبات هەقە: ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ [الزخرف: ٣٧]

* هەموو بۆچوونێک شوێنکەوتووی هەیە هەرچەندە بۆ پەرستنی شەیتانیش بێت. ناکۆکی لەبەر ئازادی ڕادەربڕینی سەرەتا نییە، بەڵکوو لەسەر ئەنجامە کۆتاییەکەیەتی.

* خودا بۆچوونە نامۆکانی دروست کردووە، وەک چۆن ژەهری خواردنی دروست کردووە، ئازادی بۆچوونی نامۆ وەک خواردنی ژەهرە، خودا چاکە و خراپەی دروست کردووە بۆ تاقیکردنەوەی خەڵک، نەک بۆ سەرپشکبوون.

* بۆچوونەکان بە هەواوئارەزوو دەشێوێن، هەواوئارەزووش بە قیاس و چواندن، هەموو قیاسێکێ ناڕەوا، قیاسێکی دروست هەڵی دەوەشێنێتەوە: ﴿قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ—قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ [یس: ٧٨-٧٩]

«نموونە لە دژی ئێمە دەهێنێتەوە و دروستکردنی خۆی لەبیر دەکات. دەڵێت: کێ ئێسکە ڕزیوەکان زیندوو دەکاتەوە؟ بڵێ: ئەو زاتەی یەکەمجار بەدیهێنا زیندووی دەکاتەوە.»

* هەواوئارەزوو ژەهرە بۆ ئەقڵ، هەرکەس پێوەی ئالوودە ببێت بۆچوونەکانی خراپ دەکات.

* هەواوئارەزوو ژەهرە بۆ ئەقڵ، فکرەکانی پێوەیان ئالوودە دەبن و دەبنە هۆی لەناوبردنی خاوەنەکانیان و ئەو کەسانەشی کە کاریگەردەبن پێیان: ﴿وَلَا

ـطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا﴾ [الكهف: ٢٨]

«بەگوێی کەسێک مەکە کە دڵی لە یادی خۆمان بێئاگا کردووە و شوێنی هەوا و ئارەزووی خۆی کەوتووە و هەموو کارەکانی خراپ و لەسنوور دەرچووە.»

* ئەگەر هەواوئارەزوو بڕیار بەسەر بۆچوونەکاندا بدات، ئەوا تووشی لادانی دەکات: ﴿فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ﴾ [طه: ١٦]

«جا با لاتنەدات لێی ئەو کەسەی باوەڕی نییە بەو (قیامەتە) و شوێن هەواوئارەزووی خۆی کەوتووە، ئەوسا تیادەچیت.»

* دروسترین بۆچوون و فکر ئەوەیە لە ئەقڵێکەوە دەربچێت کە نە تەماع و نە ترس کاری تێ نەکردبێت.

* پشت نابەسترێت بە فکر و بیروباوەڕی ئەو کەسانەی ترس و تەماع بەسەریاندا زاڵە، ئەو جۆرە کەسانە زۆرترین گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، هەرکات ڕێڕەوی ترس و تەماع گۆڕا، ئەوانیش دەگۆڕێن.

* زۆرێک لە باوەڕی خەڵکی لەژێر پەردەی ترس و تەماع شاردراوەتەوە، کاتێک ئەوپەردەیە لادرا، دەردەکەون.

* ئەقڵ ناتوانێت خۆی دەرباز بکات لە کارتێکەرەکان، چونکە وەک ئیسفنج وایە، ئەو شتانەی دەیانگرێتە خۆ بەئاسانی ناتوانێ لایان بدات، خودا دەربارەی دڵ دەفەرموویت: ﴿وَأُشْرِبُواْ فِى قُلُوبِهِمُ﴾ [البقرة: ٩٣]

دەگوترێ (أشرب القلب كذا) واتە: تێکەڵی بوو وەک چۆن ڕەنگ تێکەڵی پۆشاک دەبێت، بۆیە خودا هۆشداری داوە بە مرۆڤ لە تێکەڵبوونی بە خراپە تاکوو دڵ پارێزراو بێت، چونکە ئەوەی تێکەڵی بوو بە تەکاندن لاناچێت، بەڵکوو بە گووشین لادەچێت.

* هیچ ئاقڵێک دڵنیا نییە لەوەی بە وتە و بانگەوازی گومڕایان تێ نەگلێت هەرچەندە زانستی زۆریش بێت، خودا دەربارەی پەیامبەرە پارێزراوەکەی دەفەرموویت: ﴿وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا﴾ [الإسراء: ٧٤]

«خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان دامەزراو نەکردایە، بەڕاستی نزیک بوو تۆ کەمێک بەلایاندا بچیت.»

* ئەقڵ کاریگەر دەبێت بە کارتێکەرەکان وەک چۆن کانزاکان بە زەبر و پێکێشان کاریگەر دەبن، هەموو ئەقڵێک کاریگەر دەبێت بە دووبارەبوونەوەی باتڵ لەسەری، دەبینیت سەرەتا بەرپەرچی دەداتەوە، پاشان کەمێک لێی دوورە پەرێز دەبێت، پاشان کەم کەمە دەچێتە ناو دڵیەوە.

* زۆرێک لەوانەی سەرسامن بە هێزی جەستەیان، دەچنە ناو قەرەباڵغی خەڵکانێکی زۆرەوە، بەڵام دەبینیت بەر لێشاو دەکەون و لەگەڵ لێشاوەکە دەڕۆن، زۆرێکیش لەوانەی چوونەتە ناو گێژاو و قەرەباڵغی فکرەکان بە زانست و ئەقڵیان سەرسام بوون، بەڵام دەبینیت ئەمانیش بەر لێشاو کەوتوون و لە گەڵیان دەڕۆن!

* تێکەڵبوون لەگەڵ باتڵ و پووچەکان کاریگەری دەخاتە سەر بۆچوونەکانت: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ﴾ [النساء: ١١٣]

«ئەگەر بەخشش و بەزەیی خوا بەسەرتەوە نەبووایە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بێگومان دەستەیەک لەو ناپاکانە بەنیاز بوون کە گومڕات بکەن.»

ئەوە بۆ پەیامبەرە! جا کێ فەزڵ و بەخششی خودای وەک پەیامبەر بەسەرەوەیە، جا ئایا خەڵکی وەک ئەو دڵنیان لە جێگیریدان؟!

* فکرەکان وەکوو دەریا وان، هەرکەس لە مەلە نەزانێت، تیایدا دەخنکێت. سەلامەتی عەقڵ و بەهێزیی لاشە ئەوە ناگەیەنێت کە دەتوانیت مەلە

بکەیت، شارەزایی بە وشکانی خاوەنەکەی سوار شەپۆلەکانی دەریا ناکات، پێچەوانەکەشی دروستە.

* زۆر گوێبیستی هەڵە مەبە ئەگەر ئەمڕۆ بتوانیت جیایی بکەیتەوە، سبەی لەگەڵ هەق لێت تێکەڵ دەبێت. ئەقڵ وەک گۆزەیە ئەوەی ئەمڕۆ دەیزانیت تێی دەکەیت، سەرچاوەی سبەی نازانی لە کوێوەیە، پاشان وای لێ دێت بەبێ زانست دەیگێڕێتەوە.

* هەرکەس بەردەوام لەگەڵ خراپە و پیسی بێت، ئەوا هەست بە بۆنی ئەو پیسیە ناکات، فکرەکان وەک پیسییەکانن سەرەتا لێی ڕادەکەن، پاشان ئاسای دەبێتەوە لایان.

* پەیامبەر خەریک بوو بە وتەکانیان تووشی فیتنە ببێت و داشکاندنیان بۆ بکات لە کاتێکدا ئەو پەیامبەرە، جا دەبێت کەسانی دیکەی خوار ئەو چۆن بن: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا﴾ [الإسراء: ٧٣]

«بەڕاستی نزیک بوو ئەوانە لات بدەن لەوەی کە نیگامان کرد بۆت بۆئەوەی جگە لە قورئان شتێک بە ناوی ئێمە هەڵبەستیت (ئەگەر گوێڕایەڵیان بوویتایە) ئەوە لەو کاتەدا دەیان کردیت بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان.»

ئەوکات دەبیتە خۆشەویست و نزیکیان!

* تێکەڵی خاوەن باتڵەکان کاریگەری دەخەنە سەر بۆچوونەکانت: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُ لَهَمَّتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ أَنْ يُضِلُّوكَ﴾ [النساء ١١٣]، ئەوە پێغەمبەرە، جا کێ وەک ئەو فەزڵ و ڕەحمەتی خوای بەسەرەوەیە تاکوو وەکوو ئەم ئەمین بێت لەو ئاشووبە.

* دڵ کاریگەر دەبێت، ئەگەر ماوەیەکی زۆر تێکەڵی خراپە ببێت، بەئاسایی دەبینێت، وەک چۆن جەستە کاریگەر دەبێت ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر تێکەڵی

پیسی و خراپە ببێت. دەست سەرەتا بە بەرکەوتنی ئاوی گەرم ئازار دەچێژێت دواتر لای ئاسایی دەبێتەوە.

* زۆر گوێ لە هەڵە مەگرە ئەگەر ئەمڕۆش بیناسیتەوە سبەینێ لەگەڵ حەق لێت تێکەڵ دەبێت، عەقڵ گۆزەیەکە ئەوەی ئەمڕۆ دەیزانیت تێی دەخەیت و سبەینێش سەرچاوەکەی نازانیت، ئەوجا بەبێ زانست دەیڵێیتەوە.

* زۆر گوێبیستبوون بۆ ناهەقی و باتڵ، کاریگەری دەخاتە سەر باوەڕهێنان بە هەق، خودا هۆشداری داوە بە پەیامبەرە پارێزراوەکەی دەربارەی ئەو کارە: ﴿وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ [المائدة: ٤٩]

«وریا بە لێیان لەوەی بتترازێنن لە هەندێک لەوەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆت.»

* هەندێکجار مرۆڤ دەکەوێتە ناو بۆچوونە هەڵەکانی هاوڕێیەکی نزیکیەوە کە زۆرترین کات بەیەکەوە بوون و دانیشتوون: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ﴾ [الزخرف: ٣٨]

«هەتا کاتێک کە (دەمرێت و) دێتەوە لامان و دەڵێت: خۆزگە نێوانی من و تۆ بەقەدەر نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا بووایە، چ هاوڕێیەکی خراپ بوویت.»

* ئەمڕۆ کاردەکرێت بۆ پێوەری هاوڕێبوون لەگەڵ گشت چین و توێژە جیاوازە فکرییەکان، گەرچی لاڕێش بن، هەروەها کار دەکرێت بۆ خوێندنەوەی بیروڕاکانیان و دەڵێن ئەمە بەڵگەیە لەسەر لێبوردەیی وفراوانی بیرکردنەوە. ئەمە دابەزین نییە لە بنچینە و بیروباوەڕی خۆت، دوورترین مەودای جیاوازی بیروباوەڕ لەنێوان جوولەکە و موسڵمانە، لەگەڵ ئەمەش کاتێک هاتنە لای پێغەمبەری خوا، پەروەردگار پێی فەرموو ﴿وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ﴾ [المائدة: ٤٩]

«وریا بە لێیان لەوەی بتترازێنن لە هەندێک لەوەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆت.»

ئەم هۆشیارکردنەوەیە لە خەڵەتان بە جوولەکە ئاراستەی پێغەمبەری خوا کراوە، پەروەردگار ڕێگری لێ نەکرد کە تێکەڵ بێت لەگەڵیان بۆئەوەی حوکم بکات لەنێوانیان، بەڵکوو پێویستی کرد لەسەری کە وشیار بێت کاتێک لەگەڵیان کۆدەبێتەوە، گەر سەرپێییش بێت، ئەمە لە پلەوپایەی پێغەمبەرایەتی دایە، چەندین پیاو چاک و زانایان فریویان خواردووە بەو زانستەی هەیان بووە و دوو دەرگای تێکەڵاوبوونیان کردووەتەوە، هەنگاو بە هەنگاو تووشی بیری هەڵە بووە، لەکاتێکدا خۆی هەستیشی پێ نەکردووە، گۆڕینی بیروباوەڕ بە پلەبەندی وهێواش هێواش لە ئینساندا ڕوو دەدات، هەروەکوو چۆن ئاراستەی ڕووگای قیبلە هەنگاو بە هەنگاو لە ڕێبوار تێک دەچێت، تاوەکوو کاتێک دادەبەزێت بۆئەوەی نوێژ بکات ڕوو لە جگە لە ڕووگای قیبلە دەکات.

* فەلسەفە وەک گوریسێکی درێژی ئاڵۆزکاو وایە و خودا هەردوو سەری گوریسەکەی داوەتە دەست مرۆڤ بەبێ گەڕان بەشوێنیدا، کەچی مرۆڤ پشت هەڵدەکات و دەیەوێت خۆی بگەڕێت بەدوایدا، ئەگەر لە گوریسەکە دوورکەوتەوە، دەکەوێتە گومانەوە. خۆ ئەگەر نزیک بوویەوە، دڵنیا دەبێت. کەواتە بەردەوام لەنێوان گومان و دڵنیایدا دەسووڕێتەوە.

* دڵخۆشبوون بە فکرەکان و دوورکەوتنەوە لە قورئان بێبەش بوونە: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ [یونس: ٥٨]

«ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ هەر بەهۆی چاکە و میهرەبانی خواوەیە کەواتە با بەوە دڵخۆش بن، ئەوە چاکترە (بۆیان) لەوەی کۆی دەکەنەوە لە شتی ئەم دنیایە.

ئیبن عەباس دەڵێت: "فەزڵی خودا ئیسلامە و ڕەحمەتی خوداش قورئانە."

* هۆگربوون بە وتەی فەیلەسووفەکان و نارِەحەتبوون لە وتەی پەروەردگار نیشانەی لاوازی ئیمانە یان هەر نەبوونیەتی: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ [الزمر: ٤٥]

«کاتێک یادی خوا بکرێت بەتاک و تەنیا تێکدەچێت و بێزار دەبێت، دڵی کەسانێک کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە.»

* ئەگەر دڵ سەرقاڵ بوو بە شتانێک کە بە چاوی خۆی نەی دەبینین، ئەوا سوودی لە چاوی وەرنەگرتووە. ئەگەر دڵیش سەرقاڵ بوو بە خۆشەویستی فەیلەسووفەکانەوە، وتەکانی ئەوان دەبینێت و کوێر دەبێت لە ئاستی کۆمەڵە وتەیەک کە لە ئەوان گەورەتر و ڕێزدارترن کە هەموو چاوێک لە وەحیدا دەیبینێت.

# لیبراڵییەت و ئیلحاد

* پەیامبەری خودا هێڵێکی ڕاستی کێشا و کۆمەڵە هێڵێکی بچووکی لە ڕاست و چەپی ئەو هێڵەدا کێشا بۆ شەیتان، بەڵام بزانە عەلمانییەت بەشێک نییە لەو هێڵانە، بەڵکوو ئەو هێڵە بچووکانە هێڵی داهێندرا و لادەرانی ناو ئایینن، بەڵام هێڵی عەلمانییەت پێچەوانەی هەموو هێڵەکانە.

* لیبراڵییەت فکرێکە خاوەنەکانی بەرەهایی دایانناوە، پاشان بێدەسەڵات بوون لە وەستاندنیدا، جا هەموویان سەرقاڵی ملکەچکردنی ڕێگەن بۆی و دەبینیت هەموو بەربەستە ئایینی و سروشتیەکان لادەدەن کە دەبنە ڕێگریان.

* لیبراڵییەت لە خودی خۆیدا ترسێکی گەورە نییە لەسەر ئیسلام، بەڵکوو ئەو کاتە ترسناک دەبێت کە پۆشاکی ئیسلامی بەبەردا بکرێت و بە ناوی ئایینەوە بچێتە ناو دڵەکانەوە.

* لیبراڵییەت ڕێگەیەکە سەرەتاکەی هەواوئارەزوو و لەڕێدەرچوونە، ناوەندەکەی کوفرە و کۆتاییەکەی ئیلحاد و بێباوەڕییە، ناکرێت ئەم ڕێرەوە فکرییە تێپەڕێنیت بەم ڕێگەیەدا نەبێت!

* لیبراڵییەت دەزانن چۆن دەست پێ دەکەن، بەڵام سنوورێکیان دانەناوە چۆن کۆتایی پێ بهێنن، بە بانگەشەی "وازبهێنن با دەرببڕێت و وازبهێنن کار بکات" باسی ئەوە ناکەن چۆن دەرببڕێت و چۆن کار بکات، بە ڕاستی دەستیان پێ کرد بە چەوتی کۆتییان پێ هێنا.

* ئەقڵ سەرەتاکان جوان نیشان دەدات، بەڵام لە هەڵسەنگاندنی کۆتاییەکاندا گومڕایە.

* دژایەتی لیبڕاڵییەتی ئەمڕۆ دژایەتییە لەگەڵ سروشت و فیترەتی پاکی مرۆڤایەتی پێش دژایەتیکردنی دینیش، ئەو کەسەی زینا و هاوڕەگەزخوازی بە حەڵاڵ دەزانێت لە واجببوونی حیجاب تێناگات، تا سروشتی نەگەڕێتەوە سەر پاکێتیەکانی سەرەتا، لەو بابەتە تێناگات.

* لیبڕاڵییەت وەک گوریسێکە درێژ دەبێتەوە بە ئەندازەی دووریت لێیەوە، ئافرەتانی ڕۆژئاوا نزیکن لێیەوە بۆیە سنگیان هاوشێوەی پیاوان ڕووت دەکەن، ئافرەتانی ڕۆژهەڵات دوورن لێیەوە تەنها تێکەڵاوی گەڵ پیاوانیان وەرگرتووە. ڕاکێشانەکان جیاوازن، بەڵام کۆتایی هەموو ڕاکێشانەکان بۆ یەک ئەنجامن.

* ئیلحاد و بێدینی لە ڕۆژئاوادا دەرنەکەوت، تا ئەو کاتەی عەلمانییەت تەواو تێدا بڵاوبوویەوە، ئێستا نیوەی ئەورووپییەکان بێدین و مولحیدن. لە پەرستشی خودا هەڵهاتوون و کەوتوونەتە ناو پەرستشی مادەوە.

* لیبڕاڵییەت فکرێکی مادەگەراییە هیچ بنچینەیەکی بۆ بابەتە پەنهانی و غەیبییەکان نییە، خۆ ئەگەر بۆچوونەکانیان سەیر بکرێت، ئەوا لە ئیماندا وەک جەهمییەکانن و لە قەدەردا وەک موعتەزیلە و لە سیفاتدا وەک کەرامییەکانن، هەرچی سیاسەتیشە وەک خەواریج وان تیایدا.

* ئەقڵییەتی لیبڕاڵی باوەڕی بە شتێک نییە بە ناوی وەسوەسەی شەیتان و هەواوئارەزوو، لەگەڵ ئەوەشدا بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن کە فکرێکی گونجاوە کاری پێ بکرێت، ئەمە کرۆکی خراپەی ناو ئەم عەقڵەیە.

* فکری لیبڕاڵییەت لە ڕۆژی دوای و بابەتە پەنهانی و غەیبییەکان نادوێت کە لە ئیسلامدا بوونیان هەیە، بەڵکوو تەنها لە مادەگەرایدا ڕۆچووە، چونکە ئەگەر بەو شێوازە ئەقڵییەی خۆی لە بابەتی ڕۆژی دوای بدوێت ئەوا بێباوەڕی و ئیلحادی دەردەکەوێت.

* ئەگەر فکر جیابکرێتەوە لە بەهێزی و لاوازی دەسەڵات و مادەگەرایی ئەوا هیچ پێویستی نەدەکرد فکری ڕاست لە چەوت جیا بکرێتەوە، هێز و دەسەڵاتی ڕۆژئاوا چاو کوێر دەکات لەوەی هەڵسەنگاندن بۆ فکری عەلمانییەت بکەیت، بەڵام بە نەمانی ئەو دەسەڵاتەیان ئەو فکرەش تیادەچێت، وەک چۆن دەسەڵات ڕێگر بوو لەوەی فیرعەون وەک نەوەکانی ئیسرائیل بیر بکاتەوە: ﴿أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ﴾ [الزخرف:٥١]

«ئایا پادشایی میسر هی من نییە و ئەو ڕووبارانە بەژێر (کۆشکەکانی) مندا ناڕۆن.»

جاکاتێک فیرعەون تیاچوو، فکرەکەیشی تیاچوو، بەس تەنها هەق و ڕاستی مایەوە. ئەو فکرەیەی لە خودی خۆیدا دروست نییە و بەهۆی شتێکی دەرەکییەوە بە دروست دەزاندرێت، بە نەمانی ئەو شتە فکرەکەش دروستی لەدەست دەدات، هەر بۆیە مێژوو پڕە لەو فکرانەی گەورە و خاوەن هێز بوون، پاشان هەرەسیان هێناوە، چونکە هێز و گەورەییان بەهۆی شتێکی دیکەوە بووە.

* بڕیاردان لەسەر شتێک بە تێڕوانینێکی ماددی ڕووت و لابردنی حوکمی خودا، سەردەکێشێت بۆ بڕیاردان بە عاتیفە و سۆزی تایبەت لەسەر بابەتەکان: ﴿فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا—ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ﴾ [النجم: ٢٩-٣٠]

«دەی کەواتە تۆش وازبێنە لەو کەی پشت دهکاتە قورئان و یادی ئێمە وە بێجگە لە ژیانی دونیا هیچی ناوێت. ئەمە ئەوپەڕی زانیاری و تێگەیشتنیانە لە زانیاریدا.»

* مافەکان سێ جۆرن: مافی خودا لەسەر بەندەکانی، مافی بەندە لەسەر پەروەردگاری، و مافی بەندەکان لە دونیادا لەنێوان خۆیاندا، مادەگەرەکان توند دەست دەگرن بە مافە دونیاییەکانەوە و مافی دواڕۆژ پشتگوێ دەخەن.

* ئەقڵ هەڵە ناکات ئەگەر پارێزراو بێت لە ئارەزوو و گومان، لیبڕاڵییەتی ڕۆژئاوا کاریگەر بوون بە گومان و شوبهە، ڕۆژهەڵاتیش کاریگەر بوون بە ئارەزووات، ئیسلامیش هاتووە تا ئەقڵ بپارێزێت لە کاریگەرییە دەرەکییەکان.

* ئەقڵ و نەقڵ ئەگەر کۆبوونەوە، بۆچوونی دروستیان لێ بەرهەم دێت، لادانی هەر یەکێکیان هۆکاری گومڕاییە، لیبڕالییەت گومڕا بوون بە هۆی وەرگرتنی ئەقڵ و ڕەتکردنەوەی نەقڵ، ڕافیزەش گومڕا بوون بە وەرگرتنی نەقڵ و ڕەتکردنەوەی ئەقڵ.

* ئەقڵ بۆیە پێی دەگوترێت ئەقڵ چونکە ڕێگری لە نەفس دەکات و دەیگرێتەوە، نەک نەفس ڕێگری لە ئەو بکات و بەندی بکات، بەجۆرێک هەڵپەهەڵپی ببینێت و نەتوانێت ڕێگری بکات. لیبڕالییەت نەفس بەڕەهایی بەردەدات لەژێر پەردەی ئەقڵدا.

* ئەقڵ بۆیە پێی دەگوترێت ئەقڵ، چونکە ڕێگری لە نەفس دەکات و دەیگرێتەوە تا گومڕا نەبێت، ئیسلام بەو ڕێگرییە کەمانەی کە لە فەرمان و ڕێگرییەکانی شەرعدا هاتوون ئەو ناوەی بۆ عەقڵ داوە، چونکە ئیسلام تەنها ناوی دانەناوە بەبێ ناوەڕۆک. لیبڕالییەت یان دەبێت ناوی ئەقڵ جێگیر بکات و بە فەرمان و ڕێگری بیچەسپێنێت، یان دەبێت بگەڕێن بۆ ناوێکی دیکە و بەبەریدا بکەن.

* ئەگەر هەموو بەڵگە ئەقڵییەکانی ناو قورئان و سونەت کۆبکرێتەوە کە ئوممەتەکان لە بەرانبەر پێغەمبەران گرتوویانە، ئەوا دەبینیت بنەما ئەقڵییە لیبڕالییەکانیش هەردەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەوانە، بەڵام تەنها شێوازی دەربڕینیان گۆڕیوە.

* هەموو عەقیدە و بۆچوونەکانی ئوممەتانی پێشوو کە پەیامبەران دژی وەستاون، دەبێت ببێتە پڕۆژە بۆ خاوەنکانی لەناو فکری لیبڕالیدا، دژایەتیکردنیان زیادەڕەوی و لەڕێدەرچوونە و بە توندڕەوی وەسف دەکرێت.

* فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەزگایەکە ڕێکخەری ئازادییەکانە تا مرۆڤ لە سنووردەرنەچێت. بەڵام عەلمانییەت دەزگایەکە بۆ تێپەڕاندنی سنووری ئازادی تا سنوورەکان ڕێکنەخرێت.

* لیبڕاڵییەتی ڕۆژئاوا لیبڕاڵییەتی شوبهە و گومانە، بەڵام لیبڕالییەتی ڕۆژهەڵات لیبڕالیەتی شەهوەت و ئارەزووە، گومانەکان بە بەڵگە لەنێودەچن و شەهوەت و ئارەزووش بە شکۆداری هەق لەنێو دەچێت.

* ئەگەر هاوسەرگیری دووەم بکەیت بە ڕەزامەندی و گرێبەستی مارەیی، ئەوا کارێکی ڕێگەپێنەدراو و قەدەغەیە. خۆ ئەگەر بە ڕەزامەندی بە سەد دینار زینای لەگەڵدا بکرێت بەبێ گرێبەست، ئەوا بە کارێکی ئاسایی و ڕێگە دراو دادەندرێت. ئەمە خودی ئەو لیبڕاڵییەتەی ڕۆژئاوایە کە دەیانەوێت بیکەن بە یاسا.

* زۆرێک لەو پەرتووک و نامیلکانەم خوێندووەتەوە کە دەربارەی بنەماکانی لیبڕاڵییەتی ڕۆژئاوا نووسراون، ئەگەر لیبڕاڵییەت منداڵدان بووبا و منداڵی لێ بهاتایەدەر، ئەوا هیچ منداڵێکی تەندروستی لە ڕۆژهەڵات لێ نەدەهاتە دەرە، هەموویان منداڵی زیندووی ناکام و ناتەندروست دەبوون یان لەبار دەچوون و دەمردن.

* لە لیبڕاڵیەتی ڕۆژئاوادا هەر بڕیار و فەرمانێک دەسەڵات بەبێ گەل دەری بکات، ئەوا پێی دەگوترێت: «تاک ڕەوی»خۆ ئەگەر دەسەڵاتدار لەگەڵ لیبڕاڵیەت هاوڕا بوو، ئەوا دەسەڵاتدار ئەوکات «تاک ڕەوی ئاقڵانە و درەوشاوە»یە. خۆ ئەگەر سەرکردەیەک حوکمی خودا لەسەر خەڵکی بچەسپێنێت، ئەوا بڕیارەکانی «تاکڕەوییەکی دواکەوتووی و تاریکە» خۆ فەرزکردن و زۆرلێکردن لە هەردوو حاڵەتەکەدا بوونی هەیە، لە حەڵەتێکیان بە ڕەوای دەبینن و حاڵەتێکی دیکەشیان بە لەڕێدەرچوونی لەقەڵەم دەدەن. ئەمانە دوو قوتابخانەن لە

بەرانبەر یەکتری، شەریعەتی وەحی و شەریعەتی گومڕایی، خودا دەفەرمووێت:
﴿وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ﴾ [المائدة: ٤٩]

«(فەرمانمان پێ کردی) کە حوکم بکەی لەنێوانیاندا بەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە و شوێن حەز و ئارەزوویان نەکەوی، وریا بە لێیان لەوەی بتترازێنن لە هەندێک لەوەی خوا ناردوویەتییە خوارەوە بۆت، ئینجا ئەگەر ئەوانە ڕوویان وەرگێڕا و سەرپێچییان کرد، ئەوە بزانە و دڵنیا بە دەیەوێت بەهۆی هێندەی لە تاوانەکانییەوە سزایان بدات و تووشی زیانیان بکات، بێگومان زۆر لە ئادەمییەکان سەرکەشن و لە سنووری خوا دەرچوون.

* بڵاوکردنەوەی کوفر و ئیلحاد لەناو کۆمەڵگادا گەورەترە لە کوشتاری خەڵکی ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ﴾ [البقرة: ٢١٧]

«هەوڵدان بۆ پەشیمانکردنەوەی موسڵمان گەورەترە لە (پیاو) کوشتن.»

موفەسیرەکان کۆدەنگن وشەی (الفتنة) لەم ئایەتەدا واتە کوفر.

* دژایەتیکردنی ئەو کەسانەی کە خەڵکی هان دەدەن بۆ ئیلحاد و کوفر زۆر گەورەترە لە دژایەتیکردنی ئەوانەی خەڵکی هاندەدەن بۆ جەنگ و کوشتار:
﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ﴾ [البقرة: ١٩١]

(الفتنة) لێرەدا واتە کوفر.

* فریوخواردن بە مادەگەرایی ناوەڕۆکی ئیلحادە: ﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا ۝ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً﴾ [الكهف:٣٥- ٣٦]

«چووە ناو باخەکەیەوە لەکاتێکدا کە ستەمکار بوو لە خۆی وتی باوەڕ ناکەم هەرگیز ئەم باخەم لەناو بچێت. باوەڕیش ناکەم ڕۆژی دوایی بێت و ڕوو بدات.»

* چەند هەنگاوێکی کەم لەنێوان بێباوەڕیی فیرعەون و باوەڕهێنانیدا هەبوو کە دڵنیایی و سەرسامی بە دەسەڵاتەکەی بووە بەربەست لە باوەڕهێنانی، بڕوانە لە قەراغ وسەرەتای دەریاکەدا گوتی: ﴿وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ [الشعراء: ٢٣]

«پەروەردگاری جیهانیان کێیە.»

لە ناوەندی دەریاکەدا دەیگوت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ﴾ [یونس: ٩٠]

«هەتا ئەو کاتەی خەریک بوو (فیرعەون) بخنکێت، ئەوسا وتی بڕوام هێنا.»

* ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ﴾ [المائدة: ٦٤]

«جوولەکەکان وتیان خوا دەستی بەستراوە (پاکی بۆ خوا) ئەوان چنگ قوچراو و دەست بەستراو بن و نەفرینیان لێ کرا بەهۆی ئەوەی کە وتیان.»

تێڕوانینیان مادییە تەنانەت بەرانبەر بە خوداش (سبحانە وتعالی)، ئەوە دەپەرستن کە پێیان دەدات و جوێن بە جگە لەو دەدەن، دۆستایەتییان بۆ ماڵ و سامانە و دوژمنایەتیشیان هەر لەسەر ئەوە بنیات دەنێن.

* زۆرێک لە ئوممەتان بە سەرسامییان بە هێز و توانایان کافر بوون، گەلی سەموود بەوە بێباوەڕ بوون کە توانایان هەبوو شاخەکان داتاشن و بیانکەنە ماڵ بۆ خۆیان، ئەو ماڵ و خانووانە ئەگەر ئێستا دروست بکرێت، گاڵتە دەکرێت بە دینی ئەو کەسەی کە دروستی کردووە، زۆرێک لە ئوممەتەکان بەو جۆرە باوەڕیان بەستووەتەوە بە هێز و ماددەوە.

* پەروەردگار کەسێکی بێباوەڕ ژێربار دەکات بۆ دونیا، زیاتر لە کەسی موسڵمان سوود بە دونیا دەگەیەنێت، بەڵام ئەو کارەی لای پەروەردگار بەرزی ناکاتەوە، چونکە ژێرబارکردنێکی گەردوونییە، چۆن مانگ و خۆر کە دوو بێگیانن و ژێربارن، سوودیشیان بۆ دونیا لە گشت خەڵکی زیاترە.

* زۆرێک لە مولحیدەکان بۆیە ئیلحاد هەڵدەبژێرن تا لە کۆت و بەندکردنی ئارەزوو دەربازیان ببێت، هەرکات ئەو ئارەزووەیان نەما، دەروونیان دەکەوێتە ململانێ لەگەڵ ئەقڵیاندا، جا یان تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە، یان خۆبەگەورەزانی دەیانگرێت، یان بە خۆکوشتن لەو ململانێیە ڕادەکەن.

* زۆرێک لە مولحیدەکان لە کاتی تەندروستی جەستەیان و هێزی ئارەزوویان دەبنە مولحید، نابینیت باوەڕدارێکی تەندروست لە کاتی نەخۆشبوونیدا بووبێتە مولحید، چونکە گومان تەنها لەگەڵ ئارەزوودا دەردەکەوێت.

* هزرەکان و عەقیدەکان زنجیرەن، هەندێکیان وەک قادرمە وان بۆ هەندێکی دیکەیان، ئیلحاد لە کۆمەڵگایەک دەرناکەوێت کە لەوەو پێش جەنگیان بەرانبەر بنچینەکانی ئیمان نەکردبێت و دژایەتی هەڵگرانیان نەکردبێت، ئەم دووانە پێچەوانەن لایەنێکیان بەهێز دەبێت بە لاوازی لایەنەکەی دیکە.

* توندڕەوبوون لە دژایەتیکردنی توندڕەویدا تەنها لادانی لێ پەیدا دەبێت.

* هەر توندڕەوییەک لە دژایەتی فکرێک لە فکرەکان بەکاربهێندرێت، فکرێکی پێچەوانەی لێ بەرهەم دێت، توندڕەوی بەرانبەرەکەی ناوەندگیری نییە، بەڵکوو لادان و دەستبەردانە. ئیلحاد دەرناکەوێت تەنها لە پاش دژایەتیکردنی توندڕەوی نەبێت بە توندڕەوی هاوشێوە.

* کەسی مولحید زۆر دڵنیایە لەوەی دەوڵەتێک بەڕێوە ناچێت بەبێ بوونی سەرکردە، بەڵام وا دەبینێت ئەم گەردوونە گەورەیە بەو شێوە ڕێکە بەبێ بوونی خودا بەڕێوە دەچێت: ﴿لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ﴾ [غافر: ٥٧]

«بەڕاستی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترە لە بەدیهێنانی خەڵکی.»

* ئەقڵیەتی مولحید سەرزەنشتی ئەو ڕەفتارانە دەکات کە بێئەرزش و بێهودە ئەنجام دەدرێن، نازانێت خۆی باوەڕی بەوەیە کە بوونی لە ژیاندا هیچ واتایەکی نییە و بێهودەیە، جا بۆ ڕەخنە لە بێئەرزشی و بێهودەیی هەندێک ڕەفتار دەگرێت لەکاتێکدا بوونی خۆی بێئەرزش و بێهودەیە: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَـٰكُمْ عَبَثًا﴾ [المؤمنون: ١١٥]

«ئایا ئێوە گومانتان وابووە کە بێگومان ئێوەمان بە بێهودە دروست کردووە.»

* کەسانێک دەبینن کە مێشوولە پێیانەوە دەدات و وازی لێ دەهێنن، چونکە وا دەبینێت ئەو شتە بچووکە شایستەی تۆڵەسەندنەوە نییە لەسەری! کەچی بێباوەڕ دەبێت بە خودا کاتێک دەبینێت خودا تۆڵە لەوانە ناسەنێتەوە کە خراپە بەرانبەری دەکەن، لە کاتێکدا ئەو کەسانە و هەموو دونیا لای خودا قیمەتی باڵە مێشوولەیەکی نییە.

* ﴿وَقَالُوٓاْ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ [الأنعام: ٢٩]

«وتیان بەڕاستی هەر ئەم ژیانە (ی دونیا)مانە و ئێمە زیندوو ناکرێینەوە.»

بە دونیا ناویان بردووە، واتە ژیانی ئێستا، کەچی باوەڕیش ناهێنن بە دوارۆژ!

# ئازادی و کۆیلایەتی

* شەریعەت ئازادی فەراهەم کردووە، بەڵام سنووری تیایدا کێشاوە، مافی خودا و مافی خەڵکی تێدا ڕوون کراوەتەوە: ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ﴾ [البقرة: ١٨٧]

«ئەمانە سنوورانی خودان و نزیکیان مەکەونەوە، ئاوا خوا باسی فرمانی خۆی دەکات بۆ خەڵکی.»

* ئەقڵ بۆیە داندراوە تا ئازادییەکان سنووردار بکات و ڕێکیان بخات، بەڵام ڕەها دانانی ئازادییەکان، ئەوا ئاژەڵەکانیش بەبێ ئەقڵ گەیشتوون بەو ئاستە.

* ڕەهاکردنی ئازادی پێشکەوتن نییە بۆ مرۆڤ، بەڵکوو دواکەوتووییە و گەڕانەوەیە بۆ خۆچوواندن بە ئاژەڵان، چونکە کارەکان بە ڕێکخستنیان ستایش دەکرێن، نەک بە ڕەهاکردنیان، ڕەهاکردن پێویستی بە ئەقڵ نییە، بەڵکوو پێویستی بە پەکخستنییەتی.

* تێگەیشتنی ئازادیی ئەمڕۆ ئەقڵی سەرقاڵ کردووە بە جەنگکردن دژ بە ڕێگریلێکراوەکان لەگەڵ ئەوەی زۆرێک لە خەڵکی بیریشیان لێی نەکردووەتەوە، کەچی دەبینیت بەدوایدا دەچن و ئازادی تاقی دەکەنەوە تاکوو ئازاد ببن.

* ئازادی ئەوەیە بگەیت بە ئەو شتانەی پێویستن و قەدەغەن، نەک بگەیت بەو شتانەی کە قەدەغەن، بەڵام هیچ پێویستییەکت پێیان نییە. هەرکەس خۆی ئازاد بکات لە فەرمانەکانی خودا، ئەوا بووەتە کۆیلەی فەرمانەکانی شەیتان، مرۆڤ بۆ گوێڕایەڵی دروست کراوە جا با خۆی گەورە و گوێڕایەڵیکراوی خۆی هەڵبژێرێت.

* ئازادی وەک ئاو وایە دەبێت بە ئەندازەیەکی دیاری کراو وەربگیرێت، ئەقڵ توونییەتی و جگەریش توونییەتی، ئاو بۆ توونیەتی جگەر لەناو دەبات، ئازادیش بۆ توونیەتی ئەقڵ لەناو دەبات، ئەقڵ دەمرێت لە کاتێکدا ئومێدی ژیانی هەبووە.

* خودا هەموو زەوی حەڵاڵ کردووە بە تەنها چەند هەنگاوێکی کەمی لێ حەرام کردووە: ﴿كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ [البقرة: ١٦٨]

«بخۆن لەوەی کە لە زەویدایە بە حەڵاڵی و پاکی، دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون.»

ئازادی ئەوەیە لە فراوانیدا بژیت، نەک لە چەند هەنگاوێکدا.

* ئازادییەکانی مرۆڤ کۆتایی دێت لەو شوێنەدا کە سنوورەکانی خودا دەست پێ دەکات: ﴿وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥ﴾ [الطلاق: ١]

«جا ئەوانە سنوورێکی خوداییین هەر کەسێک لە سنوورانی خوا دەربچێت، ئەوە بێگومان ستەمی لەخۆی کردووە.»

* خودا بەوردی کۆتایی سنوورەکانی ئازادی مرۆڤی باسکردووە، بەڵام سەرەتای بە وردی باس نەکردووە، چونکە مرۆڤ دەزانێت چۆن سەرەتای ئازادییەکەی دەست پێ دەکات، بەڵام نازانێت چۆن کۆتایی پێ بهێنێت، ناکۆکی خەڵکی لە کۆتایی سنووری ئازادییەکاندایە، نەک لە سەرەتاکاندا.

* ئازادی ئەو وشەیەیە کە ڕۆژئاوا زۆرجار بەکاری دەهێنێت، دەزانن چۆن دەست بکەن بە جێبەجێکردنی، بەڵام نازانن چۆن کۆتایی پێ بهێنن؟! ئەمڕۆ گەیشتوونەتە ئاستی ئەوەی نێربازی بە یاسا دابنێن و ناوی بنێن هاوسەرگیری هاوڕەگەزی.

* ناکۆکی پەیامبەران لەگەڵ ناکۆکەکانیان لەسەر تێپەڕاندنی سنوور بووە لە تێگەیشتنی ئازادی و سنوورەکانی ئازادیدا، گەلی لووط لە خوڕەوشتیان و گەلی شوعەیب لە ئابوورییاندا، زۆرێکیشیان لەسەر ئازادبوون لە پەرستنی پەرستراوێکی تایبەتدا بووە.

* ئازادی حەقیقی و ڕاستی، خودا بۆ شەیتانی ڕوونکردووەتەوە: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ﴾ [الحجر: ٤٢]

«بەڕاستی بەندەکانی من، تۆ هیچ دەسەڵاتت نییە بەسەریاندا جگە لەو گومڕایانەی کە شوێنت کەوتوون.»

ئەوانەی شەیتان دەپەرستن ژێردەستەی جێگرەوەکانی شەیتانن، دڵخۆشن بەو ئازادییەی لە دەستێکەوە دەدرێنە ئەوی دیکەیان!

* هەرکەس چێژی پەرستشی خودای چەشتبێت، چێژی ئازادی لەگەڵ خەڵکیشی چەشتووە، ئەوەی لە یەکەم بێبەش بووبێت، لە دووەم بێبەش بووە.

* چاکبوونی ژیان زیاتر بە بەندایەتی بەدەست دێت وەک بە ئازادی، پیشەوەران و کرێکاران بە کۆمەڵە فەرمان و ڕێگرییەک بەندکراون لەگەڵ ئەوەش بەرهەمیان هەیە، هەر بەو جۆرەش ڕۆژی دوای بەدەست نایات بە پەرستش و ملکەچی نەبێت بۆ پەروەردگار.

* مرۆڤ بەندەیە و بە هیچ جۆرێک لەو بەندایەتییە دەربازی نابێت: یان بەندەی خودایە، یان بەندەی ئارەزوویەتی، یان شتێکی دیکە، ئەگەر لە یەکیان دەرباز ببێت دەبێتە بەندەی ئەوی دیکەیان، ئەگەر بووە بەندەی یەکێک، ئەوا ئازاد دەبێت لەوانی دیکە.

* خودا مرۆڤی بەدیهێناوە تا بەندەبێت لە بەرانبەر خودا و ئازاد بێت لەگەڵ بەدیهێندراوەکاندا، بە بەندەی تەواو یان ئازادی تەواوی داینەناون، ئەوەی

بەندەی بەدیهێنەر بێت، ئازاد دەبێت لە بەرانبەر بەدیهێندراوەکان، ئەوەش بەندەی دروستکراوەکان بێت لە خودا ئازاد دەبێت.

* ئومێد و ترس دیاریکاری ئەندازەی بەندایەتین، خەڵکی بەندەی ئەوەن کە ئومێدیان پێی هەیە و لێی دەترسن.

* زۆر ڕوانین بۆئەوەی لەدەستی خەڵکیدایە و بەردەوام بیرکردنەوە لە هێز و توانای کەسێک، بەبێ ئەوەی هەست پێ بکەی هەڕەمی پەرستنی ئەو لەدڵتدا دروست دەکەیت، بەبێ ئەوەی هەست بکەی تا وات لێدێت دەبیتە بەندە بۆی و ئەویش پێت نازانێت، خودا ڕێگری لە پەیامبەرەکەی کردووە کە بیر لە هێزی کەسانی دیکە بکاتەوە: ﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾ [الحجر: ٨٨]

«ئەی (موحەممەد (ﷺ)) چاوت مەبڕە نازونیعمەتی (دنیا) کە داومانە بە کومەڵێک لەو بێباوەڕانە.»

فەرمانی پێ کراوە بیر لە شکۆی خودا بکاتەوە، تا بەندایەتییەک دروست نەبێت لە دڵیدا بۆ جگە لە خودا. مرۆڤ بیری سەرقاڵی هێز و شکۆی هەر شتێک بوو، جۆرێک لە بەندایەتی بۆ دروست دەبێت هەرچەندە ئەو شتە زۆر بێبەها و بێئەرزشیش بێت، هەر بۆیە مرۆڤ مشک دەپەرستێت لە هیندستان و دار و بەرد دەپەرستن لە هەندێک شوێنی تر: ﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾ [الحجر: ٨٨]

«ئەی (موحەممەد (ﷺ)) چاوت مەبڕە ئەو نازونیعمەتی (دنیا) کە داومانە بە کۆمەڵێک لەو بێباوەڕانە.»

ئەوکەسانە چەندە بەندایەتیان بۆ خودا لاوازە کە بەئاشکرا سەرپێچی ئەو دەکەن و لە سەرکردەکەیان دەترسن لە پەنهانیشدا.

* ترسناکترین جۆری پەرستش، پەرستشی ئارەزووە، خەڵکی خۆیان دەرباز دەکەن لە پەرستشی بەرد و دارەکان بۆ پەرستشی فکرەکان، وا گومان دەبات تەوافی دەوری بتەکان ناکات، لە کاتێکدا تەواف بە دەوری هەواوئارەزوویدا دەکات و نایبینێت.

* زۆرێک لە خەڵکی وا گومان دەبەن خۆدەربازکردن لە شوێنکەوتنی خەڵکی بەدەستهێنانی ئازادییە، بەڵام دەکەونە داوی کۆیلایەتی هەواوئارەزووەوە کە سەرەکیترین کۆیلایەتییە، وەک ئەو کەسەیە کە کەلەپچەی دەستی لێ بکرێتەوە و بکرێتە گەردنیەوە و واگومان بەرێت ئازادی ئەوەیە چەپڵە بە دەستەکانی لێ بدات.

* زۆرێک لە مرۆڤەکان وا گومان دەبەن ئازادبوون لەوەی کەسێک بە پیرۆز ڕابگرن، بەڵام دەکەونە ناو پیرۆز دانانی ئارەزوویان، ئەو جۆرە کەسانە هەر بە کۆیلەیی ماونەتەوە، تەنها گەورەکەیان گۆڕیوە.

* مرۆڤ دروستکراوە بۆ ئەوەی بەندە بێت، ئەگەر بەندەی خودا نەبێت ئەوا بێگومان دەبێت بەندەی جگە لە خودا بێت، خۆ ئەگەر تەنها هەواوئارەزووی بەدی بکات، ئەوا دەیکاتە پەرستراو بۆ خۆی، دڵ کزۆڵ دەبێت و دەچەمێتەوە وەک جەستە.

* مرۆڤ لەناو ناخیدا بتێکی هەڵگرتووە زۆرجار دڵ کڕنووشی بۆ دەبات و بۆی دەچەمێتەوە ئەویش ئارەزوویەتی: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾ [الجاثية: ٢٣]

«ئاخۆ بینیوتە ئەو کەسەی هەواوئارەزووی خۆی کردووەتە پەرستراوی خۆی، خواش بەزانایی گومڕای کرد.»

کڕنووش دەبات بۆ بۆچوون و ئارەزووی، وەک چۆن لە سەردەمی نەفامی کڕنووش براوە بۆ عوزا.

*﴿لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ [يس: ٦٠]

«بەندایەتی شەیتان نەکەن، چونکە دوژمنێکی ڕاستەقینەی ئێوەیە.»

بەندایەتی بۆ شەیتان بریتییە لە گوێڕایەڵی هەواوئارەزوو، چونکە شەیتان لەسەر شێوەی ڕاستییەکەی خۆی دەرناخات بۆ مرۆڤ.

بەڵکوو بە پۆشاکی ئارەزووەوە دەچێتە لای: ﴿أَفَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾ [الجاثية: ٢٣]

«ئاخۆ بینیوتە ئەو کەسەی هەواوئارهزووی خۆی کردووەتە پرستراوی خۆی.»

*﴿لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ [يس: ٦٠]

وەک چۆن دەبینیت کۆمەڵێک جەستەی زیندوو تەواف بەدەوری جەستەیەکی مردودا دەکەن لە گۆڕەکانیاندا، دەبینیت ئەقڵگەلێکیش تەواف دەکەن بەدەوری ئەقڵانێکی مردودا و بەگەورەیان دەگرن، ئەوەش بتپەرستیی ئەم سەردەمەیە.

* وا گومان دەبات ئازادە کەچی بەندەیە و سەرقاڵی گرتنی بەشێکی گوریسی گەردنیەتی لە دەستێکییەوە دەیخاتە دەستەکەی تری، ئازادی ئەوەیە گوریسەکە بە تەواوی لە گەردنی بکاتەوە. بۆ ئەمەش پێویستیت بە هیچ دەستێک نییە تەنها دەستی خودا نەبێت.

* ئەگەر پشت بە چەمینەوە ڕاهات، ئەوا ڕاستبوونەوەی ئەستەمە، ئەگەر نەفس بە کۆیلایەتی فێربوو، ئەوا ئازادی قورسە لەسەری.

# ژن و خێزان، حیکمەت و حوکمەکان

* نوێژی ئافرەت لەماڵەوە گەورەترە بۆی وەک لە مزگەوت، ئەمەش بەپێی فەرموودەکان و بۆچوونی زۆرینەی زانایان، ئەمەش وا دەخوازێت پاداشتی نوێژی ئافرەت لە ماڵەوە هاوشێوەی پاداشتی نوێژی پیاوە کە بە کۆمەڵ ئەنجامی دەدات.

* ئافرەت واز لە نوێژ دەهێنێت لەو ڕۆژانەی لە سووڕی مانگانەدایە و نایانگێڕێتەوە، زانایان جیاوازن دەربارەی پاداشت وەرگرتنی ئەو کاتانەی کە نوێژی تێدا ناکات، دوو وتەیان هەیە دەربارەی، دروسترینیان ئەوەیە پاداشتی بۆ دەنووسرێت چونکە بەهۆی عوزرێکەوە وازی لێ هێناوە و هاوشێوەی نەخۆشی و گەشتە.

* گەورەترین هۆکار کە خودا ئافرەتان داپۆشێت لە هەردوو دونیا بریتییە لە شەونوێژ، لە فەرموودەدا هاتووە: من یوقظ صواحب الحجرات حتی یصلین؟ یا لاب کاسیة في الدنیا عاریة في الآخرة «کێ ئافرەتانی خانۆچکەکان بە خەبەردێننەوە _ خێزانەکانی پەیامبەر_ بۆ نوێژ، زۆرن ئەو ئافرەتانەی لەدونیادا پۆشتەن لە دواڕۆژدا ڕووتن.»

* ئیسلام سیستمی ژیان دادەڕێژێت، نەک حاڵەتێکی دابڕاو و گۆشەگیر، لەوە تێناگەیت بۆچی نێر لە میراتدا زیاتر دەبات تاکوو نەزانیت کە مارەیی و نەفەقە و بەرگ و جێی مانەوە و دەرمانی ژن و مناڵەکانی لەسەر نێرینەکان فەرزکراوە.

* زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی هەردوو ڕەگەز هاوتان لە تۆڵەی کوشتنەوەدا «قصاص»، هەروەها کۆدەنگن لەسەر ئەوەی خوێنبای ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوە، چونکە خوێنبای بۆ میرات گرانە، ئەوانەی بە چاوێکی ڕۆژئاوایی مادەگەراییەوە دەڕواننە بابەتەکە وادەزانن ئیسلام کەسەکان دەفرۆشێت.

* خوێنبایی ئافرەت نیوەی خوێنبایی پیاوە چونکە ئەوماڵە داندراوە بۆ پڕکردنەوەی کەلێنێک بۆ میراتگران نەک بەهای کەسە کوژراوەکە بێت، هەرچی جێبەجێکردنی سنوورەکانە، ئەوا هەمووان یەکسانن خۆ ئەگەر سەد پیاو کۆببنەوە بۆ کوشتنی یەک ئافرەت ئەوا هەر سەدیان دەکوژرێنەوە لەبری ئەو ئافرەتە.

*حەرامە ئافرەتان دەنگیان ناسک بکەنەوە بەرانبەر پیاوان لەکاتی قسەکردنیاندا، خودا لەسەر خێزانە پاکیزەکانی پەیامبەری (ﷺ) حەرام کردووە تا تێبگەین ئەو حەرامییێتییە بۆ ئافرەتانی دیکە لەپێشترە: ﴿فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ﴾ [الأحزاب: ٣٢]

«بە خەمزە و نازەوە قسە مەکەن (وەک لە ئافرەتانی ڕەوشت نزم) نەوەکوو ئەوەی دڵی نەخۆشە (دەروون نزمە) نیازی خراپ بکات.»

* سەرەتای هەموو خراپەیەک کە ڕوو دەدات لەنێوان نێر و مێدا ناسککردنەوەی وتەکانە: ﴿فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ﴾ [الأحزاب: ٣٢]

«بە خەمزە و نازەوە قسە مەکەن (وەک لە ئافرەتانی ڕەوشت نزم) نەوەکوو ئەوەی دڵی نەخۆشە (دەروون نزمە) نیازی خراپ بکات.»

ئەمە ئاگەدارییە بۆ قسەکردنی پاکیزەترینی ئافرەتان: کە خێزانەکانی پەیامبەری خودان (ﷺ) لەگەڵ پاکترین پیاوان کە هاوەڵانن.

* ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ﴾ [الأحزاب: ٣٠]

«ئەی خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەر کام لە ئێوە گوناهێکی گەورە بکات سزای بۆ دوو بەرانبەر دەکرێتەوە بە دووەوو قاتی (خەڵکی تر).»

ئاگەدارییەکە بۆ پاکەکان! ئاماژەیەکە بۆ ئافرەتانی باوەڕدار کە دڵنییا نەبن لە خۆیان و شلگیری بکە لە هۆکارەکانی خراپەدا: لە سەیرکردن و تەنهابوون لەگەڵ پیاوان و تێکەڵبوونیاندا.

* خودا دەربارەی مووسا دەفەرمووێت: ﴿فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ﴾ [القصص: ٢٥]

«ئینجا یەکێک لە دوو کچەکە هات بۆ لای مووسا و بەشەرمەوە دەڕۆیشت لەڕێگادا.»

تەنها یەکێک لە دوو کچەکە هاتنە لای مووسا، چونکە هاتنی خوشکەکەی دیکەی هیچ پێویست نەبوو، بۆیە نزیکنەبوویەوە لەبەر حەیا و شەرم و شکۆی.

* عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر پۆشاکێکی تەنکی بە دیاری بۆ دایکی نارد کە ئەسمائی کچی ئەبووبکر بوو، لە کاتێکدا پیر ببوو و چاوەکانی کوێر ببوون، دەستی بە پۆشاکەکەدا هێنا و گوتی: "ئۆف بۆی بگەڕێننەوە چونکە ئەوە جەستە دەردەخات." ئەوەش لە پۆشتەیی ئەوەوە بوو ئەو قسەیە.

* کەسایەتی و nامووس پارێزراوی و پەرژینی هەیە کە لەوانەیە لەسەروو جگە لە خۆشیەوە بێت، خودا ڕێگەی داوە بە نووح و لووط لە شەریعەتی ئەواندا ئافرەتی بێباوەڕ بکەنە خێزانیان، بەڵام مەحاڵە ڕێگە بدرێت پەیامبەرێک ئافرەتێکی زیناکار بکاتە خێزانی. هەرکەس تۆمەتی زینا بداتە پاڵ ژنەکانی نووح و لووط لەگەڵ ئەوەی کافریش بوون ئەوا بەو کارەی کافر دەبێت، چونکە

ئەو تۆمەتە دەگوازرێتەوە بۆ هاوسەر وەسفی ناپیاوی «گەوادی» دەدرێتە پاڵ هاوسەرەکەی کە ئەمەش کوفرە بدرێتە پاڵ پەیامبەران.

* خودا ڕێگەی داوە پیاوانی موسڵمان هاوسەرگیری بکەن لەگەڵ ئافرەتانی خاوەن کتاب ئەگەر داوێنپاک بن و حەرامی کردووە لەسەر پیاوانی موسڵمان ئافرەتێکی موسڵمان بخوازێ کە داوێن پیسە تا تەوبە دەکات، چونکە زیانی کوفر بۆخۆیەتی بەڵام زیانی زینا گواستراوەیە بۆ هاوسەرەکەی.

* ڕووداوی «إفك» -تۆمەت هەڵبەستنی زینا بۆ دایکمان عائیشة- بەتوندی قسەی لەسەر کراوە لە قورئان و سونەتدا زۆر توندتر لە بێباوەڕبوونی هەندێک لە خزمانی پەیامبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەوەی ئەوە کوفرە و ئەویش زینایە.

* لەپێناو پاراستنی کەسایەتی و ناموسدا ئیسلام تەنهابوونی نێوان دوو ڕەگەزەکەی حەرام کردووە، هەروەها تێکەڵاویشی لەو پێناوەدا حەرام کردووە و حیجابی فەرز کردووە و ناسککردنەوەی دەنگی قەدەغە کردووە و جگە لە ئەمانەش شتانێکی دیکەشی داناوە.

* گوێ گرتن بۆ ئەو ستەمانەی لە ئافرەتان کراوە و دەربڕینی ناڕەزاییيان بەرانبەر هاوسەرانیان هەقە، گوێگرتن بۆیان واجبە لە فەرموودەدا هاتووە: لقد طاف بال محمد نساء كثير يشكون ازواجهن ليس أولئك بخياركم «زۆرێک لە ئافرەتان سەردانی ماڵەکانی موحەممەد دەکەن، ناڕازین و شەکوایان لە پیاوەکانیان هەیە، ئەو پیاوانە باش نیین کە بەو جۆرەن.»

* ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا﴾ [يوسف: ٣٠]

«دەستێک لە ژنانی شار (بەسووکایەتییەوە) وتیان ژنەکەی عەزیز (ی میسر) دەیەوێت لەگەڵ غوامەکەی داوێنپیسی بکات.»

لە نێو ئافرەتانی شارێکدا وتەیەکی زۆر گەورە بڵاوبوویەوە کە نزیکترین پیاویان نەی دەزانی، لە پیاوانیان شاردەوە و لای ئافرەتان بڵاویانکردەوە.

* فڕۆکە کەرەستەکەی لە لەچکی ئافرەت درووست نەکراوە، وزەش پڕیشکەکەی زیاد نەبووە بە لێکخشانی ئافرەت لە پیاو، بەڕاستی قیبلەنمای شارستانییەت ساختەیە، شوێن درووستکەرەکە کەوتووین و وازمان لە درووستکراوەکە هێناوە.

* ئەندازەی ئەو هاندانەی کە ڕۆژئاوا بەکاریدەهێنێت دەربارەی حیجاب و تێکەڵبوون و سەرکردایەتی ئافرەت هەمان هاندانە کە بەکاریدەهێنێت ئەگەر ئێمە پلەبەندی بکەین و زینا حەڵاڵ بکەین و بوەستین لەلای دەرگای هاوڕەگەزبازی.

* ئەگەر وتەیەک زۆر دوبارەت کردەوە بۆ مرۆڤێک کە ستەمی لێ کراوە و ئازادی زەوت کراوە، ئەوا بەڕاستی دادەنێت و لەشوێن خەیاڵاتی ئەو زەوت کردنە دەگەڕێت هەرچەندە واش نەبێت و ئازادیش بێت، لە ئەورووپا ئافرەتانێک خۆپیشاندانیان کرد داوای مافی ڕووتکردنی سنگیان دەکرد وەک پیاوان.

* دووان لەوانەی لە گوانتانامۆ سجن کرابوون سەردانیان کردم گوتیان: "لێکۆڵەرێک کە ئەستێرە شەش ڕووەکەی ئیسرائیل وەک تاتۆ لەسەر جەستەی هەڵکۆڵیبوو گوتی: ئەو پۆشاکە ڕەشەی ئافرەتانتان هۆکاری توندڕەویتانە، پێویستە لا ببرێت لە ماوەی١٠ ساڵی داهاتوودا."

* خوێندمەوە ئافرەتێکی موسڵمان دادگایی کراوە و دووساڵ بەندکراوە لەسەر ئەوەی نیقابی پۆشیوە، جا دەبێت ئەوان کاردانەوەیان چۆن بێت ئەگەر ئافرەتێکی ڕۆژئاوای بۆ ماوەی کاتژمێرێک لە وڵاتانی ئێمەدا لەسەر ناپۆشتەیی بەندبکرێت، دەبێت توندڕەوەکانی ناو ڕاگەیاندن چی بکەن؟!

* ڕۆژئاوا هاوسەرگیری پیاو لە پیاو و ژن لە ژن بە ڕەوا و دروست دادەنێت و داوا لە موسڵمانان دەکەن مافی ئافرەت بپارێزن. بەڵام بۆیان دیاری نەکردوون کام یەک لەو دوو دانەیان ئافرەتە تاکوو مافی بپارێزن.

* گرنگی دەدەن بە زمانی ژمارە و ئافرەتیان کردووەتە «نیوەی کۆمەڵگا» لە کاتێکدا گۆمەڵگا دابەش ناکرێت چونکە گشتییە، ئافرەت و پیاو تیایدا بەژدارن و لەبری یەکترین، ئەگەر یەکێکیان لە بوارێکدا سەرکەوتوو بوو ئەوا لەسەر ئەوی دیکەیان دەکەوێت.

* ﴿يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ [آل عمران: ٤٢]

«ئەی مەریەم بێگومان خوا تۆی هەڵبژاردوە و پاکی کردوویتەوە و ڕێزی داویت بەسەر هە موو ژنانی جیهاندا.

خودا بەراوردی کرد لەگەڵ ئافرەتان و باسی پیاوانی نەکرد چونکە ئەوان ڕەگەزێکی جیاوازن، هەڵەیە ئەگەر بەراورد بکرێن بە جگە لە خۆیان.

* خودا ڕێگری کردووە لەوەی ئاواتی یەکسانی ڕەگەزەکان بخوازین، چونکە هەر ڕەگەزێک تایبەتمەندی خۆی هەیە: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ﴾ [النساء: ٣٢]

«ئاوات مەخوازن بۆ ئەو پلەیەی کە خوا باوی هەندێکتانی داوە بەسر هەندێکی ترتاندا، بۆ پیاوان بەش هەیە لەوەی بەدەستی دەهێنن و بۆ ئافرەتانیش بەش هەیە لەوەی بەدەستی دەهێنن.»

* فیترەت و سروشتی مرڤایەتی لە دوو سەردەمدا تەواو تێک چووە: یەکەم سەردەمی لووط، کاتێک ئافرەت و پیاویان یەکسان دەکران.

دووەم: ڕۆژگاری ئەمڕۆی ڕۆژئاوا دەبینیت ئافرەت یەکسان دەکەن بە پیاو و بەپێچەوانەشەوە.

* فەڕەنسا هاوڕەگەزبازی بە یاسا ڕێگە پێ دەدەن، ئەمەش دەرچوونە لە سروشتی مرۆڤایەتی، تەنانەت سروشتی ئاژەڵیش، ئەو لادانەی لە ئەمڕۆدا

هەیە زۆر زیاترە لەوەی لەسەردەمی لووطدا هەبووە، گەلی لووط ئەو کارەیان دەکرد وەک چێژێکی کاتی، نەک وەک هاوسەرگیری.

* یەکەم سزا بۆ مرۆڤ ناپۆشتەیی و ڕووتی بووە: ﴿فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ﴾ [طه: ١٢١]

«ئینجا هەردووکیان لەو (بەروبوومی درەختە)یان خوارد بەو هۆیەوە (جل و بەرگیان داماڵدراو) دەرکەوت عەیب و عەورەتیان و دەستیان کرد بە داپۆشینی لەشیان بە گەڵای (درەختەکانی) بەهەشت.»

ئەگەر سروشت و فیترەت هەڵگەڕایەوە، سزا دەبێتە شارستانییەت.

* خودا سزای ئادەم و حەوای لە بەهەشت دا بە ناپۆشتەییان دانا: ﴿فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا﴾ [الأعراف: ٢٢]

«جا کاتێک (لە بەروبوومی) ئەو درەختەیان چەشت هەردووکیان عەیب و عەورەتیان دەرکەوت.»

خودا ئەوەی کردووەتە سزا بۆ پەیامبەرێکی کەچی لەمڕۆدا بە شارستانییەت هەژماری دەکەن.

* ڕووتی و ناپۆشتەیی و سفووری ئامانجی یەکەم و هەرە گەورەی شەیتان و دارودەستەیەتی: ﴿يَا بَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَاتِهِمَا﴾ [الأعراف: ٢٧]

«ئەی نەوەی ئادەم با شەیتان فریوتان نەدات و نەتانخەڵەتێنێت هەروەک باوک و دایکتانی لە بەهەشت دەرکرد لەحاڵێکدا پۆشاکەکەیانی لێ داکەندن بۆئەوای عەیب و عەورەتیان دەربخات.»

* پاش ئەوەی خودا ڕێگری لە سفووری و ناپۆشتەیی و زینا دەکات: دەفەرموویت: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ [النور: ١٩]

«خوا دەزانێت و ئێوە نازانن.»

چونکە هەندێک لە حەرامکراوەکان زیانەکانی دەرناکەوێت بۆ هەموو کەسێک، هەندێک جار زیانە شاراوەکان زیاترە لە ئاشکراکان.

* هاوەڵدانان و ناپۆشتەیی دوو خراپەی پەیوەستی یەکترن، لە فەرموودەدا هاتووە: «لە پاش ئەم ساڵ هیچ هاوەڵدانەرێک نابێت حەج بکات، کەسیش بە ڕووتی نابێت تەواف بکات.»

* خواردنی حەرام هۆکارە بۆ سزادانی سفووری و ناپۆشتەیی، هەر ناپۆشتەییەک لە پیاوان و ئافرەتانی ئوممەتێکدا ڕوویدابێت، بێگومان لەوەو پێش حەرامیان خواردووە: ﴿فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا﴾ [طه: ١٢١] «ئادەم و حەوا لەو دارە حەرامکراوەیان خوارد، جا عەورەتی خۆیان بۆ بەدەرکەوت.»

* وەک چۆن پێویستە بەرەنگاری برسییەتی و هەژاری ببیتەوە، ئاوەهاش پێویستە بەرەنگاری ناپۆشتەیی و سفووری ببیتەوە: ﴿إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ﴾ [طه: ١١٨]

«بێگومان تۆ لەو (بەهەشتە)دا برسیت نابێت و ڕووت و قوت نابیت.»

برسیێتی ئاژەڵەکانیش بەرەنگاری دەبنەوە، ئەوەی مرۆڤ جیادەکاتەوە بەرەنگاریکردنی ناپۆشتەیییە.

* لە هەریەک لە وڵاتانی میسر و تونس و شام سفووری بە لابردنی ڕووپۆش و نیقاب دەستی پێکرد بە دەرخستنی پشت و سنگ و قاچ کۆتایی هات، لەنێوان دەرخستنی دەموچاو و ڕانی ئافرەتەکاندا تەنها ٢٠ساڵ نێوانیان هەبوو: ﴿فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾ [الحشر: ٢]

«ئینجا پەند وەرگرن ئەی خاوەن چاوەکان.»

* لە هەموو ئوممەتانی پێشوودا ئافرەت ڕۆڵ و بەرپرسیارییێتی پەروەردەی منداڵ و سەرپەرشتاری ماڵی بینیوە، چ لە شەریعەت چ لە فیترەتدا: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِي ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِي مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا﴾ [یوسف: ٢١]

«ئەو کەسەی لە میسر یوسفی کڕی، بە ژنەکەی وت: ڕێزی لێ بگرە (شوێن حەوانەوەی چاکی بۆ ئامادە بکە) بەڵکوو سوودمان پێ بگەیەنێت یان بیکەین بە کوڕی خۆمان.»

* ﴿فَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَـٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ﴾ [طه: ١١٧]

«ئینجا وتمان ئەی ئادەم بەڕاستی ئەم (ئیبلیسە) دوژمنی تۆ و هاوسەرەکەتە کەواتە (ئاگادار بن) لە بەهەشت دەرتان نەکات چونکە دووچاری ناخۆشی و زەحمەت دەبیت.»

هەردووکتان ئەی ئادەم و حەوا دەردەکرێن، بەڵام تەنها تۆ ئەی ئادەم نەگبەتی دەتگرێتەوە، چونکە ئەوە تۆی دەبێت کار بکەیت و بژێوی پەیدا بکەیت بۆ خێزانت، کە لەوەو پێش لە بەهەشتدا بێپێوست کرابووی.

* ئەگەر پیاو نەی دەتوانی پێویستی خێزانی پڕبکاتەوە، ئەوا واجبە لەسەر دەوڵەت پێویستییان پڕ بکاتەوە، نەوەک کار بۆ ئافرەتەکە بدۆزێتەوە بۆئەوەی بێتە دەرەوە لە کاتێکدا کە حەزی لێی نییە. ئافرەت بە ویستی خۆی دەبێت کار بکات نەک بەزۆر بەپێچەوانەی پیاوانەوە.

* ئافرەتە پاکیزەکانی سەردەمی نەفامی کاتێک دەڕۆیشن بە ڕێگادا ئەگەر ڕووپۆشی سەر دەموچاویان لابچووایە، ئەوا بە دەستێکیان دەموچاویان دادەپۆشی و دەستەکەی دیکەیان بۆ هەڵگرتنەوە و چاککردنی ڕووپۆشەکە بەکار دەهێنا، نابغە وەسفی ئەو حاڵەتەمان بۆ دەکات و دەڵێت:

سَقَطَ النَصيفُ وَلَم تُرِد إِسقاطَهُ

فَتَناوَلَتهُ وَاِتَّقَتنا بِاليَدِ.

نیقابەکەی کەوت بەبێ مەبەست

دەستی برد هەڵیگرێتەوە و بە دەستێکیش ڕووی لێ شاردینەوە.

* سفووریی ئافرەت لە بەکارهێنانی زمانی عەرەبیدا تەنها بۆ دەرکەوتنی دەموچاو بەکاردێت، نەک بۆ دەرکەوتنی قژ و پرچ، (ابن المنذر) لە «الأوسط»دا دەڵێت: "زاندراوە لەناو وتەکانی عەرەبدا: "أسفرت المرأة عن وجهها: كشفته" واتە: "دەموچاوی دەرخست."

* خودا دەفەرمووێت: ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾ [الأحزاب: ٥٩]

«با عەباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا (خۆیان و جوانییانی پێ داپۆشن) ئەوە نزیکترە بناسرێن (بە داوێن پاک) تا بەهۆیەوە ئازار نەدرێن.»

پێشەوا تەبەری بە ڕشتەیەکی سەحیح لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: "خودا فەرمانی بە ئافرەتانی باوەڕداران کردووە کاتێک دەرچوون دەموچاویان دابپۆشن."

* واتای وتەی خودا: ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾ [الأحزاب: ٥٩]

واتە: بەجۆرێک بن هیچ کەس توانای ناسینەوەیانی نەبێت.

(أدنى): واتە نزیکتر و لەپێشترە کە ئەوان بناسرێنەوە بەوەی ئافرەتانێکی ئازادن و کەنیزەک نین، بەو جۆرە بن تاکوو نەناسرێنەوە، بەم جۆرە پێشەوایانی تەفسیر وەک تەبەری و (ابن المنذر) تەفسیریان کردووە.

* ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَ﴾ [الأحزاب: ٥٩]

«ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ بە هاوسەرانت و بە کچەکانت و بە ئافرەتانی بڕواداران با عاباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا: «خۆیان و جوانیانی پێ داپۆشن.» «ئەوە نزیکترە بناسرێن (بە داوێن پاک) تا بەهۆیەوە ئازار نەدرێن.»

ئافرەت بە دەموچاویدا دەناسرێتەوە، نەوەک بە دەست و قاچیدا.

* پێشەوا مالک بە سەنەدێکی سەحیح لە فاتمەی کچی مونذیرەوە ڕیوایەتی کردووە، کە گوتویەتی: "ئێمە دەموچاومان دادەپۆشی لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بووین لەگەڵ ئەسمائی کچی أبو بکردا"، ئەوان بەو جۆرە بوون، تەنانەت لەکاتی قورسییێتی سەفەر و گەشتیشدا.

* حەفصەی کچی سیرین نیقابی دەکرد، لە کاتێکدا پیر ببوو، پێیان گوت خودا دەربارەی ئافرەتە بەتەمەنەکان دەفەرمووێت: ﴿فَلَيۡسَ عَلَيۡهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعۡنَ ثِيَابَهُنَّ﴾ [النور: ٦٠]

«هیچ گوناهێکیان لەسەر نییە کە (هەندێک لە) پۆشاکەکانیان لابەرن.» گوتی: ئایەتەکە تەواو بکەن ﴿وَأَن يَسۡتَعۡفِفۡنَ خَيۡرٞ لَّهُنَّ﴾ «خۆ ئەگەر لاینەبەن و پۆشتەبن، ئەوە چاکترە بۆیان.»

* سەرنجی پەرتووکەکانی سونەت و ئەسەرم داوە، نەم دیوە و نازانم ئافرەتێکی هاوەڵان یان شوێنکەوتووان ئازادبوو بێت و ناوی برابێت بە فڵانی کچی فڵان و بە سەنەدێکی سەحیح لێوەی هاتبێت کە دەموچاوی دەرخستبێت لای پیاوانی بێگانە.

* ڕێگری کراوە لە ئافرەتان لە کاتی ئیحرامدا لە حەج و عەمرەدا نیقاب بپۆشن، وەک چۆن ڕێگری کراوە لە پیاوان شەڕواڵ بپۆشن، هەردوو واتاکە ئەوە

ناگەیەنێت دروست بێت ئەو بەشانەی لەوە پێش داپۆشراوە لەو کاتەدا ڕووت بێت و دانەپۆشرێت.

* فەرموودەی خەثعەمیەکە لە حەجدا و لابردنی بەرگ لەسەر دەموچاوی، بە سەحیحی لە مسندا هاتووە لە ئیبن عەباسەوە، دەڵێت ئەو ئافرەتە نیشانی پەیامبەر دراوە بە ئومێدی ئەوەی مارەی بکات، ئەو دەموچاو دەرخستنە بۆ هاوسەرگیری بووە نەک بۆ سفووری.

* لەو وتە داهێندراوانەی هاتوونەتە ناو ئیسلامەوە بانگەشەی ئەوەیە کە حوکمی تێکەڵاوی و داپۆشینی شوێنە سەرنجڕاکێشەکان تایبەت بووە بە دایکانی باوەڕدارانەوە، ئەمە وتەیەکی داهێندراوە و یەک زانای ئەم ئوممەتە ئەم وتەیەی نەوتووە پێش داگیرکاری ڕۆژئاوا.

* دەوترێت: حیجاب تایبەتە بە دایکانی باوەڕدارانەوە، لە کاتێکدا عائیشەی دایکی باوەڕداران فێری ئافرەتانی دەکرد دەموچاویان دابپۆشن لە پیاوان، تەنانەت لە کاتی حەجیشدا، ئیبن ئەبی خیثەم ڕیوایەتی کردووە کەسیش هێندەی ئەوان شارەزا نییە بە حیجابیان.

* ئیبن ئەبی خیثەمە بە ڕشتەیەکی حەسەن لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە کە دەڵێت: "پێی گوترا: ئافرەتێک هەیە نایەوێت دەموچاوی دابپۆشێت و لە ئیحرامدایە؟!عائیشەش قوماشەکەی لای سنگیەوە هەڵگرت و دەموچاوی بۆ داپۆشی.

* هەرکەس دەموچاو داپۆشین بە عادەتی حیجاز و نەجد بزانێت، ئەوا نەشارەزایە بە سونەت و مێژوو، ئیبن حەجەر دەڵێت: "بەردەوام ئافرەتان لە کۆن و تازەدا بەو جۆرە بوون کە دەموچاویان داپۆشیوە لە پیاوانی بێگانە."

* نازانم زانایەک هەبووبێت لە هەموو مێژووی ئیسلامدا گوتبێتی کە داپۆشینی دەموچاوی ئافرەت عادەتە و بەشێک نییە لە ئایین، بەڵکوو تەنها جیاوازییان لە پلەی داپۆشینەکەدایە لەنێوان واجببوون و سونەتبوونێکی جەخت کراوەدا.

* حیجابی ئافرەتان بە شێوەیەکی گشتی موتەواترە و بێگومان هاتووە لە قورئان و سونەتدا، هەرکەس بڵێت: حیجاب هەمووی عادەتە و ئافرەتان دەتوانن چەندێکیان بوویت لە جەستەیان دەری بخەن، ئەمە بە کوفر دادەندرێت لای هەموو مەزهەبەکان تەنانەت مەزهەبە داهێنراو لادەرەکانیش.

* داپۆشینی دەموچاوی ئافرەت بابەتێکە هیچ جیاوازییەکی تێدا نییە لەناو زانایانی هەموو مەزهەبەکاندا کە شەریعەتێکی ئاسمانییە، بەڵام ناکۆکییان دەربارەی واجببوون و سونەتبوونی هەیە، ئەو وتەیەی کە دەڵێن عادەتە و هیچ پەیوەندی بە ئایینەوە نییە، وتەیەکە لە پاش داگیرکاری وڵاتانی ڕۆژئاواوە سەری هەڵداوە.

* هەرکەس خاوەنی شوێنی نیشتەجێبوون و خێزان و خزمەتکار بێت لە ژیاندا خودا بە پاشا هەژماری کردووە، خودا دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾ [المائدة: ٢٠]

«باسی ئەو کاتە بکە کە مووسا فەرمووی بە گەلەکەی ئەی گەلەکەم بیری چاکە و بەهرەی خوا بەکەنەوە بەسەرتانەوە کاتێک کە پێغەمبەرانی تێدا هەڵخستوون و کردوونی بە پادشا.»

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بە پیاوێکی گوت: ئایا ژنت هەیە؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: ئایا شوێنی نیشتەجێبوونت هەیە؟ گوتی: بەڵێ، پێی گوت: کەواتە تۆ لە دەوڵەمەندەکانی. پیاوەکە گوتی: خزمەتکاریشم هەیە. گوتی: تۆ لە پاشاکانی. موسلم ڕیوایەتی کردووە.

* باشیێتیی باوک هۆکاری بەرەکەت و پارێزراوییە بۆ منداڵ: ﴿وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾ [الكهف: ٨٢]

«باوکی ئەو دوو منداڵە چاک و خواناس بوو لەبەرئەوە پەروەردگارت ویستی هەردووکیان گەورە و بەهێز ببن و گەنجینەکەیان دەربێنن. ئەمە ڕەحمەتێک بوو لەلایەن پەروەردگارتەوە. (لەبەر باوکیان).»

ئیبن عەباس دەڵێت: بەهۆی چاکییێتی باوکیانەوە پارێزران.

* باوک ڕۆزی پێ دەدرێت بەهۆی منداڵەکانیەوە، هەروەها منداڵیش ڕۆزی پێ دەدرێت بەهۆی باوکییەوە، بەرەکەتێکی پێچەوانەیە، ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾ [الأنعام: ١٥١]

«ئێمە ڕۆزیی ئێوە و ئەوانیش دەدەین.»

﴿نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ﴾ [الإسراء: ٣١]

«ئێمە ڕۆزیی ئێوە و ئەوانیش دەدەین.»

* ئەگەر لە ماڵێکدا دایک و باوکێکی باش و برایەکی باش کۆ بوویەوە، زۆر بە کەمی لەو ماڵەدا کچ تووشی لادان دەبێت: ﴿يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا﴾ [مريم: ٢٨]

«ئەی ئەوەی وەک خوشکی هاروون وایت (لە تەقوا و خواناسیدا) نە باوکت پیاوێکی خراپ و داوێنپیس بووە، نە دایکیشت داوێنپیس و زیناکار بووە.»

ئەوان سەرمەشقن بۆی لە چاکە و خراپەدا.

* یارمەتیدانی پیاو بۆ خێزانەکەی لە کاروباری ماڵدا، ڕەوشتی پەیامبەر بووە، هەرچەندێک پێگە و کاری کەسەکە گەورە بێت. عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: "پەیامبەری خودا کاری خانەوادەکەی دەکرد و ئەگەر گوێبیستی بانگ بووبا دەردەچوو." لە کاتێکدا عائیشە منداڵی نەبوو.

* کارکردنی پیاو لە ماڵەوە و هەستان بە کاروباری خۆی و سەرقاڵ نەکردنی خانەوادە بە کارە تایبەتەکانی خۆیەوە لە ڕەوشتی پەیامبەرە، عائیشە دەڵێت: پەیامبەر لە ماڵەکەیدا خزمەتی خۆی دەکرد و پۆشاکەکەی دەدوورییەوە و مەڕەکەی دەدۆشی.

* ئیبن عەباس دەڵێت: "لای مەیموونەی پوورم مامەوە (خێزانی پەیامبەر) پەیامبەری خودا بۆ ماوەیەک قسەی لەگەڵدا کرد و پاشان نووست." قسەکردن لەگەڵ خێزان پێش نووستن ڕێبازی پەیامبەر بووە و زۆرێک لێی بێئاگان.

* بەدروستی لە عائیشەوە هاتووە کە برازاکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولڕەحمان هاتووەتە لای و خێزانەکەی لەگەڵدا بووە پێی گوت: چی ڕێگریت دەکات لە خێزانت نزیک ببیتەوە و ماچی بکەی؟ گوتی: من بەڕۆژووم ؟ فەرمووی: ئاساییە، بەدروستی هاتووە بە مرفوعی ماچکردن دروستە بۆ کەسی ڕۆژووەوان، بەڵام سەرجێی کردن حەرامە بە کۆدەنگ. ئەوەی سەرجێی بکات. لەسەریەتی کەفارەت بدات. لەم ئەسەرەی عائیشەوە ئەوە وەردەگرین کە دروستە پیاو ماچی خێزانی بکات لای ئافرەتە مەحرەمەکانی.

* «ئەوانە باشەکانی ناو ئێوە نیین. ئەوانە باشەکانی ناو ئێوە نیین» پەیامبەری خودا (ﷺ) بەو پیاوانەی فەرموو کە ژنەکانیان هاتبوون بۆ شکات کردن لێیان لای پەیامبەر.

* لەگەڵ ئەو هەموو دژایەتییەی دژ بە پەیامبەر دەکرا تەنانەت لە ئافرەتانیشەوە وەک ئەو ئافرەتە جوولەکەیەی کاتێک بانگێشتی خوانێکی کرد و خواردنی ژەهراوی بۆ ئامادەکردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا عائیشە دەفەرمووێت: پەیامبەری خودا هەرگیز لە هیچ ئافرەتێکی نەداوە.

* نەرموونیانی و لابردنی جددییێتی لەگەڵ خانەوادەدا کارێکی چاکە، لە عومەری کوڕی خەتابەوە گێڕدراوەتەوە و فەرموویەتی: "زۆر سەرسامم بەو

پیاوانەی لە ناو خانەوادەیان وەک منداڵ وان، کاتێک کە دەرچوون لە ماڵ وەک پیاوی سەنگین مامەڵە دەکەن."

* فێرکردنی خێزان و مندڵ کاری پەیامبەران بووە: ﴿وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا﴾ [مريم: ٥٥]

«هەمیشە فەرمانی دەدا بە خێزان و کەسوکاری بە نوێژکردن و زەکاتدان و هەمیشە لای پەروەردگاری جێگەی ڕەزامەندی بوو.»

* سونەتە کرداری چاک و ئاکاری بەرز لەگەڵ نوێژ فێری منداڵەکان بکرێت: ﴿يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ [لقمان: ١٧]

«ئەی کوڕە شیرینەکەم نوێژ بەجێبێنە و فەرمان بە چاکە و بەرگری بکە لە خراپە هۆگر و بە ئارام بە لەسەر هەر بەڵا و ناخۆشییەک کە تووشت دێت.»

* پاراستنی نوێژەکان و فەرمان کردن بە خانەوادە لەسەر بەرپاکردنی نوێژ هۆکاری ڕۆزی و یارمەتیدەری زۆربوونی ڕۆزییە: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ [طه: ١٣٢]

«ئەی موحەممەد (ﷺ) فەرمان بدە بە ئەندامانی خێزانەکەت بە نوێژکردن کردن و خۆشت خۆڕاگر و بەردەوام بە لەسەر بەجێهێنانی، ئێمە داوای ڕۆزیت لێ ناکەین بەڵکوو ئێمە ڕزق و ڕۆزی تۆ دەدەین و سەرەنجامی چاک بۆ پارێزکاران و خواناسانە.

* پەیامبەر بە عائیشەی فەرمووە «دەزانم چ کاتێک تۆ لێم تووڕەی» لەگەڵ ئەوەی پارێزراو بووە لە هەڵە، بەڵام پێشنیار و ناڕەزایەتیەکانی خێزانەکانی وەرگرتووە بۆ زیادبوونی هۆگری وخۆشویستییان، چونکە دەمەبۆڵە هەڵەکان گەورە دەکات.

* پیاوێک گوتی ئەی پەیامبەر: تا چەند لە خزمەتکارەکانمان ببورین: پەیامبەر -ﷺ -فەرمووی کل یوم سبعین مرة «هەموو ڕۆژێک حەفتا جار.» ئەمە دەربارەی لێخۆشبوونە لە هەڵەی خزمەتکار، جا دەبێت چۆن بێت بۆ هەڵەی خێزان و منداڵ.

* لە پەیامبەری خوداوە (ﷺ) هاتووە کە یاری و گەمەی لەگەڵ منداڵاندا کردووە وەک: دەرهێنانی زمانی لە منداڵ وەک یاری کردن، هەڵگرتنی منداڵ لەسەر پشت و دەستی و بچووک کردنەوەی ناویان بۆ خۆشەویستی.

* پەیامبەری خودا لەسەر قەدی دارێک وتاری دەدا کاتێک مینبەریان بۆ دروستکرد چووە سەر مینبەر و جا کاتێک قەدەکەی وازلێ هێنا، گوێمان لە نرکە و ناڵە و خەفەتباری قەدەکە بوو، پەیامبەر دابەزی و باوەشی پێداکرد و دەنگەکەی نەما، بۆیە سونەتە باوەش کردن بە خێزان و منداڵدا کاتێک خەمگین بوون، هەروەها ئاژەڵیش چونکە ئەمانە هەمووی لە بێڕۆحەکان بەڕێزترن.

* چوونە دەرەوە بۆ دەشت و سەرچاوە ئاوییەکان کارێکە هەنێک جار پەیامبەران ئەنجامیان داوە: ﴿أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ﴾ [يوسف: ١٢]

لەگەڵمان بینێرە (بۆ دەرودەشت) (بەئارەزووی خۆی) خواردن بخوات و یاری بکات.

عائیشە دەڵێت پەیامبەری خودا دەچووە لای ئەو بەرزاییانە، کە ئاوی بارانی پیا دەهاتە خوارەوە.

* نیشتەجێبوون لە شار و ولاتێکی چاکدا کاریگەری لەسەر منداڵ هەیە: ﴿أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ [إبراهيم: ٣٧]

«من ڕۆڵەکانم نیشتەجێ کرد لەشیوێکی بێ کشتوکاڵدا لای ماڵەپیرۆز و ڕێزگیراوەکەت ئەی پەروەردگارمان تا بەچاکی نوێژ بەجێبێنن.»

لەوانەیە نەوەکان کافر دەربچن بەهۆی ئەوەی باپیرانیان لە وڵاتی کوفر نیشتەجێ بوون.

* ئاسیای ژنی فیرعەون دراوسێی هەڵبژارد پێش ئەوەی خانووەکەی هەڵبژێرێت: ﴿ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ﴾ [التحريم: ١١]

«ژنی فیرعە،ن کاتێک کە وتی پەروەردگارم بۆم دروست بکە لای خۆت ماڵێک لە بەهەشتدا.» دەترسا لەوەی خراپەی فیرعەون لەگەڵیدا بێت: ﴿وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ﴾ «هەروەها ڕزگارم بکە لە فیرعەون.»

* خواردن لەگەڵ خزمەتکاران و ئەو هەژارانەی بانگێشتی خوانە سادەکانیانت دەکەن، چوون بەدەم داواکەیانەوە سونەتێکی پەیامبەرە، هەرچەندە خواردنەکەشیان زۆر سادە بێت، تا دەروونت پاک ببێتەوە و بەوهۆیەوە دڵەکان زیاتر هۆگر ببن، پەیامبەر -ﷺ- دەفەرمووێت:لو دعيت إلى كراع لأجبت ولو أهدي إلي كراع لقبلت «ئەگەر بانگ بکرێم بۆ خواردنی قاچە ئاژەڵێک ئەوا بەدەم داوەکەوە دەچم، ئەگەر قاچە ئاژەڵێکم بۆ بهێندرێت وەری دەگرم.»

* سەرپەرشتیاران لەسەریان واجبە دادوەری بکەن لە کاتی بەخشینی دیاری لەنێوان منداڵەکانیان، جا کوڕ بن یان کچ، ئەمەش ئەوە لە خۆناگرێت شتەکانیان وەک یەک بن، ئەگەر بۆ کچەکەت بازنێکت کڕی ئەوا بە بەهای ئەو بازنە پێنووسێک یان کاتژمێرێک بۆ کوڕەکەت بکڕە.

* لە شەریعەتدا فەرمان کراوە بە یەکسانی لەنێوان منداڵەکاندا لە کاتی پێدانی هەدیە و دیاریدا، لە فەرموودەدا هاتووە «اعدلوا بين أولادكم في العطية» «دادوەر بن لەنێوان منداڵەکانتاندا لەوانەی پێیان دەبەخشن.» بەڵام نەفەقەی منداڵ دەبێت بە ئەندازەی پڕکردنەوەی پێویستی بێت، هەرچەندە جیاوازیش بێت.

* دابەشکردنی دیاری لەنێوان منداڵەکانتدا دەبێت بەشێوەیەکی یەکسان بێت جا کوڕ و کچیان، لەسەر بۆچوونی پەسەند وەک لە فەرموودەدا هاتووە «ئایا هاوشێوەی ئەمەت داوە، بە هەموو منداڵەکانت؟»

* پێویست نییە لە نەفەقەی منداڵدا یەکسانی هەبێت لە ئەندازەی نەفەقەی کوڕ و کچدا، پۆشاکی کچ گرانترە لە پۆشاکی کوڕ، نەفەقەی منداڵی گەورە زیاترە لە بچووک، ئەو جۆرە جیاوازییە دروستە لێرەدا.

* دادوەری لەنێوان منداڵدا واجبە تەنانەت لە بابەتە زۆر وردەکانیشدا، وەک ماچ و گەمە. لە ئیبراهیمی نەخعییەوە بە دروستی هاتووە کە گوتوویەتی: هاوەڵان حەزیان دەکرد دادوەر بن لەنێوان منداڵەکانیاندا تەنانەت لە ماچکردنیشیاندا.

* بەدروستی لە حەسەنەوە هاتووە دەڵێت: پیاوێک لای پەیامبەر کوڕێکی لەسەر ڕانی ڕاستی دانیشاندبوو، پاشان کوڕێکی دیکەی هات لەسەر زەوی داینیشاند، پەیامبەر (ﷺ)فەرمووی «خۆزگە بەیەکسانی هەردووکیانت لەسەر ڕانت دادەنا.»

* عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کوڕێکی لە باوەش گرت کە زۆری خۆش دەویست و پێیگوت: "والله خۆشم دەوێت، بەڵام ناتوانم جیاوازی بکەم لەگەڵ براکەیدا هەرچەندە بە پارویەکیش بێت."

* بەدروستی لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە کە جێگەی نووستنەکەی هەڵدەگرت و هەر شەوە و لای منداڵێکی بەیەکسانی دەنووست، تا دادوەری لەنێوانیاندا بکات، ئیبن ئەبی دونیا و جگە لە ئەویش ڕیوایەتیان کردووە.

* خزمە نزیکەکانت ئەوانەی پێویستە سەردانیان بکەیت چەند پلەیەکن. بەرزترینیان: ئەوانەی حەرامە هاوسەرگیریان لەگەڵدا بکەیت، پاشان بە ئەندازەی دووری خزمایەتی بابەتەکە ئاسانتر دەبێت، لە فەرموودەدا هاتووە

أمك وأباك وأختك وأخاك ثم أدناك أدناك«دایکت، باوکت، خوشکت، برات، پاشان نزیکتر و نزیکتر.»

* گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی واجبە، بەرزترینیان دەبێت بە جەستە و ماڵ و سامان بکرێت، نزمترینیان بە نامە و ناردنی سڵاو بۆیان دێتەجێ، هەرچەندە نزیکتر بێت، دەبێت مافی زیاتر بپارێزیت. ئەگەر دووریش بوو، کەمترین پەیوەندی بەری دەکەوێت.

* خزمایەتی بەهۆی شیردان و هاوسەرگیرییەوەیە، واتە نزیکانی ژن یان مێرد لەوانە هەژمار ناکرێن کە واجبە پەیوەندی خزمایەتیان لەگەڵدا بگەیەنیت، بەڵکوو بە چاکی مامەڵەیان بەرانبەر دەکەیت وەک پێزانین و ڕێز بۆیان.

* دیاری بۆ نزیکەکان باشترە لە بەخشین بە دوورەکان، لە فەرموودەدا پەیامبەر (ﷺ) بە مەیموونەی خێزانی فەرموو کاتێک جارییەکەی ئازاد کرد: «لو أعطيتها أخوالك كان أعظم لأجرك» «ئەگەر بتدابووا بە ماڵە خاڵوانت، پاداشتت زیاتر بوو.»

# تێکەڵاوییەتی دوو ڕەگەزەکە

* پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: إياكم والدخول على النساء «وریا بن لەوەی بەتەنیا بچنە لای ئافرەتانی نامەحرەم.»

کەسێک لە پشتیوانان فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی شووبرا؟

فەرمووی: شووبرا مردنە.

(الحمو): واتا برای مێرد.

.* ئیمامی حەسەن -کە لە سەدەی یەکەمدا ژیاوە- دەڵێت: "کۆبوونەوەی پیاوان و ئافرەتان داهێنراوە." موجاهیدی کوڕی جبر دەڵێت: "دەرچوونی ئافرەت بۆ ناو پیاوان کارێکی سەردەمی نەفامییە."

* عامیری (٥٣٠ک وەفاتی کردووە):- دەربارەی ئەحکامەکانی سەیرکردنی ئافرەت یان پیاوی نامەحرەم، دەڵێت: "زانایانی ئەم ئوممەتە کۆدەنگن لەسەر ئەوەی هەر کەسێک شتێک لەم شتە قەدەغەکراوانە حەڵاڵ بکا یان پێی دروست بێت ئافرەتان و پیاوانی بێگانە لەگەڵ یەکتری تێکەڵ بن، ئەوە بێگومان بێباوەڕ بووە و لە دین دەرچووە و شایەنی کوشتنە چونکە بە هەڵگەڕاوە هەژمار دەکرێت."

* وەلیدی مالیکی (٦٧٥ ک وەفاتی کردووە) دەڵێت: "ئەوەی بۆی ڕوون بووبێتەوە کە تێکەڵاوبوونی هەردوو ڕەگەز حەرامە، دواتر حەڵاڵی بکات، ئەوا بێگومان بێباوەڕە، پێویستە لەسەرت جیهادی بەرانبەر بکەی ئەگەر توانیت بە دەستت یان بە زمانت، ئەگەریش نەتتوانی بەدڵت."

* نازانم کە هیچ زانایەک لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی تاوەکوو سەردەمی داگیرکاری تێکەڵاوبوونی پیاوان و ئافرەتان لە کار و لە خوێندندا بە دروست دانابێت، هەر کەسێک شتێکی وای لایە با بیهێنێت، بەڵام ئەو زانایانەی کە بە حەرامی دەزانن، ئەوە لە هەموو سەردەمێک و لەناو هەموو مەزهەبێکدان، هەوەک چۆن ئەم بابەتانەم باس کردوون لە نامیلکەیەکمدا بە ناوی (الاختلاط).

* ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ﴾ [الاسراء: ٣٢]

«نزیکی زینا و داوێنپیسی مەکەون.»

پەروەردگارمان ڕێگری لێ کردووین لەوەی نزیکی بکەوین، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە چەندین شتی حەرام کراو هەن، دەورەی زینایان داوە و لەپێش زینادا دەکرێن، کە بریتین لە خەڵوەت کردن، یاخود تێکەڵاوبوون، یاخود نەرمکردنەوەی قسە لەلایەن ئافرەتانەوە بەرانبەر پیاوان، یاخود سفووری و خۆڕازاندنەوە.

* ڕۆژئاوا لایان قەدەغەیە کچ پێش هەژدە ساڵی زەواج بکات، بەڵام ئاساییە لایان کە زینا بکات، کەچی ئەوانەی کە سەرسامن بە ڕۆژئاوا لایان قەدەغەیە هەم زەواج بکات و هەم زیناش بکات، بەڵام ڕێگەی پێ دەدەن کە تێکەڵاوبێت لەگەڵ پیاوان، ڕۆژئاواییەکان بەعەقڵ و لۆژیک دەجوڵێنەوە، بەڵام ئەوانەی کاریگەرن بەڕۆژئاوا نە عەقڵیان هەیە نە نەقڵ.

* کەسانێک هەن تێکەڵاو بوونی پیاوان و ئافرەتان بەدروست دادەنێن، لەبەر ئەوەی لەوەحیدا باس نەکراوە، لەکاتێک دا بە موتەواتیر نەهی کراوە لەتێکەڵاو بوون، بۆ بەتاڵکردنەوەی شەریعەتی خوای پەروەردگار زاراوەیەکیان داناوە و بەدروستیان داناوە، لەکاتێکدا کە دەستدرێژی کردن و مادە بێهۆشکەرەکان لە شەرعدا بە دەق باس نەکراون، بەڵام کۆدەنگیش هەیە لەسەر ئەوەی کە حەرامن.

* تێکەڵاوبوون یاخود کۆبوونەوە زاراوەیەکە لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا جێگیر بووە، سەیرم پێ دێت کە کەسێک حەشیش و مادە بێهۆشکەرەکان بە حەرام دادەنێت، چونکە قیاسی دەکاتە سەر ئارەق لە کاتێکدا ئەم زاراوانە لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا نەهاتوون، بەڵام دەوەستێت لە بە حەرامدانانی تێکەڵاوبوونی پیاوان و ئافرەتان.

* تێکەڵاوی بە (لفظ) و دەستەواژە حەرامکراوە، تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیش، بوخاری بەڕاسترین سەنەد ڕیوایەتی کردووە کە عەتا فەرموویەتی: "خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تێکەڵاو نەدەبوون لەگەڵ پیاوان، عائیشە -ڕەزای خوای لێبێ- لە شوێنێک تەوافیدەکرد دوور لە پیاوان.

* خودا دەفەرمووێت: ﴿تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ﴾ [آل عمران: ٦١]

«وەرن با بانگی کوڕەکانمان و کوڕەکانتان و ژنەکانمان و ژنەکانتان و خۆمان و خۆتان بکەین لەپاشان لەخوا بپاڕێینەوە.»

ئەمە ئاماژەیە بە دروستنەکردنی تێکەڵاوی، هەر پۆلێکی لەگەڵ ئەوانە دانا کە گونجاون و تێکەڵ بە ئەوانی دیکەی نەکردن، منداڵ تێکەڵی کۆڕی گەورەکان ناکرێت تا شکۆی کۆڕەکەیان لە ئاژاوە و تێکپرژان پارێزراو بێت. ئافرەتان چونکە سروشتیان وانییە تێکەڵ بە پیاوانی دەرەکی ببن بۆ پاراستنی کەسایەتییان، بەو جۆرە وەک زانراو بووە لە سەردەمی نەفامی و ئیسلامدا.

* کاتێک میوانەکانی ئیبراهیم هاتنە ماڵەکەی، خێزانی پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەبوو فەرمووی: ﴿وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ﴾ [هود: ٧١]

«لەو کاتەدا خێزانەکەی وەستا بوو و پێکەنی.»

(قائمة) بەپێوەبوو، تا گومانی ئەوەی پێ نەبرێت کە تێکەڵی کۆڕی پیاوان دەبێت، ئەمە لە کاتێکدا پیرێژن بوو و مێردەکەی پەیامبەر بوو!

* ﴿قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ﴾ [القصص: ٢٦]

«یەکێک لەو دوو (کچە بە باوکی) وت ئەی باوەگیان بەکرێی بگرە (بۆ شوانی) چونکە بەڕاستی چاکترین کەس کە بە کرێی بگری بەهێز و ئەمینە و دەست و داوێن پاکە.»

داوای لە باوکی کرد مووسا بە کرێ بگرێت، تا چیتر پێویست نەکات دەربچنە دەرەوە و تێکەڵ بەپیاوان ببن.

* ﴿إِنِّىٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَىَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِى ثَمَٰنِىَ حِجَجٍ﴾ [القصص: ٢٧]

«بەڕاستی من دەمەوێت کە یەکێک لەم دوو کچەم لە تۆ مارەکەم بەو مەرجەی هەشت ساڵ ڕەنجبەریم بۆ بکەیت.»

بۆئەوەی کچەکانی پارێزراو ببن لە تێکەڵاوییان لەگەڵ پیاوان، لەگەڵ چاکیێتی مووسادا، بۆ زیاتر پاراستنی کچەکانی یەکێکیانی لێ مارە دەکات.

* کاتێک مووسا و خێزانی ئاگرێکیان بەدی کرد لە گەشتەکەیاندا مووسا فەرمووی: ﴿ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ﴾ [طه: ١٠]

«لێرە بمێنەوە بەڕاستی من ئاگرێکم بەدی کردووە (دەڕۆم بۆ لای) بەڵکوو لەو ئاگرە سڵۆکێکتان بۆ بێنم.»

﴿ٱمْكُثُوٓا۟﴾ لێرە بمێنەرەوە، چونکە ئەو دەچوو بۆ لای پیاوان گونجاو نییە ئەو ئامادەی ئەو بەیەکگەیشتنە بێت، پێشەوا قوتوبی دەڵێت: "ئەوانی جیا کردنەوە تاکوو خێزانی نەبیندرێت."

* تێکەڵاوی ڕێگە پێنەدراو ئەو تێکەڵاوییەیە کە بەشێوەیەکی بەردەوام هەیە لە کاتی کار و فێربووندا، بەڵام تێپەڕبوون بە ناو بازاڕدا بەبێ بەرکەوتن پێی ناگوترێت تێکەڵاوی بەڵکوو ئەوە تەنیا زمانی ڕاگەیاندنە.

* تێکەڵاوی ڕێگە پێنەدراو ئەو تێکەڵاوییەیە کە بە شێوەیەکی بەردەوام هەیە لە کاتی کار و فێربووندا، بەڵام تێپەڕبوون بە ناو بازاڕدا بەبێ بەرکەوتن پێی ناگوترێ تێکەڵاوی و کەسانێک بۆ شێواندنی هەقِ وا باسی دەکەن.

* دەیانەوێت شتەکان تێکەڵ بکەن تاکوو هەق نەمێنێت! کاتێک پەیامبەر ڕیبا و سووی حەرام کرد دەیانگوت کڕین و فرۆشتنی حەرام کردووە: ﴿إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ [البقرة: ٢٧٥]

«کڕین و فرۆشتن وەک سوو وایە.»

کاتێک حەرامێتی تێکەڵاوییان بۆ ڕوون دەکەیتەوە، دەڵێن: ڕۆیشتن لە بازاڕدا بە حەرام دادەنێن!

* یەکێک لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لیکونن من أمتي قوم يستحلون الحر (الزنى) والحرير والخمر والمعازف«لە ئوممەتەکەمدا کۆمەڵانێک پەیدا دەبن زینا و ئاوریشم و ئارەق و مۆسیقا حەڵاڵ دەکەن.» ناتوانن زینا بە حەڵاڵ دابنێن بەبێ ئەوەی لەوە و پێش دایک و باوکی زینایان حەڵاڵ نەکردبێت کە بریتین لە تێکەڵاوی و هاوشێوەکانی تێکەڵاوی.

* هیچ کێشە و ناکۆکییەک نییە لەسەر کڕین و فرۆشتنی ئافرەتان لە بازاڕێکی تایبەت بە خۆیان کە دوور بن لە پیاوانەوە. ئەوەی ئەمڕۆ ڕێگە بدات ئافرەتان پێشوازی لە کڕیارە پیاوەکان بکەن، سبەی ڕێگە دەدات پێشوازی بکەن لە ئووتێل و کافتریاکانیشدا.

* کەسێکی خەلیجی پێی گوتم: ئافرەتان دەستیان کرد بە کار لە ژووری جیاوازدا کاریان دەکرد، پاش ٥ ساڵ بە شوشە ژوورەکان جیاکرانەوە، لە ئێستادا بۆ ماوەی ٨سەعات لەیەک ژووردایین: ﴿فَٱعْتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ﴾ [الحشر: ٢]

«ئینجا پەند وەرگرن ئەی خاوەنانی بیروهۆش.»

* زۆرێک لە ڕۆژئاواییەکان پێش سەدە و نیوێک هیچ شتێک لەلایان نەبوو بە ناوی تێکەڵاوی هەردوو ڕەگەز، ئەوکات زۆر دژی بوون، لە ئەمڕدا پیاو لە پیاو و ژن لە ژن مارەدەکەن، بڕینی ڕێگە درێژەکان بە یەکەم هەنگاو دەست پێ دەکەن.

* زۆری گێچەڵی سێکسی لە ڕۆژئاوا دەرناکەوێت لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو ناپۆشتەی و تێکەڵاوییەیان، چونکە زینا لایان ئاساییە، ئەوان ئامانجەکانیان لەبەردەستە و نزیکە لێیانەوە پێویستیان بە هۆکارەکان نییە، کەس ئاو نادزێت ئەگەر لە ئاسمانەوە داباریێت بەسەریدا.

# مێژوو، پەند و ئامۆژگاریی

* مێژوو زانستێکە پێویستی بە مامۆستا نییە، بەڵکوو تەنها پێویستی بە قاچێکی گەڕیدە و چاوێکی ڕوانەر هەیە: ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ﴾ [آل عمران: ١٣٧]

«بێگومان ڕابورد لەپێش ئێوەوە چەند ڕێ و یاسایەک (باوێک) ئینجا ئێوە بگەڕێن بە زەویدا و سەرنج بدەن.»

* نزیکە بڵێین هیچ ڕووداوێک ڕوونادات هاوشێوەکەی لە مێژوودا نەبووبێت، زۆر جێی داخ و حەسرەتە ببینیت هەڵە مێژووییەکان دووبارە دەکرێنەوە، بەهۆی نەزانینیانەوە.

* هەرکەس شارەزا نەبێت بە مێژوو هەڵەی پێشینەکانی دووبارە دەکاتەوە. زۆرینەی خەڵکی دەکەونە ناو هەمان چاڵ کە ئەوانەی پێشوو تێ کەوتوون.

* چەرخی مێژوو و ڕووداوەکان هەموویان هاوشێوەن سەرەتاو و کۆتاییان. لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ هەڵەکانی دووبارە دەکاتەوە: ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ﴾ [آل عمران: ١٣٧]

«بێگومان ڕابورد لەپێش ئێوەوە چەند ڕێ و یاسایەک (باوێک) ئینجا ئێوە بگەڕێن بە زەویدا و سەرنج بدەن.»

* تێپەڕبوونی تەمەن شارەزاییەک دەداتە مرۆڤ کە بتوانێت ڕووداوە لەناکاوەکانی پێ بەراورد بکات، هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی مێژوو ژیانێکی خێرایە بە چەندین سەدەدا ﴿وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُمْ﴾ [النور: ٣٤]

«چەند نموونە و بەسەرهاتی ئەو گەلانەی لەپێش ئێوەوە هەبوون.»

* هەموو نەوەیەک خەفەتبارن بۆ مێژووی پێشینەکانیان، چونکە بە وردی و تێروتەسەلی نەنووسراوەتەوە بۆیان، لە کاتێکدا خودی خۆیان مێژووی خۆیان وازلێ هێناوە بۆ ئەوانەی پاش خۆیان، لە مێژووی ئەمڕۆشدا پەند و ئامۆژگاری زۆر هەیە.

* سێیەکی قورئان چیرۆکە، خودا بۆ باشترینی مرۆڤەکانی باس دەکات، تا پەند و ئامۆژگاری و هاندانی لێ وەرگرێت. ئەگەر سەرداری مرۆڤەکان پێویستی پێ بووبێت، دەبێت کەسانی خوار ئەو چەندیان پێویست بێت؟ ناکرێت هیچ وتەبێژێک خۆی بێپێویست دابنێت لە شێوازی قورئان.

* سەرگوزەشتەی ئوممەتانی پێشوو پەند و ئامۆژگاری و زانستە تەنانەت بۆ پەیامبەرانیش: ﴿وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ﴾ [الزخرف: ٤٥]

«تۆ پرسیار بکە و لەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ ناردوومانن.»

* کەموکوڕی لە ئایەتەکان و بەڵگەکاندا نییە، بەڵکوو لە بینین و بەرچاوڕۆشنیدایە: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ﴾ [يوسف: ١٠٥]

«زۆر بەڵگە و نیشانە هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا بەلایاندا دەڕۆن بەڵام ئەوان ڕوویان لێ وەردەگێڕن.»

* خۆ ئەگەر لە قورئان تێڕابمانایە، ئەوا هەڵەی ئەوانەی پێشوویان ئەنجام نەدەدایەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا﴾ [طه: ١١٣]

«ئا بەو جۆرە قورئانێکی عەرەبیمان دابەزاندووە بە جەند جۆر و شێواز هەڕەشەمان لەودا باسکردووە بۆئەوەی لەخوا بترسن و خۆیان بپارێزن (لەتاوان) یان بیرکردنەوە و بێداری دروست ببێت بۆیان (بەهۆی قورئان)ەوە.»

هەڵەکان دووبارە دەکەنەوە جا سزاکانیش بەسەریاندا دووبارە دەبێتەوە.

* خودا چەندین شوێنی بۆ پەند و عیبرەت لە زەویدا داناوە، بێبەش ئەو کەسەیە بەلایدا تێدەپەڕێت و گاڵتەی و گەپ و ڕابواردنی تێدا دەکات: ﴿وَإِذَا ذُكِّرُواْ لَا يَذْكُرُونَ --وَإِذَا رَأَوْاْ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ﴾ [الصافات: ١٣-١٤]

«کاتێک ئامۆژگاری بکرێن ئامۆژگاری وەرناگرن. کاتێکیش موعجیزەیەک ببینن دەیکەنە گاڵتەجاڕی.»

* هەموو ڕووداوێک کە ڕوو بدات پەند و ئامۆژگاری تیادایە لەلایەن خوداوە بۆ مرۆڤایەتی، بەختەوەرترین کەس ئەو کەسەیە زۆرترین پەند و ئامۆژگاری لەو ڕووداوانەوە هەڵدەهێنجێنێت، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی بەهۆی ڕووداوەکانەوە دەسەڵاتی ناگۆڕێت و پێگەی لەگەڵ ڕۆژگاردا ناگۆڕێت.

* زۆرترین چیرۆک کە لە قورئاندا دووبارە بووبێتەوە چیرۆکی فیرعەونە، چونکە زۆرێک لە حاڵی ئوممەتان بەو جۆرە بوون و ئەم ئوممەتەش زۆر پێویستی بەو چیرۆکەیە بۆ پەند وەرگرتن.

* ئەقڵ ڕێ دەکات، حیکمەت و دانایی ئەوەیە کە حاڵی ڕێگەکە لە کەسێک بپرسێت کە بەو ڕێگەیەدا ڕۆیشتووە، نەک لە هاوسەفەرێکی خۆی بپرسێت کە ڕێگەکە چۆن دەبینیت، ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا﴾ [طه: ٩٩]

«ئەی (موحەممەد (ﷺ)) ئا بەو جۆرە دەیگێڕینەوە بۆت هەندێک لە بەسەرهات و هەواڵی ئەو (گەلانەی) ڕابوردن، بێگومان لەلایەن خۆمانەوە قورئانمان پێ داویت.»

* زانست ترس دەچێنێت لە دڵدا، ترسیش یادکردن و پەند وەرگرتن دەچێنێت. ئەو کەسەی ترسی نەبێت، پەند وەرناگرێت، هەروەها ئەگەر زانستی نەبوو، ترسی نابێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ﴾ [فاطر: ٢٨]

«بەڕاستی لەناو بەندەکانی خودا تەنیا زانایان (وەک پێویست) لەخوا دەترسن.»

﴿سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ﴾ [الأعلى: ١٠]

«بێگومان ئەوەی لە خوا بترسێت پەندی لێ وەردەگرێت.»

* کەسی نەزان پەند وەرناگرێت، هەرچەندە ئەو شتانەی کە جێی پەندوەرگرتنن زۆریش بن: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ﴾ [النازعات: ٢٦]

«بەڕاستی لەم داستانەدا پەند هەیە بۆ کەسێک لەخوا بترسێت.»

نەزانی لەگەڵ ترسان لە خودا کۆ نابێتەوە: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ﴾ [فاطر: ٢٨]

«بەڕاستی لەناو بەندەکانی خودا تەنیا زانایان (وەک پێویست) لەخوا دەترسن.»

لەپاش ناسینی شتێک، ترست بۆ دروست دەبێت لێی.

* پەند وەرناگرن! چونکە خودا ناناسن، جا چۆن لە شتێک دەترسن کە نەی ناسن: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ﴾ [النازعات: ٢٦]

«بەڕاستی لەم داستانەدا پەند هەیە بۆ کەسێک لەخوا بترسێت.»

* سزادانی فیرعەون لە گەورەترین سزاکانی خودا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەس پەندی لێ وەرناگرێت، تەنها ئەوانە نەبێت کە لەخودا دەترسن: ﴿فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ۞ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ﴾ [النازعات: ٢٥-٢٦]

«ئینجا خوا گرفتاری کرد بەسزای هەردوو جیهان. بەڕاستی لەم داستانەدا پەند هەیە بۆ کەسێک لە خوا بترسێت.»

* ئەوانەی زۆرترین هەڵە دەکەن، ئەوانەن کە کەمترین پەندیان لە ڕووداوە مێژووییەکان وەرگرتووە، چونکە ڕووداوەکان لە یەک دەچن، سەرەتا و کۆتاییەکانیان، ئەگەر چی کاتیان جیاوازە: ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا﴾ [آل عمران: ١٣٧]

«بێگومان ڕابورد لەپێش ئێوەوە چەند ڕێ و یاسایەک (باوێک) ئینجا ئێوە بگەڕێن بە زەویدا و سەرنج بدەن.»

* مرۆڤ هەڵەکانی دووبارە دەبێتەوە ئەگەر پەندوەرگرتنی لە کەسانی دیکە کەم بوو، پێشەوا عەلی دەفەرمووێت: "ئای چەند زۆرن ئەو شتانەی جێی پەندن، بەڵام پەند وەرگران کەمن."

* ڕووداوە مێژووییەکان لە یەک دەچن، دەستاڕەکان دەسووڕێنەوە بە هەمان باری پێشویاندا، بەو هەڵانەی ئەنجام دراون، چونکە پەند وەرگرەکانیان کەمن.

* خودا سزای ئوممەتان دەدات خەڵکیش هۆکارەکان نازانن، چونکە خودا بەڵگە و هۆشداریەکانی دەداتە بەندەکانی لە کاتێکدا ئەوان لێی بێئاگان: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ﴾ [یوسف: ١٠٥]

«زۆر بەڵگە و نیشانە هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا بە لایاندا دەڕۆن، بەڵام ئەوان ڕوویان لێ وەردەگێڕن.»

* لە شتە هەرە سەرسووڕهێنەکانی مرۆڤ ئەوەیە پەندەکان دەگوزەرێن بەلایاندا، بەڵام وەها مامەڵەی دەکەن وەک ئەوەی ئەوان نەگرێتەوە، تا ئەو کاتەی بە ناوەکانیان بانگ دەکرێن: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ﴾ [یوسف: ١٠٥]

«زۆر بەڵگە و نیشانە هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا بە لایاندا دەڕۆن، بەڵام ئەوان ڕوویان لێ وەردەگێڕن.»

* بێمێشک و سەرقاڵەکان لە مەستی ژیاندان هیچ شتێک بەهۆشیان ناهێنێتەوە تەنها سزایەکی تایبەت نەبێت: ﴿وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾ [یونس: ٩٧]

«بڕوا ناهێنن هەرچەند بۆیان بێت هەموو بەڵگە و نیشانەیەک هەتا دەبینن (بە چاوی خۆیان) سزای سەختی ئازاردەر.»

پێشەوا علي دەفەرمووێت: "ئەی چەند زۆرن ئەو شتانەی جێی پەندن، بەڵام پەند وەرگرانیان کەمن."

* ئەگەر بوترێت هەموو خەڵکی تیا دەچن تەنها یەک کەس نەبێت زۆرینەی خەڵکی واگومان دەبات ئەو دەرباز بووە خۆی دەبێت، بەو هۆیەوە بەردەوام دەبن لە سەرکەشییان لە کاتێکدا دەرباز بوو تەنیا یەک کەسە، هەر بۆیە کەم پەند وەردەگیرێت لە سزا دابەزێندراوەکانی خودا.

* هەموو ڕووداوە گەورەکان پەندی گەورەیان تیادایە، خودا بەهۆی تاوانی مرۆڤەکانەوە پەند وەرگرتنیان لێ قەدەغە دەکات، بەهۆی باوەڕ و گوێڕایەڵییان پەندەکانیان بۆ دەردەخات: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ [الحجر: ٧٧]

«بەڕاستی لەوەدا بەڵگەی گرنگ هەیە بۆ بڕواداران.»

* ڕووداوەکان خودا دەیانهێنێتە پێش بۆ پەند وەرگرتن، ئەگەر بینیت ڕووداوەکان گەورە بوون و پەندیان کەم بوو، ئەوا دووری نێوانیان نەناسینی خودایە و بێئاگاییە لە گەورەیی خودا.

* ڕووداوەکان دەسووڕێن وەک چۆن گەردوون دەسووڕێت، کاتی خۆیان هەیە: کاتەکان و ساڵەکان دووبارە دەبنەوە پێویسیان بە پەند وەرگرێک هەیە وەک چۆن فەلەکناسەکان پەند لە ئەستێرەکان دەبینن، بەڵام خەڵکی لە بێئاگاییدان و پەند وەرناگرن.

* ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾ [السجدة: ٢٢)

«کێ ستەمکارترە لەو کەسەی بە ئایەتەکانی پەروەردگاری ئامۆژگاری بکرێت. دوای ئەوە ڕووی وەرگێڕێت، بەڕاستی ئێمە تۆڵەسێنەرین لە تاوانباران.»

یەکێک لە شێوازەکانی پشت هەڵکردن: سەرقاڵبوونە لە پەندوەرگرتن بەهۆی لێکدانەوەی هەواڵەکانی بابەتە لاوەکییەکانەوە.

* ستەمکار پەند وەرناگرێت لە سزای ستەمکارانی دیکە، چونکە وا نابینێت خۆی ستەمکار بێت، داننان بە تاواندا کلیلی پەندوەرگرتنە و خۆبەگەورەزانین قفڵە بۆی، بۆیە خۆبەگەورەزانان پەند وەرناگرن.

* دووڕووەکان مرۆڤانێکن کەمترین پەند وەردەگرن، چونکە زۆرترین خۆبەگەورەزانینیان هەیە لە بەرانبەر هەقدا: ﴿أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِى كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ [التوبة: ١٢٦]

«ئایا ئەوانە نازانن و نابینن بێگومان ئەوان تاقی دەکرێنەوە لە هەموو ساڵێکدا جارێ یان دووجار، پاشان ئەوان ناگەڕێنەوە و تۆبە ناکەن و پەند وەرناگرن.»

* پەند وەرگرتن بە کۆتاییەکانە، نەک سەرەتاکان: ﴿قُلْ يَـٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَـٰقِبَةُ ٱلدَّارِ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ [الأنعام: ١٣٥]

«ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ ئەی گەلەکەم لەسەر ڕێبازی خۆتان ئەوای لە دەستتان دێت بیکەن، بێگومان منیش کاروکردەوەی خۆم دەکەم جا لەمەوپاش دەزانن سەرەنجامی ئەو دنیا بۆ کێ دەبێت، بێگومان (بێباوەڕان و) ستەمکاران ڕزگاریان نابێت.»

* پەندوەرگرتن بە کۆتاییەکان دێتەجێ، نەک سەرەتاکان، قورئان زۆرجار ئەوە باس دەکات، ﴿فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ [النمل:٦٩]

«سەرنج بدەن بزانن سەرەنجامی تاوانباران چۆن بووە (چییان بەسەر هاتووە).»

نیعمەتێکی گەورەیە مرۆڤ کۆتاییی کەسانی دیکە ببینێت و پەندیان لێ وەرگرێت، پێش کۆتایی هاتنی خۆی.

# حوکمە وابەستەکان بە ڕۆژ و مانگەکانەوە

* یەکی موحەڕڕەم وەک سەرەتای ساڵی قەمەری دانەنراوە لە ئیسلام و جاهیلیشدا، عەرەب بە هۆی ڕووداوەکانەوە ناوی مانگەکانیان دەنا، لای هەموویان زاندراو بوو ساڵ ١٢ مانگە، بەڵام یەکەم مانگی ساڵ دیاری نەکرابوو تا سەردەمی عومەر.

* پێشەوا عومەر ڕۆژمێری بە کۆچی پەیامبەر دانا، ڕۆژمێری بە لەدایکبوونی پەیامبەر (ﷺ) دانەنا وەک ئەهلی کتاب وایانکردووە، تا خەڵکی بزانن ئێمە ئوممەتی کردارین، نەک ئوممەتی کات و ڕووداوەکان.

* دانانی ڕۆژمێری کۆچی بەڵگەکەی لەم ئایەتەوە وەرگیراوە: ﴿لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ﴾ [التوبة: ١٠٨]

«بێگومان مزگەوتێک کە لەسەر بناغەی تەقوا و لەخواترسان دامەزرابێت لە یەکەم ڕۆژەوە.»

خودا بە یەکەم ڕۆژ ناوی برد، ئەو ڕۆژەش یەکەم ڕۆژی کۆچ بوو، ئەمەش سوهەیلی لە هاوەڵانی گێڕاوەتەوە.

* ساڵی کۆچی چەرخێکی زەمەنییە و دەسووڕێتەوە، وەک سووڕانەوەی ڕۆژ و هەفتە و مانگ و سەدە، هیچ بنچینەیەک نازانم دەربارەی پیرۆزبایکردن تێیدا، خۆ ئەگەر وەک نزا و یادخستنەوە بێت، کارێکی چاکە.

* هیچ حوکمێکی شەرعی تایبەت جێگیر نەبووە دەربارەی سەرەتای ساڵ و کۆتایی ساڵ، نە وتە، نە کردار، نە فەزڵ و گەورەیی. ساڵی کۆچییش دانەندراوە. تا سەردەمی پێشەوا عومەر.

* هەموو تاکێک ساڵێکی تایبەت بە خۆی هەیە دەستپێکی ئەو ساڵەش بە ڕۆژی لەدایکبوونی دیاری دەکرێت کە ئەوە تەمەنی ڕاستییەتی، بەڵام ئەو ڕۆژمێرەی بە مانگی موحەڕەم دەست پێ دەکات، ئەوا بۆ ڕێکخستنی ڕۆژمێری ساڵانەیە، تۆ پرسیارت لەسەر تەمەنی خۆت لێ دەکرێت، نەک ساڵی ڕۆژمێر.

* مانگە قەدەغەکراوەکان بریتین لە مانگەکانی (ذو القعدة و ذو الحجة و محرم و رجب)، هەم تاوان و هەم گوێڕایەڵی گەورەترن لەو مانگانەدا بەرانبەر بە مانگەکانی دیکە، ﴿فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡ﴾ [التوبة: ٣٦]

«کەواتە لەو چوار مانگەدا ستەم مەکەن لەخۆتان.»

ئەگەر تاوان لەو مانگانەدا گەورە بێت، ئەوا پەرستش و گوێڕایەڵی خودا زۆر گەورەترە.

* ڕۆژووی سونەت لە مانگی موحەرەم لە ڕۆژووی سونەتی هەموو مانگەکانی دیکە گەورەترە، وەک چۆن شەونوێژ لە نوێژە سونەتەکانی تەواوی ڕۆژ گەورەترە، بەهۆی فەرموودەیەی «گەورەترین ڕۆژوو پاش ڕەمەزان، موحەرەمە. گەورەترین نوێژیش پاش فەرزەکان، شەونوێژە.»

* هەموو ئەو ڕۆژانەی سونەتە بەڕۆژووبوون تێیدا، ئەوا لە مانگی موحەرەمدا سونەتبوونەکەی جەخت لێ کراوەتر و گەورەترە، وەک دووشەمە و پێنج شەمە و ڕۆژەکانی مانگ پڕی و ڕۆژووی داودیش.

* ڕۆژوی عاشورا پلەوپایەی لە دوای ڕۆژووی عەرەفەوەیە، باشترین شێوازەکانی: بەڕۆژوو بوونی نۆ «تاسوعا» و دەیە «عاشورا»، پاشان دە و یانزە، پاشان نۆ و دە و یانزە، پاشان دە بەتەنها.

* هیچ فەرموودەیەک جێگیر نەبووە دەربارەی بەڕۆژووبوونی ڕۆژی یانزەهەم لەگەڵ دەیەمدا، هەر کەس ڕۆژی نۆیەمی لەدەست چوو و دەیویست یانزەهەم

بگرێت لەگەڵ عاشورادا بۆ پێچەوانەکردنی جوولەکە، ئەوە کارێکی چاکە، چونکە بەو کارەش پێچەوانەکردنی جوولەکە دێتەجێ.

* هیچ فەرموودەیەک دەربارەی فەزڵی ڕەجەب لە پەیامبەرەوە (ﷺ)جێگیر نەبوە، دروست نییە تایبەت بکرێت بە هیچ پەرستشێکەوە وەک نوێژ و ڕۆژوو تەنها ئەوەندە نەبێت لە مانگە قەدەغەکانە و تاوان تیایدا گەورەترە: ﴿فَلَا تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾ [التوبة: ٣٦]

.«کەواتە لەو چوار مانگەدا ستەم مەکەن لەخۆتان.»

* جێگیر نەبووە کە ئیسرا و میعراج لە مانگی ڕەجەبدا بووبێت و هیچ شتێک جێگیر نەبووە دەربارەی ساڵ و مانگ و ڕۆژەکەی، نە لە پەیامبەرەوە (ﷺ) و نە لە هاوەڵانەوە.

* گەورەترین مانگ بۆ ڕۆژوو پاش مانگی ڕەمەزان مانگی موحەرەم و شەعبانە، بەڕۆژووبوونی سونەت هەموو مانگەکە دروست نییە جگە لەو دوو مانگەدا نەبێت، لە سەحیحدا هاتووە کە پەیامبەر (ﷺ) «مانگی شەعبان هەمووی بەڕۆژوو دەبوو.»

* هیچ فەرموودەیەک دەربارەی فەزڵی نیوەی مانگی شەعبان جێگیر نەبوە، هاوەڵان بە هیچ کردەوەیەکی تایبەت فەزل و پێگەیان دیاری نەکردووە. هاوشێوەی هەموو شەوەکانی دیکەیە کە خودا لە سێیەکی کۆتایی شەودا دادەبەزێت، هیچ تایبەتمەندیەکی دیکەی نییە.

* هیچ فەرموودەیەک دەربارەی فەزڵی نیوەی مانگی شەعبان جێگیر نەبوە. بە مەرفوعی لە عەلی و عائیشە و موعاز و ئەبی سەعلەبە وئەبوو دەرداوە هاتووە. بەڵام هەموویان لاوازن، بەڕۆژووبونی سونەتە تەنها بەهۆی ئەوەی کە لەو ڕۆژانەیە مانگ تیایدا پڕە، هەروەها لە مانگی شەعبانە، هیچ شتێک نەهاتووە دەربارەی تایبەتکردنی شەونوێژ بەو شەوەوە و کردەوەش لەسەر ئەوە نەبووە.

* عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: هیچ یەک لە شێخەکانمان و زاناکانمان ئاوڕیان نەدەدایەوە بە لای شەوی نیوەی شەعباندا و هیچ یەکێکیان فەرموودەکەی مەکحوولیان باس نەدەکرد، وایان دەبینی هیچ فەزڵێکی تایبەتی نییە و وەک شەوەکانی دیکە وایە.

* بەڕۆژووبوونی شەش ڕۆژی مانگی شەوال لە پاش ڕەمەزان وەک بەڕۆژووبوونی هەموو ساڵەکەیە، مەبەست لە «الدهر» یەک ساڵە، ڕەمەزان یەک مانگە و بە دە هەژمار دەکرێت، شەش ڕۆژی شەوالیش بە دوو مانگ، چونکە چاکە بە دە هێندە هەژمار دەکرێت.

* سونەتبوونی شەش ڕۆژی مانگی شەوال بەدیاریکراوی پێچەوانەی سونەتییێتی ڕۆژەکانی دیکەی نییە، بۆیە شەوال باس کراوە بۆ پەلە کردن تیایدا، ئەو نەفییەی پێشەوا مالک دەیگوازێتەوە لە کردەوەی سەلەف، مەبەستی لە تایبەت کردنە بە شەوالەوە.

* بەڕۆژووبوونی شەشەڵان پێش گێڕانەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان دروستە، چونکە ئەو کەسەی بەهۆی عوزرێکەوە ڕۆژووی شکاندبێت وەک ئەوە وایە کە بەڕۆژوو بووبێت، ئەو جۆرە کەسانە وتەی پەیامبەر (ﷺ) دەیانگرێتەوە کە دەفەرمووێت «من صام رمضان و أتبعه ستا...»

بەڵام گێڕانەوەی لە ئەستۆیدا دەمێنێتەوە.

* دروستە بەڕۆژووبوونی سونەت پێش گێڕانەوەی ڕەمەزان، ئەوانەی لە سەلەف ئەم وتەیەیان گوتووە: سەعیدی کوڕی جوبەیر لە پێشەوا ئەحمەدی ڕیوایەت کردووە، عائیشەی دایکی باوەڕداران گێڕانەوەی ڕۆژووەکانی دوا دەخست تا مانگی شەعبان و زۆر دوورە لەوەوە کە ڕۆژووی سونەتی نەگرتبێت.

* نییەت بازرگانی زانایانە. سونەتە مرۆڤ ڕۆژووی شەشەڵانی هاوتا بکات لەگەڵ ڕۆژەکانی دووشەمە و پێنچ شەمە و ڕۆژەکانی مانگ پڕی و هاوشێوەکانی تاکوو هەردوو پاداشتەکەی دەست بکەوێت، جێگیر بووە لە پێشەوا عومەرەوە ڕۆژووە گێڕانەوەکانی لەگەڵ سونەتەکاندا کۆ کردووەتەوە.

* باشترە ڕۆژوو گێڕانەوەی ڕەمەزان هاوتا بێت لەگەڵ ڕۆژە ڕێزدارەکان، پێشەوا عومەر دەڵێت: پێم خۆشە ڕۆژوە قەزاکانم بخەمە ناو نۆمینەی حاجیان.

* بۆچوونی پەسەند ئەوەیە: باشترین کات بۆ عەمرەکردن مانگەکانی حەجە و باشترینیان مانگی (ذي القعدة)یە، عەمرەکردن لەو مانگەدا لەسەر بۆچوونی پەسەند لە مانگی ڕەمەزانیش گەورەترە، چونکە زۆرینەی عەمرەکانی پەیامبەر لەو مانگەدا بووە.

* پەیامبەری خودا چوار عەمرەی ئەنجام داوە، هەموویان لە مانگەکانی حەجدا بوون، ٣ دانەیان لە (ذي القعدة)دا بووە، فەرموودەی «وەک حەجێکە لەگەڵ مندا» فەزڵێکی تایبەتە نەک فەزڵێکی گشتی بێت بەسەر هەموویدا، چەند جار دووبارەکردنەوەی کردارێک لەلایەن پەیامبەرەوە جەختکراوەترە لە وتەیەک کە کرداری پێ نەکرا بێت.

* لە دە ڕۆژی مانگی حاجییاندا خودا گفتوگۆی لەگەڵ مووسادا کرد و ئایینی بۆ ئێمە تەواو کرد. خودا سوێندی پێ خواردوە، پەرستش لەو ڕۆژانەدا گەورەترە لە کاتەکانی دیکە وەک (الله أکبر)کردن و ڕۆژوو، گەورەترین ڕۆژیش ڕۆژی عەرەفەیە.

* دە ڕۆژی مانگی حاجییان گەورەترین ڕۆژەکانی ساڵە، دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزانیش گەورەترین شەوەکانی ساڵە، هەرکەس ڕێنمایکراو بێت بۆ پەرستش لە ڕۆژەکانی یەکەم و شەوەکانی دووەمدا، ئەوە ڕێنمووی کراوە.

* خۆر هەڵنەهاتووە بەسەر ڕۆژانێکدا گەورەتربێت لە دە ڕۆژەکانی مانگی حاجیان، کردەوە تیایدا زۆر گەورەیە، باشترین کردەوەش نوێژ و (الله أكبر)کردن و بەخشین و ڕۆژوو و حەجە، ئەو کاتە پیرۆزانە تاوان تیایاندا گەورەیە.

* (الله أكب) کردنی تایبەت پاش نوێژی بەیانی ڕۆژی عەرەفە دەست پێ دەکات و بە کۆتاهاتنی ڕۆژی ١٣ی مانگ لە پاش نوێژی عەسر کۆتای دێت، دروسترین شێوازی (الله أكبر الله أكبر الله اكبر كبيرا) ...

* دروسترین شێوازی تەکبیرکردن ئەو ڕیوایەتەیە کە عەبدولڕەزاق هێناویەتی لە سەلمانی فارسییەوە: (كبروا الله ... الله أكبر الله أكبر الله اكبر كبيرا...» ئەمەش ئیسنادەکەی سەحیحە.

* باشترە ڕۆژوو گێڕانەوەی ڕەمەزان ئەوەیە هاوتا بێت لەگەڵ دە ڕۆژەکانی مانگی حاجیاندا، وا ئومێد دەکرێت ڕۆژووەوان پاداشتی هەردووکیانی بۆ بێتەجێ، پێشەوا عومەر دەڵێت: پێم خۆشە ڕۆژووە قەزاکانم بخەمە ناو نۆمینەی حاجییانەوە.

* خۆر هەڵنەهاتووە بەسەر ڕۆژانێکدا گەورەتر بێت لە ڕۆژی عەرەفە، هیچ شەوێکیش گەورەتر نییە لەشەوی قەدر، نزا و پاڕانەوە تیایاندا لە باشترین کردەوەکانن، زۆر نزیکە وەڵام بدرێنەوە و وەربگیرێن.

* ئەو ڕۆژەی بەهەشت زۆر نزیکە و دۆزەخ زۆر دوورە بریتییە لە ڕۆژی عەرەفە، بێبەش ئەو کەسەیە کردەوەیەک نەدۆزێتەوە تیایدا خۆی دەرباز بکات پێی، پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت «هیچ ڕۆژێک نییە خودا ئەستۆی خەڵکی تێدا ئازاد بکات لە دۆزەخ، بە وێنەی ڕۆژی عەرەفە.»

* بێبەشترین کەس ئەو کەسەیە کە خەریکی تاوان بێت لەو کاتەدا کە خودا شانازی دەکات بە بەندە گوێڕایەڵەکانییەوە لای فریشتەکان، پەیامبەر (ﷺ)

دەفەرموویت: «خودا نزیک دەبێتەوە و شانازی دەکات بە خەڵکانی عەرەفەوە بەسەر فریشتەکاندا.»

* گەورەترین ڕۆژوو پاش ڕەمەزان ڕۆژووی عەرەفەیە، خودا تاوانی دووساڵ دەبووریت بە ڕۆژێک، باشترین کردەوە تیایدا ڕۆژووە بۆ جگە لە حاجییان، هەروەها (الله أکبر)کردن و پاڕانەوە و بەتایبەت داوای لێخۆشبوون کردن.

* فەزڵی ڕۆژووی عەرەفە بۆ حاجیان و جگە لە ئەوانیشە، فەزڵی بەڕۆژووبوونی عەرەفە تاوانی دوو ساڵ دەسڕێتەوە، بەڵام فەزڵی وەستان لە عەرەفە سڕینەوەی هەموو تاوانەکانە، باش نییە حاجی لە ڕۆژی عەرەفە بەڕۆژوو ببێت ئەگەر بەڕۆژووبوون بێتوانای دەکرد لە وەستان و پاڕانەوە و ملکەچبوون تیایدا.

* گەورەترین کردەوە لە ڕۆژی عەرەفەدا پاش وەستان و بەڕۆژوو بوون: سەرقاڵ بوونە بە نزاو یادی خودا، سەرقاڵبوون بە نزاو پاڕانەوە گرنگترە، هیچ پارانەوەیەکی دیاری کراو جێگیر نەبووە، بە ڵکوو ئەو نزایانە هەڵدەبژێریت کە قازانجی دونیا و دواڕۆژی تیادایە.

* پێویستە کەسانی جگە لە حاجییان لەگەڵ بەڕۆژووبوونیان لە ڕۆژی عەرەفەدا کاتەکانیان بقۆزنەوە بە یادی خودا و قورئان خوێندن و پاڕانەوە بیرازێننەوە، ئیبن عەباس و عەمری کوڕی حەریس خەڵکیان هان دەدا لەسەر مانەوە لە مزگەوتدا.

* خودا لە گەورەترین ڕۆژدا ئاسانترین پەرستشی داناوە کە گەورەترین هۆکاری نزیکبوونەوەیە، ئەویش بریتییە لە یادی خودا بۆئەوەی کەمتەرخەمەکانیش ئەو پاداشتەیان دەست بکەوێت، ئەو پاداشتە تەنها بێبەشەکان لە دەستی دەدەن.

* ڕۆژی لەدایکبوونی پەیامبەر گەورەیە، بەڵام ڕۆژی ناردنی بە پێغەمبەرایەتی گەورەترە، چونکە پەیامبەری دابەزینی وتەی خودایە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی، ڕێزی

پەیامبەر وابەستەی پەیامبەربوونیەتی لەگەڵ ئەوەش ڕۆژی پەیامبەریێتی بۆ دیاری نەکردووین، چونکە جێگەی ئەنجامدانی هیچ کردەوەیەکی تایبەت نییە.

* هاوەڵان نەیان دەزانی پەیامبەر لە ڕۆژی دووشەمەدا لەدایکبووە تا خۆی هەواڵی پێدان، خۆی شارەزاترین کەس بووە بە ڕۆژی لەدایکبوونی، لەگەڵ ئەوەشدا دیاری نەکرد چ دووشەمەیەک بووە؟ ئەوانیش پرسیاریان نەکردووە دەربارەی، چونکە ئایین کرداره نەک کات.

* پیرۆزبای کردن لە گاورەکان دروست نییە بە بۆنەی درۆی لەدایکبوونی کوڕی خوداوە، هەرچەندە ئەوان پیرۆزبایی جەژن لە موسڵمانان بکەن، چونکە حوکمەکانی خودا دان و سان نییە، بۆت نییە بتێک بەگەورە ڕابگریت لەبەرئەوەی بتپەرستێک هاتووەتە ناو مزگەوتەوە لەگەڵ تۆدا.

* ڕۆژی لەدایکبوونی عیسا بە دیاریکراوی نەزاندراوە، ناکۆکی بەردەوام هەیە دەربارەی کاتەکەی لای کاسۆلیکی و ئەرسۆدۆکسییەکان، ئەوان پەرتووکەکەیان نەپاراست، جا چۆن ڕۆژی لەدایکبوونی خاوەن پەرتووکەکەیان دەپارێزن.

* مێژوونووسان و گەورانی کەنیسە کۆکن لەسەر ئەوەی کە ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیح دوای سێ سەدە لە بوونی دیاری کراوە، هەروەها کۆکن کە دیاریکردنی ئەم ڕێکەوتە ڕەمزی بووە نەوەک پاڵپشت بە بەڵگە.

* لە یادی لەدایکبوونی عیسادا گاورەکان یادی لەدایکبوونی کوڕی خودا دەکەنەوە: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا﴾ [مريم: ٨٨-٨٩-٩٠]

«گاور و جوولەکەکان دەیان وت خوا منداڵی بۆ خۆی داناوە. سوێند بە خوا بەڕاستی شتێکی زۆر نابەجێ و سەیر دەڵێن. نزیکە ئاسمانەکان لەت لەت و پارە پارە ببن، لەبەر ئەو (قسەیە) و (نزیکە) زەویش شەق بەرێت و بقڵشێت و (نزیکە) شاخ و چیاکان بە یەک جار جار بڕوخێن.»

* گاورەکان قەشەکانیان بەدوور دەگرن لەوەی ژن و منداڵیان هەبێت، بەڵام بۆ خودای بڕیار دەدەن، پاکی و بێگەردی بۆ خودا لەوەی بۆی بڕیار دەدەن زۆر زۆر دوورە.

* ژنهێنان لە گاورەکان ئەوە ناگەیەنێت دروست بێت پیرۆزبایی جەژنیان لێ بکرێت، دروستە هاوسەرگیری لەگەڵ کچی بکوژی باوکدا بکەیت و دڵخۆش نەبیت بە کوشتنەکەی، بە هەمان شێوە دڵخۆش مەبن بە هەڵبەستنی لەدایکبوونی کوڕی خودا.

* پیرۆزباییکردن لە گاورەکان بەهۆی کریسمسەوە دروست نییە بە کۆدەنگیی هەر چوار مەزهەب و نازانم هیچ وتەیەکی پێچەوانە لەم بابەتەدا هەبێت تەنها لەم کۆتاییانەدا چەند وتەیەک پەیدا بوون کە ئاوڕیان بەلادا نادرێتەوە.

* حەرامبوونی پیرۆزباییکردنی جەژن لە گاورەکان ئەوە ناگەیەنێت بە ڕەقی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەیت، بەڵکوو دڵی عەوامەکانیان بە بانگەوازێکی هێمنانە ڕادەکێشیت تاکوو بیر بکاتەوە لە حەقیقەتی لەدایکبوونی خوداکەیان! پاکی و بێگەردی بۆ خودا.

* دروست نییە بە کۆدەنگی زانایان موسڵمان ئامادەی جەژن و بۆنە ئایینیەکانی هاوەڵدانەران بێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ﴾ [الفرقان: ٧٢]

«بەندەکانی خودا کەسانێکن کە شایەتیی درۆ نادەن.»

(الزور) لێرەدا واتە جەژنەکانیان، ئەمەش وتەی (أبو العالية و طاووس و ابن سيرين) بووە لە سەلەف.

* حەرامە مرۆڤی موسڵمان ئامادەی جەژن و بۆنە ئایینیەکانی هاوەڵدانەران بن بەکۆدەنگی زانایانی وەک (مالک و أبو حنيفة و شافعي و أحمد)، دەقی ئەم کۆدەنگییە ئیبن قەییم و جگە لە ئەویش لە پەرتووکی (أحكام أهل الذمة) گواستوویانەتەوە.

* هاوەڵان ئامادەبوونی جەژن و بۆنە ئایینیەکانی هاوەڵدانەران و پیرۆزبایی لێکردنیان بەدروست دانەناوە، پێشەوا عومەر دەڵێت: "دوور بکەونەوە لە جەژنەکانی دوژمنانی خودا" بەیهەقی بە سەنەدێکی سەحیح هێناویەتی.

* دایک لە شەریعەتدا بە گەورە دانراوە، دەبێت هەموو ڕۆژێک چاکەیان لە گەڵدا بکرێت، بەڵکوو فەرمانی کردووە بە چاکبوون لەگەڵ هاوڕێکانیان لە پاش مردنیان، ئاوەڕدانەوە بە لای دایکدا تەنها لە یەک ڕۆژی ساڵدا سووکایەتییە و داهێنانە لە ئاییندا.

* ئەو کەسەی لە یەک ڕۆژی ساڵدا نەبێت دایکی ناناسێت، ئەوە بە خراپەکار و ئازاردەری دایکی هەژمار دەکرێت، ئەو کەسەی بەردەوام چاکەکارە لەگەڵ دایکیدا و دیاری بۆ دەبات، هیچ واتایەک بۆ جەژنی دایک نامێنێتەوە لای ئەو، جەژنی دایک جەژنی خراپبووەکانە لەگەڵ دایکیان نەک جەژنی چاکەکان.

* درۆ پایەی ستەمە و ڕاستگۆیی پایەی دادوەرییە، درۆ ئاکارێکی بێزراوە لە سروشتی مرۆڤدا، هەروەها لە هەموو شەریعەتەکانیش بەو جۆرەیە، بڕوادار چاوەڕوانی مانگی نیسان ناکات تا درۆی تێدا بکات، دووڕووەکانیش چاوەڕوانی جگە لە مانگی نیسان ناکەن تا ڕاستگۆبن تیایدا.

* ڕۆژەکان هیچ لە حوکمی درۆکردن ناگۆڕن، درۆکردن لە مانگی نیساندا هاوشێوەی درۆکردنە لە مانگەکانی دیکەدا، چونکە ناشرینترین ئاکار و بێزراوترین خووە، ببێتە وەسف بۆ هەر مرۆڤێک دەربازی نابێت و وەسفی هەر دەوڵەتێک بووبێت تیاچووە و نەماوەتەوە.

* بۆنە نیشتیمانییەکان دەوڵەت ناپارێزن لە فیتنە و ئاشووب، هەروەها گەلیش نابەستنەوە بە حوکوومەتەوە، میسر دە بۆنەی نیشتمانی هەیە، تونس حەوت، لیبیا پێنج. ئەوەی زۆرترین بۆنەی هەیە، ڕووخانی لە هەموویان خێراترە.

* ئەو کاتەی شارەکان فەتحکراون جەژن بۆ شارەکان دانەندراوە، چونکە

جەژنیان مرۆڤبوون و ئازادی بووە بۆ مرۆڤ، خودا زەوی دروستِ کردووە وەک ڕێزێک بۆ مرۆڤ، نەک مرۆڤی دروست کردبێت بۆ ڕێزلێنانی زەوی.

* مەککە گەورەترین و ڕێزدارترین شار بووە کە ئازاد بکرێت، ڕێزدارترین مرۆڤیش ئازادیی کردووە و لە ڕێزدارترین مانگدا بووە کە مانگی ڕەمەزانە، هەروەها لە دەرۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا بووە، ئەو هەموو هۆکاری ڕێزداری کۆببونەوە، بەڵام ڕۆژی ئازادکردنی نەکرا بە ڕۆژێکی نیشتمانی.

* خودا زەوی دروست کردووە وەک ڕێزێک بۆ مرۆڤ، نەک مرۆڤی دروست کردبێت بۆ ڕێزلێنانی زەوی، خودا زەوی بۆ مرۆڤی ژێربار کردووە، تا مرۆڤیش خۆی بۆ پەرستشی خودا ژێربار بکات: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ [البقرة: ٢٩]

«ئەو زاتەیە هەرچی لە زەوی هەبێت هەمووی بۆ ئەوەی دروست کردووە.»

* هەندێک لە دەسەڵاتداران باسی نیشتمان و قوربانیدان بە هەموو شتێک بۆ نیشتیمان دەکەن، جا کاتێک دژایەتییان بکرێت لە کارێکدا، ئەوا نیشتیمان و ئەوەشی لە ناویدایە دەیسووتێنن.

* سەرکردەکان زۆرجار خەڵکی بانگ دەکەن بۆ کۆبوونەوە لەسەر نیشتیمان، جا کاتێک جیاوازییان تێدا بوو لە ئاییندا، ئەوا نیشتمان لەناو دەبەن، ئەگەر خەڵکی کۆبکەنەوە لەسەر ئایین وەک چۆن لەسەر نیشتیمان کۆیان دەکەنەوە، ئەوا ئایین و نیشتیمانیان پارێزراوو دەبوو.

* «یەک وتەیی» لەسەر «وتەی یەکخواپەرستی» گەورەتر و لەپێشتر و پێویسترە لە سەر دەوڵەت وەک کۆکردنەوەیان لەسەر سامان و زەوی و سیاسەت ﴿وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا﴾ [آل عمران: ١٠٣] «هەمووتان دەست بگرن بەهۆی پەیوەستیتان بە خواوە.»

(حبل الله): واتە یەکخواپەرستی.

# شام و فەزڵەکانی شام

* ڕێزدارترین پارچە زەوی لە پاش مەککە و مەدینە زەوی شامە فەزڵ و گەورەییەکەی لە وەحیدا بە موتەواتری هاتووە. باشترین پارچە زەوی شام بریتییە لە فەلەستین، دەوڵەتی ئیسلام سەقامگیر نابێت تەنها بە سەقامگیری ئەو سێ پارچە زەوییە نەبێت. لە سونەندا هاتووە بە ڕشتەیەکی سەحیح لە (قرة)وە لە پەیامبەرەوە (ﷺ) إذا فسد أهل الشام فلا خير فيكم «ئەگەر خەڵکی شام خراپ بوون، ئەوا خێرتان تێدا نەماوە» مەبەست لێی خراپیی کاروباریان نیشانەیە لەسەر ناجێگیری کاروباری ئوممەت.

* شام پێوەری بەردەوام مانەوەی ئوممەتی ئیسلامە، بە سەحیحی لە پەیامبەرەوە (ﷺ) هاتووە «ئەگەر خەڵکی شام خراپ بوون ئەوا خێرتان تێدا نەماوە مەبەست لێی خراپیی کاروباریان، نیشانەیە لەسەر ناجێگیری کاروباری ئوممەت.

* ئەو پارچە زەوییەی پەیامبەر وەسیەتی پێ کردووە کە لەگەڵ خەڵکەکەیدا باش بن لە پاش مەککە و مەدینە زەوی شام بووە، چونکە زۆرینەی کات ئاسایش و خێر بووە فیتنە و بەڵا تیایدا پێشهاتە بووە، معاویيە داوای لە پەیامبەر کرد شارێکی بۆ دیاری بکات، فەرمووی: "شام."

فەزڵ و گەورەیی شام لە وەحیدا لە پاش فەزڵی مەدینەوەیە، عیماد لە پەرتووکی (مختصر البرق الشامي، لاپەڕە: ٣١٣) دەڵێت: "هەوەڵان کۆدەنگ بوون کە شوێنی نیشتەجێبوونیان لە شام بێتواتە: پاش مەککە و مەدینە."

* ڕووکەشی بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە شام لە ئاخیر زەماندا جێگە و پەناگەی باوەڕە، عەبدوڵڵای کوڕی عەمر دەڵێت: "کاتێک بەسەر خەڵکیدا دێت بڕوادار لەسەر زەویدا نامێنێت خۆی نەگەیەنێت بە شام."

* یەکێک لە فەزڵەکانی شام ئەوەیە کە لەم فەرموودەیەدا هاتووە، لە حەسنەوە «چی دەکەن لە فیتنەیەکدا کە دەوری هەموو زەوی دەدات وەک شاخی مانگا؟» دەڵێت: گوتم چی بکەین ئەی پەیامبەری خودا؟ فەرمووی: «بچۆ شامەوە.»

* دەجال گەورەترین فیتنەیە بۆ سەر زەوی شوێنی تیاچوونی لە شامە. جا ئەگەر ئەمە سەرەنجامی دەجال بێت، دەبێت سەرەنجامی دەجالۆچکەکان چۆن بێت؛ لە سەحیحدا هاتووە: «دەجال لەپشت ئوحودەوە دەوەستێت. پاشان فریشتەکان ڕووی وەردەگێڕن بەرەو شام و هەر لەوێشدا لەناو دەچێت.»

* شام لەناو ژانی فڕێدانە دەرەوەی گەندەڵکارانی ناو جەستەیدا دەژیی، وا نیشانەی چاکبێتیان دەردەکەوێت، ئەگەر شام باش بوو، ئەوا باشیی ئوممەت بە شوێنیدا دێت، لە فەرموودەدا هاتووە «ئەگەر خەڵکی شام خراپ بوو، ئەوا خێرتان تێدا نییە.»

* تەمەنی شەڕ و خراپەکاری و فیتنە لە شامدا درێژە ناکێشێت، چونکە لە قورئان و سونەتدا چەندین جار بە بەرەکەت و ئیمان باسکراوە و وەسف کراوە. لە فەرموودەیەکدا پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «بێگومان خودا پاراستنی شامی بۆ من گرتووەتە خۆ.»

* لاچوونی فیتنەی شام سەرکەوتنی موسڵمانانی بەدوادا دێت و باوەڕ بەهێز دەبێت و دووڕوویی لاواز دەبێت، لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە «دڵنییابن ئەو کاتەی فیتنە و ئاشووب ڕوو دەدات، باوەڕ و ئیمان جێگەیان دەکەوێتە شامەوە.»

* خەڵکی شام لە دەوری هیچ دوژمنێک کۆنەبوونەتەوە و شکست و دۆڕانیان بەسەردا هاتبێت، لە فەرموودەدا هاتووە «بەردەوام خەڵکی ڕۆژئاوا [شام] لەسەر هەقن، تاکوو قیامەت هەڵدەستێت.» پێشەوا ئەحمەد دەڵێت: "ئەوانە خەڵکی شامن."

* فریشتەکان باڵیان دادەنێن لەسەر شام لە کاتی ئاشتیدا جا دەبێت چی بکەن بۆی لە کاتی جەنگدا، لە سەحیحدا هاتووە: «طوبا بۆ شام، ئەوە فریشتەکانی خودان و باڵیان ڕاخستووە بەسەر شامدا.»

* ڕووکەشی بەڵگەکان ئەوە دەگەیەنن دەوڵەتی ئیسلام یەک دەوڵەتن پێش ڕوودانی ئەو جەنگە گەورەیەی لەنێوان موسڵمانان و ڕۆمدا ڕوودەدات، لە فەرموودەیەکدا هاتووە «شام ناو دەبرێت بە: (فسطاط المسلمين) واتە: کۆکەرەوەی ئاڵاکانیان. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کۆبوونەوەی هەموو ئوممەت لەوێدا.

* لەگەڵ ئەوەی ئەو هەموو جارە ناوی شام باسکراوە لە قورئان و سونەتدا، هیچ جارێک بە فیتنە باس نەکراوە، بەڵکوو بە بەرەکەت و ئیمان و جیهاد وەسف کراوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم حاڵەتەی لەمڕۆدا خەڵکی شام تێی کەوتووە حاڵەتێکی تایبەت و پێشهاتەیە و بە ویستی خودا لادەچێت و نامێنێت.

* وازهێنان لە یارمەتی دانی موجاهیدان نیشانەی لە ناوچو،نە: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾ [البقرة: ١٩٥]

«دارایی خۆتان بەخت بکەن لەڕێی خوادا و بە دەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تیاچوونەوە.»

موفەسیرەکان کۆدەنگن واتای ئەم ئایەتە، واتە: ئەگەر وازتان لەو جۆرە بەخشینە هێنا، تیادەچن.

* کەمترین واجب و مافی موسڵمانانی ستەملێکراوی سووریا بریتییە لە یارمەتیدانی سەربازییان تاکوو ستەمیان لەسەر لاچێت و دادوەری بێتەجێ. خودا دەفەرمووێت: ﴿وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ﴾ [الأنفال: ٧٢]

«ئەگەر داوای یارمەتییان لێ کردن لە (پارێزگاری) ئایین ئەوە یارمەتی دانیان پێویستە لەسەرتان.»

* ئەو کەسەی ناتوانێت و چەکی هەڵنەگرتووە بۆ سەرخستنی ستەملێکراوان. ئەوا با ئەو کەسە چەکی دەستی نزا و پاڕانەوە بێت بۆیان، لە ئەسەرێکدا هاتووە: «چەکی بڕوادار نزاو پاڕانەوەیە.» لە فەرموودەدا هاتووە: أعجز الناس من عجز عن الدعاء«بێتوانا ترین مرۆڤ ئەو مرۆڤەیە بێتوانا بێت لە ئاست پاڕانەوە.» ئەمڕۆ ئەوان لە تەنگانەیەکی زۆردان.

* سەرخستنی لاوازەکان لە سووریا واجبە لەسەر ئوممەت پێش واجببوونی لەسەر دەوڵەت، پەیامبەری خودا بە ستەملێکراوێکی فەرموو: «داوای یارمەتی لە موسڵمانانی دەورت بکە.... داوای یارمەتی لە کاربەدەست بکە.»

* هەر دەوڵەتێک توانای هەبوو گەلی سووریا سەربخات و سەری نەخستن. بە هەمان شێوە سزا دەدرێت، لە فەرموودەدا هاتووە: «هەر تاکێک لە ئێوە موسڵمانێک سەرشۆڕ بکات لەو شوێنەی کە شەرەف و شکۆی شکێندراوە، ئەو بێگومان خودا سەرشۆڕی دەکات.»

* با ئەو کەسانە لە سزای خودا بترسن کە توانای سەرخستن و یارمەتیدانی مسولمانانیان هەیە، کەچی ئەنجامی نادەن. بترسن لەوەی خودا هەمان سەرشۆڕییان بەسەردا بهێنێت و کەس نەبێت سەریان بخات، خودا یاسایەکی گشتی هەیە «پاداشتەکان لە جۆری کردارەکانن»

# تاقیکردنەوە، ئارامگری و ڕزگاربوون

* هەموو تاکێک تاقیکردنەوەی لەسەر نووسراوە جا بە خۆشی یان ناخۆشی، وەک چۆن مردنی لەسەر نووسراوە، دەبینیت خەڵکی جیاوازن تیایدا لە ڕووی چەندێتی و چۆنێتیەوە: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ [الأنبياء: ٣٥]

«هەموو کەسێک مردن دەچێژێت (دەمرێت) ئێمە تاقییان دەکەینەوە بە خراپە و ناخۆشی، هەروەها بە چاکە و خۆشی تا چاک و خراپ دەرکەوێت.»

* خودا خراپە و شەڕ بۆ بڕوادار بڕیار نادات، ئەگەر بێبەش بوو لە چاکەیەک یان خراپەیەک هاتە ڕێی ئەوە بۆ ئەوەیە ئەو دووانە بەرەو خێر و چاکەی ببەن، بەڵام مرۆڤ گومانی خراپ بە پەروەردگاری دەبات و بێبەش دەبێت لە کۆتاییی باش.

* ئەگەر دەتەوێت پێگەی خودا لە دڵتدا بزانیت، ئەوا بڕوانە لە کاتی تەنگەژەکاندا ڕوو دەکەیتە کێ، چونکە مرۆڤ لە کاتە تەنگانەکاندا ڕوو دەکاتە گەورەترین سەرخەر و پشتیوانی کە لە دڵیدا گەورەیە.

* ئەگەر خودا سەرکەوتنی بەبێ تاقیکردنەوە بهێنایەتە دی، ئەوا بۆ پەیامبەرانی دەهێنایە دی.

* دەروونی مرۆڤەکان پاک نابێتەوە، بە تاقیکردنەوە نەبێت، ئەو مرۆڤەی تاقی کراوەتەوە، ڕاستگۆترە لەوەی لە نیعمەتدایە: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ [العنكبوت: ٣]

«سوێند بە خوا بێگومان کەسانی پێش ئەوانمان تاقی کردەوە (ئێمانیش تاقی دەکەینەوە) ئینجا بێگومان خوا ئەو کەسانەی ڕاستیان کرد دیاری دەکات. درۆزنەکانیش دیاری دەکات، واتە دەناسرێن.»

* گەڕانەوە بۆلای خودا وتنی (إنا لله وإنا إليه راجعون) لە کاتی موسیبەت و بەڵادا هۆکاری دابەزینی ڕەحمەت و میهرەبانی خودایە: ﴿ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ﴾ [البقرة: ١٥٦-١٥٧]

ئهوانهی کهلهگهڵ دووچاری سهختی یهک بوون دهڵێن ئێمههر هی خواین و ههر بۆلای ئهو دهگهڕێینهوه.—ئا ئهوانهدروودوو بهزهیی بهسهر ئهواندا دهبارێ لهلایهن پهروهردگاریانهوهو ئهوانهئهو کهسانهن هیدایهتیان وهرگرتووه.

* وتەی (لا حول ولا قوة إلا بالله) لەناو خەڵکیدا بڵاوە بۆ کاتی موسیبەت بەکاری دەهێنن، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، بەڵکوو لە کاتی ویستنی کارێکدا ئەو ویردە دەخوێندرێت، لە کاتی موسیبەتدا دەگوترێت: (إنا لله وإنا إله راجعون).

* ناڕەزایی لە کاتی موسیبەت و تۆمەت بارکردنی خەڵک بە گومان. وادەکات ئەو موسیبەتە لە پاداشتەوە هەڵگەڕێتەوە بۆ تاوان، بە سەحیحی لە ئیبن مەسعوودەوە هاتووە، «ئەو کەسەی دزی لێ کراوە بەردەوام گومانی خراپ بەخەڵکی دەبات تا وای لێ دێت تاوانەکی لە تاوانی دزەکە زیاتر دەبێت.»

* پەژارە و خەم دەروون بەند دەکات لە قازانجەکانی، خۆت بەدوور بگرە لە هەر هۆکارێک کە بەڵا و موسیبەتەکانت دەخەنەوە یاد، کاتێک وەحشی بکوژی مامی پەیامبەر موسڵمان بوو، پەیامبەر پێی فەرموو: هل تستطيع أن تغيب وجهك عني «ئەگەر دەتوانیت مەیەرە بەرچاوم.»

* ناپەسەندە بەردەوام بیر لە موسیبەتەکانی ڕابردوو بکەیتەوە، چونکە دەروون بەند دەکات لە کردەوە کردن، وەحشی بکوژی مامی پەیامبەر چووە لای پەیامبەر، پەیامبەر پێی فەرموو «مەیەرە بەرچاوم»، چونکە موسیبەتێکی گەورەی وەبیر دەهاتەوە.

* ئومێد بە هاتنی بەڵا و موسیبەت مەخوازە، خۆ ئەگەر دابەزی پێی ڕازی بە، بەرزترین پلەی دڵنیایی و یەقین هۆگرییە لە پاش دابەزینی بەڵا، ئەمە نیشانەی تەواو تێگەیشتنە لە حیکمەتی دابەزینی ئەو بەڵایە لەلایەن خوداوە بۆ سەر تۆ، جا یان دەبێتە لابەری تاوان، یان پلەت بەرز دەکاتەوە.

* لە کاتی بەڵا و موسیبەتەکاندا بڕوانە ئەو کەسانەی لەو بەڵایە قورستریان بەسەر هاتووە و ئارامیان گرتووە، مەڕوانە کەسانێک کە تووشی بەڵا نەبوون چۆن دەربازیان بووە، بەڵا و موسیبەت هاتە سەر پەیامبەر و فەرمووی: أوذي موسى بأكثر من هذا فصبر «مووسا لەمە زیاتر ئازار دراوە و ئارامی گرتووە.»

* بە ئارامگری و لەخواترسان ناڕەحەتییەکان دەگۆڕێن بە نیعمەت، پیلانی دوژمن بەتاڵ دەبێتەوە و خەمەکان نامێنن: ﴿وإن تصبروا وتتقوا لا يضركم كيدهم شيئا﴾ [آل عمران: ١٢٠] «ئەگەر ئارام بگرن و لە خوا بترسن، پیلان و فێڵی ئەوان هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنێت.»

* بەڵا تەنانەت لەسەر پەیامبەرانیش ماوەکەی درێژدەبێتەوە جا ئارامگریت لەسەرە: ﴿مَسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّىٰ يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَىٰ نَصْرُ اللَّهِ ۗ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ﴾ [البقرة: ٢١٤] «بەڵا لە ماڵ و گیاندا تووشیان هات و هەژێنران، تاکوو پێغەمبەران و ئەوانەی لەگەڵیاندا باوەڕیان هێنابوو وتیان: کەی سەرخستنی خودا دێت، بەڕاستی کە سەرخستنی خودا نزیکە.»

* پەیامبەر (ﷺ) لە دۆڵێکی مەککەدا سێ ساڵ گەمارۆدرا و یووسفیش چەندین ساڵ زیندانی کرا، موسیبەتەکەی ئەیووب لەسەرو ئەوەشەوە بوو، عیبرەت بە سەرەنجامەکانە.

* ﴿ وَجَزَاهُمْ بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا﴾ [الإنسان: ١٢] «بەهۆی ئارامگرییانەوە بەهەشت و هەورێشمی کردە پاداشتیان.»

پاداشتی لەسەر ئارامگری دانا، وەک ئاماژەیەک بەوەی کە ناڕەحەتی و بەڵا دابەزینی یەکلاییە، جا پاداشت لەسەر ئارامگری گەورەترە لە خودی کارەکە.

* پەلەکردن و ئارامگری کۆنابنەوە، بە ئارامگری ئامانجەکان دێنەدی و بە پەلەکردن کارەکە دەپچڕێت و ناگاتە ئەنجام: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِلْ لَهُمْ﴾ [الأحقاف: ٣٥] «ئارام بگرە وەک چۆن پێغەمبەرانی ئولولعەزمی خاوەن هیممەت ئارامیان گرت و پەلە مەکە لەسەریان.»

* باشترین ئەنجامەکان سەختترین ڕێگایان هەیە و قورسترین بەڵایان لەپێشە و پێویستیشان بە زۆرترین ئارامگری و چەسپانە: ﴿حَتَّىٰ إِذَا اسْتَيْأَسَ الرُّسُلُ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا جَاءَهُمْ نَصْرُنَا﴾ [یوسف: ١١٠] «تاکوو ئەو کاتی کە پێغەمبەران بێئومێد بوون و دڵنیابوونەوە کە ئیتر قەومەکانیان باوەڕیان پێ ناهێنن، ئەوکات سەرخستنی ئێمەیان بۆ هات.»

* کەس توانای شکاندنی زنجیر و کۆتی بەڵای نییە ئەو خوایە خۆی نەبێت کە بە قەزا هێناویەتی بە سەرتدا، گەورەترین هۆی ڕزگارییش گەورەڕاگرتنی خوایە بە یادکردن و تەسبیحات و سوژدەبردن: ﴿ فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ ۝ لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ [الصافات: ١٤٣- ١٤٤] «خۆ ئەگەر یوونس لە یادکەرەوان و دەم بە تەسبیحان نەبا، لە سکیدا دەمایەوە هەتا ڕۆژێک کە زیندوو دەکرێنەوە.»

* خودا بۆ خۆی دابەزێنەری بەڵایە و خۆشی لادەریەتی، دروستکراوەکانیش هۆکارن لە بەردەستیدا با خۆشیان نەیانەوێت، یوونسی لە سکی نەهەنگەکە دەرکرد لەکاتێکدا نەهەنگەکە حەزیشی نەدەکرد یوونس فڕێبداتەوە و حەزی لێی بوو.

* ئەگەر کەسێکت دی تووشی بەڵا و موسیبەتێک ببوو، ئەوا بزانە هیچ جیاوازییەک لەنێوان تۆ و ئەودا نییە تەنها سۆز و میهرەبانی خودا نەبێت، فەرموودەیەک لەو بارەوە ڕیوایەت کراوە: «ئەگەر برایەکت تووشی موسیبەتێک بوو، لای خەڵکی بەدڵخۆشییەوە باسی مەکە، نەوەک خودا ڕەحم بە ئەو بکات و تۆ گیرۆدە بکات پێوەی.»

* ئەو کەسەی تووشی موسیبەت بووە، ئەوا خودا ئەو موسیبەتەی بۆ پێش هێناوە، ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێت ئەو کەسەی پارێزراو بووە لەو باشتر بێت. باسکردنی بۆ شکاندنەوەی دەبێتە هۆی دابەزینی ئەو بەڵایە بۆ سەر ئەو کەسەی باسی کردووە، لە فەرموودەدا هاتووە، «ئەگەر برایەکت تووشی موسیبەتێک بوو، لای خەڵکی بەدڵخۆشییەوە باسی مەکە، نەوەک خودا ڕەحم بە ئەو بکات و تۆ گیرۆدە بکات پێوەی.»

* ئەگەر بەڵایەک دابەزییە سەرت بەهۆی گوێڕایەڵی و لەسەر هەق بوونتەوە، ئەوا داوا لە خودا بکە جێگیرت بکات پێش ئەوەی داوای هەڵگرتنی ئەو بەڵایە بکەی، چونکە پارێزراوی لەگەڵ هەڵگەڕانەوە و لادان، خودی بەڵا و موسیبەتە.

* پەیامبەری خودا (ﷺ) داوای لە خودا دەکرد پارێزراوی بکات و لێی ببورێت، لە کاتێکدا بەتواناترین کەس بوو لەسەر ئارامگری ئەگەر بەڵایەک دابەزیبووایە. بەرانبەر بەڵاکان بوەستەرەوە بە نزا و پاڕانەوە، نەک بەڵاکان لات بدەن لە هەق.

* بەخشین دەبێتە هۆی لادانی بەڵا و موسیبەت، لە فەرموودەدا هاتووە: «چاکە کردن دەتپارێزێ لە بەڵا و موسیبەت.»

* لە کاتی بەڵا و موسیبەتەکاندا مرۆڤ پێویستە ئارامگر بێت، نەک لەخۆی بدا، ئارامگری جێگیرت دەکات و لەخۆدان شپرزەت دەکات.

* کردەوەی چاکەی پەنهانی هۆکاری جێگیربوونە لە کاتی فیتنە و موسیبەتدا، هەروەها هۆکاری تەواو بەهێزکردنی گوریسی نێوان خودا و بەندەکەیەتی، لە فەرموودەدا هاتووە: «هەرکەس لە ئێوە دەتوانێت کردەوەیەکی پەنهانی و شاراوەی هەبێت با ئەنجامی بدات.»

* چاکساز ناکرێت تووشی تاقیکردنەوە و بەڵا نەیەت: ﴿وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ [لقمان: ١٧]

«فەرمان بە چاکە و بەرگری بکە لە خراپە و هۆگر و بەئارام بە لەسەر هەر بەڵا و ناخۆشییەک کە تووشت دێت.»

خودا فەرمانی کردووە بە ئارامگری، چونکە بەڵا و موسیبەت هەر پێش دێت.

* چاکسازی و تاقیکردنەوە دووانەن، لەگەڵ هەموو چاکسازییەک بەڵا و تاقیکردنەوە هەیە: ﴿وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ [لقمان: ١٧]

* ئەگەر خودا زیرەکی و پاکی لە کەسێکدا کۆکردەوە، ئەوا تاقیکردنەوەیەکی قورسی بۆ دەهێنێتە پێش.

* نازانم لە هەموو مێژوودا کەسێک هەبووبێت خودا کردبێتیە جێی سوود بۆ ئوممەت و تووشی بەڵا و تاقیکردنەوە نەبووبێت جا کەم بێت یان زۆر. تاقیکردنەوە دەرگایەکە هەر دەبێت هەموو ڕاستگۆیەک پیایدا تێپەڕ ببێت.

* ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا﴾ [الطلاق: ٢]

«هەر کەسێک خواناس بێت، خوا دەرووی لێ دەکاتەوە.»

هەر دەبێت ڕاستگۆیان بکەونە ناو تەنگەژەکانەوە، هەر بۆیە خودا دەرووی داناوە و لە سەرەتاوە نەی پاراستوون کە نەچنە ناوی.

* ئەوکەسەی سەرمەشقە لە هەقدا، دەبێت لە کەسانی دیکە زیاتر تاقی بکرێتەوە، هاوشێوەی سەر بۆجەستە، کە ئەندامێکە لە جەستەدا زۆرتر تووشی پێشهاتە و بەڵا و پێکان دەبێت بەراورد بە ئەندامەکانی دیکە.

* پێشڕەوی و سەرمەشقی لە هەقدا نایەتەجێ، تەنها بە ئارامگرتن نەبێت لەسەر بەڵا و تاقیکردنەوەکانی سەر ڕێگە: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ﴾ [السجدة: ٢٤]

«لەناو ئەواندا پێشەوایانێکمان دانا ڕێنموونیی (خەڵک)یان دەکرد بە فەرمانی ئێمە کاتێک خۆیان گرت.»

* پەیامی هەق پاک نابێتەوە و گەشە ناکات بەهۆی دوژمنەکانییەوە نەبێت، هەروەها خاوەنەکەشی پاک نابێتەوە، بە تاقیکردنەوە نەبێت.

* زۆرێک لەوانەی پشتیان لە ڕێگەی ڕاست کردووە بەهۆی هاتنەپێشی بەڵا و تاقیکردنەوەکان بووە بۆسەر ڕێگەکەیان بەو هۆیەوە ڕێگەیان گۆڕیوە، پارێزراوی خۆیان پێش پارێزراوی هەق خستووە، پاشان ڕێگە تازەکەیان بە ڕاستکردنەوە و پێداچوونەوە ناو بردووە.

* ئەگەر کەسانێک دڵخۆش بوون بەو بەڵا و موسیبەتەی دابەزیوە بۆ سەر بەندەگەلێک کە هەستاون بە جێبەجێکردنی فەرمانی خودا، ئەوا ئەم جۆرە دڵخۆشییەیان نیشانەی دووڕوویيە: ﴿وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ يَقُولُواْ قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن قَبۡلُ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ﴾ [التوبة: ٥٠]

«ئەگەر ناڕەحەتی و تێشکانت تووش بێت (بەکەشخەوە) دەڵێن بەڕاستی ئێمە کاری خۆمان کرد لەمەوپێش جا بەخۆشحاڵی و شادمانییەوە ڕوو وەردەگێڕن.»

* دڵخۆشی تەواو بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا دێتە جێ، بەڵا و تاقیکردنەوەکانی دونیاشی لەگەڵدا سانا دەبێت، پارێزراوی لە بەڵا بەڵگەی دروستی ڕێبازی کەسەکە نییە، بەڵکوو زۆرجار نیشانەی پێچەوانەی ئەوەیە.

* بەڵا و موسیبەت سەرەتایەکە بۆ سەرکەوتن، هەندێک جار ڕێگاکە درێژ دەبێتەوە و موسیبەتەکە بۆ ماوەیەکی کەم لە سەرکەوتن دوات دەخات، سەرکەوتنی یوسف لەو دەرگایەوە دەستی پێ کرد کە کردیانە ناو بیرەوە پاشان فرۆشتیان و پاشان دوورخرایەوە و پاشان بەند کرا، چەند قۆناغێکی جیاواز بوون، بەڵام کۆتاییەکەی بە پاشایەتی میسر تەواو بوو.

* تاقیکردنەوە و بەڵا یەکەم هەنگاوی جێگیربوون و پتەوبوونی ئیماندارە، زۆر جاریش ڕێگاکەی درێژ دەبێتەوە لە کاتی سەرکەوتن و جێگیربوون. جێگیربوونی پێغەمبەر یوسف یەکەم هەنگاوی لە خستنە بیریەوە بوو، پاشان لە فرۆشتنی، پاشان لە بەکۆیلەکردنی پاشان لە سجنکردنی، کۆمەڵە قۆناغێکی جیاواز تا گەیشت بە موڵکی میسر، لەکاتێکدا هەر یەک لەو بەڵا و موسیبەتانە کە بەتاک و بە کۆش سەیر بکرێن، هیچ سازانێکی تێدا نابینرێت لەگەڵ جێگیربوونی لە میسر، بەڵام ئەمە لوتف و میهرەبانی خوایە.

* لە بەڵا و تاقیکردنەوەکان پێویستە بەندە گومانی باش بە پەروەردگاری بەرێت، چونکە پەروەردگار بە دانایی وردی خۆی دەیانگوزەرێنێت، بە لوتفێکی پەنهان کە زیرەکترینی مرۆڤیش درکی پێ ناکات.

* سەرەتای سەرکەوتن بە لاوازی دەست پێ دەکات، یەکەم سەرکەوتنی یوسف فرۆشتنی بوو: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ [یوسف: ٢١]

«ئەو کەسەی لە میسر یوسفی کڕی بە ژنەکەی وت: ڕێزی لێ بگرە (شوێن حەوانەوایەکی چاکی بۆ ئامادە بکە) بەڵکوو سوودمان پێ بگەیەنێت یان بیکەین بە کوڕی خۆمان، ئا بەم جۆرە یوسفمان جێگیر کرد (و پەلە و پایەمان پێ دا) لە زەوی (میسر) دا.»

* نەهامەتییەکان قورس و ئەستەم دەبن، بەڵام لەگەڵ تەواوبوونیدا میهرەبانی بەدی دەکرێت، مەریەم ئاواتی مردنی دەخواست لە سەرەتای تاقیکردنەوەکەیدا، ﴿يَٰلَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا﴾ [مريم: ٢٣]

«ئای خۆزگە پێش ئەم (ڕووداوە) بمردبوومایە.»

کەچی لە سکیدا پەیامبەرێکی هەڵگرت بوو کە ڕەحمەت بوو بۆ خەڵکی.

* براکانی یوسف ویستیان یوسف بخەنە ژێرەوەی زەوی، بەڵام خودا خستییە سەرەوەی زەوی و بەرزی کردەوە، خستیانە ناو بیرەوە تاکوو نەی بیننەوە، بەڵام خودا وای لێ کردن بچنەوە بەردەمی.

* خودا چۆن ویستی لێ بێت کاروبار و ڕووداوەکان هەڵدەسووڕێنێت و سەرلەبەریان پێچەوانە دەکاتەوە، ئەو زاتەی کوژاڵک لەو تاڵییەوە دەگۆڕێت بۆ شیر کاتێک بە سکی ئاژەڵەکاندە تێدەپەڕێت، هەر ئەو زاتەیە کاتە ناخۆشەکان دەگۆڕێت بۆ خۆشی و ڕەحمەت.

* پێشهاتنی تاقیکردنەوەی قورس بۆ کەسانی دڵسۆز دەبێتە هێزێکی تەواو بۆ سەرکەوتنیان.

* دەستگرتن بە هەقەوە و تاقیکرانەوە و ئارامگرتن لەسەری. ئەم سێ شتە لە هەر بەندەیەکدا کۆ بوویەوە، ئەوە نزیکترین کەسە لە خوداوە، بەڵکوو خودا خۆی چاودێری دەکات: ﴿وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ [الطور: ٤٨]

«ئارام بگرە بۆ بڕیاری پەروەردگارت ئەوسا بێگومان تۆ لەژێر چاودێری ئێمەدایت.».

* مرۆڤ بەرز نابێتەوە تەنها لەسەر شانی بەڵا و تاقیکردنەوەکان نەبێت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟﴾ [البقرة: ٢١٤]

«ئاخۆ ئێوە لاتان وایە (بە هاسانی) دەچنە بەهەشت؟ کەچی هێشتا ئەوەی بە سەر پێشینانتانا هاتووە، بە سەر ئێوە نەهاتووە. ئەوان تووشی گەلێک تەنگانە و ئازار و نەداری و چەوسانەوە بوون؛ زۆر بە توندی هەژێنران.»

* بە ئەندازەی قورسی تاقیکردنەوە، سەرکەوتن و هەڵبژاردن بەدەست دێت.

* سەرکەوتن بەدەست نایات تەنها لەسەر قادرمەی تاقیکردنەوە نەبێت، شکستی دوای سەرکەوتن هیچ قادرمەیەکی نییە.

* تاقیکردنەوە منداڵدانی سەرکەوتنە، چەندین قۆناغی هەیە خودا بە چەند شێوەیەک دایناوە. سەرکەوتنی یوسف بە خستنە ناو بیر دەستی پێکرد، پاشان فرۆشتنی، پاشان بەندە بوونی و پاشان بەندکردنی، چەند قۆناغێکی جیاواز بوون، بەڵام بە سەرداری میسر کۆتایی پێ هات.

* هیچ ئوممەتێک سەرناکەوێت پاش ستەم، تەنها بە تاقیکردنەوەی زۆر قورس نەبێت، نەوەکانی ئیسرائیل سەرنەکەوتن بەسەر فیرعەوندا تا ڕۆڵەکانیان نەکوژرا. ئەوانەی باوەڕیان بە مووسا هێنا هەندێکیان کوژران هەندێکیان لە خاچدران لە کاتێکدا مووسا لەناویاندا بوو.

* تاقیکردنەوەی باوەڕدار دەرگای سەرکەوتنیەتی بەسەر بێباوەڕاندا: ﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٤١]

«تا خوا (لە تاوان) پاکیان بکاتەوە ئەوانەی کە بڕوادارن و بێباوەڕانیش بنبڕ بکات.»

* تاقیکردنەوە خوداییەکان یان سزان یان پاکردنەوەن یان هەڵبژاردن و پلەبەرزکردنەوەن، هەندێکجار هەموویان کۆدەبنەوە یان هەندێکیان کۆدەبنەوە. هەرچەندە بەندە لە خوداوە نزیک بێت، خودا زیاتر پاکی دەکاتەوە و هەڵیدەبژێرێت، هەرچەندە لێوەی دوور بێت، ئەوا سزای دەدات.

* بڕوانە حاڵی ئەو کەسەی تاقیکراوەتەوە لە پاش تاقیکردنەوەکەی، ئەوکات حیکمەتی تاقیکردنەوەکەت بۆ دەردەکەوێت. جا یان خودا نزیکی دەکاتەوە لە خۆی یان دووری دەخاتەوە.

* بەڵا و موسیبەت دەبێتە نیعمەت ئەگەر لە خودا نزیکت بکەنەوە، ئەو نیعمەتیش موسیبەتە ئەگەر لە خودا دوورت بخاتەوە.

* موسیبەت ئەگەر ببێتە ڕێنموویی، بۆت باشترە لە نیعمەتێک لە ڕێ لات بدات.

* موسیبەت لەگەڵ ئارامگرتندا باشترە لە نیعمەتێک کە سپاسگوزاری لەسەر نەکرێت.

* مرۆڤ تاقی دەکرێتەوە بە چاکە وەک چۆن تاقی دەکرێتەوە بە خراپە، ئەوەی لە خودا نزیکت دەکاتەوە نیعمەتە هەرچەندە خراپیش بێت، ئەوەش کە لە خودات دوور دەخاتەوە بەڵایە هەرچەندە چاکیش بێت: ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ [الأنبياء: ٣٥]

«تاقیتان دەکەینەوە بە خراپە و ناخۆشی و بە چاکە و خۆشیش.»

* ئەگەر زیانێکت پێ گەیشت و بووە هۆی نزیکبوونەوەت لە خودا، ئەوا بزانە نیعمەتێکت بۆ هاتووە لە وێنەی سزادا، خۆ ئەگەر خێر و نیعمەتێکت بۆ دابەزی، بەڵام بووە هۆی دوورکەوتنەوەت لە خودا، ئەوا بزانە سزایەکت بۆ هاتووە لە شێوەی نیعمەتدا.

* خودا هەندێک جار بەندەکانی تووشی بەڵا و موسیبەت دەکات تاکوو وەبیر هەندێک لە مرۆڤەکان بهێنێتەوە کە کەسانی چواردەورت سوودت پێ ناگەیەنن و ناتوانن بەڵات لەسەر لابدەن ئەگەر خودا ویستی بەڵایەکت بۆ پێش بهێنێت: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ﴾ [الأنعام: ١٧]

«ئەگەر خوا دووچاری بەڵا و زیانێکت بکات، ئەوا جگە ئەو (خوا) کەس نییە بتوانێت لایبات.»

* خودا بەڵا و موسیبەت بۆ سەر بەندەکانی دادەبەزێنێت، بەڵام بە ئەندازەگیری و حیکمەتێکی ورد لایدەدات، یوسف بەند کرا و ئازادکردنی دواخست تا ئەو کاتەی خەڵکی میسر پێویستیان بوو ببێتە عەزیز و سەرداری میسر، خۆ ئەگەر پێشتر ئازاد ببوایە ئەوا هۆکارەکانی بەو جۆرە بۆ نەدەڕەخسا.

* خودا ماوەی تاقیکردنەوەکان درێژ دەکاتەوە تاکوو ئەو کەسەی جێگیرترە شایستەتر بێت بە هەڵبژاردن: ﴿ٱسْتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓاْ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ [الأعراف: ١٢٨]

«داوای یارمەتی لەخوا بکەن و خۆڕاگر بن، بێگومان هەموو زەوی موڵکی خوایە دەیدا بە هەرکەس لە بەندە (شیاوە)کانی کە خۆی بیەوێت و سەرەنجامی چاک بۆ خواناسانە.»

* خودا بەڵا و موسیبەتەکان لانادات تەنها بە تاقیکردنەوە نەبێت، لە کاتێکدا بەتوانایە کە لایبدات بەبێ هیچ تاقیکردنەوەیەک، بەڵام بۆئەوەی خەڵکی جیا بکاتەوە و دەروونەکان پاکبکاتەوە: ﴿وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَاْ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ﴾ [محمد: ٤]

«ئەگەر خوا بیویستایە خۆی تۆڵەی لێ دەسەندن بەڵام (فەرمانی پێ دان بە جەنگ) تا بەیەکتری تاقیتان بکاتەوە.»

* هەموو ئەوانەی لە وتەدا ڕاستگۆن، لە دڵیاندا ڕاستگۆ نین، تاقیکردنەوە دەری دەخات کێ بە عاتیفە و سۆز قسە دەکات و کێ بە باوەڕی پتەو و دامەزراوەوە دەدوێت: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَاْ أَخْبَارَكُمْ﴾ [محمد: ٣١]

«تاقیتان دەکەینەوە تا بزانین کێ لە ئێوە تێکۆشاوە و کێتان خۆڕاگرتر بووە. بەراوردی دەنگوباسی ئێوەش دەکەین.»

* خودا سەرخستنی خۆی بۆ بەندەکانی کەمێک دوادەخات، چونکە تاکوو تاقیکردنەوە زیاتر بێت، هەڵبژاردنیان زیاتر دەبێت و ڕاستگۆیان و دووڕووان زیاتر دەردەکەون: ﴿وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَاْ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ﴾ [محمد: ٤]

* هەموو کەس دەتوانێت هەق نیشان بدات و بەردەوام بێت لەسەری، بەڵام تاقیکردنەوەکان دەریان دەخات، مێخ بە جووڵاندنی دەردەکەوێت کە جێگیرە یان نا.

* خودا بەڵا دادەبەزێنێتە سەر هەندێک لە بەندەکانی، چونکە دەزانێت ئەگەر بەڵای تووش نەبێت، لە ڕێ دەردەچێت: ﴿وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّواْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ [المؤمنون: ٧٥]

«خۆ ئەگەر بەزەییمان پێیاندا بێتەوە و ڕەحمیان پێ بکەین و ناخۆشی و سەغڵەتیان لەستر لابەرین، ئەوە لە ستەم و سەرکەشیاندا ڕۆدەچن و سەرگەردان دەبن.»

* هەندێک لە بەڵا و موسیبەتەکان نیعمەتن، خۆ ئەگەر خودا لەسەر هەندێک لە مرۆڤەکان لای بدات لە ڕێ دەردەچن، خودا دەیەوێت ئەو مرۆڤە ڕابگرێت تاکوو خراپەی زیاتر نەبێت: ﴿وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّواْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ [المؤمنون: ٧٥]

«خۆ ئەگەر بەزەییمان پێیاندا بێتەوە و ڕەحمیان پێ بکەین و ناخۆشی و سەغڵەتیان لەستر لابەرین، ئەوە لە ستەم و سەرکەشیاندا ڕۆدەچن و سەرگەردان دەبن.»

* هەندێک لە خەڵکی بەشێک لە موسیبەتەکانیان لە بەخشیندایە، خودا سامان و منداڵیان پێ دەدات تا دڵیان وابەستە بێت پێیەوە و خۆشەویستی ئەو بەخششانە بچێتە دڵیانەوە، کاتێک کە تەواو جێگیر بوو، خودا لێیان وەردەگرێتەوە ئەم جۆرە موسیبەتە گەورەترە لەوەی کە لەسەر هەژاری بەردەوام بووبا و هەر لە سەرەتاوە منداڵی نەبووبا.

* هەرچەندە دەروونی مرۆڤ سەرکەش و خۆبەگەورەزان بێت، ئەگەر بەڵا دابەزێتە سەری ڕوو دەکاتەوە خودا هەرچەندە لەوە و پێش سەری بەرز نەکردبێتەوە بۆ لای خودا، ئەو کەسە لە فیرعەون سەرکەشتر و لادەرتر نییە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ﴾ [یونس: ٩٠]

«هەتا ئەو کاتەی خەریک بوو (فیرعەون) بخنکێت ئەوسا وتی بڕوام هێنا.»

* تاقیکردنەوەکان ڕیزەکان جیادەکەنەوە، هەقی شێواو ڕۆشن دەکاتەوە، کەواتە وا گومان مەبەن خراپە بۆتان: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُم بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ [النور: ١١]

«ئەوانەی ئەو بوختانەیان هەڵبەستبوو، دەستەیەک لە خۆتان بوون. پێتان وانەبێت بۆ ئێوە خراپ دەبێت، بەڵکوو قازانجە بۆ ئێوە.»

* بەڵا و موسیبەتەکان دەروون پاک دەکەنەوە لە ئارەزوو، ئەگەر مرۆڤ نەخۆش بوو یان پیر بوو، لە خودا نزیک دەبێتەوە و تاوانی کەم دەبێتەوە، لە کاتێکدا پەروەردگاری کاتی نەخۆشی و پیری هەر پەروەردگاری لەشساغی و گەنجییە، بەڵام هەواوئارەزوو دەروون بەند دەکات.

* یەکێک لە هۆکارەکانی بەڵا و تاقیکردنەوە نیشاندانی لاوازیی دونیا و فانیبوونیەتی، کاتێک کە هەندێک لە ماڵ وگیان لەناو دەچێت، ئاماژەیە بەوەی لەناوچوونی گشتیشی بە هەمان شێوەیە، چونکە دونیا بەش بەشە، کاتێک بەشێکی دەڕوا نیشاندەری ڕۆیشتنی هەموویەتی.

* نەفس هەق دەنێژێت لە ژێر تەپۆڵکە گڵی هەواوئارەزوودا، جا کاتێک بەڵا دادەبەزێت، ئارەزوو نامێنێت و هەق دەردەکەوێت: ﴿وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ [الأنبياء: ٤٦]

«سوێند بە خوا ئەگەر کەمێک لە لاوی سزای پەروەردگارت ڕوویان تێ بکات و لێیان بدات، ئەوە خواناسان بەکوڵ دەڵێن: هاوار و ئاه و ناڵە بۆ ئێمە، بەڕاستی ئێمە ستەمکار بووین.

* باوەڕ لە دەروونی هەموو خەڵکیدا جێگیرە، بەڵام دەنێژرێت بە خۆبەگەورەزانین و دەوڵەمەندی و دەسەڵات؛ ئەگەر ئەو ناشتنە لابرێت، ئەوا ئەو باوەڕە دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت، هەر بۆیە هەموو خۆبەگەورەزانەکان لە پاشاکان و دەسەڵاتداران و دەوڵەمەندان کاتێک دونیا لە دەست دەدەن زمانی باوەڕیان دەردەکەوێت، کێ لە فیرعەون سەرکەشتر و لادەرتر بوو: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ [يونس:٩٠]

«هەتا ئەو کاتەی خەریک بوو (فیرعەون) بخنکێت، ئەوسا وتی بڕوام هێنا کە هیچ پەرستراوێک نییە جگە لە ئەو (خوایە) نەبێت کە بڕوایان پێ هێناوە نەوەی ئیسرائیل.»

لەکاتی هاتنی ترس و نەمانی ئەو هۆکارانەی سەلامەتی بەرجەستەیین، ئەوانەی کە بوونەتە هۆی سەرکەشی و لادان، ئەو هۆکارانە لا دەچن بە لاچوونی ئەو سەرکەشی و لادانەی کە هەق لە ژێریدا شاراوەتەوە: ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ﴾ [لقمان: ٣٢]

«هەر کاتێک (لە دەریادا) شەپۆلێکی وەک هەورەکان دایانپۆشێت (ترسی نوقمبوونیان ببێت) هاوار لە خوا دەکەن دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو ملکەچ دەبن ئینجا کاتێک (خوا) ڕزگاری کردن بۆ وشکانی ئەوسا هەندێکیان مامناوەندییە

(هەندێکی تریان کافرە و دان نانێت بە چاکەی خوادا) کەس نیشانەکانی ئێمە ئینکار ناکات، جگە لە پەیمانشکێنانی ناشوکور واتە سپڵە.»

دەگەڕێنەوە بۆ خۆبەگەورەزانین و جا باوەڕیان دەنێژن.

* ترس و خۆف پەردە لەسەر ڕاستی حەز گیرسانی ئینسان بە ماددییاتەوە لا دەدەن، بۆیەش پەروەردگار بەڵا و موسیبەتی خۆی دادەبەزێنێت هەرکاتێک خەڵکی ڕۆدەچن تێیدا، بۆئەوەی ژەنگی دڵەکان نەمێنێت و بگەڕێنەوە سەر ڕێگا ڕاستەکە، بەلاش فەیلەسووفەکانی هاوشێوەی ئەرستۆ و ئەفلاتۆن ناوی دەنێن بە پاکبوونەوە، چونکە ئینسان لە گومانەوە پاک دەکاتەوە و دەیبات بۆ ڕاستی.

فەیلەسووفەکان کاریگەری بەڵایان لەسەر نەفس زانیوە بەبێ ڕۆشنایی وەحی.

* هەموو دەرگایەک بەردەرگایەکی هەیە، بەردەرگاکانی سەرکەوتنیش تاقیکردنەوەکانن.

* پەیامبەری خودا (ﷺ) لێیدرا و جوێنی پێ درا و دابڕێنرا، یوسف خرایە ناو بیرەوە و فرۆشرا و تۆمەتی خرایە پاڵ و بەندکرا، ئەمانە شکست نیین، بەڵکوو تاقیکردنەوەن، تاقیکردنەوەکان بەردەرگای سەرکەوتنن، هەموو دەرگایەکیش بەردەرگای هەیە.

* سەرکەوتن بەدەست نایات تەنها لەسەر پلیکانەکانی ئارامگرتن نەبێت، ئەوەی پلیکانەکانەی زیاتر دەبڕێت سەرکەوتنی زیاتر و بەهێزترە، پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت «بزانە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە.»

* ئەگەر تەنگانە و تەنگژەکان قورس بوون و نائومێدی دەرکەوت، ئەوکات سەرکەوتن دێتە پێش: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا﴾ [یوسف: ١١٠]

«هەتا کاتێک پێغەمبەرەکانیان نائومێد بوون (لە سەرکەوتن) و گەلەکەیان وایان زانی کە (پێغەمبەران) درۆیان لەگەڵدا کردوون (لەو کاتەدا) سەرکەوتن و یارمەتیی ئێمەیان بۆ هات.»

* ئەگەر بەڵا و موسیبەتەکان تەواو قورس بوون، ئەوا دەربازبوون نزیکە و سەرکەوتن دێتە پێش، خودا هیچ کەس جێگیر و سەرکەوتوو ناکات لە هەقدا ئەگەر تاوانەکانی کەم نەکاتەوە، چونکە تاوانە قورسەکان خاوەنەکەیان دەخەن ئەگەر بەرز ببنەوە.

* گەورەترین جۆری دەرووکرانەوە، ئەوەیە لە منداڵدانی بێئومێدییەوە دەربچێت.

* دەربازبوون و بێئومێدی نزیکی یەکترن و یەکیان پێش ئەوی دیکەیان دەکەوێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُواْ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا﴾ [یوسف: ١١٠]

«هەتا کاتێک پێغەمبەرەکانیان نائومێد بوون (لە سەرکەوتن) و گەلەکەیان وایان زانی کە (پێغەمبەران) درۆیان لەگەڵدا کردوون (لەو کاتەدا) سەرکەوتن و یارمەتیی ئێمەیان بۆ هات.»

* ئەو کەسەی ئارامگری نەبێت، سەرکەوتنی بۆ دەستەبەر نابێت: ﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ﴾ [فصلت: ٣٥]

«بەم ئاستە ناگات کەسانێک نەبێت کە خۆڕادەگرن و بەئارامن.»

* هەر دەبێت لە پاش قورسی و ئاستەنگی دەربازبوون و ئاسانی بێت، بەڵام خودا کاتی هەردووکیانی دیاری کردووە و ئاسانی و دەربازبوون تەمەنی زیاترە لە قورسییەکان: ﴿سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾ [الطلاق: ٧]

«بێگومان خوا دوای تەنگانە ئاسانی دێنێت.»

پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «هەرگیز یەک تەنگانە بەسەر دوو ئاسانیدا سەرناکەوێت.»

زۆرترین هۆکاری هەڵگەڕانەوەی کەسە پێشڕەو و دیارەکان لە هەق، پەلەکردنیانە لە دیتنی دەرئەنجامەکان: ﴿فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ﴾ [الأحقاف:٣٥]

«کەواتە خۆگر بە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) هەروەکوو پێغەمبەرانی خۆڕاگری بەهێز دانیان بەخۆدا گرت و پەلە مەکە.»

بەشوێن ڕێگەیەکی دیکەدا دەگەڕێن ئەگەر ئەو ڕێگەیەی گرتوویانە سەرکەوتن تیایدا دوابکەوێت.

* لەسەرهەقبوونت ئەوە ناگەیەنێت کە تاقی نەکرێیتەوە یان ئازار نەدرێیت، پەیامبەرانی وەک زەکەریا و یەحیا کوژراون و موسی دەرکرا و یوسف بەندکرا، گەورەی پەیامبەرانیش موحەممەد (ﷺ) ئابڵووقە دراوە و لێی دراوە و دەرکراوە پاشان هەموویان سەرکەوتوون.

* هەر بەڵا و تاقیکردنەوەیەک پەروەردگار پێغەمبەری خوای پێ تاقیکردبێتەوە، سەلامەتبوون و نەهاتنی ئەو تاقیکردنەوەیە بۆت گەورەیی و پلە بەرزی نییە تا کەسی چاکسازی پێی ستایش بکرێت.

* خودا چاکسازانی بە هیچ شتێک تاقی نەکردووەتەوە ئەگەر پەیامبەرانی وەک پێشەنگ بەو تاقیکردنەوەیەدا نەبردبێت، تاکوو ئاماژە بێت بەوەی کەرامەت و ڕێز لە سەلامەتیدا نییە. بەڵکوو ڕێز لە مەنزڵی ڕێزدایە کە بەهەشتە.

* هەر بەڵا و موسیبەتێک دابەزیبێتە سەر باوەڕدارێک، ئەوا بێگومان خودا هاوشێوەی ئەوە یان قورستری دابەزاندووەتە سەر پەیامبەران، ڕێزداری پارێزراویی نییە لە دونیادا، بەڵکوو ڕێزداری پارێزراوبوونە لە ئاییندا.

* تەواوی نیعمەتەکانی خودا لەسەر باوەڕدار و شکۆ و ڕێزی لای خودا ئەوە ناگەیەنێت لە دونیادا بەڵا و موسیبەت نایەتە ڕێی، دڵنیا بن دەسکەوتی شوێنکەوتنی هەق پارێزراویی دونیا نییە، بەڵکوو پارێزراویی دواڕۆژە، ئەگەر پارێزراوی لە دونیادا وابەستە بووایە بە شوێنکەوتنەوە، ئەوا دەبوو موجاهیدەکانی ڕێگەی خودا کە بە ماڵ و سامان و گیانی خۆیان دەجەنگن، دوورترین کەس بوونایە لە کوشتن و تیاچوونی ماڵ و سامانیان.

* لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا هەڵگەڕانەوە و شکست زۆر ڕوو دەدات.

* ئارام نەگرتن لەسەر بەڵاکانی ڕێگەی هەق لە دیارترین هۆکارەکانی هەڵگەڕانەوە و گۆڕانە، پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت: "کۆمەڵانێک خودایان ناسی و پاشان گەڕانەوە سەر کوفر، بەهۆی بەڵایەکەوە کە تووشیان هاتووە."

* زۆرێک لە خەڵکی شوێنی هەق دەکەون، بەڵام لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا دەگۆڕێن و هەڵدەگەڕێنەوە: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ﴾ [العنكبوت: ١٠]

«هەندێک لە خەڵکی دەڵێن باوەڕمان بەخوا هێناوە ئینجا کاتێک سزا بدرێت لەپێناوی خوادا (لەلایەن کافرانەوە) ئازار و سزای خەڵکی وەکوو ئازار و سزای خوا دادەنێت.»

* ئەو کەسەی هەقی دەوێت تەنها بۆ دەستخستنی دەسکەوت، ئەوە یەکەم کەسە کە لادەدات و هەڵدەگەڕێتەوە لەگەڵ یەکەم بەڵا و تاقیکردنەوەدا: ﴿وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ﴾ [المائدة: ٧١]

«وایان دەزانی کە تۆڵە و سزا دووچاریان نابێت جا بۆیە کوێر و کەڕ بوون.»

پێشبینی بەڵا و موسیبەتی سەر ڕێگە، هۆکاری ئارامگرتن و چەسپانە کاتێک بەڵا داببەزێت.

* زۆرێک لە خەڵکی زۆر چاوەڕوانی کردنی سەرکەوتن لەسەریان قورسە بۆیە لادەدەن و هەڵدەگەڕێنەوە، بێئاگان لەوەی خودا بەڵێنی داوە هەق سەربخات، نەک کەسەکان، زۆرێک لە هاوەڵان وەفاتیان کرد پێش ئەوەی هێز و دەوڵەتی پەیامبەری خودا (ﷺ) ببینن.

*پاش بەڵا و موسیبەتەکان کۆمەڵانێک هەڵدەگەڕێنەوە و کۆمەڵانێک جێگیر دەبن و کۆمەڵانێک هێزیان زیاتر دەبێت، بەڵاکان یەکێکن و جەستەکانیش یەک جۆرن، بەڵام چونکە دڵەکانیان پێش تاقیکردنەوەکان جیاواز بوون، حاڵیشیان دوای تاقیکردنەوەکان جیاواز دەبێت.

* ئەو کەسەی لە هەق هەڵگەڕاوەتەوە پاش تاقیکردنەوە، نیشانەی ئەوەیە ئەو کەسە کاتێک لەسەر هەق بووە بەدڵنیایی و یەقینێکی تەواوە لەسەری نەبووە، خودا بەو تاقیکردنەوەیە وای لێ کردووە ڕووکەشی بگەڕێتەوە سەر ئەو شتەی دڵ و ناخی لە سەرەتادا لەسەری بووە.

# نیعمەتەکان و ڕۆزی و دەوڵەمەندی و سوپاسگوزاری

* نیعمەتەکانی خودا بە کۆتا نایەن تەنانەت سپاسگوزاری لەسەر نیعمەتەکانیش نیعمەتێکی دیکەیە کە پێویستی بە سپاسگوزاریەکی تازە هەیە: ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ﴾ [النمل: ١٩]

«ئەی پەروەرندەی من! وام ڕابێنە سوپاسی چاکەی تۆ بکەم کە دەربارەی من و دایک و بابمت کردووە.»

* دەربڕینی سوپاسگوزاری بۆ خودا لەسەر نیعمەتەکان لەبری باوک بەشێکە لە چاکەکاریی بەرانبەر بە باوک.

* هەندێک جار دایک و باوک لە سوپاسگوزاری ئەو نیعمەتانەی لەسەریانە کەمتەرخەمن، چاکەکارییە بەرانبەریان ئەگەر منداڵەکانیان ئەو سپاسگوزاریەیان بۆ بکەن، چونکە سپاسگوزاری منداڵەکان وەک سپاسگوزاری باوک و دایک هەژمار دەکرێت: ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ﴾ [النمل: ١٩]

«ئەی پەروەرندەی من! وام ڕابێنە سوپاسی چاکەی تۆ بکەم کە دەربارەی من و داک و بابمت کردووە.»

* ئەو کەسەی دەبەخشێت نیعمەتەکانی بۆ بەردەوام دەبێت هەرچەندە بێباوەڕیش بێت، لە فەرموودەدا هاتووە: «خودا چەند کۆمەلانێکی تایبەت کردووە بە نیعمەتگەلێکەوە بۆ سوودی بەندەکان، تا ئەوان ببەخشن خودا بۆیان

بەردەوام دەکات، جا کاتێک دەست بگرنەوە لە بەخشین، ئەوا لێیان دەگرێتەوە و دەیداتە کەسانێکی دیکە.»

* سەرکەوتنەکان ئەگەر سوپاسگوزارییان لەسەر نەکرێت، شکستیان بە شوێندا دێت: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [آل عمران: ١٢٣]

«سوێند بەخوا بێگومان خوا ئێوەی سەرخست لە (جەنگی) بەدردا لە کاتێکدا ئێوە کەم و لاواز بوون، دەی لە خوا بترسن، بەڵکوو سوپاس گوزاری بن.»

* ئەگەر خودا بەرزی کردیتەوە لەخۆت بای مەبە. لەوانەیە بۆ ئەوە بەرزی کردبیتەوە تا داتبگرێت، نیعمەتەکان بە سپاسگوزاری دەپارێزرێت و بە سپڵەیی و پێنەزانیش نەمانی بەسەردا دێت.

* ئەو نیعمەتەی مرۆڤ لە خودا نزیک نەکاتەوە، پێشەکییە بۆ تیاچوون، ئەو پێشەکییەش سەرەتاکەی پشتکردنە چاکەیە و کۆتاییەکەی سەرقاڵبوونە بە خراپەوە.

* ئەگەر خودا نیعمەتەکانی بەسەر مرۆڤێکدا زیاد دەکرد و ئەو مرۆڤەش زیاتر تاوانی دەکرد، ئەوا خودا بەرەو خراپە دەیبات تاکوو سزای بدات پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: «ئەگەر دیبیت خودا هەموو ئەو شتانەی بەندە خۆشی دەوێت، پێیدا، بەڵام هەر لەسەر تاوان بوو، ئەوا بێگومان ئەوە بردنیەتی بەرە و تیاچوون.»

* خودا چەندین حیکمەتی هەیە لە دابەزاندنی نیعمەتەکان و سزاکانیدا، بە یەکیان کەسێک ڕێنمووی دەکات، بەوی دیکەیان کەسێک گومرا دەکات. موسیبەتێک ببێتە ڕێنموویت باشتر و چاکترە بۆت لە نیعمەتێک لە ڕێی ڕاست لات بدات.

* ئەگەر زیانێکت پێ گەیشت بەڵام بووە هۆی نزیک بوونەوەت لە خودا، ئەوا بزانە نیعمەتێکت بۆ هاتووە لە وێنەی سزادا، خۆ ئەگەر خێر و نیعمەتێکت بۆ دابەزی، بەڵام بووە هۆی دوورکەوتنەوە لە خودا، ئەوا بزانە سزایەکت بۆ هاتووە لە وێنەی نیعمەتدا.

* لە قورسترین جۆرەکانی سزا، ئەو سزایەیە کە بەهۆی نیعمەتێکەوە دەی چێژیت، خاوەنەکەی لە سزادا دەبێت و حەزناکات وازی لێ بهێنێت و بەردەوام لە سزادا دەمێنێتەوە: ﴿وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَـٰدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ﴾ [التوبة: ٨٥]

« (ئەی موحەممەد (ﷺ)) با سەرت سوڕنەهێنێ ماڵ و منداڵی زۆریان، بەڕاستی خوا دەیەوێت بەوە (ماڵ و منداڵ) سزایان بدات لەدنیادا و گیانیان دەربچێت لەکاتێکدا کە بێباوەڕن.»

* پاڵدانی نیعمەتەکان بۆ لای جگە لە خاوەن نیعمەت لە سپڵەیی و پێنەزانی نیعمەتەکەیە، سولەیمان کاتێک نیعمەتی خودای بەسەر خۆیەوە دیی، فەرمووی: ﴿هَـٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾ [النمل: ٤٠]

«ئەمەش چاکەی پەروەرندەی منە، ویستی تاقیم بکاتەوە؛ ئاخۆ شوکرانەبژێرم یان پێنەزان.»

* گەورەترین ئامانجی شەیتان ئەوەیە مرۆڤ سپڵە و پێنەزان بێت بەرانبەر نیعمەتەکانی خودا و سپاسگوزاری خودا نەبێت: ﴿ثُمَّ لَـَٔاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَـٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَـٰكِرِينَ﴾ [الأعراف: ١٧]

«ئەوسا لە پێش و پاشەوە بۆیان دەچم، ڕاست و چەپیشیان لێ دەگرم؛ جا دەبینی زۆرینەیان شوکر ناکەن.»

* لەبیرکردنی نیعمەتەکان هۆکارن بۆ هاتنی ناخۆشی. خراپەکاری سەرهەڵنادات تەنها لەگەڵ سپڵەیی و پێنەزانیدا نەبێت: ﴿فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ [الأعراف: ٧٤]

«نیعمەتی خواتان لە بیر بێت و پێ دامەگرن لە سەر بەدفەڕی لە زەویدا.»

* نیعمەتەکان دەڕۆن و نامێنن بەهۆی سپڵەیی و پێنەزانی خاوەنەکەیانەوە هەرچەندە ئەگەر لە پاکترین شوێنیش بن، پەیامبەر موحەممەد گەورەترین نیعمەت بوو، کاتێک خەڵکی مەککە پێنەزان بوون بەو نیعمەتە، خودا گواستیەوە بۆ مەدینە، نیعمەتەکان جێگاکانیان خۆش ناوێت، بەڵکوو شوێن سوپاسگوزارەکەیان دەکەون.

* پێنەزانی و سپڵەیی بەرانبەر نیعمەتەکان هۆکارن بۆ سزای گشتی و تیاچوونی دەوڵەتەکان: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا﴾ [القصص: ٥٨]

«چەندە شاریشمان قڕ کردن (کە خەڵکەکەی) بە خۆشگوزەرانی خۆیان سەرخۆش ببوون.»

* پێنەزانی و سپڵەیی بەرانبەر نیعمەتەکان دەرگای فیتنەی ترس و برسێتی و ستەم دەکاتەوە بەسەر دەوڵەتەکاندا: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَاقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ﴾ [النحل: ١١٢]

«خوا نموونەی هێناوەتەوە بە (خەڵکی) شارێک کە هێمن و دڵنیا بوون ڕزق و ڕۆزی زۆری بۆ دەهات لە هەموو شوێنێکەوە کەچی بەرانبەر چاکە و بەهرەکانی خوا ناسوپاس و سپڵە بوون جا خوا بەو هۆیەوە کردی بەبەر (خەڵکەکەی)یدا پۆشاکی برسێتی و ترس لەبەر ئەو کردەوانەی کە دەیانکرد.»

* مرۆڤ کاتێک سپڵە و پێنەزان بوو بەرانبەر خودا، بەڵا و موسیبەتەکانی لە بیردا دەبێت و نیعمەتەکانی لەبیر دەکات، مرۆڤ ئەگەر ئەمە حاڵی بێت بەرانبەر خودا، دەبێت چۆن بێت بەرانبەر خەڵکی، بێگومان خراپەکانیانی لەیاد دەبێت و چاکەکانیان لەیاد دەکات: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ﴾ [العاديات: ٦]

«بەڕاستی ئینسان بۆ پەروەردگاری ناسوپاسە.»

* دڵخۆشبوونی مرۆڤ بەو ڕۆزییەی خودا پێی داوە و ستایشنەکردنی خودا لەسەر ئەو ڕۆزییەی، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی سەرکەشی و سپڵەی و پێنەزانی ئەو نیعمەتە، قاروون بەو جۆرە بووە: ﴿إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ﴾ [القصص: ٧٦]

« (ئیماندارانی) گەلەکەی پێیان وت دڵخۆش مەبە (بەو سامانە) بێگومان خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە دڵخۆشن و لەخۆبایی بوون بە سەروەت و سامانەوە.»

* ئەمان و ئاسایش پاشان ڕۆزی پاشان کوفر و بێباوەڕی، ئەم هەنگاوانە بە سزا کۆتاییان پێ دێت: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ﴾ [النحل: ١١٢]

«خوا نموونەی هێناوەتەوە بە (خەڵکی) شارێک کە هێمن و دڵنیا بوون ڕزق و ڕۆزی زۆری بۆ دەهات لە هەموو شوێنێکەوە کەچی بەرانبەر چاکە و بەهرەکانی خوا ناسوپاس و سپڵە بوون جا خوا بەو هۆیەوە کردی بەبەر (خەڵکەکەی)یدا پۆشاکی برسێتی و ترس لەبەر ئەو کردەوانەی کە دەیانکرد.»

* ئەو ئوممەتە باوەڕدارەی پاش فەزڵ و بەخششی خودا بە ئاسایش و خۆشگوزەرانی کافر دەبێت و سپڵە دەبێت بەرانبەر نیعمەتەکان، تیاچوونی

لەپێشترە لەو ئوممەتە کافرەی هەر لە سەرەتاوە بە کافری خودا ئاسایش و خۆشگوزەرانی پێ داوە.

* زۆرجار خودا دەوڵەت و شارستانیەکان لەناو نابات تاکوو دەگاتە ئەوپەڕ تەواوی و سنوورشکێنییان، ئەوجا خودا دەیان گێڕێتەوە بۆ سەرەتایان: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا﴾ [القصص: ٥٨]

«چەندە شاریشمان قڕ کردن (کە خەڵکەکەی) بە خۆشگوزەرانی خۆیان سەرخۆش ببوون.»

* مرۆڤ نیعمەتی پێ دەدرێت و ئەو نیعمەتەی دەبێتە جێی تاقیکردنەوە بۆی، هەروەها خراپەی تووش دێت، دەبێت هۆی تاقیکردنەوە بۆی، شەڕ و خراپەیەک لە خودا نزیکت بخاتەوە نیعمەتە، نیعمەتێکیش لە خودا دوورت بخاتەوە بەڵا و خراپەیە ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ [الأنبياء: ٣٥]

«ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بە خراپە و ناخۆشی و بە چاکە و خۆشیش، تا چاک و خراپ دەرکەوێت.»

* دەربازبوون لە بەڵا و موسیبەت تاقیکردنەوەیە، خودا سپاسگوزار و سپڵەکانی پێ تاقی دەکاتەوە: ﴿فَإِذَا مَسَّ الْإِنْسَانَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَاهُ نِعْمَةً مِنَّا قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَىٰ عِلْمٍ ۚ بَلْ هِيَ فِتْنَةٌ﴾ [الزمر: ٤٩]

«ئینجا کاتێک ئادەمی زیانێکی لێ کەوت هاوارمان بۆ دێنێت لەپاشان هەر کاتێک بەهرەیەکمان پێدا دەڵێت: بەڕاستی ئەم بەهرەیەم پێ دراوە بەهۆی لێزانی خۆمەوە (وا نییە) بەڵکوو ئەزموون و تاقیکردنەوەیە.»

* تاقیکردنەوە بە خۆشگوزەرانی زیاتر دوورت دەخاتەوە لە خودا بەراورد بە تاقیکردنەوە بە تەنگی و ژینی قورس، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف دەڵێت: "تاقیکراینەوە بە ناخۆشی و ئارامممان گرت، بەڵام تاقیکراینەوە بە خۆشگوزەرانی و ئارامممان نەگرت."

* هاتنی نیعمەتی لەناکاو پاش تەنگانە و هەژاری سەرکەشی دەچێنێت لە دڵدا، بۆیە زۆر بەئاگا بە بەرانبەری: ﴿وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً مِّنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُمْ إِذَا لَهُم مَّكْرٌ فِىٓ ءَايَاتِنَا﴾ [يونس: ٢١]

«کاتێکیش خەڵکی لەدوای ناخۆشییەک کە بۆیان پێش دێت لە ڕەحمەت و بەخششی خۆمان بەهرەوەریان دەکەین، ئەوە یەکسەر پیلانگێڕی کاریانە دژ بە ئایین و فەرمانەکانی ئێمە.»

ئەو نیعمەتانەی لەناکاو و بێ هەنگاو دێن، ئەوا ئیستدراج و پلەپێبڕینن بەرەو تیاچوون.

* نیعمەتەکان مرۆڤ تووشی سەرکەشی دەکەن و شتگەلێکی لەبیر دەبەنەوە، خودا تووشی چەند ئازارێکی دەکات تاکوو پەروەردگاری بەیاد بێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ لای: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ﴾ [الأنعام: ٤٢]

«ئێمە بۆ سەر گەلێک لە گەلانی پێش تۆش (پێغەمبەرمان) بەڕێ کردوون. (ئەو کەسانەی یاغی دەبوون) تووشی بەڵا و نسیبەتانمان دەکردن، تا بەشکوو لەبەرمان بلاڵێنەوە.»

* خودا ڕۆزی دەدات بە هەمووان، ئەوانەی خۆشی دەوێن و ئەوانەش کە ڕقی لێیانە، کۆمەڵانێکی پێ نزیک دەکاتەوە و کۆمەڵانێکیش دوور دەخاتەوە: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًا﴾ [آل عمران: ١٧٨]

«هەرگیز وا گومان نەبەن ئەوانەی کە بێ باوەڕن ئەو مۆڵەتدانەی ئێمە بۆ ئەوان چاکە بۆ خۆیان، بەڕاستی ئێمە مۆڵەتی ئەوان دەدەین بۆ ئەوەی گوناهی زیاتر بکەن.»

* تەنیا ئەوانە ڕێ لە ڕۆزی دوژمنەکانیان دەگرن کە دژایەتی کاریان تێ دەکات، بە زانایەک گوترا: بۆچی خودا خۆی بە باشترین ڕۆزیدەر وەسف کردووە؟ گوتی: ئەگەر بەندەکەی باوەڕی پێ نەهێنێت، ڕۆزی لێ نابڕێت. چونکە باوەڕداری و بێباوەڕییەکەی بۆ خودی خۆیەتی.

* گومڕاکان وا گومان دەبەن خودا ڕزقیان دەدات بەهۆی ئەوەی کە خۆشیانی دەوێت، بەڵام خودا بە پلەبەندانە بەرەو گومڕاییان دەبات و لەبیریان دەباتەوە و تیایان دەبات: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ۝ نُسَارِعُ لَهُمْ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ۝﴾ [المؤمنون: ٥٥-٥٦]

«ئاخۆ ئەوان پێیان وایە کە بەو ماڵ و منداڵە پێیان دەبەخشین، نەخێر، وانییە، مەبەستمانە بەپەلە لە نازونیعمەت بەهرەوەریان بکەین؟ بەڵکوو ئەوانە هەستی پێ ناکەن.»

* خودا بەهۆی نییەتی مرۆڤەکانەوە زیاتر ڕۆزییان دەداتێ وەک لە کارکردنیان: ﴿إِن يَعْلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمْ﴾ [الأنفال: ٧٠]

«ئەگەر خوا خێر لە دڵەکانتاندا بەدی بکات، ئەوە زۆر لەوە باشترتان پێ دەبەخشێت کە لێتان وەرگیراوە.»

* پارێزگاری لە نوێژ و فەرمانکردن بە خانەوادە بە ئەنجامدانی نوێژ هۆکاری ڕزق و یارمەتیدەری زیادبوونی ڕۆزییە: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ [طه: ١٣٢]

«ئەی موحەممەد (ﷺ) فەرمان بدە بە ئەندامانی خێزانەکەت بە نوێژکردن و خۆشت خۆڕاگر و بەردەوام بە لەسەر بەجێهێنانی ئێمە داوای ڕۆزیت لێ ناکەین بەڵکوو ئێمە ڕزق و ڕۆزی تۆ دەدەین و سەرەنجامی چاک بۆ پارێزکاران و خواناسانە.»

* یەکێک لە هۆکارەکانی ڕۆزی، سەرخستنی لاواز و ستەملێکراوانە بەسەر بەهێز و ستەمکاراندا، پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرموویت:هل تنصرون وترزقونإلا بضعفائكم؟ «جا ئایا ئێوە سەردەخرێن و ڕۆزی دەدرێن تەنها بەهۆی لاوازەکانتانەوە نییە؟»

* هەندێک جار بێبەشبوون نیعمەتە و ڕۆزی و پێبەخشینیش سزایە، لە فەرموودەدا هاتووە «خودای گەورە بەندە باوەڕدارەکەی لە دونیا دەپارێزێت، لە کاتێکدا ئەو حەزی لێیەتی وەک چۆن ئێوە نەخۆشەکانتان لە خواردن و خواردنەوە دەپارێزن لە ترسی زیان بەرکەوتنیان.»

* خێر و چاکەیەک ئەگەر لە خودا دوورت بخاتەوە، ئەوە سزایە: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ۝ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ۝﴾ [المؤمنون: ٥٥-٥٦]

«ئاخۆ ئەوان پێیان وایە کە بەو ماڵ و منداڵە پێیان دەبەخشین ٥٥ مەبەستمانە بەپەلە لە نازونیعمەت بەهرەوەریان بکەین؟ بەڵکوو ئەوانە هەستی پێ ناکەن.»

* هەندێک جار خودا شتێک لە مرۆڤ قەدەغە دەکات، ئازاری پێ دەچێژێت، ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ﴾ [القصص: ١٢]

«ئێمە پێشتر هەرچی ئافرەتی شیردەرە لەومان حەرام کرد.»

چونکە پارێزەرێکی لەوە باشترمان بۆ دانابوو کە پێویست ناکات پێوەی سەرقاڵ ببن: ﴿فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا﴾ [القصص: ١٣]

«ناردمانەوە لای دایکی، تا چاوی پێ ڕوون بێتەوە.»

* خودا ڕۆزییەک لە مرۆڤ لادەدات کە تەمەنی خۆی تێدا سەرف کردووە، چونکە دەبێتە هۆی چوونە دۆزەخیەوە، ئیبن مەسعوود دەفەرموویت: "پیاوی

وەها هەیە بازرگانی یان دەسەڵاتێکی دەوێت جا کاتێک کە نزیک بوو بەدەستی بهێنێت، خودا بە فریشتەیەکی دەفەرمووێت: بچۆ لای ئەو بەندەیەمْ و ئەوی لێ لابدە، چونکە ئەگەر بۆی ئاسان بکەم، ئەوا دەیخەمە دۆزەخەوە، ئەو فریشتەیەش کارەکەی لێ لادەدات، بەردەوام گومان بە خەڵکی دەبات: فڵان پێی هەڵخلیسکاندم، فڵان پێشم کەوت، لە کاتێکدا تەنها خودا لێی لاداوە."

* پایە و پێگە ئەو زەوییەیە کە ئارەزووی تێدا گەشە و چەکەرە دەکات، سامان ئەو ئاوەیە کە پێی ئاو دەدرێت، بۆیە هەموو بیدعە و گومڕاییەک پێویستی بە زەوی و ئاوە، هەروەها کەسێکیش کە ئاوی بدات.

* شارستانییەت و دەوڵەتەکان زیاتر بەهۆی دەوڵەمەندییەوە لەناوچوون وەک لە هەژاری، لە فەرموودەدا هاتووە: سوێند بە خودا لە هەژاریتان ناترسم، بەڵام دەترسم دونیا بەڕووتاندا بکرێتەوە وەک چۆن بە ڕووی ئوممەتانی پێش ئێوەدا کرایەوە جا پێشبڕکێیان تێداکرد و بەهۆیەوە تیاچوون.»

* بێگومان ئەو کاتانەی خودا ڕۆزی زۆر و خۆشگوزەرانی و بەخششی زۆری تێدا دەدات بە خەڵکی، ئەوا خەڵکی زیاتر خراپەکاری و کوشتاری تێدا ئەنجام دەدات، ئەو کاتانەش کە خۆشگوزەرانی تێدا کەم بێت کوشتار و خراپەکاری تێدا کەم دەبێت، مێژوو و حاڵی ئێستامان شاهید و گەواهیدەرێکی دادوەر و ئاشکرایە لەسەر ئەم بابەتە.

* زۆرترین لادانی مرۆڤ لە کاتی دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانیدایە، نەوەک کاتی هەژاری و تەنگەژە: ﴿وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً مِّنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُمْ إِذَا لَهُم مَّكْرٌ فِىٓ ءَايَاتِنَا﴾ [یونس: ٢١]

«کاتێک ئێمە دەچێژین چاکە و بەهرەیەک بە خەڵکی لە پاش زیان و ناخۆشییەک کە لێیان کەوتووەتە دەست بەجێ ئەوان پیلان دەگێڕن دەربارەی ئایەتەکانی ئێمە.»

* زۆرێک لە سزاکانی خودا بۆ ئوممەتەکان لە کاتی خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندیدا ڕوویان داوە، نەک لە کاتی هەژاری و تەنگەژەدا.

* هەق و خۆشگوزەرانی کەمجار هەیە لە کەسێکدا کۆ ببێتەوە: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ۝٣٤ وَقَالُواْ نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ۝٣٥﴾ [سبأ: ٣٤-٣٥]

«(ئێمە) بۆ هەر شوێنێک (پێغەمبەرێکی) بێدارخەرەوەمان نەناردووە، خۆشگوزەرانان نەیانتوانیبێت: ئێمە بڕوامان بەم (بیروباوەڕە) نییە کە بە ئێوەدا ڕەوانەکراوە! هەروەها وتوویانە: ئێمە سامان و نەوەی زۆرترمان هەیە (لە ئیمانداران، دیارە کە خوا ئێمەی خۆش دەوێت!)، ئێمە (لە قیامەتدا) سزا و ئەشکەنجە نادرێن!»

* دەوڵەمەندی بووەتە ڕێگر لەنێوان کەسانێک کە بگەن بە حەق، لە کاتێکدا سەروەت و سامان لە ڕێگا دەست دەکەوێت، زۆرجاریش لە نزیکانەوە بە میرات بۆت دەمێنێتەوە، لە کاتێکدا حەق دەستەکان پێی ناگەن، بەڵکوو دڵەکان بە ناڕەحەتی و ماندووبوون بەدەستی دێنن.

* خەڵکی کاتێک دەوڵەمەند بوون، خودایان لە بیر دەچێتەوە کاتێکیش هەژاربىن ڕوو دەکەنەوە پەروەردگار: ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرّٞ دَعَوۡاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنۡهُ رَحۡمَةً إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ﴾ [الروم: ٣٣]

«کاتێک تەنگانەوە و ناخۆشی تووشی خەڵکی دەبێت، هانا و هاوار بۆ پەروەردگاریان دەبەن و هەر لەو دەپاڕێنەوە، پاشان کە ناخۆشی و تەنگانە کە نەما و خوا دەوری ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی لێکردنەوە، یەکسەر دەستەیەکیان هاوەڵ بۆ پەروەردگارییان بڕیار دەدەن.

# هەق لەنێوان بەهێز و لاوازەکاندا

* ئوممەتان بەهۆی کردەوەی بەهێز و دەوڵەمەندەکانەوە لەناو دەچێت نەک لاواز و هەژارەکان ﴿وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا﴾ [الإسراء: ١٦]

«کاتێک بمانەوێت (دانیشتووانی) شار و وڵاتێ لەناو ببەین فەرمان دەدەین (بە گوێڕایەڵی و کردەوەی چاک) بە دەوڵەمەندە خراپەکار و زۆردارەکانی کەچی ئەوان یاخی دەبن و لە فەرمان دەردەچن جا بڕیاری (سزادان) پێویست دەبێت بۆ (دانیشتووانی) ئەو شارانە جا ئەو شارانە وێران دەکەین بە وێرانکردنێکی تەواو.»

* زۆرێک لە گومڕایی خەڵکی بەهۆی لاساییکردنەوەی گەورەکان و خۆگونجاندنیان لەگەڵ ژیانی واقعدا پەیدادەبێت، بەبێ ئەوەی بیربکەنەوە لە هەق: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠﴾ [الأحزاب: ٦٧]

«دەڵێت: ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە بەگوێی سەران و گەورەکانمان کرد ئیتر لە ڕێگای ڕاست گومڕایان کردین.»

* کرداری پاشاکان و گەورەکان گەورەترین هۆکاری زوو بڵاوبوونەوەی هەڵە و ڕەواجپێدانی هەڵەن، چونکە خەڵکی پێشبڕکێ دەکەن بۆ لاساییکردنەوەیان، هەر ئەم هۆکارەیە وای کردووە کە ڕێگریکردنیان لەهەڵە بە گەورەترین جیهاد هەژمار بکرێت.

* دژایەتی کردنی پەیامبەران لەلایەن سەرکردە و کەسە گەورەکانەوە دەستی پێ کردووە، نەک لای خەڵکی گشتییەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُواْ فِيهَا﴾ [الأنعام: ١٢٣]

«بەو شێوەیە لە هەموو شارێکدا گەورەترینی تاوانبارانیمان کرد (بە دەسەڵاتدار) بۆئەوەی پیلان و فێڵ بکەن لەو شارانەدا.»

* یەکەم دژایەتیکردنی هەق لە هەموو کاتێکدا گەورەکان پێی هەڵساون، پاشان لاوازەکان شوێنیان کەوتوون: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُواْ فِيهَا﴾ [الأنعام: ١٢٣]

هەروەها یەکەم کەس کە گوێڕایەڵی هەقی کردووە لاوازەکان بوون، پاشان گەورەکان.

* وتەی نزم و بێئەرزش کە دەربڕەکەیان خاوەن پێگە و گەورەیی و دەسەڵات بێت وای لێ دەکات گرنگ و جێی بایەخ بێت، هەروەها لاوازی و هەژاری و بێدەسەڵاتی ئەو کەسەی وتەیەکی بەرز و جوان دەڵێت و وای لێ دەکات بێئەرزش و هەژمارنەکراو بێت، فێڵکردنە لە ئەقڵ ئەگەر وتە و خاوەنەکەی تێکەڵ بکرێت و هەردووکیان بەیەکەوە بکێشرێن.

* ئەقڵ لاواز دەبێت لە بیرکردنەوە و تێڕامان لەو بۆچوونانەی گەورە و سەرکردەکان دەری دەبڕن و پشتگیری دەکەن: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠﴾ [الأحزاب: ٦٧]

«دەڵێت: ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە بەگوێی سەران و گەورەکانمان کرد ئیتر لە ڕێگای ڕاست گومڕایان کردین.»

* زۆرینەی ئەقڵەکان وەک پۆلە باڵندەن شوێن بەهێزەکانیان دەکەون ئەگەر ئەوانیان لەدەستدا شوێن هاوشێوەکەی دەکەون، نەک لەبەر شوێنکەوتنیان

بۆ هەق، هەموو وڵاتێک بۆچوونێکی هەیە کە دەسەڵاتدارەکانیان دروستیان کردووە: ﴿أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠﴾ [الأحزاب: ٦٧]

«ئێمە بەگوێی سەران و گەورەکانمان کرد، ئیتر لەڕێگای ڕاست گومڕایان کردین.»

* متمانەبوون بە مەزنێتییەک و ژیان لەژێر سێبەریاندا، دەبێتە هۆی لێسەندنەوەی ورەبەرزیی فێربوونی زانستە شەرعییەکان. بۆیە زۆر کەمە گەورەکان کەسی گەورەی وەک خۆیان بهێننە دنیاوە.

* هەموو ئەوانەی کە توانایان هەیە بەسەر خەڵکیدا، وەک سەرکردەکان و دەوڵەمەندەکان دەتوانن وابکەن خەڵکی شوێن فکر و بۆچوونەکان بکەون هەرچەندە ئەو فکرانە تەواو هەڵە بن، خودا ئەوە جێگیر دەکات و دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ [النمل: ٣٤]

«هەمیشە ئەوە پیشەیانە و بەو جۆرە دەکەن و هەر واش دەبن.»

* هەر فکر و بیروباوەڕێک بە هێز و سیاسەتی سەرکردەکان چەسپابێت بە نەمانیان ئەو فکرەش نامێنێت، بیروباوەڕی چەسپی و ڕەگداکوتاو ئەوەیە خودی خۆی لە دڵدا بچەسپێت، پاشان بپارێزرێت بە ڕەگ داکوتانی زیاتری.

* لە هەر سەردەم و زەمەنێکدا دەسەڵاتدارێکی بەهێز هەبێت خەڵکی گشتی و زۆرێک لە کەسە تایبەتەکانیش وادەبینن کە لەسەر هەقە، هەرچەندە لەسەر ئەوپەڕ ناهەقی و باتڵ بێت، ئەگەر دەسەڵاتەکە نەما، ئەوا پێوەرەکەش نامێنێت، هیچ بیروباوەڕێک لە بیروباوەڕی فیرعەون گومڕاتر نەبووە، لە کاتێکدا وای دەبینی کە بیروباوەڕێکی هەق و ڕاستە.

* دەروونی مرۆڤ حەز و خواستی بۆ نزیکی لە گەورەکانەوە هەیە و بۆچوونەکان بەو لایەدا دەشکێندرێنەوە کە ئەو ڕازی دەکات، گەورەترین پاداشتی فیرعەون بۆ ساحرەکان ئەوە بوو کە پێی گوتن: ﴿قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ [الشعراء: ٤٢]

«گوتی: دیارە ئەوسا ئێوە لە نزیکانی خۆم دەبن.»

ئەوانیش ئەوپەڕ هەوڵی خۆیان لە ناهەقیدا سەرف کرد، تاکوو ببێتە هۆی نزیکبوونەوەیان.

* هەرکەسێک بە سادەیی بژێت تووشی سەرکەشی و لە سنووردەرچوون نابێت، چونکە یەکەم هەنگاوی سەرکەشی زێدەڕەویکردنە. ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَلَا تَطْغَوْاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِي﴾ [طه: ٨١]

«بخۆن لەو ڕۆزییە پاکانەی پێمان داون و زیادەڕەوی تێدا مەکەن ئەگینا خەشم و قاری من دەتانگرێتەوە.»

زێدەڕەوی کردن و خۆبەکەمزانین کۆنابنەوە.

*خودا زۆرێک لە پەیامبەران و بانگەوازکارانی هەقی لە هەژاران یان لە خەڵکانی مامناوەند هەڵبژاردووە، بۆئەوەی تەنها پاکەکان شوێنیان بکەون و تەماحکار و چنۆکەکان لێیان دووربکەونەوە، هەربۆیە شوێنکەوتووانی پەیامبەران لە کاتە تەنگانەکاندا جێگیر و چەسپاون.

* هەرکەس بڕوانێتە مێژوو، دەبینێت ئەوەی بەهێزترین ئەقڵ و تەواوترین فکریان هەیە خەڵکانی لاوازن، بەڵام بیروباوەڕ و فکری هەژار لای دەوڵەمەند بێئەرزش و هەژارە.

* هەق لای ئەو کەسانەی لە خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندیدان هێندە ڕوون نییە بەو جۆرەی لای هەژار و لاواز و زەحمەتکێشەکاندا ڕوونە: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ [العنکبوت: ٦٩]

«کەسانێک کە لەپێناو ڕەزامەندیی ئێمەدا تێکۆشانیان کردووە بەڕاستی ڕێنموونیان دەکەین بۆ ڕێبازەکانی خۆمان.»

* ئەگەر خەڵکی جیاواز بوون، ئەوا هەق لای لاوازان بەدەست دێت. دووربکەوە لە بۆچوونی خۆبەگەورەزانان، لە فەرموودەدا هاتووە: «خەڵکانی بەهەشت هەموو لاواز و بە لاواز داندراوەکانن و خەڵکانی دۆزەخ کەسە خراپ و ڕەق و خۆبەگەورەزانەکان.»

* هەرکەس سادە بژی، سەرکەشی و سنوورشکێنی ناکات چونکە مادەگەرایی تۆوی سنوورشکێنییە: ﴿كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَلَا تَطْغَوْا۟ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِى﴾ [طه: ٨١] لە حەڵاڵ و پاکی ئەوە بخۆن کە پێمانداون بە ڕۆزی، زێدەڕەوی تێدا مەکەن و سنووربشکێنن، جا خەشمی منتان بەسەردا دەچەسپێت.

ئیسراف و زێدەخەرجی لەگەڵ خۆبەکەمزانیدا کۆنابنەوە.

# هەڵە و گومڕایی و خراپە

* باوەڕبوون بە خودا ئەقڵ بەهێز دەکات و هەڵەی کەم دەکاتەوە، ئەو کەسەی بەهێزترین باوەڕی هەیە کەمترین هەڵەی هەیە، پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «بڕوادار دوو جار لە یەک کونەوە ناگەزرێت.»

* هەندێک جار خودا مرۆڤ دەخاتە ناو هەڵەوە، تا لاوازبوونی بەبیر بهێنێتەوە و تەواوییێتی پەروەردگاری بۆ دەربکەوێت، خۆ ئەگەر مرۆڤ بەردەوام لەسەر هەڵە بووبا، ئەوا پەروەردگاری لەیاد دەکرد و لاڕێ دەبوو، بەڵام هەندێک جار تێی دەکەوێت تاکوو بگەڕێتەوە لای پەروەردگاری و لاڕێ نەبێت.

* هەرکەس بەخۆیدا چووەوە و هیچ هەڵەیەکی لە خۆیدا بەدی نەکرد، ئەوا خودایەتی بۆ خۆی داناوە، یان نەفامییەکی خەستوخۆڵ و گەورەی بۆ خۆی چەسپاندوە.

* ناسینی هەڵەکان ڕێڕەوی پێکانی ڕاستییەکانن.

* خۆبەریکردن لە هەڵە هەڵەیەکی دیکەیە، دان نان بە هەڵەدا قادرمەی گەیشتنە بە ڕاستییەکان: ﴿وَمَن يَكۡسِبۡ خَطِيٓـَٔةً أَوۡ إِثۡمٗا ثُمَّ يَرۡمِ بِهِۦ بَرِيٓـٔٗا فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا﴾ [النساء:١١٢]

«جا ئەوەی هەڵەیەک یان تاوانێک ئەنجام بدات و لەوەودوا بیسەپێنێت بەسەر بێتاوانێکدا و بێتاوانێکی پێ لەکەدار بکات، بێگومان ئەو کەسە بوختان و تاوانێکی ئاشکرای ئەنجامداوە و تاوانێکی گەورەی کردووە (زیاد لە گوناهەکەی خۆی.)»

* ئەم جۆرە کەسانە بە خاوەنی لاوازترین ئەقڵ دادەندرێن کە هەق و ڕاستی وەرناگرن تا بە خودی خۆیان ئازاری ئەو هەڵەیە نەچێژن: ﴿فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ [الزخرف: ٨٩]

«جا وازیان لێ بێنەو گوێیان پێ مەدە و ماڵاواییان لێ بکە لەمەوپاش دەزانن چییان بەسەر دێت.»

* ئەو مامۆستایانەی زۆرترین کاریگەرییان هەیە ئەوانەن کە خاوەنی زۆرترین ئەزموونن، بەڵام هەموو ئەو مامۆستایانە مردن بەسەریاندا دێت و دەمرن، تەنها تاکە مامۆستا و یەکەم مامۆستای خراپە کە شەیتان بەردەوام دەمێنێت تا ڕۆژی دوای. فێڵ و ئەزموونێکی درێژی هەیە و وازی لەو هەڵانە هێناوە کە لە کاتی بەلارێدابردنی خەڵکیدا فێری بووە.

* ئەو دەروونانەی لەسەر هەڵە چەسپیون و ماوەیەکی زۆر لەسەری بەردەوام بوون، لە بەرد ڕەقتریان لێ هاتووە لە ڕووی گۆڕانیانەوە: ﴿فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ﴾ [الحديد: ١٦]

«ئەوسا لەپاش ماوەیەکی زۆر، تووشی دڵڕەقی هاتن و زۆربەیان لە ڕێ لایان دا.»

بۆیە نەرمکردنەوەی پێویستی بە هێز هەیە.

* قورسترین کەس بۆ گەڕانەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست ئەوانەن کە ماوەیەکی زۆر لەسەر هەڵە ماونەتەوە: ﴿فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ﴾ [الحديد: ١٦]

ئەوسا لەپاش ماوەیەکی زۆر، تووشی دڵڕەقی هاتن و زۆربەیان لە ڕێ لایان دا؟

* پێ هەڵخلیسکان و هەڵەی کەم نیشانەی تەواویێتی ئەو مرۆڤەیە، ئەو مرۆڤە دەبێت ستایش بکرێت نەک سەرزەنشت، چونکە تەواوییێتی مرۆڤ بە کەمی ئەنجامدانی هەڵەکانی دەپێورێت نەک بە زۆری ڕاستی و تەواوییێتیەکانی.

* هەڵە وەک پەڵەی ڕەشی ناوچەوانە، ئەگەر بچووک بوو، جوانت دەکات خۆ ئەگەر گەورە بوو ناشرینت دەکات. چونکە سروشتی مرۆڤ لەسەر هەڵەکردن هاتووە.

* ئەگەر هەڵە و پێهەڵخلیسکانێکی کەمت دی لە کەسێکدا، ئەوە جێی عەیبە و سەرزەنشت نییە، چونکە خودا کەموکوڕی بۆ مرۆڤ بڕیار داوە، خودا کەموکوڕی مرۆڤ بە بچووکترین پێ هەڵخلیسکان دەچەسپێنێت، ئەنجامدانی هەڵەی کەم تەواوی مرۆڤ نیشان دەدات.

* لەکاتی هەڵەدا ڕێزدارەکان بێتاقەت دەبن و ئامۆژگاریت دەکەن، بێڕێزەکانیش پێیان خۆشە و دەیخەنەبەر باس و بڵاوکردنەوەوە.

* دڵخۆشبوون بە کەموکوڕی کەسانی دیکە تا کەموکوڕی خۆتی پێ دابپۆشیت بە لاوازی ئیمان دادەندرێت، هەروەها غەمباربوون بە کەموکوڕی کەسانی دیکە لە بەهێزی باوەڕە هەرچەندە لە خودی خۆشتدا بوونی هەبێت.

* دروست نییە سزای هەڵەکار بدرێت پێش ئەوەی گوێبیستی پۆزش و بەڵگەکانی بیت: ﴿لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾ [النمل: ٢١]

«سوێند بێت دەبێت سزایەکی زۆر سەختی بدەم یان سەری ببڕم، یان دەبێت بە بەڵگەیەکی ئاشکراوە بێت بۆ لام.»

* هەڵەکان چارەسەر ناکرێن بەهەڵە، دیکتاتۆرەکان چاوەڕوانی دین ناکەن تا دیکتاتۆری پێوە بکەن، سەدام و بەشار و حوسنی موبارەک و قەزافی

هەموویان دیکتاتۆر بوون بەبێ ئەوەی دیینیان هەبێت: ﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ [المائدة: ٤٩]

« (فەرمانمان پێ کردی) کە حوکم بکەی لەنێوانیاندا بەوەی کە خوا ناردوویەتییە خوارەوە.»

* تاوانی گەورەیە گشتگیرکردنی هەڵەی تاکێک بەسەر کۆمەڵێک یان شارێک یان کۆمەڵێکی هاوپیشەدا، لە فەرموودەدا هاتووە: «گەورەترین تاوانی خەڵکی لای خودا ئەو کەسەیە کە جوێن بە تاکێک بدات، بەڵام بیگەیەنێتەوە سەر هەموو تیرە و هۆزەکەی.»

* خەڵکی نەکەوتوونەتە ناو هیچ هەڵەیەکەوە ئەگەر لە بەرانبەرید دەرگایەکی چاکە دانەخرابێت یان تەسک نەکرابێتەوە، شەریعەت بۆیە هاتووە تا ئەوانە ڕێک بخات نەک تەسکیان بکاتەوە و دایان بخات.

* هەموو شەڕ و خراپەیەک کە لە مرۆڤێکی ئاساییدا ڕوو دەدات، ئەو تۆوەکەی لە ناخی هەموو کەسێکدا هەیە، بەڵام لەکەسێکدا زیاتر گەشە دەکا لەچاو کەسێکی دیکەدا، بۆیەش پەیامبەری خوا پەنای گرتووە بە پەوەردگار لە خراپی نەفس، چونکە نەفس زەوی تۆوە خراپەکانە چاوەڕێی کەسێک دەکات ئاوی بدات.

* خودا هەندێک لە مرۆڤە گومڕاکانی چواندووە بە ئاژەڵەکانەوە: ﴿إِنۡ هُمۡ إِلَّا كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ [الفرقان: ٤٤]

«ئەوانە هەر وەک ئاژەڵن بەڵکوو ئەوان گومڕا تریشن.»

ئەمە پەیامێکە بۆ شوانەکان -سەرکردەکان- بەسۆز و بەزەیی بن بەرانبەریان و دووریان بخەنەوە لە لەوەڕی خراپ هەرچەندە پێشیان ناخۆش بێت.

* یەکەم تۆوی گومڕایی ئارەزووە، پاشان خۆبەگەورەزانی، پاشان بەدرۆخستنەوەی هەق: ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ﴾ [البقرة: ٨٧]

«هەر کاتێک پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردبێت، بەڵام لەگەڵ ئارەزووەکانی ئێوەدا نەگونجا بێت، خۆتان بەزلزانیوە و لووتتان بەرز کردووەتەوە و بڕواتان نەهێناوە، ئەوسا دەستەیەکتان (بەرنامەی خواتان) بە درۆ زانیوە و هەندێکیشتان پێغەمبەرانتان دەکوشت.

* کۆمەڵانێک پشت دەکەنە خودا، چونکە لە ناخیاندا چاودێری خودای تێدا نییە ﴿أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ۝﴾ [العلق: ١٣-١٤]

«ئایا نابینی درۆ دەکات و پشتی کردووە لە ئیمانهێنان. ئایا نەی زانیوە کە خوا دەیبینێت.»

* مرۆڤ دەڕوانێتە خۆی و دەتوانێت خۆی دەربخات لە خەڵکی و خۆیان لێ حەشار بدات و نەیبینن، خەڵکیش دەبینێت دەردەکەون و شاراوەش دەبن لێی، لە بیری دەکات خودا بەو شێوەیە، بۆیە لە پەنهانیدا گومڕا دەبێت: ﴿أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم﴾ [الزخرف: ٨]

«ئاخۆ وا دەزانن ئێمە نهێنی و چپەکانیان نابیستین.»

* ئیمان لەگەڵ خۆشویستنی گومڕای و سەرسامبوون بە گومڕاکان لە دڵێکدا کۆنابێتەوە پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «هەرکەس بەدڵ بەرانبەریان تێ بکۆشێت ئەوە باوەڕدارە، لەپاش ئەوە هیچ بەشێک لە باوەڕ نەماوەتەوە تەنانەت ئەندازەی دەنکە خەرتالەیەکیش.»

* گومڕاکان دەیانەوێت خەڵکی هاوشێوەی خۆیان بن تا هەست بە تەنهایی لادانیان نەکەن: ﴿وَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءً﴾ [النساء: ٨٩]

«ئەوان ئاواتەخوازن ئێوەش بێباوەڕ بن وەک چۆن خۆیان بێباوەڕ بوون تا ئێوە و ئەوان یەکسان بن.»

﴿يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ﴾ [النساء: ٤٤]

«گومڕایی هەڵدەبژێرن و دەیانەوێت ئێوەش لە ڕێبازی ڕاست گومڕا بن.»

* ئەو کەسانەی درێژترین ئاواتیان هەیە، زۆرترین گومڕاییان تیادایە، گومڕاترین کەس شەیتانە بەهۆی ئاوات درێژییەوە: ﴿قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ [الأعراف: ١٤]

«وتی مۆڵەتم بدە (مەممرێنە) تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە.»

* گەورەترین موسیبەت ئەوەیە خودا مرۆڤ تاقی بکاتەوە بە خراپەیەک و لەدڵیدا خۆشەویستی بکات تا دەمارگیر دەبێت بۆیی و لەناو خەڵکیدا بڵاوی دەکاتەوە، تا تاوانەکانی زۆر دەبن و لەسەری دەمرێت: ﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا﴾ [فاطر: ٨]

«ئایا ئەو کەسەی کە کردەوە ناشرینەکانی بۆ ڕازێنراوەتەوە و بە جوان و چاک دەیبینێت، وەک ئەو کەسە وایە کە پێوەری خوایی پێیە بۆ ناسینەوە و جیاکردنەوەی چاکە لە خراپە؟»

* هۆگربوون بە خراپەوە ئەو خراپەیە ناگێڕێت بە چاکە، دڵ کاریگەر دەبێت بە زۆر تێکەڵبوونی لەگەڵ خراپەدا و دەبێتە هۆی وەرگرتنی، وەک چۆن جەستە کاریگەر دەبێت بە زۆر بەرکەوتنی لەگەڵ شتانی ئازاربەخشدا، دەستەکان یەکەم جار ئازاریان پێ دەگات بە ئاوی گەرم پاشان لەگەڵیدا ڕادێن.

* بیر لە جێگیری گومڕاکان مەکەرەوە لەسەر گومڕاییان نەبادا تووشی شکست بێیت، بەڵکوو بیر لە توانایی خودا بکەرەوە کە ئەو هەقەی لێ لاداون کە دەیبینن و لە بەردەمیانە: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾ [فاطر: ٨]

«بەڕاستی خوا هەر کەسێکی بوێ گومڕای دەکات و هەر کەسێکی بوێت ڕێنموونی دەکات دەی کەواتە بە خەفەت خواردن لەبەر (ئیمان نەهێنانی) ئەوان خۆت مەفەوتێنە.»

* ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾ [المجادلة: ١٨]

«لە ڕۆژێکدا کەخوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە ئەوسا سوێندی بۆ دەخۆن هەر چۆنێک سوێندیان دەخوارد بۆ ئێوە (لەدنیادا) و وا دەزانن شتێکیان بەدەستەوەیە.»

تەنانەت دەیانەوێت فێڵ لە خوداش بکەن! بەدرۆ سوێند بۆ خودا دەخۆن: ﴿كَلَّآ إِنَّهُۥ كَانَ لِءَايَٰتِنَا عَنِيدًا﴾ [المدثر: ١٦]

«نەخێر، بەڕاستی ئەو بەرانبەر فەرمانەکانی ئێمە هەر سەرکەش و کەلەڕەق و سەرسەختە.»

* هەندێکجار دەروونی مرۆڤ ڕازییە بە کردار و بۆچوونەکانی لە کاتێکدا لەسەر ناهەقی و باتڵە، ئەوە بەپلەبردنیەتی بۆ گومڕابوون و سەرلێشێوان: ﴿رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ [التوبة: ٨٧]

«ڕازیبوون بەوەی کە لەگەڵ بەجێهێڵراوان (ئافرەت و منداڵ و پەککەوتان)دا بن و مۆر نراوە بەسەر دڵیاندا.»

* هیدایەت و ڕێنمای ئەوە نییە کە دەروونی مرۆڤ باوەڕی پێیەتی، بەڵکوو بەڕەزامەندی خودایە لەو بیروباوەڕە، چەندەها گومڕا وا دادەنێن لەسەر هەقن: ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ [الزخرف:٣٧]

«بێگومان ئەوانە لە ڕێگا ڕاست بەرگرییان دەکەن واش دەزانن بەبێگومان هەر ئەوانن ڕێنووین.»

* پێویست ناکات بۆ چەسپاندنی گومڕایی مرۆڤ کەسەکە خۆی بزانێت کە گومڕایە، ڕازیبوون بە بۆچوونێک نایکات بەهەق: ﴿إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ [الأعراف: ٣٠]

«بەڕاستی ئەوانە شەیتانەکانیان کرد بە دۆست و پشتیوانی خۆیان لەجیاتی خوا ووا گومان دەبەن کە ڕێنموونیکراون.»

* گەورەترین فیتنە ئەوەیە ڕێگە ون بکەیت و وا گومان ببەیت لەسەر هیدایەتی: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا — ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾ [الكهف: ١٠٤]

بڵێ ئایا هەواڵتان بدەینێ بەخەسارەتمەندترین (کەس) لەکارو کردەوەکانیاندا (ئەوانە) ئەو کەسانەن کەکردەوەو کۆششیان بەفیڕۆ چوو.— لەژیانی دنیادا واشیان واگومان دەبرد بەڕاستی ئەوان کارێکی زۆر چاک دەکەن.

* هەندێک جار گومڕاکان تاقی دەکرێنەوە بە سەرسامبوون بە بۆچوونەکانیان بەجۆرێک کاتێک دەڕواننە خاوەن هەقەکان، بەزەییان پیاندا دێنەوە و دەڵێن لەخشتەبراون و خڵەتێندراون: ﴿إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ﴾ [الأنفال: ٤٩]

«بیربکەرەوە کاتێک دووڕووەکان و ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندا بوو دەیانوت ئەوانە (موسڵمانەکان) ئایینەکەیان فریوی داوون.»

* ئەوکەسەی دان نەنێت بە گومڕایەتیەکەیدا، ئەوا تەنیا درۆ لەگەڵ خۆیدا دەکات تاکوو ئارامی بکاتەوە لە کاتێکدا ئەو بەرەو گومڕایی دەبات: ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ (٢٣) ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ.... (٢٤)﴾ [الأنعام: ٢٣_٢٤]

«پاشان بەهانەیان هیچ نەبوو بێجگە لەوەی کە وتیان سوێند بە خوای

پەروەردگارمان ئێمە بە هیچ جۆر هاوبەشدانەر نەبووین بۆ خوا، سەیرکە چۆن درۆ لەدژی خۆشیان دەکەن.»

* نەخۆشییەکانی دڵ دەگوازرێنەوە هاوشێوەی نەخۆشییە جەستەییەکان، بۆیە پێویستە خۆ بپارێزی لە دانیشتن لەگەڵ خاوەنەکانیان: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ﴾ [الأنعام: ٦٨]

«هەر کاتێک ئەوانەت دی قسەی ناشایستە دەکەن دەربارەی ئایەتەکانی ئێمە ئەوە ڕوو وەرگێڕە لێیان تا دەچنە سەر باسێکی تر.»

* خودا زۆرجار باسی نەخۆشی دڵی کردووە لە قورئاندا لە کاتێکدا نەخۆشی دڵ تەنیا یەک جۆرە لە بەرانبەر ئەو هەموو نەخۆشیانەی جەستە، چونکە نەخۆشی دڵ ئەگەر وازی لێ بهێندرێت، زیاد دەکات: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البقرة: ١٠]

«دڵیان نەخۆشی تێدایە، بۆیە خودا نەخۆشییەکەیان زیاد کردووە.»

# خراپە و ستەم و شوێنەواریان لەسەر تاك و گەلان

* بنچینە و بنەمای خراپەکاری لە زەویدا بریتییە لەوەی خەڵکی هەق ملکەچ بکەن بۆ ئەو بۆچوون و لێکدانەوەی خۆیان هەیانە تا شوێن هەواوئارەزوویانی دەخەن: ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾ [المؤمنون: ٧١]

«ئەگەر هەق و ڕاستی شوێن هەواوئارەزووی ئەوان بکەوتایە ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەی تیایاندایە دەشێوان و تێک دەچوون بەسەر یەکدا.

* هەموو خراپەکاری ناو دەوڵەت و کۆمەڵگاکان بەهۆی پێچەوانەکردنی هەق یان بەهۆی خراپ جێبەجێکردنی ئەو هەقەوەیە لەلایەن هەندێکەوە ڕوودەدات، تاکوو هاوتای بکەن لەگەڵ هەواو ئارەزوویاندا: ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾ [المؤمنون: ٧١]

* هەموو خراپە و شەڕێک کە لە دەوڵەتەکاندا ڕووی داوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەهۆی شوێنکەوتنی ئارەزووات و وازهێنان بووە لە هەق: ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾ [المؤمنون: ٧١]

* خراپەکارێکی بەهێز کاریگەری زیاترە لە چاکسازێکی لاواز، پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت «پەنا دەگرم بە خودا لە بەهێزی خراپەکاران و لاوازیی چاکەکاران.»

* خراپەکاران تەنها خۆیان بە چاکساز دەبینن، بێگومان پەند و عیبرەت بە ڕاستی شتەکانە نەک بە بانگەشەکان: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾ [البقرة: ١١]

«کاتێ پێیان بوترێ: ئاشووب مەنێنەوە لەسەر زەوی دەڵێن: «ئێمە تەنیا چاکسازی دەکەین.»

* هەست کردنت بەوەی خراپەکار نیت ئەوە ناگەیەنێت کە بەوجۆرە نەبیت، خراپە شتێکی جیایە لە بۆچوونەکانت: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ﴾ [البقرة: ١٢]

«باش بزانن کە خراپەکار ئەوانن؛ بەڵام بەخۆیان نازانن.»

* ئەگەر مرۆڤ خراپە و شەڕی تێکەڵ کرد، وا گومان دەبات خەڵکی هەموویان بەو جۆرەن، لە سەحیحدا هاتووە «هەرکەس بڵێت: خەڵکی تیاچوون ئەوە خۆی لە هەموویان زیاتر تیاچووە» واتە: ئەو خراپەی لە هەموویان زیاترە و تیاچووترە.

* خراپەکاری لەناو ئوممەت و گەلاندا لە کەسە بەهێز و گەورەکانەوە سەری هەڵداوە و پاشان لاوازەکان لاساییان کردوونەتەوە: ﴿وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا﴾ [الإسراء: ١٦]

«کاتێک بمانەوێ (دانیشتوانی) شار و وڵاتێ لەناو ببەین فەرمان دەدەین (بەگوێڕایەڵی و کردەوەی چاک) بە دەوڵەمەندە خراپەکار و زۆردارەکانی کەچی ئەوان یاخی دەبن و لە فەرمان دەردەچن جا بڕیاری (سزادان) پێویست دەبێت بۆ (دانیشتوانی) ئەو شارانە جا ئەو شارانەوێران دەکەین بە وێرانکردنێکی تەواو.»

* کاتێک لە ناو ئوممەتدا کەسێک هەبێت کە پرسیاری لێ نەکرێت و لێپرسینەوەی بەرانبەر نەکرێت، جا لەهەر لایەنێکەوە بێت، ئەوا خودایەتیکردنێکە کە جگە لە (الله) شایستەی هیچ کەس نییە، ئەمەش بناغەی گەندەڵی گشت نەتەوەکانە: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ﴾ [الأنبياء: ٢٣]

«پرسیار ناکرێت لەوەی کە خوا دەیکات، لەکاتێکدا ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت و موحاسەبە دەکرێن.»

* ئەگەر هەوڵدرا گومڕایی و خراپە بگەیەنرێتە خەڵکی گشتی، ئەوا با ئەو کەسانە بڕواننە سەرئەنجامیان کە چ سەرنجامێک چاوەڕوانیانە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُواْ فِيهَا وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ [الأنعام: ١٢٣]

«بەو شێوەیە لە هەموو شارێکدا گەورەترینی تاوانبارانیمان کرد (بە دەسەڵاتدار) بۆ ئەوەی پیلان و فێڵ بکەن لەو شارانەدا و فێڵ و پیلان ناکەن (لە کەس) بێجگە لە خۆیان، بەڵام هەست ناکەن.»

* لە پشت هەموو خراپەکارییەکەوە چەند کەسانێکی کەم هەن ڕێگا دروست دەکەن بۆ خەڵکی تا پیایدا بڕۆن بەرەو خراپە، گەلی سالح هەموویان تیاچوون بەهۆی نۆ کەسیانەوە: ﴿وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ [النمل: ٤٨]

«لەو شارەدا نۆ هەبوون کە گوناه و تاوانیان ئەنجام دەدا و تۆوی خراپەیان لە وڵاتدا دەچاند و بە لای چاکە و چاکەکاریدا نەدەچوون.»

* خراپەکاری ناو دەوڵەتەکان چەند کەسێکی کەمی لەپشتەوەیە بڵاوی دەکەنەوە ﴿وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ [النمل: ٤٨]

«هەموو گەلێک ئەو کۆمەڵە خراپەکارانەیان هەیە، هەر کەس بیانناسێت، ئەوا چارەسەرەکەی زانیوە.»

* چەرخ و تایەی خراپە کۆمەڵانێک پاڵی دەنێن و کۆمەڵانێک دەیوەستێنن، خۆ ئەگەر ڕۆیشتنی بەردەوام بێت، ئەوا تەنها بە سزای گشتی کۆتایی پێ دێت: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ﴾ [البقرة: ٢٥١]

«ئەگەر خوا خەڵکی لەناو نەبردایە هەندێکیان بە هەندێکیان، هەموو سەر زەوی پڕ دەبوو لە خراپە و تاوان.»

* خراپەکاری کەسانێکی کەم پێی هەڵدەستن، سزاش دادەبەزێتە سەر ئوممەتێکی بێدەنگبوو لە ئاستیاندا: ﴿وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرًا﴾ [الإسراء: ١٦]

«کاتێک بمانەوێ (دانیشتوانی) شار و وڵاتێ لەناو ببەین فەرمان دەدەین (بەگوێڕایەڵی و کردەوەی چاک) بە دەوڵەمەندە خراپەکار و زۆردارەکانی کەچی ئەوان یاخی دەبن و لە فەرمان دەردەچن جا بڕیاری (سزادان) پێویست دەبێت بۆ (دانیشتوانی) ئەو شارانە جا ئەو شارانەوێران دەکەین بە وێرانکردنێکی تەواو.»

* دەوڵەتەکان خراپ دەبن و تیادەچن بە خراپبوونی دادگاکانیان، تاکەکانیش بە خراپیی ئاکار و ڕەوشتیان تیادەچن. ئیبن خەلدوون دەڵێت: "خراپیی دادگا سەردەکێشێت بۆ کۆتا هاتنی دەوڵەت."

* ستەم و تاوان هۆکاری بێبەشبوونن لە نیعمەتەکان، هەروەها هۆکاری دابەزینی بەڵا و سزان بۆ ئوممەت: ﴿فَبِظُلۡمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتۡ لَهُمۡ﴾ [النساء: ١٦٠]

«بەهۆی ستەمکردنە لەلایەن جوولەکەکانەوە حەراممان کرد لێیان، چەند خۆراکێکی پاک و خاوێن کە حەڵاڵ کرابوو بۆیان.»

* ستەم لە دەروونی هەموو مرۆڤێکدا هەیە، بەڵام کەم دەمێنێتەوە، تا ئەوکاتەی خۆبەگەورەزانی تێ دەچێت، چەندە خۆبەگەورەزانی تێدا بێت ستەمی زیاد دەکات.

* ستەم لە کاتی دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانیدا زیاتر بڵاو دەبێتەوە وەک لە کاتی هەژاری، لە هەژاریدا مرۆڤ بەزەییان بەرانبەر یەکتری هەیە، بەڵام لە دەوڵەمەندیدا پێش بڕکێیان هەیە: ﴿وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ﴾ [الشورى: ٢٧]

«خۆ ئەگەر خوا ڕزق و ڕۆزی فراوان بکردایە بۆ بەندەکانی لە زەویدا، ستەمیان دەکرد بەڵام (خوا) ڕزق و ڕۆزی بەو ئەندازەیە دەهێنێتە خوارەوە کە خۆی بیەوێت.»

*هیچ ستەمکارێک نازانێت ئەندازەی ستەم چەندە، تەنها دادگەرەکان دەتوانن ستەم لە دادگەری جیا بکنەوە، کەسی ستەمکار ستمکارەکانی هاوشێوەی بە دادگەر و عادل دەبینێت، چونکە پێوەری ئەو جیاوازە.

* هیچ ستەمکارێک نازانێت ئەندازەی ستەم چەندە، ستەم تاڵییێتییەکی هەیە ئەوانە هەستی پێ ناکەن کە دەمیان تاڵە.

* یەکەم شت کە خودا لە ستەمکاری وەردەگرێتەوە شکۆ و هەیبەتیەتی پاشان دەوڵەت و دەسەڵاتی.

* ئەو هۆکارانەی ستەمکاران دەیگرنە بەر بۆ خستنی دیینی خودا، ئەو هۆکارانە خودی هۆکاری خستن و لەناوبردنی خۆیانە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُواْ فِيهَا وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ [الأنعام: ١٢٣]

«بەو شێوەیە لە هەموو شارێکدا گەورەترینی تاوانبارانیمان کرد (بە دەسەڵاتدار) بۆ ئەوەی پیلان و فێڵ بکەن لەو شارانەدا و فێڵ و پیلان ناکەن (لە کەس) بێجگە لە خۆیان، بەڵام هەست ناکەن.»

* هەندێک جار ڕوو دەدات کەسێکی چاک لە ژێر سێبەر و فەرمانی ستەمکارێکی خراپدا بێت، ئاسیای کچی موزاحیم یەکێکە لەو چوار ئافرەتە تەواوەکان لەژێر دەستی فیرعەون بووە کە یەکێکە لە چوار کەسە دیارەکانی ناو دۆزەخ.

* ئەگەر ستەمکاران نەیان توانی بە بەڵگە ڕووبەڕووی هەق ببنەوە، ئەوا خەڵکی و ڕەشایی لەدەور خۆیان کۆ دەکەنەوە: ﴿فَأَجْمِعُواْ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُواْ صَفًّا وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ﴾ [طه: ٦٤]

«جا کەواتە هەموو جادوو و پیلانێکتان کۆبکەنەوە پاشان بە یەک ڕیز بێنە (گۆڕەپانەوە) بەڕاستی هەر کەسێک ئەمڕۆ سەرکەوێت، ڕزگاری دەبێت و سەرفرازە.»

* ستەمکار هەقی لا بچووکە و بە کەم لەبەرچاوی دەگرێت تا دەبێتە هۆی لەناوبردنی ﴿فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ۝ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ۝﴾ [الشعراء: ٥٣-٥٤]

«ئەوسا فیرعەون پیاوانی کۆکەرەوەی نارد بە شارەکاندا بۆ کۆکردنەوەی لەشکر و هێز. فیرعەون وتی بەڕاستی ئەوانە (مووسا و شوێنکەوتووانی) کۆمەڵێکی کەمی بێنرخن.»

ئیبن عەباس دەڵێت: "مووسا شەسەد هەزار کەسی لەگەڵدا بوو."

* ستەمکار حەزدەکات بە ستەم لێکراو بوترێت «ئارام بگرە»، بەڵام پێی خۆش نییە بەخۆی بگوترێت (لە خوا بترسە).

* ستەمکاری خۆبەگەورەزان متمانەی تەواوی بە دەربازبوونی هەیە لە سزای خودا تەنانەت تا کۆتا ساتەکانی ڕادەکات لە خودا، نەک ڕابکات بۆ لای: ﴿فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ﴾ [الأنبياء: ١٢]

«کاتێک کە هەستیان بە سزای ئێمە کرد ئەو کاتە ڕایان دەکرد لە سزای خوای گەورە.»

* مرۆڤ دیکتاتۆرە و دان نانێت بە ستەمەکانیدا، هەموو ئەو بەڵگانەش ڕەت دەکاتەوە کە هەڵەکانی دەردەخات، تا ئەو کاتەی خودا گەواهی بە ئەندامەکانی جەستەی دەدات ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ [النور: ٢٤]

«ڕۆژێ دەبێ کە زمان و دەست و پایان، لەسەر هەر کارێ دەیانکرد دەبنە شایەت.»

* دوژمنایەتی مەکە کاتێک دەزانیت کە ستەمکاریت، خۆ ئەگەر لە دونیادا سەرکەویت، لە دوارۆژدا ئاشکرا دەبیت.

* ئەگەر مرۆڤ هەموو شێکی لەدەستدا، ئەوا ستەمکارە لە هەموو شتەکاندا: ﴿فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوٓا۟﴾ [النمل: ٥٢]

«ئینجا ئەوە (جێ) خانووەکانیانە چۆڵ و خاڵییە لەبەر ئەوەی ستەمیان کرد.»

لە ئەسەرێکدا گێدراوەتەوە "ماڵی ستەمکار هەر تێدادەچێت هەرچەند لە پاش ماوەیەکیش بێت."

* دەربازبوون لە سزای خودا نییە، فیرعەون منداڵەکانی لە میسر دەکوشت لە ترسی لەدایکبوونی مووسا، خودا وای لێ کرد لە ماڵەکەیدا بەخێو بکرێت لەسەر خەرجی و شانی ئەو، کەس ناتوانێت لە خودا هەڵبێت.

* مرۆڤ سەرکەش دەبێت و ستەم دەکات لەبەر دوو هۆکار:

ـ ئەگەر سەرسام بێت و بخڵەتێت بە هێزی خۆی و ئەوانی دیکەی لا لاواز بێت: ﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ﴾ [البلد: ٥]

«ئایا وا دەزانێت کە کەس دەسەڵاتی بەسەریدا نییە؟»

ـ ئەگەر دڵنیا و ئەمین بێت لە چاودێری و سزا: ﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ﴾ [البلد: ٧]

«ئایا وا دەزانێت کە کەس نەیدیوە؟»

* نەبوونی ترس و ئاوات مرۆڤ بە لاڕێدا دەبەن و نیعمەتەکانی لەبیر دەبەنەوە، بۆیە خودا ئەمنی مرۆڤ بە ترس لادەبات و ئاواتەکانی بە نەخۆشی لادەبات تا بگەڕێتەوە و بەردەوام نەبێت لەسەر لادان و ستەم.

* کەسانێک کاتێک دەڕوانن بۆ هێز و دەسەڵاتی خۆیان کەسانی خوار خۆیان بەلاواز دەبینن، سەیری هێزی سەرو خۆیان ناکەن تا خۆیان بە لاوازی ببینن، بۆیە ستەم دەکەن و لاڕێ دەبن: ﴿مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ [الحج: ٧٤]

«ئەوانە بەو شێوە پێویستە خوا بناسن نەیانناسیوە بگومان خوا بەتوانای بەدەسەڵاتە.

* پەیامبەری خودا (ﷺ) چووە ناو باخێک، کاتێک وشترێکی دی هاتە لای و دەگریا، پەیامبەر (ﷺ) بە خاوەنەکەی فەرموو «ئەوە حاڵی خۆی باس دەکات کە برسی دەکەیت و ماندووی دەکەیت.» بڕوانە پەیامبەر ئاژەڵێکی ستەملێکراوی سەرخست، چ جای سەرخستنی ئەو مرۆڤانەی ستەمیان لێ دەکرێت.

* سەرکەوتن و دەسەڵات وابەستە بە سەرخستنی لاوازەکانەوە نەک پشتگیری کردنی بەهێزەکان، لە فەرموودەیەکدا پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «جا ئایا ئێوە کە سەردەخرێن و ڕۆزی دەدرێن تەنها بەهۆی لاوازەکانتانەوە نییە؟»

* سەرخستن تاقی کردنەوەیەکی گەورەیە، لەپاش ئەو یان مانەوەی دەوڵەتان دەبێت یان گۆڕینیان: ﴿إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔا﴾ [التوبة: ٣٩]

«ئەگەر نەڕۆن و دەرنەچن (بۆ جیهاد) (خوا) سزاتان دەدا ب سزایەکی سەخت و ئازاردەر و لەجیاتی ئێوە گەل و کۆمەڵێکی تر دەهێنێ (جیاواز لە ئێوە) و ئێوە هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنن و خوا بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.»

* سەرقاڵبوون بە باسکردنی هەڵەی ستەملێکراوانەوە لەبری باسکردنی ستەملێکراوییان هەروەها بێدەنگبوون بەرانبەر ستەمکار بەو جۆرەی بۆ ئەو

گونجاوە، ئەوە کارێکە بە هەواوئارەزوو هەژمار دەکرێت، جا کاتێک ستەم ڕوویدا کات کاتی سەرخستنە نەک کاتی ڕاستکردنەوە.

* سەرخستنی کەسی بێتاوان ئاسانە، بەڵام سەرخستنی ستەمکار لەو کاتەی سنووری دەبەزێندرێت سەختە، پەیامبەر بەو کەسەی فەرموو کە نەفرینی لە ئارەق خۆرێک کرد «نەفرینی لێ مەکەن، سوێند بە خوا هێندەی بیناسم خودا و پەیامبەرەکەی خۆش دەوێت.» پەیامبەر (ﷺ) لەوێدا بەرگری لە ئارەقخۆرەکە کرد کە ستەمی لێ کرا.

* دەوڵەتەکان هەرەس دەهێنن و قاچەکان دەلەرزن کاتێک خودا بانگیان بکات بۆ سەرخستنی هەق و ئەوان هەق ژێربخەن، ئەو کات خوداش بە هەمان شێوە سەرشۆڕیان دەکات، پاداشتەکان لە جۆری کارەکانن: ﴿إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ﴾ [محمد: ٧]

«ئەگەر ئێوە یارمەتی (ئایینی) خوا بدەن خواش ئێوە زاڵ و سەرکەوتوو دەکات (بەسەر کافراندا) پێیەکانتان جێگیر دەکات (لە جەنگدا خۆڕاگرتان) دەکات.»

* ستەمی مرۆڤ بگاتە هەر ئاستێک، پێویستە دادوەر گوێی لێ بگرێت، خودا بڕیاری بەسەر شەیتاندا سەپاند بە وتەی: ﴿فَٱهۡبِطۡ﴾ [الأعراف: ١٣]

«لە بەهەشت بڕۆرە خوارەوە.»

لەگەڵ ئەوەشدا گوێی لە داواکارییەکەی گرت: ﴿قَالَ أَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾ [الأعراف: ١٤]

«وتی مۆڵەتم بدە (مەم مرێنە) تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە. خودا وەڵامی داواکەی دایەوە.»

* گوێ گرتن بۆ داواکاریەکانی ئافرەتان و گلەییەکانیان لە هاوسەرانیان، هەقە، وەڵام دانەوەی پێویستیەکانیان واجبە، لە فەرموودەدا هاتووە: «زۆرێک کە ئافرەتان دێنە ماڵەکانی موحەممەد و گلەییان لە هاوسەرانیان باس دەکەن، ئەو پیاوانەی بەو جۆرەن باشەکانتان نیین.»

* پەیامی هیچ زانایەک تەواو ناگاتە جێ ئەگەر دونیای خەڵکی نەپارێزن لە ستەم وەک چۆن دینیان دەپارێزن لە گۆڕان.

* ئەو کەسەی نەی توانی ڕێگری ستەم بکات، هاوڕێیەتی مەکە، چونکە هاوڕێیەتی ئەو کەسە دەبێتە ڕەواپێدانی بێدەنگی بۆ ئەو ستەمەی.

* ئەو کەسەی بەتوانایە لە سەرخستنی ستەملێکراو پاشان بێدەنگە و سەریان ناخات، ئەوا ئەو کەسە لە حوکمی پاڵپشتیکەری ستەمکاراندایە، ڕیوایەت کراوە «سوێن بە شکۆ و ڕێزم، تۆڵە لە ستەمکاران دەکەمەوە، لەوانەش کە ستەملێکراوێک دەبینێت دەتوانن سەری بخات و نایکەن.»

* کەسی بێدەنگ هاوبەشە لە ستەمدا، بەڵام دەربڕینی هەق دەیپارێزێت لە سزا: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ أَنْجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ [الأعراف: ١٦٥]

«ئەنجا کاتێک ئەوەی پێی ئامۆژگاری کرابوون لەبیریان چوو ئەوانەی بەرگرییان دەکرد لەخراپە و تاوان ڕزگارمان کردن، ئەوانەش کە ستەمیان کرد، سزامان دان بە سزایەکی زۆر خراپ بەهۆی دەرچوونیان لە فەرمانی خوا.»

بێدەنگبوون لە ستەم دەبێتە هۆی هاوبەشبوون لەو تاوانەدا، هەروەها هاوبەشبوون لە سزادا، لە فەرموودەدا هاتووە: «ئەگەر خەڵکی ستەمکارێکیان دیت و ڕێیان لێ نەگرت، ئەوا نزیکە خودا سزایەک بنێرێت هەموویان بگرێتەوە.»

* خودا بەتوانایە لەوەی سەرکەوتنی خۆی پێش بخات، بەڵام دەیەوێت ستەملێکراو دەست پێشخەری بکات و هۆکارەکانی سەرکەوتن بگرێتە بەر پاشان خوداش یارمەتی بدات: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ [الحج: ٣٩]

«مۆڵەت دراوە بەو ئیماندارانەی شەڕیان پێ دەگێرن، کە بجەنگن و

بەرهەڵستی بکەن چونکە بەڕاستی ستەملێکراون، بێگومان خوا دەسەڵاتی هەیە کە سەریان بخات و سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت.»

* بەخشینی ماڵ و سامان هۆکاری یارمەتییە بۆ ستەملێکراو بۆ سەرکەوتن بەسەر ستەمکاردا، هەروەها ڕێگری لە خراپەیان دەکات و شوێنەواری ستەمیان کەم دەکاتەوە ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ [البقرة: ٢٧٠]

«ئەوای بەختتان کردبێت لە چاچەدا نەزرێکتان بڕیار دابێ ئەوە بێگومان خوا ئاگای لێی هەیە و ستەمکاران نییە هیچ یارمەتی دەرێک.»

* ستەمی ستەمکار بە بەخشین لادەچێت، لە نەخعییەوە بە دروستی هاتووە دەڵێت: "هاوەڵان وایان دیوە کەسی ستەملێکراو ئەگەر ببەخشێت ئەوا ستەمەکەی لەسەر لادەچێت. ئەم هۆکارە زۆرێک لە خەڵکی لێی بێئاگان لەکاتێکدا قورئان ئاماژەی پێ کردووە.

* ستەملێکراو ئەگەر کەسی نەبوو سەری بخات و دەسەڵاتێک نەبوو دادوەرانە بڕیار بدات، ئەوا بۆی هەیە بە دەنگی بەرز و ئاشکرا داوای مافەکەی بکات بەبێ سنوور بەزاندن: ﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ [النساء: ١٤٨]

«خوا پێی خۆش نییە ئاشکراکردنی قسەی نابەجێ و خراپ مەگەر کەسێک ستەمی لێ کرابێ.»

* پەروەردگار ستەمی گەورە بە بەڵا و موسیبەتی گەورە لادەبات، تاوەکوو دەوڵەتێکی دادپەروەر دابمەزرێت لەسەر دەستی کەسانێکی ماندوو و ئازار دیدە، نەوەک کەسانی خۆشگوزەران، چونکە ئەوان دەست دەکەن بەگەڕێکی نوێ لە زوڵم وستەم.

* هیچ ئوممەتێک سەرناکەوێت پاش ستەملێکران تەنها بە تاقیکردنەوەی زۆر قورس نەبێت، نەوەکانی ئیسرائیل سەرنەکەوتن بەسەر فیرعەوندا تا ڕۆڵەکانیان نەکوژرا و ئەوانەی باوەڕیان بە مووسا هێنا هەندێکیان کوژران و هەندێکیان لە خاچ دران لە کاتێکدا مووسا لەناویاندا بوو.

* بە ئەندازەی ڕەگ داکوتانی ستەم، لابردن و هەڵکێشانی قورس دەبێت.

* بە ئەندازەی جێگیربوون و پتەویی زوڵم لە ڕەگەوە دەرهێنانی قورس دەبێت، پەروەردگار ئازاری هەڵکەندنی زوڵم دەدا بەسەر ئوممەتدا، چونکە سەرەتا ستەمیان چاند و جێگیریان کرد، چاکخوازانیش نکۆڵی لە چاندنی ستەم دەکەن، نەبادا جێگیر بێ و پتەو بێ و خەڵکی گیرۆدەی سەختی و ئازاری هەڵکەندنی بێن.

* ستەم و خراپە پێش ڕەگداکوتانی بەتەنها دەستێک لادەبرێت و ڕەگکێش دەکرێت، بەڵام ئەگەر ڕەگی داکوتی و چەسپا بە دەستی هەزارەها چاکساز لانابرێت، ئەوکات بە تاقیکردنەوەیی گەورە نەبێت لاناچێت.

* ئەگەر ئوممەت بەڵا و تاقیکردنەوەیەکی گەورەی بۆ دابەزیی، ئەوا بەهۆی ستەمێکی گەورەوەیە کە ماوەیەکی زۆرە خەڵکی لەسەر بەردەوامن و بۆیە بەو جۆرە پێویستی کردووە لاببرێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ ٱلْمَصِيرُ﴾ [الحج: ٤٨]

« (خەڵکی) چەندەها شار و دێ (هەبوون) مۆڵەتم دان کە ستەمکار بوون لەپاشان تۆڵەم لێ سەندن (لەناوم بردن) و هەر بۆ لای من دەگەڕێنەوە.»

* دروستە بۆ خاوەن مافەکان ئەگەر نەتوانن مافەکانیان بە شێوەیەکی یاسایی وەربگرن فێڵ بەکار بهێنن بۆ وەرگرتنەوە بەبێ ئەوەی زیانی لێ بکەوێتەوە: ﴿كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلْمَلِكِ﴾ [یوسف: ٧٦]

«بەو جۆرە پلانمان نیشانی یوسف دا ئەو نەیدەتوانی براکەی بگرێ بەپێی ئایینی و یاسایی پادشا.»

* هێز لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ستەمدا حاڵی لاوازان ناگۆڕێت، یوسف کاتێک لەبیرکراو بوو لە بەندینخانەدا فەرمووی: ﴿ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ﴾ [یوسف: ٤٢]

«باسم بکە لای گەورە و پادشاکەت.»

کاتێک پێویستیان بوو فەرمووی: ﴿ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ [یوسف: ٥٠]

«بگەڕێوە بۆ لای گەورەکەت.»

* نزای ستەملێکراو هەرگیز ڕەت ناکرێتەوە هەرچەندە بێباوەڕیش بێت، بەڵکوو خودا لە ئاسمان ڕای دەگرێت و چاودێری ستەمکار دەکات تا بگەڕێتەوە و خۆی چاک بکات، خۆ ئەگەر خودا ڕاستەوخۆ وەڵامی نزای هەموو ستەملێکراوانی بدابایەوە، ئەوا خەڵکی هەموو تیا دەچوون.

* وەڵامدانەوەی نزای ستەملێکراو بابەتێکی بڕێندراوەیە نەک شتێکی کاتی، خودا دەفەرموویت «سوێند بە شکۆ و ڕێزم سەرت دەخەم ئەگەر پاش ماوەیەکیش بێت» ئەو ماوەیە خودا دیاری دەکات، بەدەست ستەمکار و ستەملێکراو نییە.

* «سوێند بە شکۆ و ڕێزم سەرت دەخەم ئەگەر پاش ماوەیەکیش بێت.» سوێندێکە خودا فەرموویەتی لە نزای ستەملێکراودا، ئەمە بۆ خودی ستەملێکراو نییە، بەڵکوو بۆ پاڕانەوەکەیە. ئەم پەیامە لەخۆ دەگرێت ئەی ستەمکار ئەو ستەملێکراوە بەسووک و کەم مەزانە و پاڕانەوەکانی لەیاد مەکە.

* لەنێوان پاڕانەوەی ستەملێکراو و وەڵامدانەوەیدا ماوەی وازلێهێنان هەیە جا ئەو ماوەیە کورت بێت یان درێژ، بەهۆی چەند هۆکارێکەوە لەوانە بەزەییهاتنەوە بە ستەمکار و وازلێهێنانی تا بگەڕێتەوە، لەوانەیە ئەو ستەمکارە چەند کردەوەیەکی چاکەی هەبێت بەهۆیەوە سزادانی دوا بکەوێت.

* ستەمی ستەمکار درێژە دەخایەنێت ئەگەر ستەملێکراوان لەنێوان خۆیاندا جیاواز بوون، هەروەها خراپەی خراپەکاران بەردەوام دەبێت ئەگەر چاکسازان لەنێوان خۆیاندا سەرقاڵ بوون بە یەکەوە.

* هەندێک جار ستەمکار سەردەکەوێت، بەڵام سەرکەوتنەکەی بەردەوام نابێت، سەرئەنجام بۆ هەقە، خودا دەفەرموویێت: ﴿ٱسْتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓاْ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ [الأعراف: ١٢٨]

«داوای یارمەتی لە خواا بکەن و خۆ ڕاگر بن، بێگومان هەموو زەوی موڵکی خوایە دەیدا بە هەر کەس لە بەندە (شیاوە)کانی کە خۆی بیەوێت و سەرەنجامی چاک بۆ خواناسانە.

* لە ئەسەردا هاتووە "ئەگەر شاخێک زیادەڕەوی و سنووربەزێنی بکاتە سەر شاخێکی دیکە، ئەوا خودا سنووربەزێنەکەیان ورد و خاپوور دەکات، خودا ستەمکار لەناو دەبات ئەگەر شاخێکیش بێت، چجای ستەمی مرۆڤ و دەوڵەتان؟!

* خودا ستەمکار سەرناخات، ئەگەر ڕۆژگارێک وازی لێ بهێنێت دڵنیابە هەر سزا بەرۆکی دەگرێت: ﴿قُلْ يَـٰقَوْمِ ٱعْمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَـٰقِبَةُ ٱلدَّارِ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ [الأنعام: ١٣٥]

«ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ ئەی گەلەکەم لەسەر ڕێبازی خۆتان ئەوەی لەدەستتان دێ بیکەن، بێگومان منیش کاروکردەوەی خۆم دەکەم جا لەمەوپاش دەزانن سەرەنجامی ئەو دنیا بۆ کێ دەبێ؟ بێگومان (بێباوەڕان و) ستەمکاران ڕزگاریان نابێ.»

* ئەگەر خودا گەلێکی ستەمکاری لەناوبرد، ئەوا زۆرجار گەلی ستەملێکراو دەهێنێتە شوێنی: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ﴾ [القصص: ٥]

«ئێمە دەمانەوێ (بە چاکەی خۆمان) منەت بنێین بەسەر ئەوانەی کە لاواز و ژێر دەست کرابوون لە وڵاتی (میصر)دا و بیانکەینە پێشەوا و بیانکەینە میراتبەرانی کەلەپووری فیرعەون و شوێنکەوتووانی.»

* ئەوانەی خودا لە پاش لەناوبردنی ستەمکارێک دەیانهێنێتە پێش، تاقیکردنەوە دەیانگرێتەوە: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾ [الأعراف: ١٢٩]

«بەڵکوو پەروەردگارتان دوژمنەکانتان لەناوبەرێت و ئێوە بکات بە جێنشین (ی دوژمنەکانتان) لەسەر زەوی جا تەماشا دەکات ئێوە چۆن کار دەکەن؟»

* ستەملێکراو کاتێک سەردەخرێت، مەستی دەسەڵات و هێز دەچێتە ناخیەوە و هەندێک جار وای لێ دەکات ستەم بکاتەوە لە ستەمکار، بۆیە پێویستە ئەو مەستییە بشکێنێت، پەیامبەری خودا مەککەی ئازاد کرد وەک خۆبەکەمگرتن و خاکیبوونێک سەری نەوی کردبووەوە تا بەجۆرێک ڕیشی بەر وشترەکەی دەکەوت و نوێژی کرد.

* سەرکەوتنی ستەملێکراو بەسەر ستەمکاردا مەستییەکی ئەقڵی و نەفسی دروست دەکات کە دەبێتە ڕێگر لە دادگەربوون، پاڵدانی ئەو سەرکەوتنە بۆ خودا و دورخستنەوەی لە خودی کەسەکان دەبێتە هۆی چاندنی دادگەری لە دڵدا وەک دادگەری پەیامبەر کە لە ئازادکردنی مەککەدا ئەنجامی دا.

* مرۆڤ ئەگەر خودی خۆی سەرخست، هەندێک جار ستەملێکراو دەبێتە ستەمکار، لە ئەسەرێکدا هاتووە "بەردەوام ستەملێکراو جوێن دەداتە ستەمکار و کەمی دەکاتەوە، تا هەموو مافەکانی تەواو دەبێت لەسەری، تا وای لێ دێت ستەمکار لەو باشتر دەبێت."

* تووڕەیی مرۆڤ لە ستەمی ستەمکارێک نابێت بیگەیەنێتە ئاستێک کە خودا لە خۆی تووڕە بکات، تۆڵەسەندنەوە سەرمەستییەک دروست دەکات کە سنوورەکان فەرامۆش دەکرێت لە کاتی سەرکەوتندا.

* هەرکەس دوژمنێکی خودا سەربخات، خودا هەر بەو دوژمنە لەناوی دەبات، لە ئەسەرێکدا هاتووە "هەرکەس یارمەتی ستەمکارێک بدات، خودا زاڵی دەکات بەسەر ئەویشدا."

* پشتگیریی ستەمکار مەکە لەسەر هیچ کەسێک، چونکە خودا بەو سزات دەدات هەرچەندە لە پاش ماوەیەکیش بێت، لە ئەسەرێکدا هاتووە: "هەرکەس یارمەتی ستەمکارێک بدات، خودا زاڵی دەکات بەسەر ئەویشدا."

* ئەو کەسەی ستەمکارێک سەردەخات، ئەوا خۆی ستەمکارە: ﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ﴾ [الجاثية: ١٩]

«بەڕاستی ستەمکاران هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن.»

﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ [الأنعام: ١٢٩]

«بەو شێوەیەی هەندێک لە ستەمکاران دەکەین بە دۆست و پشتیوانی هێندێکی تریان بەهۆی ئەو کردەوانەی ئەنجامیان دەدا.»

* خودا هەڕەشەی کردووە کە کەسانێک ڕسوا و تێکشکاو دەکات، چونکە دوژمنێکی خودا سەردەخەن، ئەو هەڕەشەیە هەر دێتە جێ هەرچەندە پاش ماوەیەکیش بێت: ﴿وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ [هود: ١١٣]

«نەکەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانەدا بێت کە ستەمیان کردووە و لە خوا یاخی بوون، چونکە ئەو کاتە ئاگر دەتانسووتێنێت، کەسیش جگە لە خوا پشتیوانتان نابێت، لەوەو دوایش یارمەتی نادرێن.»

* بە ئەندازەی مەیل بە لای ستەمکاراندا ئەوەندە سەرخستن و پشتیوانی خودایی لێیان دوور دەکەوێتەوە: ﴿وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ [هود: ١١٣]

«نەکەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانەدا بێت کە ستەمیان کردووە و لەخوا یاخی بوون، چونکە ئەو کاتە ئاگر دەتانسووتێنێت، کەسیش جگە لە خوا پشتیوانتان نابێت، لەوەو دوایش یارمەتی نادرێن.»

* یەکێک لە هۆکارەکانی تیاچوون بریتییە لە سەرخستنی ستەمکار بەسەر ستەملێکراودا، لە فەرموودەدا هاتووە: «هەرکەس قەومەکەی خۆی بە ناهەق سەربخات، ئەوە وەک ئەو وشترە وایە کەوتبێتە بیرێکەوە و بەدەم مرداربوونەوەوە کلکی بسووڕێنێت.»

* پشتگیری دەمارگیرانە بۆ ستەمکار و لاڕێیان هەندێک جار کەسە چاکەکانیش تێی دەکەون و هەستی پێ ناکەن، لەگەڵ ئەوەی پەیامبەر پارێزراوە لە هەڵە، بەڵام خودا هۆشداری پێدا لەو بارەیەوە: ﴿وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا﴾ [النساء: ١٠٥]

«بۆ ناپاکان مەبە بە پارێزەر و داواچی.»

واتە: پشتگیرییان لێ بکەیت.

* خودا سزای ئوممەتێک نادات بەهۆی ئەوەی سەرکردەیەکی ستەمکار بەڕێیانەوە دەبات، تا خەڵکی پشتگیری نەکەن لەسەر ستەمەکانی، ئەگەر پشتگیرییان کرد هەرچەندە بە دووڕوویش بێت، ئەوا هەموویان شایستەی سزا دەبن.

*گەورەترین هۆکاری جێگیربوونی نیعمەتەکان پشتگیری نەکردنی خراپەکارانە، مووسا بە پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿رَبِّ بِمَآ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ فَلَنۡ أَكُونَ ظَهِيرٗا لِّلۡمُجۡرِمِينَ﴾ *[القصص: ١٧]*

«ئەی پەروەرندەی من! لە بەرانبەر ئەو چاکەی دەگەڵ منت کرد، بڕیار دەدەم هەرگیز نەبمە پشتیوانی تاوانباران.»

گەورەترین هۆکاری لاچوونی نیعمەتەکانیش داواکردنی مانەوەیەتی لە جگە لە بەخشەرەکەی.

* یەکێک لە هۆکارەکانی فیتنە شەرمەزار کردن و سەرنەخستنی ستەملێکراوانە لە کاتی پێویستیاندا، خودا فەرمانی بە سەرخستن و پشتگیری کردنی ستەملێکراو کردووە و فەرموویەتی: ﴿إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ﴾ [الأنفال: ٧٣]

«ئەگەر ئێوە (پشتیوانی) نەکەن لە زەویدا ئاژاوە و فەساد و بەدخوویەکی گەورە بەرپا دەبێت.»

* ئەگەر ستەم زۆر بوو سەرخەرەکانیش کەم بوون، ئەوا خودا کۆمەڵێک هۆکار دەڕەخسێنێت بۆ سزادانی ستەمکاران و بێدەنگەکان بەیەکەوە، سونەتەکانی خودا نازانن، لە تاقیکردنەوەی خوداوییەوە ڕادەکەن بەرەو سزای خودا.

* سزا تایبەتەکان خەڵکی گشتیش دەگرێتەوە، چونکە بەشدارن لەگەڵیان ئەگەر بە هۆی بێدەنگیشیانەوە بووبێت: ﴿وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ [الأنفال: ٢٥]

«خۆتان بپارێزن لە ئاشووب و بەڵایەک کە تووشی ستەمکارانتان نابێت، بەتایبەتی (هەمووتان دەگرێتەوە) بشزانن کە بەڕاستی تۆڵە و سزای خوا زۆر سەختە.»

* سزای خودا بەتەنها دانابەزێتە سەر ستەمکاران و لەڕێ دەرچووان، بەڵکوو دادەبەزێتە سەر ئەوانەش کە بێدەنگبوون بەرانبەریان، لە فەرموودەدا هاتووە: «ئەگەر خەڵکی ستەمکارێکیان دی و دەستیان نەگرت بۆ وەستاندنی ستەمەکەی، ئەوا نزیکە خودا سزای گشتییان بدات.»

* سزای گشتی دانابەزێتە سەر دەوڵەتەکان تەنها لە کاتی بەربڵاوی ستەم و کەمی چاکسازاندا نەبێت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ [هود: ١١٧]

«هەرگیز پەروەردگارت لەناوی نەبردووە (دانیشتوانی) شارەکان بە ستەم لەکاتێکدا دانیشتووانی (ئەو شارانە) چاکەکاربوو بن.»

* ئەو دەوڵەتەی کار بەیاساکانی خودا ناکەن و ستەم تیایاندا پەرەی سەندووە، ئەوا سەرەتای هەرەسهێنانی لەناوخۆدا تێدا ڕوو دەدات، لە فەرموودەدا هاتووە: «ئەگەر سەرکردەکەیان بە پەرتووکەکەی خودا حوکمی نەدەکردن، ئەوا خودا ئاژاوەی ناوخۆییان تێ دەخات.»

* ستەم ئەندازەیەکی هەیە تا ئەو ئەندازەیەی خودا دیاری کردووە نەیەتە پێش، خودا سزای خۆی دانابەزێنێت، ئەندازەی ئەو ستەمە خودا دیاری دەکات نەک سۆز و عاتیفەی مرۆڤ ﴿فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ [مریم: ٨٤]

«هیچ پەلەیەکیان لێ مەکە، ئەوا ئێمە بە ژماردن لەسەر ئەوانی دەژمێرین.»

* خودا سزای گشتی دادەبەزێنێت لەسەر ئەو ستەمەی بووەتە یاسا، نەک ئەو ستەمانەی نەکراونە یاسا و هەڕەمەکیانە ئەنجام دەدرێن.

* خودا تەنها بەهۆی بوونی ستەمەوە سزا دانابەزێنێت، بەڵکوو کاتێک کە بڵاو بوویەوە و بو بە یاسا، سزا دادەبەزێنێت، سزاکان بە ئەندازەی دەستدرێژکردنی خراپەکارانە بۆ خراپە، هەروەها بە ئەندازەی ڕێگریکردنی چاکسازانە لە خراپە، سەرکەوتن بۆ ئەوەیانە کە زۆرترین کار دەکەن.

* خودا شارێک دەپارێزێت لە کاتێکدا ستەمێکی زۆری تیادایە بەهۆی بوونی چاکسازانەوە تیایدا، شارێک لە ناو دەبات کە ستەمی کەمتر تیادایە، بەڵام چاکسازی تێدا نییە: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ [هود: ١١٧]

«هەرگیز پەروەردگارت لەناوی نەبردووە (دانیشتوانی) شارەکان بە ستەم لەکاتێکدا دانیشتووانی (ئەو شارانە) چاکەکار بووبن.»

* خودا سزای دانەبەزاندووەتە سەر وڵات و شارێک کە لەوەو پێش ئاگەداری نەکردبێتنەوە و نەی ترساندبن بە بەڵگەی ئەقڵی و نەقڵی جا ئەوانیش پشتیان تێی کردووە ﴿وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ۝ ذِكْرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ۝﴾ [الشعراء: ٢٠٨-٢٠٩]

«ئێمە هەر شار و شارۆچکەیەکمان کاول کردبێت بەبێ فرستادە و بێدارخەرەوە نەبووە. تا دابچڵەکێن و بیر بکەنە، بێگومان هەرگیز ئێمە ستەمکار نەبووین و نابین.»

* ستەمکار متمانەی بە هێز و دەسەڵاتی خۆی هەیە لە دەربازبوونی لە سزای خودا، تەنانەت لە قیامەتیشدا ئەگەر بێت: ﴿فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ۝ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ۝ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۝ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ۝﴾ [القيامة: ٧— ١٠]

«کاتێک: کە چاو ئەبڵەق بووو مانگ گیرا و تاریک بوو، خۆر و مانگیش لە یەکتر کۆ کرانەوە، ئەو ڕۆژە ئینسان دەڵێت: (ئەی هاوار) بۆ کوێ ڕا بکەم، لەکوێوە خۆم ڕزگار بکەم.»

* هیچ کەس لە سزای خودا ڕاناکات تەنها بۆ لای ئەو نەبێت. (فیرعەون چەند منداڵی سەربڕی بۆ گەڕان بە شوێن مووسادا، زمانحاڵی قەدەریش دەڵێت: لە ماڵی تۆدا نەبێت گەورەی ناکەین.)

* ئەگەر سزای خودا دابەزی، ئەوا بە فێڵ لاناچێت، بەڵکوو بە لابردنی هۆکارەکانی لادەچێت، ڕاکردن نییە لە سزای خودا: ﴿قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ﴾ [هود: ٤٣]

«کوڕەکە وتی: پەنا بۆ شاخێک دەبەم کە بمپارێزێت لەم لافاوە (نووح) وتی ئەمڕۆ هیچ پارێزەرێک (پەنادەرێک) نییە لە فەرمانی خوا.»

* خودا سزای سەر ستەمکار لانابات تەنها بە خێرا لابردن و وازهێنان نەبێت لەو ستەمە، خۆ ئەگەر سزای خودا دابەزی، ئەوا خۆی و ستەمەکەشی لەناو دەبات.

* ئەگەر سزا دابەزییە سەر ستەمکارە پلەبەرزەکان ئەوا بە هێواشی دانابەزێت بەڵکوو بە خێرای دادەبەزێت، لە فەرموودەدا هاتووە (خودا مۆڵەت دەدات بە ستەمکار، بەڵام کاتێک لەناکاو گرتی، بەری نادات ) ئەگەر دییت کەسێکی پلە بەرز بەخێرای دابەزی، بزانە خاوەن ستەمێکی زۆر بووە.

* لەنێوان بڵاوبونەوەی ستەم و سزای گشتی، مۆڵەتێک هەیە بۆ چاکسازی:
﴿وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا﴾ [الكهف: ٥٩]

«ئەو هەموو وڵات و شارانەمان بەرباد و وێران کرد کاتێک (دانیشتووانیان) ستەمیان کرد و بۆ لەناوبردنیشیان کاتێکی دیاری کراومان دانا بوو.»
چاکسازان بەرگری لە سزا دەکەن و ئەوانی دیکەش هۆکاری دایدەبەزینی سزان.

* ئەگەر دییت چاکسازان خەریکی چاکسازین و ستەمکارانیش زیاتر سەرەڕۆ دەبن، بزانە ئەوا خودا دەیەوێت سزایان بدات، بەڵام کاتیان نەهاتووە، خودا دەیەوێت زیاتر بەڵگەکانی لەسەریان بچەسپێت تا زووتر سزایان بدات:
﴿فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ [مريم: ٨٤]

«هیچ پەلەیەکیان لێ مەکە، ئەوا ئێمە بە ژماردن لەسەر ئەوانی دەژمێرین.
﴿فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ [مريم: ٨٤]

«هیچ پەلەیەکیان لێ مەکە، ئەوا ئێمە بە ژماردن لەسەر ئەوانی دەژمێرین.»

* بە ئەندازەی ڕوونیی بەڵگەکان سزا دادەبەزێت، هەندێک جار خودا سزای ستەمکارێک دەدات و سزای کەسێکی زۆر لەو ستەمکارتر نادات، چونکە یەکەمیان ستەمکارێکی زانایە، بەڵام دووەم ستەمکارێکی نەزانە.

* خودا هیچ ستەمکارێک لەناونابات ئەگەر بەڵگەی لەسەر جێگیر نەکات، هەرچەندە بەڵگە لەسەر ستەمکار ڕوونتر بێت، ئەوا سزای خێراتر دەبێت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولًا﴾ [القصص: ٥٩]

«پەروەردگاری تۆ هیچ وڵات و شارێکی کاول نەکردووە، تا لە پایتەختەکەیدا پێغەمبەرێکی نەناردبێت.»

* ئەگەر ئوممەتێک ویستیان سزای خودا زوو دابەزێتە سەر ستەمکارێک، ئەوا با بەڵگەی تەواو لەسەر ستەمکارەکە بگرن و بینێن بە ڕوویەوە و بڵاویبکەنەوە تا ستەمەکەی بە زانست و کەلەڕەقییەوە بکات، چونکە سزای خودا بۆ کەلەڕەقەکان توندتر و قورسترە.

* خودا سزای ستەمکارێکی نەزان نادات هەرچەندە ستەمەکەشی گەورە بێت، بەڵام سزای ستەمکارێکی زانا دەدات بە ئەندازەی زانین و شارەزایی بە ستەمەکەی: ﴿ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَٰفِلُونَ﴾ [الأنعام: ١٣١]

«بەم شێوازە پەروەردگار هیچ شار و دێیەک لەناو نادات کە خەڵکەکەی بێئاگا بن و پێغەمبەریان بۆ نەچووبێت و زوڵم و ستەمیان لێ بکات، خوای گەورە دوورە لە زوڵم و ستەم.»

* هەندێک لە ستەمکاران خودا سزایان نادات بەهۆی لاوازی ڕووقایمی دڵیانەوە، هەروەها بەهۆی ئەوەی کەسێک لە پشتیانەوە ستەمیان بۆ بەڕەوا دادەنێت، خودا دادوەرە ستەمکارێکی نەزان بە هەمان شێوەی ستەمکاری کەلەڕەق و زانا سزا نادات، هەرچەندە ستەمی ستەمکارە نەزانەکە گەورەتریش بێت.

* سزای خودا جیاوازە بۆ ئەوانەی پشت هەڵدەکەن بە ئەندازەی پێگەی خودا لە دڵیاندا لە کاتی پشت هەڵکردنەکەیاندا، ئەگەر تەواو خودا لە دڵیاندا ئامادە بوو بەڵام هەر پشتیان هەڵکرد، ئەوا خودا سزای توندتریان دەدات چونکە کەلەڕەقییەکەیان لەگەڵ زانستدایە.

* ئەگەر خودا ستەمکارێکی زاڵ کرد بەسەر ستەمکارێکی دیکەدا، ئەوا لەنێوانیاندا ستەملێکراوێک هەیە، خودا ستەمکارترینیان لەناو دەبات و ئەوی دیکەیان واز لێ دەهێنێت بۆماوەیەکی دیاری کراو: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَوْلَآ أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَآءَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ [العنكبوت:٥٣]

«بەپەلە داوای (هێنانی) سزات لێ دەکەن ئەگەر ماوەی دیاریکراو نەبووایە (بۆ سزادانی ئەوانە) بێگومان سزاکەیان بۆ دەهات و بەڕاستی لەناکاودا ئەو سزایەیان بۆ دێ کە ئەوان هەستی پێ ناکەن.»

* ئەگەر سەرکردە و پێشڕەوێک ستەمکار بوو، ئەوا سزا بەتەنها بۆ ئەو دانابەزێت، بەڵکوو هەموو دەستەو تاقمەکەی دەگرێتەوە و هەموو ئەوانەی پەیوەندییان پێوەی هەیە:

﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ﴾ [الأنبياء: ١١]

«چەندەها شار و دێهاتمان تێک شکاند (لەناو برد) کە (خەڵکەکەی) ستەمکار بوون و پاش ئەوان گەل و تاقمی ترمان (لەجێیان) بەدی هێنا.»

گۆڕینێکی تەواوەتی.

* خودا لەپێناو ستەمە تایبەتەکاندا دەوڵەت لەناونابات و پاشایەتییان لێ وەرناگرێتەوە، بەڵکوو ستەمە تایبەتەکان موڵکی تایبەتی دەفەوتێنێت، نەک گشتی، دادوەری خودا ئەمە دەخوازێت و سونەتی گەردوونیش هەر بەو جۆرەیە.

* سزای خودا بۆ گەلە ستەمکارەکان لە قورئاندا وەها باسکراوە کە لە کاتی سەرخۆشی و بێترسیاندا بەرۆکیان دەگرێت، لە بەیانیاندا کە دەروونەکان بە ورە و گوڕ و خۆشین و گەشبینن: ﴿وَلَقَدْ صَبَّحَهُمْ بُكْرَةً عَذَابٌ مُسْتَقِرٌّ﴾ [القمر ٣٨] بۆ شکاندنی هەرچی پێشبینییە.

* خودا بە جۆرێک سزای ستەمکاران دەدات کە بە مێشکی هیچ کەسدا نەهاتبێت، سزاکانیان جیاواز دەکات و بەیەک جۆر دای نانێت، بۆئەوەی ستەمکاران خۆیان نەپارێزن و بێترس بن، تا بە دڵەڕاوکێ بمرن پێش ئەوەی مردنی ڕاستییان بەرۆکیان بگرێت.

* خودا بە جۆرێک سزای ستەمکاران دەدات بە مێشکی هیچ کەسدا نەهاتبێت، فیرعەون هەموو ڕێگەکانی تۆڵەسەندنەوەی لەخۆی داخستبوو، بەڵام خودا وای لێ کرد دوژمنەکەی بە دەستی خۆی و لە سامانی خۆی و لەناو ماڵی خۆیدا بەخێو بکات.

* هەرەسهێنانی دەوڵەتە ستەمکارەکان لەناکاو ڕوو دەدەن بە جۆرێک کەس بە مێشکیدا نەیەت، ئەگەر دیبیت خەڵکی بەدووریان دەزانی ستەمکارێک لەناو بچێت، بزانە ئەوە کاتی گونجاوی هەرەس هێنانێتی: ﴿فَأَخَذْنَاهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ [الأعراف: ٩٥]

«ناکاودا سزامان گرتنی لەکاتێکدا کە هەستیان نەدەکرد.»

* سزا کاتێک بۆ ستەمکار دادەبەزێت کە لەوپەڕ خۆشگوزەرانی و خۆشیدا دەژی، تا ئازار و پەژارە و داخی زۆربێت: ﴿أَوَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ﴾ [الأعراف: ٩٨]

«ئایا خەڵکی ئەو شارانە ترسیان نەبوو لەوەی کە سزای ئێمەیان بۆ بێت لە چێشتەنگاودا لە کاتێکدا یاری و گاڵتە دەکەن.

* ئەگەر خودا ویستی ستەمکارێک لەناوبەرێت، وای لێدەکات هۆکاری لەناوچوونی لەگەڵ خۆیدا بگێڕێت و هەستیشی پێ نەکات، خودا فیرعەونی لەناوبرد بە مووسا و وای لە فیرعەون کرد لەژێر چاودێری خۆیدا گەورەی بکات: ﴿يَأۡخُذۡهُ عَدُوٌّ لِّي وَعَدُوٌّ لَّهُۥ﴾ [طه: ٣٩]

«تا سەرەنجام دوژمنەکەی من و دوژمنەکەی ئەو هەڵیبگرێتەوە.»

* ئەگەر خودا ویستی لەناوبردنی ئوممەتێکی هەبێت و بیەوێت دەوڵەتێکی ستەمکار هەرەس پێ بهێنێت، ئەوا هۆکاری لەناوبردنەکەی لا خۆشەویست دەکات، بەجۆرێک لەخۆی دەگرن و دەیکنە ڕۆشنای چاوەکانیان: ﴿وَقَالَتِ ٱمۡرَأَتُ فِرۡعَوۡنَ قُرَّتُ عَيۡنٖ لِّي وَلَكَ لَا تَقۡتُلُوهُ﴾ [القصص: ٩]

«ویستیان مووسا بکوژن ئاسیەی ژنی فیرعهون وتی مایەی چاو و دڵ ڕۆشنییە بۆ من و بۆ تۆش (فیرعەون)، مەیکوژن.»

* مۆڵەت وەرناگیرێت لە سزادانی ستەمکاراندا: ﴿قَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنۡيَٰنَهُم مِّنَ ٱلۡقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّقۡفُ مِن فَوۡقِهِمۡ وَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ [النحل: ٢٦]

«بەڕاستی ئەوانەش کە لەپێش ئەمانەوە بوون، پیلانیان کرد جا خوا کۆشک و خانوەکانیانی لە بن و بناغەکانی یەهوود دەرهێنا ئەوسا سەربانەکانیان لەسەریانەوە ڕووخا بەسەریاندا لەلایەکەوە سزایان بۆ هات کە هەستیان پێ نەدەکرد.»

* سزادانی خودا کاتێک دابەزی، مۆڵەت وەرناگیرێ لە ئوممەتان، هەرکە کاتی هات، خودا هۆکارێکی بۆ دەڕەخسێنێت بە مێشکی کەسدا نەهاتبێت: ﴿فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْ﴾ [الحشر:٢]

«سزای خوایان بۆهات لە شوێنێکەوە کە گومانیان بۆی نەدەچچوو.»

* ئەگەر خودا ویستی ئوممەت تووشی سزا و بەڵا بکات، ئەوە لایان دەدات لە هۆکارەکانی خۆ پاراستن لێی: ﴿وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ﴾ [الرعد: ١١]

«کاتێک خوا بیەوێت هۆزێک تووشی بەڵا بن، هیچ بەرگرێکی بۆی نییە و جگە لەو (خوا) هیچ یارمەتیدەر و پشتیوانێکیان نییە.»

* سزای خودا بۆ دوژمنانی جێگیرە و ناگۆڕێت، بەس تەنها کات و شێوازەکەیان جیاوازە: ﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا﴾ [الأحزاب: ٦٢]

«ئەمە سوننەتی خوای گەورە بووە لا ئوممەتانی پێشتریشدا بەم شێوەیەیان لێ کراوە و هەرگیز نابینیت سوننەتی خوای گەورە گۆڕانی بەسەردا بێت و بەردەوامە.»

* سزای خودا بۆ ستەمکار هەندێک جار لەلای خۆیەوە دەبێت، بێ ئەوەی کەس دەستی تێیدا هەبێت و هەندێک جاریش بە دەستی ستەملێکراو دەبێت: ﴿وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ﴾ [التوبة: ٥٢]

«ئێمەش چاوەڕوانین بۆ ئێوە کە خوا دووچارتان بکات بە سزایەک لەلایەن خۆیەوە یان بەدەستی ئێمە کەواتە چاوەڕوانی بکەن.»

* پەروەردگار تۆڵە لە زاڵم و ستەمکار ئەکاتەوە، بەڵام تۆڵە سەندنەوەکە مەرج نییە لەسەر دەستی ستەم دیدەکە بێت و هەروەها مەرج نییە بەئاگایی و زانستی ئەو بێت، پەروەردگار خۆی ئەندازە و کات و شوێن وجۆری تۆڵەکانی دەکێشێت، نەوەک مرۆڤەکان.

* لە نیعمەتی خودا بۆ کەسی ستەملێکراو ئەوەیە کە تیاچوونی ئەو کەسەی ستەمی لێ کردووە بە چاوی خۆی ببینێت: ﴿وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ [البقرة: ٥٠]

«بیربکەنەوە کاتێک کە دەریامان بۆ لەت کردن و ڕزگارمان کردن و دەست و پێوەندی فیرعەونمان خنکاند لەکاتێکدا ئێوە تەماشاتان دەکردن.»

* خودا فێڵ لە ستەمکاران دەکات، سزای خۆی لە شێوەی خێر و چاکەدا نیشانیان دەدات: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا ٱسْتَعْجَلْتُم بِهِۦ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ [الأحقاف: ٢٤]

«جا کاتێک پەلە هەورێکیان بینی ڕووی کردووەتە دۆڵ و ناوچەکەیان، دڵیان خۆش بوو، وتیان: ئەمە بارانی پێیە بۆمان، نەخێر وانییە، بەڵکوو ئەوە ئەو کارەساتەیە پەلەتانە پێش بێت، ڕەشەبایەکی توند، کە سزایەکی بەئازار و بەئێشی پێیە.»

* یەکێک لە شێوازەکانی سزای خودا بۆ ستەمکاران ئەوەیە کە ستەمکارێکی دیکەی بەسەردا زاڵ دەکات و پێوەی گیرۆدە دەکات، خەڵکی دەپارێزێت لە خراپەی ستەمکاران بە زاڵکردنی هەندێک لە ستەمکاران بەسەر هەندێکی دیکەیاندا: ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ﴾ [الأنعام: ٦٥]

«یاخود بتانکاتە دەستە دەستە و پارچە پارچە و تاڵاوی توندوتیژی هەندێکتان بکات بە گەرووی هەندێکی ترتاندا.»

* خودا ستەمکار کوێر ناکات تا ئەو کاتەی هۆکاری تیاچوونی بە هۆکاری دەربازبوونی دەبینێت، خودا دەریای بۆ مووسا لەت کرد، فیرعەون وای دیت ڕێگەیەکی ئاسانە بۆ گەیشتن بە مووسا، بەڵام بووە هۆکاری تیاچوونی.

* خودا سونەت و یاسایەکی نەگۆڕی هەیە دەربارەی ستەمکاران، تۆڵەیان پێ دەسەنێتەوە و پاشان تۆڵەیان لێ دەسەنێتەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ [الأنعام: ١٢٩]

«هەر بەو شێوەیەش ستەمکاران دەکەینە پشتیوان و خۆشەویست و هاوکاری یەکتر، بەهۆی ئەو کار و کردەوانەی کە دەیانکرد.»

* پەروەردگارمان زۆر بەسەیری تۆڵەی زاڵمان هەڵدەسووڕێنێت، لە یەکەم هەنگاوی بۆ فیرعەون، پەروەردگار مووسای بۆ ئامادە کردببێت بە هۆشیارکەر وبێداری کەری، ئەو خۆی بۆ زوڵم وستەم ئامادە دەکات، ئەمەش بۆ ڕووبەڕوونەوە ئامادە دەکرێت، دوای ئەمەش بەرەنگاری یەکتری دەبنەوە.

* نابێت مرۆڤ دڵخۆش بێت بەو ناز و نیعمەتانەی دادەڕژێتە سەر ستەمکار، چونکە هەموو ستەمێک مەودایەکی هەیە گەر گەیشتە ئەم مەودایە، ئەم کات تۆڵەی خوای گەورە لەسەری واجب دەبێت، پەروەردگار نازونیعمەتی خۆی دەڕژێنێتە سەر ستەمکار تاوەکوو مەغرور بێت و زوڵمی زیاتر بکات و مەودایەکەی زوو تەواو بکات.

* بڕوادار گومانی لە دەسەڵاتی خودا بۆ دروست نابێت ئەگەر دی ستەمکارێک بەردەوام ستەمی زیاد دەبوو، بەڵکوو دڵنییای بۆ دروست دەبێت لە هێدی و هێمنێتی کاری خودا و حیکمەتی مۆڵەتپێدانی، پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «خودا مۆڵەت دەداتە ستەمکار ...»

* ﴿فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ [مريم: ٨٤]

«هیچ پەلەیەکیان لێ مەکە، ئەوا ئێمە بە ژماردن لەسەر ئەوانی دەژمێرین.»

نیشانە و بۆسەیەکی وردە لە پەروەردگارەوە، پەروەردگار هیچ ستەمدیدەیەک سەرناخا بەسەر ستەمکاردا بە هەواو ئارەزووی ئەو، بەڵکوو خوا پێوەری زوڵم

دەکات و دەیژمێرێت ودەینووسێت، پاشان بە ئەندازەی ستەمەکەی بەڵا و ئازار دادەڕژێنێت بەسەر زاڵمدا بە دادگەری و کارجێیی خۆی، نەوەک بە حەزی هیچ کەسێک.

* پەلەمەکە لە سزای ستەمکار، بەڵکوو تەنها چاوەڕێ بە: ﴿فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ [مریم: ٨٤]

«هیچ پەلەیەکیان لێ مەکە، ئەوا ئێمە بە ژماردن لەسەر ئەوانی دەژمێرین.»

* ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ [الأعراف: ٩٩]

«جا ئایا لە پیلانی خوا نەترسان و بێباک بوون؟ دەی کەس لە پلانی خوا دڵنیا نابێت جگە لە کەسانی زەرەرمەند.»

کاتێک خودا مۆڵەت دەداتە ستەمکارێک، ئەوا پیلانە و بە پلەبەندی بەرە و تیاچوونی دەیبات، تاکوو بە گومانی خۆی گەورە دەبێت پاشان گرتنی تووڕەیی دەیبات.

* مۆڵەتدانی خودا بۆ ستەمکاران لەوانەیە ماوەیەک درێژە بخایەنێت، بەڵام لەناکاو دەیگرێت و تیایدەچێنێت: ﴿فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ [الأعراف: ٩٥]

«ئیتر لەپڕ و بەبێ ئەوەی هەست پێ بکەن گرتمانن.»

هەر بەوجۆرە هەرکات خودا باسی سزای ستەمکاران بکات، باسی لە ناکاو گرتنیان دەکات.

* هەندێک جار سزای ستەمکار دوادەکەوێت و واگومان دەبات ئەمە بەڵگەی ڕاستیەتی یان خودا لێی خۆش بووە، ئەوەی لەبیر کردووە خودا ناوی خۆی بردووە بە "حلیم مۆڵەت دەدات بەڵام لە بیری ناکات وازی لێ ناهێنێت.

* لە حیکمەت و دانایی خودایە کە ستەمکاران لە چاو تروکانێکدا لەناو نابات بەڵکوو خودا لەهەموو چرکەیەکدا سزایان دەدات بە نەمانی موڵک و هێزیان کە خشت بە خشت بەبەرچاویەوە دەکەوێت بەمە هەموو چرکەیەکی چەندین جار دەمرێت.

* ئەگەر خودا ویستی کەسێک بخات بەرزی دەکاتەوە، بەڵام بزانە هەموو بەرزکردنەوەیەک سەرکەوتن نییە.

* مەخەڵەتێ بەو ئەمینییەی ستەمکار هەستی پێ دەکات: ﴿مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾ [غافر: ٤]

«هیچ کەس لە بەرانبەری ئایەت و فەرمانەکانی خواوە موجادەلە و دەمەدەمێ ناکات، جگە لەوانەی کە بێبڕوا و خوانەناس بوون، ئەی پێغەمبەر (ﷺ) کەواتە دەسەڵات و سەرمایە و هێزیان فریوت نەدات.»

ئەمانە هەمووی کۆتاییان هەیە: ﴿فَأَخَذۡتُهُمۡ فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ﴾ [غافر: ٥]

«جا منیش پێچامنەوە و لەناوم بردن، بڕوانن چۆن تۆڵەیەکم لێ سهندن!»

* تەواویێتی چێژ لە ژیانی ستەمکاراندا و هەروەها کەم نەبوونەوەی نیشانەی نزیکی کاتی سزایەتی: ﴿فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ﴾ [الأنعام: ٤٤]

«دەرگای هەموو شتێکمان لەسەر کردنەوە تا کاتێک دڵخۆش بوون بەوەی پێیان درابوو، لەناکاودا تۆڵەمان لێ سەندن ئیتر ئەوانیش نائومێد و سەرگەردان بوون.»

* هەرچەندە ستەمکار بەرزببێتەوە، ئەوا کەوتنی ڕوونتر دەردەکەوێت. ئەمە لە حیکمەتی خودایە ستەمکار ساڵانێکی درێژ مۆڵەت دەداتە تا تەواو بەرز ببێتەوە تا هەمووان بی بینن تەنانەت دوورترین کەسیش بەڕوونی بی بینێت پاشان دەیخات، تا ببێتە جێی پەند و عیبرەت بۆ هەموو ئەوانەی دەیبینن.

* ستەمکار بەسەر پەیژەی ستەمدا بەرز دەبێتەوە، دڵگران مەبە لەو بەرزبوونەوەی چونکە هەنگاوێکی بێ پلیکانەی لەپێشە. ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰٓ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَعَلۡنَا لِمَهۡلِكِهِم مَّوۡعِدٗا﴾ [الكهف: ٥٩]

«لەناومان بردوون و کاولمان کردوون، کاتێک کە (دانیشتوانی) ستەمیان کردووە و بۆ لەناوبردنیان کاتی دیاریکراومان بڕیارداوە.»

* هەندێک جار خودا ستەمکار بەرز دەکاتەوە، لەبەر خۆشویستنی نییە، بەڵکوو بۆ ئەوەی لەبەرزییەوە بیخات.

* خودا ستەمکار بەرز دەکاتەوە تا خەڵکی لە دوورەوە کەوتنی ببینن، نەک ئەوەی پێگەی بەرز بکاتەوە وەک ڕێز و بەرزییەک بۆی بەسەر ئەوانی دیکەدا.

* ستەمکار بە پلەبەندی و هێواش هێواش لە ستەمدا بەرز دەبێتەوە، بەڵام دابەزینی بەو جۆرە نییە، بەڵکوو بەرزێتی سەرکەوتنە و دابەزینی کەوتنە: «خودا مۆڵەتی ستەمکار دەدات، بەڵام کاتێک کە گرتی بەری نادات.»

* ستەم پلە و قادرمەی هەیە ستەمکار پێیدا سەردەکەوێت، ئەوەی زیاتر سەردەکەوێت کەوتنی قورستر دەبێت.

# دادپەروەری

* دادگەری ئەوەیە ئەو ڕقە دەروونییە دەربکەیت کە دەبێتە ڕێگر لە دیتنی چاکەی ئەو کەسەی ڕقت لێیەتی و خراپەکانی ئەو کەسەش ببینیت کە خۆشت دەوێت، لە فەرموودەدا هاتووە: «با هیچ پیاوێکی باوەڕدار ئافرەتە باوەڕدارەکەی لەبەرچاو نەکەوێت، چونکە ئەگەر لە سیفەتێکی ناڕازی بێت ئەوا لەسیفەتێکی دیکەی ڕازییە.»

* ئەگەر مرۆڤ نەیزانی چی بۆ هەیە، ناشزانێت چی لەسەرە، ئەوەی لەگەڵ خۆیدا دادگەر نەبێت، لەگەڵ خوداش دادگەر نابێت، خود پێوانەیە، ئەگەر لابدات، دەرئەنجامەکان دەشێوێت.

* دادگەری و هەواوئارەزووی نەفس کۆنابنەوە: ﴿فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ﴾ [النساء: ١٣٥]

«کەواتە شوێن ئارەزوو مەکەون بۆئەوەی لە هەق لانەدەن.»

* دەوڵەت هەرەس ناهێنێت تەنها بەستەم نەبێت، هەروەها جێگیریش نابێت تەنها بەدادگەری نەبێت.

* ئەگەر دادگەری نەما و ستەم هاتە جێی ناکۆکی دەکەوێتە نێوان دەسەڵات و گەلەوە، پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «ئەگەر سەرکردەکانتان حوکم نەکەن بە پەرتووکەکەی خودا و سەرپشکتان بکەن لەوەی کە خودا دایبەزاندوە، ئەوا دڵنیا بن خودا ناکۆکی دەخاتە نێوانیانەوە.»

* دادگەری لاوازەکان بەرز دەکاتەوە، ستەمیش بەهێزەکان دادەگرێت، ئەمە سونەتی خودایە لە ناو خەڵکیدا: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَارِثِينَ﴾ [القصص: ٥]

«ئێمە دەمانەوێت (بە چاکەی خۆمان) منەت بنێین بەسەر ئەوانەی کە لاواز و ژێر دەست کرابوون لە وڵاتی (میسر)دا و بیانکەینە پێشەوا و بیانکەینە میراتبەرانی کەلەپووری فیرعەون و شوێن کەوتووانی.

* خودا بێباوەڕ سەردەخات بەهۆی دادگەرییەوە، موسڵمانیش دادەبەزێنێت بەهۆی ستەمکردنییەوە.

* لە ژیانی دونیادا خودا دادگەر سەردەخات هەرچەندە بێباوەڕیش بێت، هەروەها ستەمکار دادەگرێت هەرچەندە موسڵمانیش بێت، بەڵام لە قیامەتدا یەکخواپەرست بەرز دەکاتەوە بەسەر کافراندا، چونکە مافی خودا دوا دەخرێت و مافی مرۆڤ پێش دەخرێت.

* نەچەسپاندنی سزا بە یەکسان لەناو خەڵکیدا هۆکاری ڕووخانی دەوڵەتەکانە. «بێگومان ئەوانەی پێش ئێوە تیاچوون، بەهۆی ئەوەی ئەوا ئەگەر کەسێکی ڕێزداریان دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا، ئەگەر لاوازێکیان دزی بکردایە ئەوا سزایان لەسەر جێبەجێ دەکرد.»

* دەوڵەت هیچ بڕیارێکی بۆ جێبەجێ ناکرێت ئەگەر بڕیارەکانی لەسەر گەورە و ڕێزدارەکان نەچەسپێنێت، یەکەم ڕیبا کە پەیامبەر (ﷺ)لای برد ڕیبای مامی بوو. یەکەم خوێن کە لای برد خوێنی کوڕە مامی بوو و یەکەم کەسیش هەڕەشەی بڕینی دەستی لێ کرا ئەگەر دزی بکات فاتمەی کچی بوو.

* جێبەجێکردنی سنوورەکانی خودا لەسەر یەک کەسی گەورە و خاوەن دەسەڵات گەورەترە لە جێبجێکردنی لەسەر سەد لاواز، چونکە لاوازەکان سڵ دەکەنەوە بە چەسپاندنی سزاکان لەسەر گەورەکان، بەڵام گەورەکان سڵ ناکەنەوە بە لاوازەکان.

* دادگەری بەوە دەبێت گوێ لە وتەی هەموو لایەنەکان بگریت، لە فەرموودەدا هاتووە: «بڕیار مەدە لەنێوان دوو کەسدا کە ناکۆکییان لەنێواندایە، تا گوێ لە دووەمیان نەگریت وەک چۆن گوێ لەلایەنی یەکەم دەگریت، ئەگەر ئەو کارەت ئەنجامدا، ئەوە بڕیار و دادگەریت بۆ ڕوون دەبێتەوە.»

* پێوەری پیرۆزی و پێگەی ئوممەت بەوە دەردەکەوێت کە مافی لاوازەکان لە بەهێزەکانیان وەربگرنەوە، لە فەرمووەدەدا هاتووە: «ئوممەت پیرۆزییان تێدا نییە کە لاوازەکان مافیان لە بەهێزەکان وەرنەگرنەوە، بێ ئەوەی زیانی پێ بگات و بێزاری بکات.»

* ئەگەر لاوازەکان بەکەم و بێڕێز سەیرکران لە ئوممەت و دەوڵەتێکدا ئەوا خودا سەرشۆڕ و بێزراویان دەکات لەنێو ئوممەتان، لە فەرمووەدەدا هاتووە «ئوممەت پیرۆزییان تێدا نییە کە لاوازەکان مافیان لە بەهێزەکان وەرنەگرنەوە، بێ ئەوەی زیانی پێ بگات و بێزاری بکات پاداشتەکان لە جۆری کردەوەکان.»

# زانست و زانایان

* نەزانی دوو جۆرە:

شارەزانەبوون و نەزانی بە حەقیقەت و ڕاستی شتەکان.

هەبوونی شارەزای بە خودی شتەکان بەڵام پێگە و پایەیان نازانێت لەنێوان شتەکانی دیکەدا هەروەها نەزانینی ئەندازە گرنگی و پێویستی ئەو شتە چەندە.

دووهەمیان زیاتر بڵاوە و بەهۆی ئەوەوە ئوممەت بابەتە لە پێشینەکانیان لەیاد کردووە.

* جیاوازی نێوان نەزان و زانا وەک جیاوازی نێوان چاوساغ و کوێرە ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ [الرعد: ١٩]

«جا ئایا کەسێک کە بزانێت بەڕاستی ئەوەی نێردراوەتە خوار بۆ تۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە حەق و ڕاستە وەک ئەو کەسەیە کە کوێر بێت، بێگومان هەر ئەوانە بیردەکەنەوە کەخاوەنی ژیرین.»

* زانست تەواو جوان و کامڵ نابێت، تەنها لەگەڵ تەواوییێتی و کامڵی ئەقڵدا نەبێت، ئەقڵیش تەواو کامڵ نابێت لە پاش سی ساڵییەوە نەبێت، خودا دەربارەی یوسف دەفەرمووێت: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ [یوسف: ٢٢]

وەختێک بوو بە پیاوی تەواو، سەلیقە و زانستمان پێدا. ئێمە ئاوا پاداش بە کارچاکان دەدەین.

(الأشد) سی و ئەوەندەیە.

* مرۆڤی نەزان خودی خۆی ناناسێت وەک چۆن کەسێکی زانا شارەزایە پێی، چونکە کەسی زانا لەوەو پێش بە نەزانیدا گوزەری کردووە، بەڵام نەزان زانا ناناسێت چونکە لەوە و پێش زانا نەبووە.

* ئەگەر مرۆڤ زانستی بە ئەندازەی نەزانییەکەی زیاد بوو، ئەوا خاکیبوون و بەدواگەڕانی بۆ زانستدا زۆر دەبێت، خۆ ئەگەر زانستی بە نەزانییەکەی کەمی کرد، ئەوا خۆبەگەورەزان و ملهوڕی زیاد دەکات، یەکەم دەرگای زانستی تاکەکان زانست بوونیانە بە ئەندازەی نەزانییان.

* نەزانی باشترە لە زانست بۆ هەندێک کەسی خاوەن ئارەزوو کە بەدوای گوماندا دەگەڕێن تا بڵاوی بکەنەوە، (ابن المبارک) دەڵێت: خودا چاکەی بەرانبەر موسڵمانان کردووە بەوەی لەبەرکردنی ئیسماعیلی کوڕی خلیفەی خراپکردووە، بەهۆی ئەو ئارەزووەی تیایدایە.

* زانست کۆکەرەوەیە و نەزانی هۆکاری پەرت بوونە، بڕوانە ئەگەر خەڵکی پاش زانستیان پەرت و جیاواز بوون، ئەوا ئەو زانستەیان لەبەر خودا نەبووە: ﴿فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ﴾ [الجاثية: ١٧]

«جا جیاواز نەبوون لەنێو خۆیاندا دوای ئەوە نەبێت زانستیان بۆ هات لەبەر دوژمنایەتی و ئیرەیی نێوان خۆیان.»

* نیعمەتی زانست ئەو ڕاستیەیە کە پلەبەندی و ڕێزداری نێوان مرۆڤەکان دیاری دەکات: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ [النمل: ١٥]

«سوێند بەخوا زانستمان بە داود و سولەیمان بەخشی هەردووکیان وتیان: هەموو سوپاس و سەنایە بۆ ئەو خوایەی کە ڕێزی داوین بەسەر زۆر لە بەندە باوەڕدارەکانیدا.

* زانست ڕەحمەتە بۆ ئوممەت و نەزانی بەڵایە بەسەر ئوممەتەوە: ﴿ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ [الكهف: ٦٥]

«لەلایەن خۆمانەوە ڕەحمەتمان پێ دابوو شارەزاشمان کردبوو لە زانیاری تایبەتی خۆمان.»

* پەیامبەر زانایانی بە ئەستێرە ناو بردووە بەهۆی ئەو هەموو قازانج و سوودەی هەیانە بۆ زەوی، شوێنیان جێگیرە هەرچەندە ئەقڵەکان نەی بینن وەک چۆن هەورەکان ئاستێرەکان دادەپۆشن لە چاوەکان، ئەوا بەدوایدا مەگەڕێن خۆی لەو جێگەی بۆ دەڕوات دەردەکەوێت.

* ئەو کەسەی زیاتر خودا دەناسێت، دڵخۆشترین مرۆڤە لە دنیادا، چونکە بەدیهێنەری ناسیوە جا بۆیە پەژارەی دروستکراوەکان هیچ کاری تێ ناکات.

* باشترین مرۆڤ ئەو مرۆڤەیە چاکە فێری خەڵکی دەکات، خراپترین مرۆڤیش ئەو مرۆڤەیە خراپە فێری خەڵکی دەکات، یەکەمیان لەپاش مردنیش چاکەکانی بەردەوام دەبێت، دووەمیان خراپەکانی بەردەوام دەبێت پاش مردن و ناتوانن ڕایان بگرن.

* کەسانی زانا خودا بەرزیان دەکاتەوە، بەڵام نەزانەکان خەڵکی بەرزیان دەکەنەوە: ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ﴾ [المجادلة: ١١]

«خوا پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە لە ئێوە کە بڕوایان هێناوە، ئەوانەی کە زانستیان پێ بەخشراوە بە چەند پلەیەک (پلەیان بەرز دەکاتەوە.)»

پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «خەڵکی کەسانێکی نەزان دەکەنە پێشەوای خۆیان. خۆیان گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن.»

* ئەو شتانەی ڕوودەدەن هەمووان بە چاوی سەر دەیبینن، بەڵام دەرئەنجامەکان بەچاو نابیندرێن بەڵکوو بە بەرچاوڕوونی دەبیندرێن، هەمووان خاوەنی چاون، بەڵام تەنها زاناکان خاوەنی بەرچاوڕوونین.

* تەنیا ئەو کەسە ڕاستە لەگەڵ ئوممەت کە لەگەڵ زانست و زانیاریەکەی، دینداریەکی تۆکمە و ئیمان و باوەڕێکی پتەوی هەبێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ﴾ [الروم: ٥٦]

«وە کەسانێک کە زانیاری و ئیمانیان پێ دراوە وتیان...»

زانای ئیمان لاواز خەڵکی بەرەو هەواوئارەزووی خۆی و خۆیان دەبات.

* ئەگەر زانایەک وتەی پێچەوانەی و گۆڕانکاری زۆر بوو، ئەوە نیشانەی جێگیرنەبوونی دڵە لە زەویی ئیخلاس و ڕاستگۆییدا، ئەگەر دڵ جێگیر ببێت، ئەوا ئەندامەکانیش جێگیر دەبێت.

* چەسپێنەرەکانی زانست بریتین لە:

نییەت پاکی، دەبێتە هۆی چاندنی بەرەکەت و وابەستەبوون بە زانستەوە

پێداچوونەوە بیرچوونەوە لا دەبات

کۆڕی زانستی لەگەڵ هاوڕێیان

کردەوەکردن بە زانست

* زانست مرۆڤ دەچەسپێنێت و خواپەرستی زانست دەچەسپێنێت، مرۆڤ بەبێ زانست نەزانە، زاناش بەبێ پەرستش لاوازە لە بەرانبەر هەواوئارەزوودا.

* زانست هەڵگرتنی قورسە لەسەر خاوەنەکەی، ئەو ئەمانەتە تەنها کەسێک دەتوانێت هەڵی بگرێت کە قاچەکانی لە پەرستشدا چەسپاندبێت، بە ئەندازەی پەرستش زانستەکەی دەچەسپێت و بە ئەندازەی نەبوونی پەرستشیش زانستەکەی نامێنێت.

* گەورەترین شت کە زیانی گەورە بە زانا بگەیەنێت بریتییە لە کەمیی پەرستش، هەروەها گەورەترین شت کە زیان لە پەرستش دەدات کەمیی زانستە، زانست و پەرستش مێخی دامەزراویین.

* نزیکە بڵێین زانایەک نابیندرێت کە خاوەن پەرستش بووبێت و لە هەق هەڵگەڕابێتەوە و لایدابێت، ئەوانەی هەڵگەڕاونەتەوە یان زانای کەمتەرخەم بوون لە پەرستشدا، یان خواپەرستی بێ زانست بوون، یاخود هەردوو لایەنەکەیان کەم بووە، چونکە زانست ناچەسپێت تەنها بە پەرستش نەبێت.

* یادی خودا یارمەتی چەسپاندنی زانست و وەبیرهاتنەوەی دەدات: ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ [الكهف: ٢٤]

«ئەگەر لە بیریشت نەما، یادی پەروەرندەت بکە.»

چونکە لەبیرچوونی هەق لە شەیتانەوەیە و یادی خوداش شەیتان دوور دەخاتەوە: ﴿وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ﴾ [الكهف: ٦٣]

«دیارە شەیتان نەیهێشت وەبیرم بێتەوە.»

* پەرستش لەگەڵ زانستدایە، ئەگەر زانست زیاد بوو، ئەویش زیاد دەکات؛ ئەگەر بەو جۆرە نەبوو، ئەوە نیشانەی دووڕوویيە. سوفیان دەڵێت: ئەگەر مرۆڤ زانستی زیادبوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نزیکبوونەوەی لە دونیا زیادی کرد، ئەوا زیاتر لە خودا دوور دەکەوێتەوە.

* زانستێک یارمەتیدەرت نەبێت لەسەر شەو نوێژ، نەزانییە: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ [الزمر: ٩]

«(ئایا ئەو جۆرە کەسانەی کە باسکران چاکترن) یان ئەو ئیماندارەی کە لە دووتوێی شەوگاردا هەڵدەستێت بۆ خواپەرستی، سوژدە دەبات و بەپێوە

دەوەستێت، لە لێپرسینەوەی قیامەت دەترسێت و ئومێد و هیوای بە میهرەبانیی پەروەردگاری هەیە. ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ: ئایا ئەو کەسانەی دەزانن و شارەزان، وەک ئەوانەن کە هیچ نازانن و شارەزاییان نییە؟ بەڕاستی تەنیا خاوەن بیروهۆشەکان لەم جۆرە یادەوەریانە سوود وەردەگرن و تێدەگەن.»

* ئەگەر مرۆڤ زۆر ئاڵوگۆڕی دەکرد و دەگۆڕا، یان پێخلیسکان و هەڵەی زۆر بوو لەگەڵ ئەوەی زانستی پێ درابوو، ئەمە نیشانەی کەمی پشت بەستنیەتی بە خودا و کەمتەرخەمیەتی لە پەرستشیدا، بۆیە خوداش پشتیوانی خۆی بۆ کەم کردووەتەوە.

* هەرکەس زانستی زۆر بێت، هەڵەی کەم دەبێت، خۆ ئەگەر زانستی زۆر بوو و هەڵەکانی لەگەڵیدا زیادی کرد، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو زانایە پەرستشی کەمە بۆیە پاراستن و پشتیوانی خودا بۆی کەم بووەتەوە: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ﴾ [الزمر: ٣٦]

«ئایا خوا بۆ بەندەی خۆی (پێغەمبەر (ﷺ)) بەس نییە.»

* زانست و ئەقل سوود بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت ئەگەر ڕێنموونی و تەوفیقی خودایان لەگەڵ نەبێت، پەیامبەری خودا (ﷺ) ئامۆژگاری عەلی کرد و پێی فەرموو: «قُلِ اللَّهمَّ اهْدِني وسدِّدْني، واذكُرْ بالهدايةِ هدايةَ الطَّريقِ، واذكُرْ بالسَّدادِ تسديدَک السَّهمَ» «بڵێ پەروەردگارم ڕێنموونیم بکە و پێم بپێکە، بە ڕێنموونی ڕێنموونی ڕێگات بێتەوە یاد و بە پێکانیش پێکانی تیر.»

* یەکێک لە ئاکاری پەیامبەران ئەوە بووە کە پەیوەست بوون لەگەڵ زانایان تا سوود لە وتە و کردار و ئاکاریان ببینن: ﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾ [الكهف: ٦٦]

«مووسا بەو (بەندە ساڵحە)ی وت ئایا (هاوڕێیەتیت بکەم و) شوێنت بکەوم بۆ ئەوەی فێرم بکەیت لەو زانیارییە ڕاستەی فێری بوویت.»

* زۆرینەی زانستەکان مرۆڤ لەڕێی خوێندنەوەی پەرتووکەکان و بەردەوام ڕوانیین تیایاندا پەیدای دەکات بە لەبەرکردن و تێگەیشتن، زانایان و فێرکاران کلیلی زانستەکانت پێ دەدەن و نەخشە ڕێگەی گەیشتن بە زانستت بۆ دەکێشن.

* لەبەرکردن و تێگەیشتن دوو پێن بۆ زانست بە ئەو دووانە نەبێت ڕۆیشتن ناکرێت.

* زانست لەبەرکردن و تێگەیشتنە. لەبەرکردنی بێ تێگەیشتن دەبێتە هۆی نەزانی و لەخۆباییبوون، تێگەیشتنی بێ لەبەرکردن لاوازی و کەمتەرخەمییە.

* ﴿بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ﴾ [العنكبوت: ٤٩]

«نەخێر وانییە گومان دەبەن بەڵکوو قورئان نیشانەکانی ئاشکران لە دڵ و دەروونی کەسانێکدایە کە زانستیان پێ دراوە.»

ئەو زانستەی لەناو سینەدا هەڵنەگیراوە بە بەڵگە و چۆنییێتی بەڵگەکەوە ئەوا نابێتە هۆی ناوبردنی خاوەنەکەی بە زانا، ئەو بابەتەی نەتوانی بەبێ کتێب بیخەیتە ڕوو، ئەوە زانا نییت تیایدا.

* پلەبەندی لە زانست و کردەوەدا لە هۆکارەکانی جێگیربوونە، خودا پەیامبەرەکەی بەوە جێگیر کردووە: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ﴾ [الفرقان: ٣٢]

«خوانەناسەکان دبێژن: بۆچی خودا بە تێکڕایی هەموو قورئانی بۆ نەناردووەتە خوارەوە؟ هەر بۆ ئەمە بوو کە ئێمە دڵتی پێ دامەزرێنین.»

* زیادبوونی زانست بە خێرابوون لە وەرگرتنیدا پەیدا نابێت، بەڵکوو بە ئارامگری و جێگیری دەچەسپێت و ڕەگ دادەکوتێت: ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا﴾ [طه: ١١٤]

«پەلە مەکە لە (خوێندنی) قورئاندا لەپێش ئەوەی سرووش کردنەکەی بۆت تەواو بێت و بڵێ ئەی پەروەردگارم زانست و زانیاریم زیاد بکە.»

* هاوەڵان زانستەکانیان پلە پلە لەبەردەکرد، نەک بەپەلە بۆئەوەی لەبەرکراوەکەیان بچەسپێت، کاتێک ئیبن عەباس بیستی کەسانێک پەلە دەکەن لە لەبەرکردنی قورئاندا، گوتی: "ئەو جۆرە پەلەکردن و خێرا لەبەرکردنەم پێ خۆش نییە."

* لەبەرکردن بنچینەی زانستە، پلەبەندیکردن لە لەبەرکردنی مەتنەکاندا زیاتر زانست دەچەسپێنێت وەک لە لەبەرکردنی لە خولێکی کاتی و چڕدا، ئەوەی بەخێرای لەبەردەکرێت خێراش دەڕوات، پێشەوا عمەر و ئیبن عەباس پەلەکردنی لە لەبەرکردندا پێ خۆش نەبووە.

* کارکردن بە زانست گەورەترین هۆکاری جێگیر بوونە: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾ [النساء: ٦٦]

«ئەگەر بەڕاستی ئەوان کاریان بکردایە بەپێی ئەو ئامۆژگارییانەی دەکران، ئەوە باشتر بوو بۆیان و دامەزراوتر دەبوون لەسەر ئایینەکەیان.»

* ئەوانەی زۆرترین جێگیری و چەسپاوییان هەیە ئەوانەن کە زانست و کردەوەیان کۆ کردووەتەوە، ئەوانەش کە هەڵگەڕانەوە و لادانیان هەیە خاوەن زانستی بێ کردەوەن ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾ [النساء: ٦٦]

«ئەگەر بەڕاستی ئەوان کاریان بکردایە بەپێی ئەو ئامۆژگارییانەی دەکران، ئەوە باشتر بوو بۆیان و دامەزراوتر دەبوون لەسەر ئایینەکەیان.»

* ڕێنموونی و تەوفیقی خودایی لە زانستدا نییە، بەڵکوو لە کارپێکردنی ئەو زانستەدایە، ئەگەر خودا ویستی خراپی بە کەسێک بێت، هۆکارەکانی زانستی بۆ ئاسان دەکات و کارکردن بەو زانستەی لێ دوور دەخاتەوە.

* زانستی بێ کردەوە سزایەکی خوداییە، هەرچەندە مرۆڤ زانستی زیاد بێت و کردەوەی کەم ببێتەوە، ئەوە زیاتر بە شەیتان دەچێت، خۆ ئەگەر زانستی زیادی کرد و کردەوەشی زیادی کرد، ئەوا لە پەیامبەران دەچێت.

* زانست ئەقڵ پاک دەکاتەوە، کردەوەش دەروون پاک دەکاتەوە، لاوازترین کەس لە کاتی تەنگانە و ئاستەنگەکاندا زانای بێ کردار و کردەوە و کاری بێ زانستە.

* زانست گەنجینەیە و کردەوەکان دەیپارێزن، زانست زۆر بووە و کردەوە کەم بووە، هەواوئارەزوو هاتووەتە ناو زانستەوە ئەمە وێڵی کردوون و پاوانەی لەسەر کردوون و تاجی لە قاچدا داناون، جا چۆن شوێنەکانیان دەزانێت کە هەرگیز کاری پێ نەکردوون!

* باشترین کاتی تاوتوێ و گفتوگۆ و فێرکردن چێشتەنگاوە، چونکە هیچ شتێک پێش ئەوکاتە کاری لە دەروون نەکردووە، ئەوە دەبێتە یەکەم ڕووداو: ﴿قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى﴾ [طه: ٥٩]

«مووسا وتی: کاتی دیاریکراومان ڕۆژی ڕازاندنەوە بێت لەکاتی چێشتهنگاودا خاڵکی کۆبکرێتەوە.»

* زەکاتی زانست گەیاندنییەتی، وەک چۆن زەکاتی سامان بەخشینیەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ [المائدة: ٦٧]

«ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕایگەیەنە (بە خەڵک) ئەوەی هێنراوەتە خوارەوە بۆت لەلایەن پەروەردگارتەوە ئەگەر وا نەکەی ئەوە ڕاسپێرییەکەی خوات ڕانەگەیاندووە و بەجێت نەهێناوە.»

* گەورەترین بەڵا و موسیبەت زۆریی زانستە لەگەڵ هەواو ئارەزوودا.

* زانست ئەگەر تێکەڵ بە ئارەزوو کرا، ئەوا لە نەزانی زیاتر زیان بە خاوەنەکەی دەگەیەنێت: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَـٰوَةً﴾ [الجاثية: ٢٣]

«ئاخۆ تۆ ئەو کەسەت دیوە کە ئارەزووی خۆی دەپەرست؟ خودا -کە ئاگای لێ هەبوو- ڕێی لێ گۆڕی و گوێچکە و دڵیشی مۆرکرد و لێڵایی خستە سەر چاوی.»

* زانست ئارەزوویەکی هەیە، ئەویش ئەوەیە بۆ چێژی دەروون فێری ببێت، نەک بۆ سوود گەیاندن بە دەروون، لە فەرموودەدا هاتووە: «خودایە پەنات پێ دەگرم لە زانستێک کە سوودی نەبێت.»

* ئەگەر دواڕۆژ لە دڵی زانایەکدا نەما، ئەوا وای لێ دەکات فەتوا لە قازانجی دونیای بدات، پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «بێگومان خودا زۆر ئەوانەی لا بێزراوە کە زانان بە دونیا و نەزانن بە دواڕۆژ.»

* ماڵ/ سەروەت و سامان و موڵک، ناو و ناوبانگ و ڕەگ و ڕیشە کەسی زانا بەرهەم ناهێنن، زۆرینەی ئەوانەش کە بانگەشەی زانایەتی دەکەن بە جگە لە زانست وعیلم خۆیان بەرزکردووەتەوە و خۆیان بەودا هەڵواسیوە.

* ئەگەر مرۆڤ دڵی پڕ بوو لە نەسەب و پێگە و سامان و دەسەڵاتی، ئەوا دڵی بەتاڵ دەبێت لە زانست بە ئەندازەی پڕبوونی لە شتەکانی دیکە.

* پارە و بازرگانی ئەگەر تێکەڵی زانست بوون، ئەوا دەی شێوێنن و خراپی دەکەن، بەتایبەت زانستی ئایین کە شەریعەتە و زانستی جەستەش کە پزیشکییە.

* کاری زانایان تەنها بڵاوکردنەوە و پاراستنی پەرستشەکان نییە، بەڵکوو کاریان پاراستنی دیین و چاککردنی دونیایانە. شوعەیب بۆ چاکسازی کردن لەو ستەمانەی لە سامانددا دەیانکرد نێردرا بوو بۆ لای گەلەکەی، لووط بۆ چاکسازیی ئاکار و تێکچوونی سروشتی مرۆڤبوونیان نێردرا بوو بۆ لای گەلەکەی.

* کاری زانایان چاکسازییە لە دینی خەڵکی و دونیاشیاندا، ئەگەر بەو جۆرە نەبوو ئەوا پەیامەکەی تەواو نییە، ئیبن عەبدولهادی دەڵێت: زۆرینەی خەڵکی ئیبن تەیمییەیان خۆش دەوێت، چونکە شەو و ڕۆژ وەستاوە بۆ خزمەتی خەڵکی بە زمان و قەڵەمەکەی.

* پەیامی هیچ زانایەک تەواو نابێت، تا بە دادگەری دونیای خەڵک بەرەو باشی نەبات وەک چۆن دیینیان بەرەو باشی دەبات بە قورئان: ﴿وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾ [الحديد: ٢٥]

«کتێبی (ئاسمانی) و تەرازووی دادمان لەگەڵدا ناردن بۆئەوەی خەڵکی بەدادگەری ڕەفتار بکەن.»

* کاربەدەستی موسڵمانان مافی هەیە و مافی لەسەرە، خاوەن شوورا و قەڵایە، دادگەری ئەوەیە زانایان لە دەرەوەی قەڵاکەی بوەستن و بەرگری لە مافی سەرکردە بکەن، هەروەها لە ناو سنوور و بەربەستەکانیدا بوەستن تا لە ناوەوە بەرگری لە خەڵک بکەن تا ستەمیان لێ نەکات.

* ئەگەر زانایان هەڵنەستان بەو واجبەی لەسەریانە، ئەوا نەزانەکان شوێنیان دەگرنەوە و هەڵە دەکەن، پێش ئەوەی سەرزەنشتی نەزان بکرێت لەسەر هەڵەیەکی پێویستە زانایان ئاگەدار بکرێنەوە لەسەر کەمتەرخەمییان.

* نابێت زانایان وەڵامی داواکاری ئەوانە بدەنەوە کە دەیانەوێت لایان بدەن لە گرنگیدانیان بە قازانجی خەڵکی و سەرخستنیان، تەنها سەرقاڵی فێرکردنیان

بێت، واز لە پیشەی پەیامبەران بهێنێت کە سەرخستنی ستەملێکراوان و چاککردنی باری دونیای خەڵکی بووە.

* جێگە و پێگەی زانایان بە بەتاڵی نامێنێتەوە، خەڵکی ئەگەر زانایان بەدی نەکرد لە شوێنەکەی نەزانێک دادەنێن، لە فەرموودەدا هاتووە: «کاتێک کە زانایان نەمان، خەڵکی کۆمەڵە نەزانێک دەکەنە گەورە و زانایان پرسیاری لێ دەکەن و ئەویش بە نەزانی وەڵامیان دەداتەوە.»

* ﴿قَالَ ٱجْعَلْنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ﴾ [یوسف: ٥٥]

«یوسف فەرمووی (بە پادشا) لەسەر خەزنە و دارایی زەوی (میسر)دا دامنێ.»

دروستە بۆ زانایەکی بەرچاو ڕوون داوای لابردنی کەسێک بکات کە بەجوانی ناتوانێت کاروباری دیین و دونیای خەڵکی بەڕێوەبەرێت، یوسف داوای سەرپەرشتی دارایی میسری کرد، ئەمەش ئەوە لەخۆ دەگرێت کە داوای لابردنی کەسێک دەکات کە جوان بەڕێوەی نەبردووە.

* خۆ بێ ئاگاکردنی زۆرێک لە زانایان لە ژیان و کاروباری خەڵکی، زەویەکی گونجاو بۆ ڕووان و جێگیربوونی فکرە ماددییەکانی وەک عالمانییەت و لیبڕالییەت دەڕەخسێنێت، چونکە ئەوانە دەبنە جێگرەوەی ڕێکخستنی دونیای خەڵکی، کاتێک بەهۆی ستەمکارانەوە خراپ دەبێت، لەوانەشە سەرقاڵبوونی زانا لە ئاست ئەوە ببێتە بەهانە بۆ نکۆڵیکردن لە دەستوەردانی زانایانی خواناس لە ڕێکخستنی ژیانی خەڵک و گرینگیپێدانی، ئەوەشی لێ دێتە ئەنجام کە ڕەمزەکانی فکری عەلمانی بینیان ژینگەی ئیسلام جیابووەتەوە لەنێوان هاوەڵانی دین و هاوەڵانی دونیا، جا تەنیا پێویستییان بەوە بوو ناوەکان دابنێن و تەواو، بەبێ جیاکردنەوەی کردارەکان.

* فەتوا سەرناگرێت لەم جۆرە سەردەمانەدا، مەگەر بە سەربەخۆبوونی زانا لە بژێوی دونیایدا، ئەوسا لە بازنەی دامەزراندن و فەسڵکردن دەچێتە دەرەوە و موفتییەکان ئەوقاف و موڵکێکی تایبەت دەیانپارێزێت لەوەی گوشاریان لێ بکرێت.

* لە کاتی فەتوادان بڕوانە کێیە کە نهێنی و ئاشکرا وەک یەک پێ دەزانێت، نەک لە جگە لەو زاتە بڕوانیت، شتەکان دادپەروەرانە بپێوە، ڕاستە کە هەموو حەقێک ناوترێت، بەڵام هەندێک حەق هەن کە هەر دەبێت بوترێن.

* زانایان نابێت ببنە پرد و خەڵکی بەسەریاندا تێ بپەڕن، ئەوان تەنها بۆ هەق ملکەچ و کزۆڵ دەبن، هەرچەندە پێچەوانەی ئارەزوو و حەزەکانیشیان بێت.

* بەشێک لە پێ خلیسکانی زانایان ئەوەیە لە کاتی ناکۆکی حوکوومەتەکاندا هەریەکەیان بەرگری لە سەرکردەکەی خۆی بکات بە ناوی خوداوە، بەڵگە بە کتێبەکەی خودا بهێننەوە بۆ جگە لە خودا، مافی ئوممەت کورتبکەنەوە لە مافی تاکێک یان حوکوومەتێک.

* زانای کاربەجێ ئەو زانایەیە کە ئەو مەکروهـ و ناپەسەندانەی سەرناکێشن بۆ حەرام، گەورەیان ناکات، بەڵام ئەو موباحانە قورس دەکات کە سەر دەکێشێت بۆ حەرام، زانایان دەڕواننە سەرەتا و دەرئەنجامەکان، بەڵام کەسانی دیکە تەنها دەڕواننە سەرەتاکان.

* دروست نییە کەسی زانا هیچ بڕیارێک بدات تا ئەو کاتەی بەڵگە و واقعی کاتی چەسپاندنی بەڵگەکان دەزانێت، تا لەسەریان بیانچەسپێنێت، حوکم و بڕیاری بێ بەڵگە هەواوئارەزووە، بەڵگە بەبێ چەسپاندن و زانینی واقع هەڵەیە.

* ئەو کەسەی توانای بەڵگەی ئەحکامەکانی هەبێت بەڵام هۆکارەکانیان نەزانێت، بێگومان دەکەوێتە ناو هەڵەوە، هەروەها ئەو کەسەش کە هۆکارەکان دەزانێت و توانای بەڵگەی نییە، بێگومان دەکەوێتە لادانەوە لە وەرگرتنی بەڵگەکان و تووشی ڕەتکردنەوەیان دەبێت.

* مەرج نییە هەرکەس پارچەکانی ئامێرێک بزانێت، بتوانێت بەیەکەوە بیانبەستێتەوە، ئەمەش هاوشێوەی زانستە، مەرج نییە ئەو کەسەی بابەتە جیاوازەکانی زانی بتوانێت ئەو بابەتانە دابەزێنێتە سەر واقیع و پێشهاتەکان.

* بەشێک لە گومڕاکردنی زانایان بۆ ئوممەت ئەوەیە بابەتێکیان بۆ بەڕەوا دابنێت بە مەرجەوە، لە کاتێکدا دەزانێت خەڵکی ڕەوا دانانەکەی وەردەگرن و مەرجەکانی وەلا دەنێن.

* قورسترین گومڕاکردنی زانایان ئەوەیە فەتواکەی جیا بکاتەوە لە خراپ بەکارهێنانی، فەتوای هەق بدات و خەڵکی بیکەنە پردێک بۆ ناهەقی، پێشەوا ئەحمەد ڕێگری کردووە لەوەی فەتوا بۆ خەلیفە بدات، گوتویەتی: دەترسم ببێتە هۆکار بۆ خراپەیەکی دیکە.

* زۆرێک لەو پاشگەزبوونەوانەی زانایان لە ئەمڕۆدا کە دەبیندرێت بەهۆی لادانی زانایانە بە فەسڵکردن و دامەزراندن، ئەوەی فەتوای بە فەرز بوونی نیقاب دەدا لە میسر، هەر ئەوە فەتوای بیدعەبوونی دەرکرد کاتێک بەو جۆرە داوای لێ کرا.

* بێگومان بڕیاردان لە بابەتی ئاییندا بەتاڵ و خاڵی نابێت لە تێکەڵبوونی ئارەزوو لەگەڵیدا، تەنانەت لە زانا باش و چاکەکارەکانیشدا هەر ڕوو دەدات، ئەم ئایەتە دواندنە لەگەڵ پەیامبەر داود: ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ﴾ [ص: ٢٦]

«ئەی داوود بێگومان ئێمە تۆمان کرد بە جێنشین (ی پێغەمبەرانی پێش خۆت) لە زەویدا کەوابوو تۆش لەنێوان خەڵکدا بەڕاستی فەرمانڕەوایی بکە شوێن هەواوئارەزووات مەکەوە با لە ڕێگای خوا لات نەدات، بێگومان ئەوانەی لەڕێگای خوا لادەدەن و گومڕا دەبن و سزای سەختیان بۆ هەیە چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لەبیر کردبوو.»

ئەمە چ هەواوئارەزوویەکە لەسەر پەیامبەرێک بێت و پاشان چاکەکارێک پارێزراو بێت لێی!

* هیچ وتەیەکی نامۆ نابینیت کە ئوممەت پێی تووشی بەڵا بووبێت و گەشەی کردبێت تیایاندا، ئەوا بێگومان بە ئاوی سامان و دەسەڵات ئاو دراوە لەسەر زەوی ئارەزووات. گەشە ناکات بەو سێ دانەیە نەبێت.

* هەرکەس فەتوای ناهەقی و باتڵ بۆ خەڵکی بدات، ئەوا تەوبەی لێ وەرناگیرێت تا هەق بۆ ئەو کەسانە ڕوون نەکاتەوە کە بەهۆیەوە لە ڕێ لایانداوە و گومڕا بوون، چونکە خودا لە پاش نەفرینکردنی ئەوانەی فەتوای باتڵ و ناهەقی دەدەن دەفەرموویێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ﴾ [البقرة: ١٦٠]

«مەگەر ئەوانەی کە پەشیمان بوونەوە و کردەوەی باشیان کردبێت و (ئەوەی شاردبوویانەوە) ئاشکرایان کردبێت.»

* لە قورسترین ئەرکەکانی نەفس ئەوەیە وەڵامی فەتوایەکی هەڵە بدەیەوە کە لە ئاکاریەوە دیاربێت هەواو ئارەزوو و بازرگانی کردن بەدینەوە بەسەریدا زاڵە، لە کاتێکدا خەڵکی وا وەری بگرن کە ڕایەکی هەڵقووڵاوی نییەت پاکییە. تۆش شتانێکی تێدا دەبینیت کە ئەوان نایبینن.

* هەموو ئەو شتانەی زانایان بڕیاری لەسەر دەدەن بە ئیجتهاد هەژمار ناکرێت کە خاوەنەکەی پاداشتی لەسەر وەربگرێتەوە، بەڵکوو ئەو موجتەهیدە پاداشت وەردەگرێت کە تەواو هەوڵ و ماندووبوونی گەڕدەخات لە کاتی نەبوونی دەقدا، مەرج نییە هەموو موجتەهیدێک ئیجتهاد بکات، لەوانەیە پەلە بکات یاخود شلگیری بکات و لەباتی پاداشت تاوانی بۆ بنووسرێت.

* کەسانی ئاسایی و نەشارەزا لە بەرانبەر حەقیقەت و ڕاستیدا وەک نابینا وان لەسەر ڕێگە، وەک چۆن کەسی نابینا دەستی درێژ دەکات و هەوڵ دەدات کەسێک بدۆزێتەوە دەستی بگرێت، ئاوەهاش دەبێت بگەڕێت ئەقڵی بۆ کەسێک درێژ بکات و هیدایەتی بدات.

* مرۆڤ زۆر خۆپارێزی دەکات لە هەڵبژاردنی پزیشکدا بۆ جەستەی، بەڵام شلگیری دەکات لە هەڵبژاردنی وتەی زانایان بۆ دینەکەی، شوێنکەوتنی ئاسانکارییەکانی پزیشکان جەستە خراپ دەکات وەک چۆن شوێنکەوتنی ئاسانکارییەکانی زانایان دین خراپ دەکات.

* پێویستە پرسیاری دونیانەویستی و خۆپارێزی لە زانایان بکرێت. ئیبن عومەر گوێی لە پیاوێک بوو دەیگوت: ئەوانە لە کوێن کە دونیا نەویستن و ڕوویان کردووەتە دوارۆژ؟ گۆڕی پەیامبەر و ئەبوبەکر و عومەریان نیشان دا، گوتی لەبارەی ئەوانەوە بپرسە.

# هەق، نیشانەکانی و دوژمنایەتییەکانی

* دەتواندرێت دەست و پێیەکان کۆت و بەند بکرێن، بەڵام ناتواندرێت ڕێ لە چاوەکان بگیرێت لە دیتنی هەق و زمانیش لە دەربڕینی ڕاستی: ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ۝ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ۝ وَهَدَيْنَـٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ۝﴾ [البلد: ٨-٩-١٠]

«ئایا دوو چاومان نەداوەتێ؟ هەروەها زمانێک و دوو لێومان پێ نەداوە؟ ڕێی چاک و خراپیشمان نیشان نەداوە؟»

* هەق لە خودی خۆیدا دیارە پێش ئەوەی بگات بە نەفس، بەڵام ئەگەر چووە نەفسەوە، ملکەچی ئارەزووی دەکات و دەیشێوێنێت: ﴿إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّىٓ﴾ [یوسف: ٥٣]

«بەڕاستی نەفس زۆر فەرماندەرە بە خراپە بێجگە لەو نەفسەی پەروەردگارم ڕەحمی پێ کردبێت.»

* هەق هیچ کەسێک ناناسێت، بەڵام پێویستە هەمووان هەق بناسن.

* هەق هیچ کەسێک ناناسێت، بەڵام پێویستە هەموو کەس هەق بناسێت. ئەقڵەکان لە دەوری هەق دەسووڕێنەوە بە ڕاستگۆ و درۆزنەوە، هەمووانیش بانگەشەی دەکەن.

* هەق خاوەنەکەی بەرز دەکاتەوە و ئارەزووش دای دەبەزێنێت: ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَـٰهُ بِهَا وَلَـٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ﴾ [الأعراف: ١٧٦]

«ئەگەر بمانویستایە بەو ئایەتانە پلەیمان بەرز دەکردەوە بەڵام ئەو خۆی نووساند بە زەوییەوە و دوای ئارەزووی خۆی کەوت.»

* هەق لە خودی خۆیدا بەهێزە، ئەگەر شوێنی وتووێژی بۆ بکەنەوە، هەق شکستی بەسەر نایەت ئەگەر دەنگی کپ نەکرێت، یان بە کەموکوڕییەوە دەرنەکەوێت لە ڕووی ناهەقییەکی تەواودا.

* حەق و ڕاستی پەیوەست نییە بە کاتەوە، بە تێپەڕبوونی کاتیش کۆن نابێت، حەق جێگیرە وخەڵکین بەرەو پیری دەچن یان لێی دووردەکەونەوە. حەق کاتێک کۆن دەبێت، واتای ئەوە ناگەیەنێت بۆچوونە نوێیەکەی تۆ شایستەترە و لەپێشتر بێت لێی.

* لا ڕێیان خۆیان لە حەق لا دەدەن بۆئەوەی خۆیان بەکۆنەپەرەستییەوە هەڵنەواسن، کەچی گیرۆدەی نوێگەری دەبن بەهۆی نوێبوونیەوە، نوێگەرییەکەی ئەوانیش بۆ دوای خۆیان کۆنە، حەقیش جێگیرە و پەیوەست نییە بە کاتەوە.

* زۆر جار حەق لە سەردەمانێکدا ئاوا دەبێت، وەکوو بانگەوازی پەیامبەرانی پێش پەیامبەر (محمد ﷺ)، هەرکەسێکیش بەرهەڵستی حەق بکات بە کار و کردەوەی خەڵکی و گەلان و باووباپیران، ئەوا بەڵگەکەی هەمان بەڵگەی گەلانی دژ بە پەیامبەرانە.

* حەق ڕەچەڵەک و ڕەگوڕیشە ناناسێت، هیچ شار و دێهاتێکیش پیرۆز ناکات، بەڵکوو مرۆڤ دەبێت لەحەق بگەڕێت، حەق لە دوای مرۆڤەکان ناگەڕێت، لە ڕیوایەتدا هاتووە: حیکمەت و دانایی ونبووی بڕوادارە.

* حەق بە ڕەچەڵەک ناناسرێت هەرچەندە بەرزیش بێت، ئەوەتا وەچەی پێغەمبەر ابراهیم کەسانی ستەم کاری تێداهەبوون. ﴿قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [البقرة: ١٢٤]

« (خوا) فەرمووی: بێگومان من تۆ دەکەم بە پێشەوای خەڵکی (ئیبراهیم) وتی: لە نەوەشم ئکەیت؟ (بە پێشەوا) فەرمووی: پێغەمبەرییێتی من ناگات بە ستەمکاران.»

* حەق ناگەڕێتەوە، بەڵام زۆر جار پەروەردگارمان دوای ئەخات، لەپێشی ڕووداو و بەڵاگەلێک دائەنێت، تاکوو بگاتە ئەوپەڕ بەهێزی و لە دڵاندا جێگیر ببێت.

* حەق پاڵناداتە ستایش و سەرکۆنەی خەڵکییەوە، بەڵکوو مانایەکە خۆی بە خۆی ڕاوەستاوە.

* کات و سەردەم حەق ناگۆڕن، حەقیش لە چەرخی دابونەریتی خەڵکیدا ناسووڕێتەوە، ئەگەر وابووبا، ئەوا دابونەریتە جیاواز و دژبەیەکانی گەلانمان کۆدەکردەوە و حەقمان تێدا بەرجەستە دەکرد، جەستەیەکی وا شێواوی لێ دەردەچوو پەروەردگار دروستی نەکردبێت.

* دەوڵەمەندی، هەژاری، تەندروستی، نەخۆشی، ترس و ئەمینی، ئەمانە کۆمەڵە هۆکارێکن دەبنە هۆی گۆڕینی دەروون، بەو هۆیەوە بۆچوونەکانیش دەگۆڕدرێن. هەق لە خودی خۆیدا پەیوەست نییە بە هیچ هۆکارێکی گۆڕانەوە.

* مرۆڤ کاریگەر دەبێت بە بۆچوونی کەسانی دیکە، چونکە سەرسام بووە بە ماڵ و سامان و پێگە و جوانییان، ئەمانە شتانێکی جیاوازن لە هەق، بەڵام فکرەکان لە ئەقڵدا دەچێنن، کەم کەس هەیە هەق لە کارتێکەرەکانی جیا بکاتەوە.

* مانەوە لەسەر فکرێک زۆر دەگمەنە، مرۆڤ ئەگەر دەوڵەمەند بوو، پاشان هەژار کەوت، دەگۆڕێت. ئەگەر کاربەدەست بوو، پاشان لابرا دەگۆڕێت. بە ئەندازەی گۆڕانکارییەکانی لە بەرز و نزمبوونی فکری دەگۆڕێت، هەق بوونی هەیە، بەڵام هەواوئارەزوو پاڵی پێوە دەنێت.

* زۆرێک لە خەڵکی فکرەکانیان دەگۆڕن بە گۆڕانی پێگەی کۆمەڵایەتییان لە دونیادا، چونکە هەقیان لەسەر شێوەی قازانجی خۆیان داناوە بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، هەق جێگیرە و خەڵکی بە دەوریدا دەسووڕێنەوە، نەک هەق بە دەوری خەڵکدا بسووڕێتەوە.

* هەندێک هەق تاڵە ئەگەر خۆت نەتچەشتووە (کارت پێ نەکردووە)، ئەوا مەیدە بە کەسانی دیکەش بیچەژن.

* هەق ناوەڕۆک و ناوەندێکی هەیە ئەگەر لە ناویدا نەبوویت، ئەوا لایەکان و قەراغەکانی بەیەکسانی نابینیت وەک ئەوەی خودا دەیەوێت، کاربەدەست و خەڵک و نەفس، ئەگەر لە پشت هەر کامێکیان بوەستیت، ستەم لەوی دیکەیان دەکەیت.

* زیرەکی ئەوەیە کە حەق بەوردی و وەکوو خۆی بناسیت، پاکیش ئەوەیە کە حەق هەڵبژێری بەسەر ڕای هەموو هاوڕێ و کەسە نزیکەکانتدا.

* هێز و سامان هەق دروست ناکەن بەڵکوو ویستراو یان بێزراوی دەکەن جا کاتێک کە نەمان، دڵ دەگەڕێتەوە بۆ هەق: ﴿لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ﴾ [الأنفال: ٦٣]

«ئەگەر بەختت هەرچی لە زەویدا هەیە، هۆگریت نەدەخستە نێوان دڵەکانیانەوە، بەڵام خوا هۆگریی خستە نێوانیانەوە.»

* گەورەترین هەق قورسترینە لەسەر نەفس، قورسترین هەقیش لەسەر نەفس -لە کاتی دان دانان بە هەڵەی نەفسدا- ڕێگریکردنی خراپەکارێکە کە مرۆڤ تەماعی پێی هەبێت و لێی بترسێت.

* ئەو کەسەی مەزنترین شوێنەوار و کاریگەریی هەیە، نزیکترینە لە هەقەوە، وەک چۆن ئەوەی درێژترین سێبەری هەیە، نزیکترینیانە لە ڕۆشناییەوە. ئەو کەسەی هیچ نوور و ڕۆشناییەکی نییە، ئەوا هیچ سێبەرێکی نابێت، بۆ خۆی دەژیێت و بۆ خۆشی دەمرێت.

* زۆرینەی ئەوانەی شوێنی هەق دەکەون لاوە تازە پێگەیشتووەکانن، بەڵام گەورەکان کەلەڕەق و سەرکەشی دەکەن بۆئەوەی لە باوباپیرانیانەوە بۆیان جێ

ماوە: ﴿فَمَا آمَنَ لِمُوسَىٰ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِنْ قَوْمِهِ عَلَىٰ خَوْفٍ مِنْ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أَنْ يَفْتِنَهُمْ﴾ [يونس: ٨٣]

«جا (لە سەرەتاوە) بڕوای نەهێنا بە مووسا چەند گەنجێک نەبێت لە گەلەکەی بەهۆی ترس و بیمیان لە فیرعەون و پیاوماقووڵ و گەورەکانیان نەوەک بیانگێڕێتەوە بۆ بێدینی.

* هەندێک لە خەڵکی شوێن هەق دەکەون، چونکە ئەوەی ویستوویانە بەدەستی بهێنن لە باتڵدا بەدەستیان نەهێناوە.

* خەڵکی لەسەر هەق یان لەسەر ناهەقی کۆببنەوە، بە هەر شێوەیەک بێت هیچ کۆمەڵێکیان پارێزراو نابن لە ستایش و ڕەخنە، کەمینەیەک سەرزەنشت بکرێن لەسەر هەق، باشترە لە زۆرێک لەسەر ناهەقی و باتڵ ستایش بکرێن.

* کەمینەیەکی جێگیر لەسەر هەق، نەک زۆرینەیەک لەسەر باتڵ: ﴿قُل لَّا يَسْتَوِي ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ﴾ [المائدة: ١٠٠]

«ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: پیس و پاک یەکسان نین، هەرچەند زۆرییێتی ئەو پیسە سەرنجی ڕاکێشابێت.»

* لێکترازانی خەڵکی لەسەر هەق باشترە لە کۆکردنەوەیان لەسەر باتڵ و ناهەقی: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ﴾ [النمل: ٤٥]

«سوێند بەخوا ناردمان بۆ گەلی سەموود برایان سالّح پێغەمبەر (عليه السلام) (پێی وتن) کە خوا بپەرستن کەچی ئەوان بوونە دوو کۆمەڵی دژ بە یەک.»

پەیامبەر سالح بە ئیمان و باوەڕ جیاوازی تێخستن.

* تەنیا ئەو کەسانە لە کۆتاییەکان ترسیان هەیە کە گومانیان لە سەرەتاکانیان هەیە، ئەوەی دڵنیایە لە سەرەتای کە لەسەر هەقە لە چی دەترسێت؟! زۆرێک لە خەڵکی ئاواتی مردن ناخوازن لەسەر ئەو ڕێبازەی لەسەری دەڕۆن «چونکە خۆشیان گومانیان لێی هەیە».

* کەسی دڵسۆز گرنگی بە کۆتاییەکان دەدات، ئەوانەی لەسەر ناهەقین گرنگی بە سەرەتاکان دەدەن، هەرچەندە چاو بۆ دوورتر بڕوانێت ئەوا پێیەکان باشتر دەچەسپێن.

* ئەگەر سەرەتاکان بە ئارەزوویەکی شاراوە تێکەڵ بکرێت، ئەوا ترسناکی کۆتاییەکان لە ئەقڵ دەشاردرێتەوە، هەرچەندە مرۆڤ نەزان بێت بە کۆتاییەکان ئەوەندەش بوێر دەبێت لە سەرەتاکان.

* هەق ناپێکرێت تەنها بە دوو تیر نەبێت: زانست و یەکلابوونەوە.

* بەڵگەکان دابڕێنە لە دەربڕەکانیان هەروەها لە زۆری و کەمی شوێنکەوتووانی و دایبڕێنە لە پەستانی واقع و ئارەزووی نەفس، بە تەنها لەگەڵیاندا بە و خودا سێیەمتانە. ئەوکات هەق لە ناهەقی و باتڵ جیا دەکەیتەوە.

* ناگەیت بە هەق ئەگەر نەزانیت یەکەم دوژمنت هەواوئارەزووی خۆتە: ﴿وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفۡسِكَ﴾ [النساء: ٧٩]

«هەر خراپەیەک تووش بوو، ئەوە لەخۆتەوەیە.»

* مرۆڤ هەندێک جار هەقی خۆش دەوێت، بەڵام ناتوانێت وەریبگرێت، بەهۆی تاوانێکەوە کە ئەنجامی داوە: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ﴾ [الأنفال: ٢٤]

«چاکیش بزانن کە بێگومان خوا دەتوانێت لەنێوان مرۆڤ و دڵیدا لەمپەر دانێت و نەهێڵێت تووشی هیچ خێر و چاکەیەک ببێت.»

ئەبوو تالیب بەردەوام پارێزگاری لە باوەڕداران دەکرد و لەدەوری باوەڕ بوو، بەڵام نەیتوانی شایەتومان بهێنێت.

* ڕوو بکەرە هەق، دەی بینییت هەرچەندە دووریش بێت، ئەگەر پشتی تێ بکەیت، ئەوا نای بینیت هەرچەندە لای پاژنەی قاچەکانیشت بێت. ڕوو بکەرە هەق، ڕووت تێ دەکات.

* هەرکەس ڕوو بکاتە هەق، دەیبینێت هەرچەندە دووریش بێت لێی، هەرکەسێک پشتی تێ بکات، نایبینێت ئەگەر لەلای پاژنەپێیەکانیشی بێت. هەرکەسێک بەدوای حەقدا بگەڕێت دەیدۆزێتەوە: ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ﴾ [الأنفال: ٣٢]

«خۆ ئەگەر خوا خێری تێدا بەدی بکردنایە، کارێکی دەکرد کە وشەی هەق و ئامۆژگاریەکانی قورئان ببیسن.»

* ئەگەر ویستت حەق بناسی بەبێ خەوش و لایەنگیری بۆ هیچ کەسێک، ئەوا خۆت بخەرە ئەم تەنگانەیەی فیرعەونەوە: ﴿وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰ إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ [یونس: ٩٠]

«تا ئەوساتە خەریک بوو بخنکێت و نوقم ببێت، ئەوسا وتی: وا بڕوام هێنا کە بەدەر لەو خوایە نەوەکانی ئیسرائیل بڕوایان پێ هێناوە هیچ پەرستراوێکی تر نییە شیاوی پەرستن بێت.»

* ئەو کەسە حەق ناناسێت کە خۆی نەناسیبێت. ئەگەر نەفست بەرزکردەوە بۆ سەرووی حەقی خۆی ئەوە خۆبەگەورەزان دەبیت و هەق بەسووک دەزانیت، ئەگەر لە ژێر حەقی خۆی دایبنێیت زەلیل دەبێت بۆ باتڵ.

* سەرلێشێوان لە پێکانی حەقدا نیشانەیە لەسەر زاڵبوونی شەیتان بەسەر کەسی سەرلێشێواودا: ﴿كَالَّذِي اسْتَهْوَتْهُ الشَّيَاطِينُ فِي الْأَرْضِ حَيْرَانَ﴾ «وەکو کەسێک کە شەیاتینی هەڵیخەڵەتاندبێت و چەواشە و سەرگەردان بووبێت و لە زەوییدا بسووڕێتەوە.»

یادی خوا شەیتان دوور دەخاتەوە و دوورخستنەوەی شەیتانیش سەرگەردانی دوور دەخاتەوە.

* خەڵکی دەیانەوێت بگەن بە هەق ئەگەر ترسی ستەمکاران نەبێت، ئەمەش لە کاتی هەڵبژاردنەکانی گەلاندا دەردەکەوێت: ﴿فَمَا آمَنَ لِمُوسَىٰ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ﴾ «جا لە سەرەتاوە چەند تازە لاوێکی هۆزەکەی نەبێت بڕوایان بە مووسا نەهێنا لەترسی فیرعەون و پیاوەگەورەکانیان کە سزایان بدەن و لەو ئایینە بەزۆر وەریان گێڕن.»

* شوێنکەوتنی هەق ئاسانە لەو کاتەی خاوەن هێزە و خەڵکی خۆشەویستییان بۆی هەیە، بەڵام خۆڕاگری لەکاتی لادان لێی و لاوازیدا قورسە و ئەمەش تەنیا بۆ دەگمەنەکانە: ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ﴾ «چوونیەک نین ئەو کەسەتان کە پێش فەتح و ئازادکردنی مەککە ماڵ و دارایی خۆی بەخت کردووە و لەگەڵ دوژمنانی خوادا جەنگاوە، لەگەڵ ئەوانەی تردا کە پاش فەتحی مەککە دێن و ماڵ و دارایی خۆیان بەخت دەکەن.»

* شوێنکەوتنی حەق لە کاتی لاوازبوونیدا گەورەترە لە شوێنکەوتنی لەکاتی بەهێزیدا، چونکە هێز هەیبەتێکی هەیە کە حەقیقەت دەشارێتەوە لە عەقڵەکان، ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً﴾ «بێگومان چوونیەک نین ئەوانەتان کە پێش ڕزگاری مەککە، یاخود پێش سەرکەوتن، ماڵ و سامانی بەخشیوە و جەنگاوە، چونکە ئەوانە پلە و پایەیان زۆر بەرزترە لەوانەی دیکە.»

* تاقیکردنەوەیەکی قورسە لەسەر هەق بمێنی لەکاتێکدا خەڵک وازی لێدەهێنن، لەوەش قورستر ئەوەیە کە بچیتە ناو حەقەوە لەکاتێکدا خەڵک خەریکن لێی دێنە دەرەوە.

* سەعاتێک ئارام گرتن لەسەر هەق لەو ساتانەی بە تەنهای، گەورەترە لە ساڵێک ئارام گرتن لەسەر هەق کە خەڵکیت لەگەڵدا بێت.

* مرۆڤ هەوڵ دەدات لە هەق تێبگات و ناتوانێت، لەوە گەورەتر ئەو کەسەیە کە سەیری هەق دەکات و بە باتڵ تێی دەگات، دەست بە هەموو هۆکارێکەوە دەگرێت و بەدیهێنەر لەبیر دەکات: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّـهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ﴾ «چاکیش بزانن کە بێگومان خوا دەتوانێت لەنێوان مرۆڤ و دڵییدا لەمپەر دانێت.»

* کاروباری ئەقڵ بەڕاستی سەیرە ستەم لە حەقیقەت دەکات لەبەرئەوەی لێی تێنەگەیشتووە! ئەگەر لێی تێگەیشت دەستدرێژی دەکاتە سەر ئەوەی کە لێی تێنەگەیشتووە، لە کاتێکدا کلیلی قفڵی تێگەیشتن لەلای خوای گەورەیە، با داوای لێ بکات، چونکە هەر ئەو بەخشەر و ڕێگرە.

* هەندێک لە حەقیقەتەکان بۆ تێگەیشتن پێویستیان بە وردبینی و تێڕامانێکی درێژە، وەک ئەو کەسەی سەعاتێک ورد دەبێتەوە لە مانگی نوێ لە ئاسماندا پاشان دەیبینێت، بە تێگەیشتنی تاکێک ئوممەت بەناهەق بەڕۆژوو دەبێت یان ڕۆژوو دەشکێنێت بە حەق.

* باتڵ لووتکەی هەیە وەکو لووتکەی شاخ، کە ئەو لووتکەیە لە هەمووی ئازاربەخشترە، بەڵام کاتەکەی کورتە و هاتنە خوارەوەیەکی خێرای بەدوادا دێت، جا سەرکەوتن بۆ ئەوپەڕی باتڵ وەکوو دابەزین نییە لێیەوە.

* هێز باتڵ ناچەسپێنێت لە زەویدا، بەڵکوو هەڵیدەواسێت جا هەرکاتێک ئەو هێزە نەما، باتڵەکەش دەکەوێت.

* هەق کاتێکی تایبەتی هەیە و باتڵ کاتێکی تایبەتی هەیە، جا باشترینی خەڵکی ئەوانەن کە شوێن هەق دەکەون لە کاتی لاوازی هەقدا، هەروەها خراپترینی خەڵکی ئەوانەن کە شوێنی باتڵ دەکەون لەکاتی لاوازی باتڵدا. ئاسانترین شت شوێنکەوتنی هەقە کاتێک بەهێز بێت و وازهێنانە لە باتڵ کاتێک کە لاوازە.

* هەر کاتێک دەنگی باتڵ تیایدا سەرکەوێت بەسەر حەقدا، هەندێک لە ئەهلی حەق خۆیان دەخەنە ناوەندەوە بۆئەوەی لەنێوان حەق و باتڵدا بووەستن و ئەمەش لەبەر لاوازییانە یان دوورِوویان. پاشان کە باتڵ ڕووخا، دەگەڕێنەوە.

* نەفس ئەگەر باتڵ و ناهەقی تێکەڵ بوو، ئەوا ڕقی لە حەق دەبێت و لێی ڕادەکات، جا پێویستی بە بوێری و ئارامگرتنە تاکوو نیشتەجێ دەبێت، پەیامبەری خودا (ﷺ) بە کەسێکی فەرموو: «موسڵمان بە» وتی: "حەزم لێی نییە؟!" فەرمووی: «موسڵمان بە ئەگەر حەزیشت لێی نەبێ»

* هەندێک جار نەفس چالاک دەبێت لەسەر باتڵ و بێتاقەت دەبێت لە هەق، شافیعی دەڵێت: پیرەمێردێکم دییت تەمەنی ٩٠ ساڵ دەبوو ڕۆژەکە هەمووی بە پێپەتی دەسووڕایەوە و خەڵکی فێری مۆسیقا و گۆرانی دەکرد، بەڵام کاتی نوێژ بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد.

* باتڵ ناگات بە دڵ، تاکوو بە فێڵ بەرگی هەقی بەبەردا نەکرێت: ﴿وَلَا تَلْبِسُواْ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُواْ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ [البقرة: ٤٢]

«بە زانینەوە ڕاستی لەگەڵ درۆ تێکەڵ مەکەن و ڕاستی مەشارنەوە.»

* زۆر کەم هەواوئارەزوو لەگەڵ هەق لە دەروونداکۆدەبێتەوە، ئەگەر هەواوئارەزووت لە لایەک بەدی کرد، ئەوا بزانە هەق لە لایەکەی دیکەیە: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ﴾ [النازعات: ٤٠)

«بەڵام ئەوەی لە پایە و شکۆی پەروەردگاری ترسابێت و حیسابی بۆ کردبێت و جڵەوی نەفسی گرتبێتەوە لە هەموو هەواوهەوەس و ئارەزوویەکی نادروست ...»

* ئەگەر هەق تەنها بوو لەڕووی دڵدا، ئەوا بێگومان دەچێتە ناو دڵەوە، بۆیە شەونوێژ و قورئان خوێندنی شەو وادەکەن مرۆڤ زیاتر کاریگەرتر بێت بە کارتێکەرەکان: ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا﴾ [المزمل: ٦]

«بەڕاستی شەو بێداریی و گفتوگۆ و پاڕانەوە و ڕازونیازە لەگەڵ پەروەردگاردا زۆر کاریگەرترە لەسەر شانی نوێژکار لە نوێژی ڕۆژ، چونکە شەو کاتی خەوو حەوانەوەیە و بۆ خوێندنی قورئانیش لەبارترە.»

* ئەو کەسەی دەڕوانێتە زانستی کەلام و دڵی نەخۆشە، ئەوا ئەوەی لەگەڵ نەخۆشییەکەیدا گونجاوە وەری دەگرێت، چونکە تەنها دڵە ڕاست و پاک و دوور لە گومانەکان سوود لە هەق وەردەگرن.

* ئەو کەسە لە حەق ناگات وەکوو خۆی کە پیسی باتڵ و ناهەقی گەرایی لە مێشکیدا هەبێت تا خۆی پاک نەکاتەوە لێی، وەک چۆن دەمێک چێژی ئاو ناکات کە تامێکی دیکەی تێدابێت، بیروبۆچوونەکان وەکوو ماددە وان گەر تێکەڵ بوون و دەرەنجامەکانیشیان کاریگەر دەبن.

* هەواوئارەزوو وەک بێهۆشکەر و ئارەق وایە بۆ ئەقڵ، کوێری دەکات لە دیتنی هەق و سەرگەردانی دەکات و لە تاریکایی بۆچوون و فکرەکاندا وێڵی دەکات: ﴿فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ﴾ [طه: ١٦]

«نەیهێلیت ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە قیامەت نییە و شوێنی ئارەزووی خۆیان کەوتوون، (لەو ڕاستییە) وێڵت بکەن، چونکە ئەوسا تیادەچیت و زەرەر دەکەیت.»

* مرۆڤ لە هەق لانادات تەنها بەهۆی هەواوئارەزووەوە نەبێت، بە ئەندازەی هەواوئارەزووی لە هەق لادەدات جا بە لای ڕاست یان چەپدا: ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [ص: ٢٦]

«کەوابوو تۆش لەنێوان خەڵکدا بەڕاستی فەرمانڕەوایی بکە، شوێن هەواوئارەزووات مەکەوە با لە ڕێگای خوا لات نەدات.»

* هەرکەس حوکمێکی خودا بەهۆی هەواوئارەزوویەوە ڕەت بکاتەوە، ئەوا بوێر دەبێت لەسەر ڕەتکردنەوەی حوکمێکی دیکەی هاوشێوەی، چونکە هەواوئارەزوو نەخۆشییەکی گواستراوەی دڵە کە بە هەموو ئەو فکر و بۆچوونانە دەگوازرێتەوە کە بەریان دەکەوێت، بە ناو فکرەکاندا بڵاو دەبێتەوە وەک چۆن نەخۆشی بە جەستەدا بڵاو دەبێتەوە.

* کەسانی خاوەن هەواوئارەزوو بیرکردنەوە و تێڕامانی زیاتر دەبێتە هۆی زیاتر لادانیان، ئەگەر دەربازی بوو لە ئارەزوو، تەنها کەمێک تێڕامان و بیرکردنەوەی بەسە: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾﴾ [المدثر: ١٨-١٩-٢٠-٢١]

«ئەو هەر ڕاما و هەڵیسەنگاند. دەک بەکوشت چێ چۆنی هەڵسەنگاند. دووبارە بەکوشت چێت چۆنی لێکداوەتەوە. لەپاشان تەماشایەکی کرد.»

* تێڕامان و بیرکردنەوە هەرچەندە درێژ بێت، جگە لە گومڕای و لادان هیچی دیکە بۆ خاوەن ئارەزوو زیاد ناکات: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾﴾ [المدثر: ١٨-١٩-٢٠-٢١]

«ئەو هەر ڕاما و هەڵیسەنگاند. دەک بەکوشت چێ چۆنی هەڵسەنگاند. دووبارە بەکوشت چێت چۆنی لێکداوەتەوە. لەپاشان تەماشایەکی کرد.»

* زۆر تەماشاکردنی بەڵگەکان بەردەوام ناتگەیەنن بە هەق، ئەگەر هەواوئارەزوو لەگەڵ تێڕامانەکەدا بوو، ئەوا کۆمەڵە ئەشکەوت و بۆشاییەکی خەیاڵی دەدۆزێتەوە لە بەڵگەکاندا. ئەگەر کەسەکە دوورکەوتەوە لە هەواوئارەزوو، ئەوا بچووکترین تێڕامانی بەسە.

* دڵ وەک ئاوێنە وایە، بەرانبەرەکەی هەڵناگێڕێتەوە، کەموکورتییەکی تێدابێ جوان نیشانی بدات، دڵت پاک بکەوە لە هەواوئارەزوو وەک چۆن ئاوێنە پاک دەکەیتەوە لە تەم و تەڵخی، ئەوکات هەق بەڕوونی دەبینیت: [وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ] «بەڵکوو ئەو دڵانە کوێر دەبن و هێزی دەرککردنیان نامێنێت.»

* عەقڵ تەرازووە، نابێت کێشانەی پێ بکەی لەکاتێکدا تەرازووەکە لارە و پارسەنگە، کەواتە هەردوو لاکانی خاڵی بکەوە لە هەموو خەوش و ئارەزوویێک تاکوو دەرئەنجامەکانی ڕاست دەربچێت.

* نەفس هەواوئارەزوویی ئاشکرا و نهێنی هەیە و مرۆڤ لە ڕاستی لادەدات بە ئەندازەی حەزی بۆ ئارەزووەکەی، لە فەرموودەدا هاتووە: «یبیع دینه بعرض من الدنیا» واتە: «دینەکەی دەفرۆشێت بە کاڵایەکی کەم لە دونیا.»

ئەنەس فەرمووی: "رأینا من باع دینه بدرهم." واتە: "کەسانی وامان بینی دینەکەی بە درهەمێک فرۆشت."

* ئەگەر هەواوئارەزوو زاڵ بوو بەسەر مرۆڤدا، ئەوا وای لێ دەکات نەتوانێت کردەوەکانی جیا بکاتەوە، ئەوانەی بۆ خودا ئەنجامی داوە لەوانەی بۆ ئارەزووی خۆی کردوویەتی.

* لە نیشانەکانی تەوفیق نەدانی خوا بۆ مرۆڤ ئەوەیە کە خودا دووری دەخاتەوە لە هەق و قورسی دەکات لەسەری تاوەکوو سستی دەکات لە وەرگرتنی هەق: ﴿وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ﴾ [التوبة: ٤٦]

«بەڵام خوا دەرچوونی ئەوانی پێ ناخۆش بوو بۆیە (خوا) خاوی کردنەوە (لە دەرچوون بۆ جیهاد) پێیان وترا دانیشن لەگەڵ جێماواندا.»

* هەندێک لە حەق قورسە لەسەر نەفس، تاکوو هەق قورستر بێت لەسەر نەفس، پاداشتی گەورەتر دەبێت لای خودای گەورە.

* زۆرێک لەوانەی هەق بە درۆ دادەنێن کاتیان تەرخان نەکردووە بۆ عەقڵیان تا تێڕامان بکات، خێرا بەدرۆی دەخەنەوە، جا لەسەریان قورسە کە بگەڕێنەوە بۆهەق بەهۆی خۆبەزلزانیانەوە: ﴿بَلۡ كَذَّبُواْ بِمَا لَمۡ يُحِيطُواْ بِعِلۡمِهِۦ وَلَمَّا يَأۡتِهِمۡ تَأۡوِيلُهُۥ﴾ [یونس: ٣٩]

«نەخێر ئەوان شتێک بە درۆ دەزانن کە هیچی لێ تێنەگەیون و بۆشیان لێک نەدراوەتەوە.»

* پەلەکردن ڕێگری لە عەقڵ دەکات لە تێڕامانی بەڵگەکان، بەهۆیەوە قەناعەتی بەرانبەر بەڵگەکان لاواز دەبێت، بۆیە هەندێجار ڕوودەدات تەنها یەک بەڵگە لای کەسێک جێی باوەڕە و کەسێکی دیکە باوەڕی پێ نابێت: ﴿خُلِقَ الْإِنسَانُ مِنْ عَجَلٍ ۚ سَأُرِيكُمْ آيَاتِي فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ﴾ [الأنبیَاء: ٣٧] «سروشتی ئینسان لەسەر پەلەکردن بەدیهێنراوە و بەزوویی تۆڵەی خۆمتان نیشان دەدەم کەواتە پەلە مەکەن.»

* دژایەتی حەق دەکەن لەکاتێکدا کە لێی ورد نەبوونەتەوە، وەکوو دژایەتی کردنێک بۆ هەڵگرانی و ڕقلێبوونەوەیەک لێیان: ﴿قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا بِالَّذِي آمَنتُم بِهِ كَافِرُونَ﴾ [الأعرَاف: ٧٦ ]

* دژایەتی هەق دەکەن لە کاتێکدا تێڕامانیان تێدا نەکردووە، بەڵکوو تەنها بەهۆی خۆبەگەورەزانی و ڕێگری لە هەڵگرەکانی هەق دەکەن.

﴿قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا بِالَّذِي آمَنتُم بِهِ كَافِرُونَ﴾ «ئەوانەی خۆیان بەزل دەزانی وتیان: دەسا بزانن! ئەو پەیامەی ئێوە بڕواتان هێناوە پێی، ئێمە ئینکاریی و حاشای لێ دەکەین.»

عەقڵەکان تێکدەچن ئەگەر هەواو ئارەزوو ئاڕاستەیان بکات.

* زۆرێک لە خەڵکی دەخوێننەوە، بەڵام ورد نابنەوە و تێڕامان ناکەن، جا بێبەش دەبن لە هەق بەهۆی خێرا تێپەڕینیان بەسەر بەڵگەکاندا، هەر بەمەش هاوبەشدانەران گومڕا بوون و خودای گەورە لۆمەی کردن: ﴿أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ﴾ [المُؤمنون: ٦٨]

«ئاخۆ ئەوان تێنەفکران لەم گوفتارە، واتە: لە قورئان.»

* پێویستە ڕاستی بە چاوی خۆت ببینی، بەڵام نەفس وادەکات بینین بەلایدا خێرا تێپەڕێت و بیشارێتەوە، چونکە پێچەوانەی هەواوئارەزووی دەکات. مافی خۆی بە حەق بدە لە تێڕامان، ڕاستی دەبینیت.

*هەرکەسێک ڕقی لە حەق بێت، پێش ئەوەی بەڵگەکانی ببیستێت، سوودی لێ نابینێت: ﴿قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَآتَانِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَارِهُونَ﴾ [هُود: ٢٨]

«نووح وتی: ئەی گەلەکەم هەواڵم بدەنێ ئەگەر من بەڵگەی ئاشکرام هەبێت لەلای پەروەردگارمەوە ڕەحمەتێکی پێ بەخشیبم لەلایەن خۆیەوە بەڵام ئەوە لە ئێوە شاردرابێتەوە و بەزۆر پابەندتان بکەین پێیەوە لەکاتێکدا ئێوە حەزی لێ ناکەن.»

* عەقل لە بەڵگە ورد دەبێتەوە، نەفسیش سەرقاڵی دەکات بە قسەکەر و شێوەیی و وەسفی تاوەکوو دوورکەوێتەوەو وردنەبێتەوە: ﴿وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ رَسُولًا﴾ [الفُرْقان: ٤١]

«ئەوانە کە تۆ دەبینن، هیچ ڕێز و پایەیەکت بۆ قایەل نابینن، بەڵکوو دەتکەنە گاڵتەجار و دەڵێن: ئا ئەمەیە خوا کردوویە بە پەیامبەر و ڕەوانەی کردووە؟»

* لە هەق ڕادەکەن چونکە ڕاهاتوون لەسەر باتڵ، وەکوو چاو چۆن ڕادەکات لە ڕووناکی کاتێک بە تاریکی ڕاهات: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ﴾ [الزُّمَر: ٤٥]

«کاتێک ناوی خوا ببرێت، دڵی ئەوانە کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نییە دێتەوە یەک و پڕ دەبێت لە ڕق و کینە!»

* تۆمەت مەدە پاڵ هەق، لەبەرئەوەی دڵت لێی ڕادەکات، ئەو دڵەی نوقوم بووە لە گومڕاییدا، لە ڕۆشنایی هەق ڕادەکات، وەک چاوێکی نوقومبوو لە تاریکیدا کە لە ڕووناکی خۆر ڕادەکات، کەواتە دڵت هۆگری هەق بکە، ڕادێیت لەسەر ئەو هەقە.

* هەرکەس خۆی ڕاهێنابێت لەسەر وەرنەگرتنی هەق، ئەوا لێی تێناگات ئەگەر هەموو ڕۆژێکیش گوێ بیستی بێت: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُواْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [یونس: ٤٢]

«کافران کەسی وایان هەیە گوێت لێ دەگرن (کە قورئان دەخوێنیت) جا ئایا تۆ گوفتارت بە کەڕان دەژنەوێنی؟ ئەگەر چی ئەو کەڕانە هیچیش تێنەگەن.»

* هەر کەس تەنها بۆ ساتێک سەیری هەق بکات بە تێگەیشتنی خۆی، دەبینێت ئەو کەسانەی لەسەر کەلەڕەقی ڕاهاتوون بە هیچ کاریگەر نابن و هیدایەت وەرناگرن، بێجگە لە زیادکردنی فرتوفێڵیان نەبێت، هیچی دی زیاد

ناکەن. گەلی نووح ٩٥٠ساڵ گوێبیستی حەق بوون کەس باوەڕی نەهێنا تەنها کەمێک نەبێت.

* بەڵگە سوودی نییە بۆ کەسێک کە نەیەوێت تێبگات: ﴿وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا﴾ [الأنعام: ٢٥]

«ئەگەر هەموو بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوون ببینن، بڕوای پێ ناهێنن.»

﴿لَا يُؤْمِنُونَ ۝ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ۝﴾ [یونس: ٩٦-٩٧]

«ئیتر باوەڕی ناهێنن، ئەگەرچ هەرچی بەڵگە و موعجیزە هەیە بۆیان پێش بێت، ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن، هەتا سزای بەئێش و ئازار دەبینن.»

* ئەگەر مرۆڤ لەنێوان خۆی و کەسێکی تردا بەربەستێکی دەروونی دروست بکات، ئەوا قبووڵی ناکات، ئەگەر تەنانەت لەلایەن پەیامبەری خواداشەوە بێت: ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ﴾ [البقرة: ٨٧]

«جا هەرکاتێک پێغەمبەرێکتان بۆ بهاتایە بەجۆرێک کە ڕێکی ئارەزووتان نەبووایە، لووت بەرز بوون و خۆتان بە گەورە گرتووە جا دەستەیەکتان (لە پێغەمبەران) بەدرۆ زانیوە و دەستەیەکتان کوشتوون.»

-* شوێنکەوتووانی هەواوئارەزوو ئامانجیان ئەوەیە حەق و ڕاستی ڕەتبکەنەوە، بەڵگەکانی تەنیا هێنانەوەی پۆزشە. گەلانێک حەق ڕەتدەکەنەوە لەبەرئەوەی کە پێیان وایە کۆنە: ﴿اساطير الاولين﴾ [القلم: ١٥] هەندێکیشیان ڕەتی دەکەنەوە لەبەرئەوەی پێیان وایە نوێیە: ﴿مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ﴾ [المؤمنون: ٢٤]

«ئێمە شتی وامان نەبیستووە لە باووباپیرە پێشووەکانمانەوە.»

* کەسانێک دەبینیت گفتوگۆ ناکەن لەسەر بەڵگەکان کەچی بەرانبەرەکەیان بە دواکەوتویی وەسف دەکەن، ئەمە ڕەفتارێکی سەردەمی نەفامییە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ [الأنعام: ٢٥]

«کاتێک بێن بۆ لات دەمدەمێ و بەربەرەکانیت لەگەڵ دەکەن ئەوانەی بێباوەڕن دەڵێن: ئەم قورئانە هیچ نییە بێجگە لە ئەفسانەی پێشینان.»

* بانگەوازی پەیامبەری خودایان بە دواکەوتویی وەسف دەکرد: ﴿أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ [القلم: ١٥]

«(ئەمان) ئەفسانەی پێشینانن.» دەڵێن بانگەوازەکەی دەمرێت و نامێنت بە نەمانی خۆی، بە دوابڕاو وەسفیان دەکرد، ئەوان مردن و دینەکەشیان مرد، ئەوەی کە مایەوە یادی پەیامبەر و دینەکەیەتی.

* زۆرکات مرۆڤەکان بەرپەرچی هەق دەدەنەوە، پێش ئەوەی لێی ڕابمێنن، لەبەر ئەوەی لە کەسێکەوە هاتووە کە حەزی پێناکات، هەق نادرێتە پاڵ هیچ کەس تا ڕاست بێت، بەڵکوو هەموو شتەکانی دیکە دەدرێنە پاڵ ئەو بۆئەوەی ڕاست بن.

* هەندێک مرۆڤ خۆیان پەیوەست دەکەن بە چەند بۆچوونێکەوە کە نە خۆشیان دەوێت و نە بڕوایان پێی هەیە، بەڵکوو لەبەرئەوەی دژی بۆچوونی بەرانبەرەکەیانە کە ڕقیان لێیەتی، ئەم جۆرە کەسانە زۆرترین گۆڕان و هەڵگەڕانەوەیان هەیە.

* زۆرێک لە خەڵکی پەرەئەدەن بە بۆچوونێک لەبەرئەوەی ڕقیان لە کەسانێکە لەبەر خودی خۆیان، بەوەش ڕقیان لە بۆچوونیان دەبێت، ڕاستی هەر ڕاستییە گەر ڕقیشت لە خاوەنەکەی بێت و باتڵ و ناهەقیش هەر ناهەقییە گەر خاوەنەکەیشت خۆش بوێت.

* کەسی ڕاستگۆ تەماشای خودی پەیامەکە دەکات، بەڵام کەسی خۆبەزلزان تەماشای پەیڕەوانی دەکات، ئەگەر ڕقی لێیان بوو، ئەوا ڕقی لە پەیامەکەش دەبێت: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ﴾ [الأعراف: ٧٥]

«وتیان بێگومان ئێمە بڕوادارین بەوەی پێی ڕەوانەکراوە.»

* لاوازی کەسایەتی و سامانی مرۆڤ هەندێجار ڕێگرە لە قبووڵکردنی ئەو ڕاستییەی پێیەتی لەلایەن ئەوانەوە کە ماددین: ﴿قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا﴾ [هود: ٩١]

«وتیان ئەی شوعەیب ئێمە تێناگەین لە زۆرێ لەوەی تۆ دەیڵێیت بەڕاستی ئێمە تۆ بە لاواز دەبینین لەناوماندا.»

لاوازی پەیوەندی چییە بە هەقەوە؟!

* ناتوانیت لە بەڵگەی کەسێکی هەژار تێبگەیت کاتێک قسەت لەگەڵدا دەکات و تۆش چاوت لەسەر جلە کۆنەکانی بێت، ٩٥٠ ساڵ هیچ سوودێکی نەبوو لەگەڵ گەلی پێغمبەر نووح (علیه سلام) ﴿مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأْيِ﴾ [هود: ٢٧]

«ئێمە تۆ نابینین جگە لە ئادەمییەکی وەک خۆمان و نابینین تۆ هیچ کەسێک شوێنت کەوتبێت جگە لەوانەی کە هەژار و پەستەکانمانن بێئاوەزا و ساویلکەن.»

* لە شوێنکەوتنی ڕاستی دەوەستێت چونکە پێی وایە ئەوانەی کە لەسەر ئەو ڕێگایەن هاوشانی ئەو نین و پێگەیان لەو نزمترە و پێی خۆش نییە لەگەڵ ئەوان بژمێردرێت ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ﴾ [الشعراء: ١١١]

«وتیان ئایا (چۆن) باوەڕ بە تۆ بێنین لەکاتێکدا ئەوانەی شوێنت کەوتوون پەسترین کەسن (هەژار و داماو و نەفام)ن.»

ئەم خۆجیاکردنەوەیە نەفامیە و لادانە لە ڕێگای ڕاست.

* شەیتان زاڵ نابێت بەسەر هیچ مرۆڤێکدا، هەتا باوەڕی لاواز نەبێت، کاتێک باوەڕی بەهێز بوو، دەسەڵاتی شەیتان لاواز دەبێت: ﴿إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾ [النحل: ٩٩]

«بەڕاستی ئەو (شەیتان) دەسەڵاتی نییە بەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە تەنیا پشتیان بە پەروەردگاریان دەبەستن.»

* شەیتان دەست دەکات بە فریودانی مرۆڤ بەپێی دووری و نزیکی لێوەی، سەرەتا چاکەکانی دەگۆڕێت بۆ ئەو شتانەی کە چاک نین و نەخوازراون، ئەو کەسەیشی کە کارێکی نەخوازراو ئەنجام دەدات، هانی دەدات بۆ ئەنجامدانی گوناهی بچووک، پاشان هانی دەدات بۆ گوناهی گەورە: ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ [البقرة: ١٦٨]

«دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون. خودا بە چەند هەنگاوێکی کەم ناوی برد.»

* شەیتان پەلە ناکات لە پێشڕەویکردنی مرۆڤ بۆ خراپە، بەڵکوو هەنگاو بە هەنگاو تا تووشی تاوانەکەی دەکات، دەیخاتە ناو تاوانەکە و ڕێگەی دەرچوونی بۆ ناهێڵێتەوە ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ [البقرة ٢٠٨]

«دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون. لەبەرئەوەی ڕێگەکەی تاریکە و پێویستی بە هۆگرکردن هەیە هەنگاو بەهەنگاو ئەوکارە دەکات.»

* ئیبلیس قسە و شیکارییەکی دۆزیەوە بۆئەوەی بیکاتە بیانوو بۆ کوفرەکەی، ئیدی کەس هەیە نەتوانێت بیانوو بۆ هەواوئارەزوو گومڕاییەکان بهێنێتەوە. بزانە بیانوو تێپەڕدەبێت بەسەر خەڵکدا، بەڵام تێبەڕنابێت بەسەر خودای گەورەدا.

# دامەزراوی و شکست و نسکۆ

* زۆرێک لە خەڵکی بۆ تاقیکردنەوە پەیڕەوکارن نەک خاوەن بیروباوەڕبن، هەربۆیە بە ڕوودانی بچووکترین گۆڕانکاری کاریگەر دەبن، تاکە شوێنکەوتوویەک بەتەنها کە خاوەن باوەڕێکی دامەزراو بێت باشترە لە هەزار کەس کە بە مردنی پێشەواکەیان پاشگەز ببنەوە، ئەوانەی لە پاش وەفاتی پەیامبەر هەڵگەڕانەوە وابەستەی خودی بانگەوازکار ببون نەوەک بانگەوازی و پەیامەکە، بێگومان سەرکەوتنی ئیسلام بە جێگیرەکان بەدەست دێت نەک بە کەسانی دیکە، بەتەنها ئەوەندەی کە شوێنکەوتەی بیروباوەڕێکی هەقەیت بەس نییە بەبێ چەسپانی ئیمان لە دڵدا، پەیامبەر گرنگی بە چاندنی ئیمان دەدا، نەک تەنها ملکەچبوونی خەڵکی. زۆرێک لەو لاساییکەرەوانەی لەمڕۆدا شوێن بانگەوازییە بریق و باقەکان کەوتوون، ئەو شوێنکەوتنەیان کۆتا دێت بە کۆتا هاتنی بریقوباقیی بانگەوازەکە یان بە مردنی پێشەواکەیان.

* ئەوەی لە دەسپێکی ڕێگە دەترسێت، ئەوا گومانی هەیە لە کۆتایی ڕێگەکەی، ئەوانەی جێگیر و بەردەوامن لە سەرەتادا ئەوانەن کە تەواو دڵنیان لە سەرنجامی کۆتایی ڕێگەکەیان. ڕاستگۆیان جێگیر دەبن و دووڕووانیش هەڵدەگەڕێنەوە.

* ئەوانەی لاوازترین یەقین و دڵنیاییان هەیە، ئەوانەن کە گوفتار دەردەبڕن و کاری پێ ناکەن، ئەم جۆرە کەسانە زۆر کەم لەسەر وتەکانیان جێگیر دەبن و دەبینیت لادان و هەڵگەڕانەوەیان زۆرە، زۆرینەی هەڵگەڕاوەکان لە مێژوودا ئەوانەن کە تەنها تیۆریسازی دەکەن و کردەوە ناکەن، ئەمانە خودا بۆی باس

کردووین و فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ۝ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ۝﴾ [الشعراء: ٢٢٥-٢٢٦]

«ئایا نابینی کە ئەوانە بە هەموو دۆڵ و شیوێکدا بەسەرلێشێواوی دەڕۆن (شیعر دەڵێن) و بەڕاستی ئەوانە شتێک دەڵێن کە خۆیان نایکەن.»

بەڵکوو ئەمان هەڵدەگەڕێنەوە بۆ هەمان بۆچوون و فکر کە لەوەوپێش لەسەری بوون و وازیان لێهێناوە، خودا دەربارەی ئەو سووڕانەوە و ناجێگیرییەیان دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ﴾ [النساء: ١٣٧]

«بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێنا و پاشان بێباوەڕ بوونەتەوە دواتر باوەڕیان هێنا و ئەوسا بێباوەڕ بوونەتەوە.»

کردەوەکان چەسپێنەری بیروباوەڕن، وەک مێخ وان بۆ چەسپاندنی خێمە، ئەگەرنا کەمترین با دەبووە هۆی فڕین و لادانی خاوەنەکانیان، ئەوانەی خاوەن عەقیدە و باوەڕێکی پووچەڵ و باتڵن ئەگەر کردووە بکەن، ئەوا چەسپاوتر لەسەر بیروباوەڕەکەیان دەمێننەوە لە بەرانبەر ئەو کەسانەی خاوەن عەقیدە و باوەڕێکی ڕاستن و کردەوە ناکەن، لاوازترین فکر و بیروباوەڕ ئەو فکرانەن کە کردەوە کردن بە ئەندامەکانی جەستەیان زۆر بەکەمی لە ڕێبازەکەیاندا داناوە، بەهێزترین کردەوە بۆ چەسپاندنی بەندە لەسەر ئایین بریتییە لە نوێژ، چونکە بەهێزترین کردەوەیە بۆ جێگیربوونی بیروباوەڕ، بگرە وەک پەرژینێکە بۆی، بەرانبەر هەڵگەڕانەوە دەوەستێتەوە و بەسەریدا سەردەکەوێت، خودا دەفەرمووێت: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾ [العنكبوت: ٤٥)

«نوێژ بکە بێگومان نوێژ بەرگری (نوێژکەر) دەکات لە کاری ناشرین و ناپەسەند (خراپە).»

کەمتەرخەمی لە نوێژدا، کەمتەرخەمییە لە پاراستنی بیروباوەڕ و شکانی پەرژینی دەوریەتی.

* هێزی دووڕوو لە زوبانیدایە و هێزی باوەڕدار لە دڵیدایە، زۆرێک لەوانەی هەڵدەگەڕێنەوە ئەوانەن زۆرترین وتە و کەمترین کردەوەیان هەیە، هەموو ئەوانەش کە کەمترین وتە و زۆرترین کرداریان هەیە زۆر دامەزراو چەسپاون.

* گەورەترین کەرامەت بەردەوامییە لەسەر هەق تا مردن.

* شوێنکەوتنی هەق لەو کاتەی خەڵکی بە پۆل ڕووی تێ دەکەن کارێکی ئاسانە، بەڵام جێگیربوون لەسەر هەق قورسە لەو کاتەی خەڵکی پشتی تێ دەکەن.

* ڕێگەی هەق زۆر درێژە، خودا لێپرسینەوەت لەگەڵ ناکات لەسەر ئەوەی نەگەیشتوویت بە کۆتا مەنزڵ، بەڵکوو لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکات لەبارەی جێگیر نەبوونت لەسەر هەق.

* ئەو کەسەی بە چەسپاوی لەسەر هەق مردبێت هەرچەندە نەگەیشتبێتە ئامانج، ئەوا خودا پاداشتی ئەوانەی دەداتێ کە گەیشتوونەتە ئامانج: ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾ [النساء: ١٠٠]

«هەر کەسێک لە ماڵی خۆی دەرچێت و کۆچ بکات بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی پاشان مردن پێی بگات، ئەوە بێگومان پاداشتی ئەو کەسە کەوتووەتە سەر خوا.»

* دامەزراوی لەلایەن خوداوەیە چەند کەسی زانا لە ڕێ لایداوە، چەندەها کەسی کەم زانستیش جێگیر و دامەزراو ماوەتەوە، یەکێک لە نزاکانی پەیامبەر (ﷺ) بریتی بووە لە «ئەی ئەو پەروەردگارەی دڵەکان ئاڵوگۆڕ دەکەیت دڵم جێگیر بکە لەسەر ئایینەکەت.»

* ﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ﴾ [الزمر:٣٧]

«هەر کەس خوا ڕێنموونی بکات، ئەوە هیچ گومڕاکەرێکی بۆ نییە.»

ئەو مرۆڤەی خودا دامەزراوی بکات، بە هیچ شتێک کاریگەری و گۆڕان و هەڵگەڕانەوەی بەسەردا نایات. ئەگەر نەفسی بیەوێت بیگۆڕێت، ئەوا ناتوانێت، چونکە دڵی بەدەستی خودایە، جا چ دەستێک زاڵ دەبێت بەسەر دەستی خودادا.

* مرۆڤ لاوازی و ترس و دڵەڕاوکێی لە پیادەکردنی ڕێگەی هەقدا تووش دەبێت ئەگەر خودا دامەزراوی نەکات، خودا بە مووسای فەرموو کاتێک گۆچانەکەی بوو بە مار ﴿لَا تَخَفْ﴾

مەترسە. لەکاتی دیتنی ساحیرەکاندا فەرمووی: ﴿لَا تَخَفْ﴾

«مەترسە»

جاکاتێک گەیشتە لای دەریاکە، پێی فەرموو: ﴿لَا تَخَفْ﴾

«مەترسە»

* ژینگەی گومڕای و خراپ کەسێک گومڕا ناکات کە خودا جێگیری بکات و ڕێنمووی بکات، مووسا پەیامبەرێکی ئولول عەزمە و لە ماڵ و ژینگەی فیرعەون گەورە دەبێت: ﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ﴾ [الزمر:٣٧]

«هەر کەس خوا ڕێنموونیی بکات، ئەوە هیچ گومڕاکەرێکی بۆ نییە.»

* دروستکردنی یەک ئەقڵ باشترە لە شوێنکەوتنی هەزار کەس بەهۆی جووڵاندنی عاتیفە و سۆزیانەوە، ئەقڵ جێگیرە و عاتیفە و سۆز دەمرێت، یەک کەسی دامەزراو لە هەزار کەسی هەڵگەڕاوە باشترە.

* زۆرینەی ئەوانەی لە هەق هەڵدەگەڕێنەوە ئەوانەن کە عاتیفە و سۆز بەڕێوەی بردوون، نەک زانستێکی ڕەگداکوتاو، ئەگەر بەڵا و تاقیکردنەوە هات، زانست جێگیر دەبێت و عاتیفە دەڕوات و نامێنێت.

* کاتێک ئەمڕۆ لەسەر هەقیت، ئەوە ناگەیەنێت سبەینێش لەسەر هەق دەمێنیتەوە، ﴿ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ﴾ [الأنفال: ٢٤]

«وەڵامی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) بدەنەوە کاتێک بانگتان دەکەن بۆ لای ئەو (ئایینەی) کە زیندووتان دەکاتەوە بشزانن بەڕاستی (ویستی) خوا دەبێتە بەربەست لەنێوان ئادەمی و دڵیدا.»

* لە سەردەمی هەڵگەڕانەوە و لاداندا پێویستە خۆ پەنادانت بە خودا زۆر بێت، ئەبوو بەکری سدیق لە کاتی هەڵگەڕاوەکاندا قنووتی لە نوێژەکانیدا دەخوێند و ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا﴾ [آل عمران: ٨]

«ئەی پەروەردگارمان لای مەدە (لەڕێی ڕاست) دڵەکانمان دوای ئەوەی کە ڕێنموونیت کردین.»

* ئارامگری و لەخودا ترسان پایەی جێگیر بوونن، ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا﴾ [آل عمران: ١٢٠]

«بەئارام بن (لەسەر گوێڕایەڵی خوا) و لەخوا بترسن پیلانی ئەوان هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنێت.»

* ئەو کەسەی لە پەنهانیدا پەرستشی زۆر بێت، خودا لە کاتە تەنگانە و تارییکیەکاندا جێگیری دەکات.

* گەورەترین هۆکاری جێگیری بریتییە لە پەرستشی پەنهانی، هەروەها گەورەترین هۆکاری هەڵگەڕانەوە ئەنجامدانی تاوانە لە پەنهانیدا.

* یادی خودا هۆکاری جێگیربوونە لەکاتە قورس و تەنگانە و فیتنەکاندا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ [الأنفال: ٤٥]

«ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ (لە جەنگدا) لەگەڵ کۆمەڵێکدا ڕووبەڕوو بوونەوە خۆ بگرن (هەڵنەیەن) و یادی خوا زۆر بکەن بۆئەوەی سەرکەوتوو بن.»

* خودا سوننەتێکی هەیە، هەر شتێک لە سنوور تێپەڕێت و زیاد بکات، بەو ئەندازەیە لە ناوەندگیری دێتە خوارەوە، بە هەمان شێوە بە ئەندازەی شلگیریش زیادەڕەوی زیاد دەکات، ئەمەش خراپیی توندڕەوی و شلگیرییە.

* دڵنیا مەبە لەوەی لادان و هەڵگەڕانەوەی گەورەت بەسەر نەیەت، پاش ئەوەی بەسەر شەیتاندا هات.

* هەموو لادانێک لە هەق و ترس لە نزیکبوونەوە لێی، بەهۆی تاوانێکەوە دروست بووە کە تەوبەی لێ نەکراوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ﴾ [آل عمران: ١٥٥]

«بەڕاستی ئەوانەی پشتیان هەڵکرد لەناوتاندا لەو ڕۆژەی کە هەردوو کۆمەڵ گەیشتن بەیەک (لەئوحوددا) بێگومان تەنیا شەیتان هەڵیخلیسکاندن بەهۆی هەندێک لەو گوناهانەی لەوەوبەر کردبوویان.»

* ئەو کەسەی لە هەق لادەدات، یەکەم شت پەرستشی کرداری تێدا لاواز دەبێت، پاشان بەشوێنیدا لادانی بۆچوون و زانستی بەسەردا دێت. لادان و هەڵگەڕانەوە بریتییە لە کەوتن، هیچ کەس ناکەوێت ئەگەر لە دوولاوە پاڵپشتی هەبێت: لایەنی «زانست» و لایەنی «کردار».

* یەکەم دەستپێکی لادان بە شێوەیەکی لاواز و پەرتەوازە لە کەسەکەدا دەردەکەوێت، خۆ ئەگەر وەها خۆی نیشان دەدا کە بەتوندی دەستی گرتووە بەو بیروباوەڕە تازەیەوە، ئەوە عاتیفە و سۆزە نەک بیروباوەڕ و عەقیدە، چونکە عەقیدە بەبێ زانستی تەواو بەدەست نایات. هەر بەو جۆرەیە ئەو کەسەی لە بابەتە جێگیرەکاندا دەڵێت دوو وتە هەیە: چونکە وتە نامۆکە لەمێشکیدا ئامادەیە و بەگەورە ڕایگرتووە، وای لێ هاتووە لەگەڵ وتە بنەڕەتییەکە هاوتای بکات و باسی بکات، ئەمەش لادانە بە ناوی هەقەوە.

* ئەوانەی لایانداوە لە هەق زۆرجار دەگەڕێنەوە سەر ئەو کارانەی کە پێشتر لە پەنهانیدا کردوویانە. کەواتە پەیوەندیت بەهێز بکە لەگەڵ خودا لە پەنهانیدا، دەتپارێزێت لە ئاشکرادا.

* دڵی ئەو کەسانە ڕابگرە کە گەڕاونەتەوە و تەوبەیان کردووە لە لادانەکانیان، بەڵام دڵنیا مەبە لێیان! لەوانەیە جارێکی دیکە تووشی لادان ببنەوە: ﴿لَّن تَخْرُجُواْ مَعِيَ أَبَدًا وَلَن تُقَٰتِلُواْ مَعِيَ عَدُوًّا إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ [التوبة: ٨٣]

«هەرگیز ئێوە لەگەڵ مندا دەرناچن بۆ جیهاد و هەرگیز ئێوە لەگەڵ مندا جەنگ ناکەن لەگەڵ هیچ دوژمنێکدا چونکە بێگومان ئێوەڕازی بوون بە دانیشتن لە یەکەم جاردا.

* ئەو کەسەی زانست و زانیاری هەبوو دەربارەی هەق، پاشان هەڵگەڕاوەتەوە لەهەق، کەم جار ڕوودەدات بگەڕێتەوە سەر هەق: ﴿كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ﴾ [آل عمران: ٨٦]

«چۆن خوا ڕێنموونی گەلێک دەکات بێبڕوا بوون دوای بڕواهێنانیان.»

جا ئەو جۆرە کەسانە بەهۆی ئەو سەرکەشییەی کە هەیانە، زیاتر دژایەتی هەق دەکەن وەک لە کەسێک کە هەر لە سەرەتاوە لەسەر ناهەقی بووبێت.

* ئەو کەسەی لە هەق لایداوە، کەم هەیە بگەڕێتەوە، چونکە سەرکەشە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًا﴾ [النساء: ١٣٧]

«بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە پاشان بێباوەڕ بوونەتەوە و دواتر باوەڕیان هێناوە ئەوسا بێباوەڕ بوونەتەوە، پاشان لە بێبڕواییدا زیاتر ڕۆچوون. خوا هەرگیز لێیان خۆش نابێت و ڕێنماییان ناکات بۆ ڕێگای ڕاست.»

* ئەو کەسەی لە هەق لایداوە و پاش ئەوەی باوەشی پێدا کردبوو، گەڕانەوەی زۆر سەختترە بۆ هەق بە بەراورد بەو کەسەی لەوەو پێش لەسەر هەق نەبووە، چونکە دژایەتی خاوەن هەقەکان زیاتر دەکات وەک لە خودی هەق: ﴿كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ﴾ [آل عمران: ٨٦]

«چۆن خوا ڕێنموونی گەلێک دەکات کە بێبڕوا بوون دوای بڕوا هێنانیان.»

* ئەو کەسەی لە هەق لادەدات، زۆر سەرکەشترە لەو کەسەی کە لە سەرەتاوە لەسەر هەق نەبووە، چونکە ئەو هەقی ناسیوە و دەزانێت لە کوێوە زەفەری پێ بەرێت و فێڵی لێ بکات: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ﴾ [آل عمران: ٩٠]

«بەڕاستی ئەوانەی کە بێبڕوا بوون دوای بڕواهێنانیان، پاشان زیاتر بێبڕوا بوون هەرگیز تەوبەیان لێ گیرا ناکرێت.»

* ئەگەر ڕێژەی کەمتەرخەمیت لە دەستگرتنت بە هەقەوە زۆر بوو، وادەکات دەستگرتنت بە ناهەقییەوە زیاد بکات: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًا﴾ [النساء: ١٣٧]

«بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە پاشان بێباوەڕ بوونەتەوە و دواتر باوەڕیان هێناوە ئەوسا بێباوەڕ بوونەتەوە، پاشان لە بێبڕواییدا زیاتر ڕۆچوون. خوا هەرگیز لێیان خۆش نابێت و ڕێنماییان ناکات بۆ ڕێگای ڕاست.»

* کەمتەرخەمی لە هەق گومانت بۆ دروست دەکات لەو هەقەی لەسەری بوویت بۆیە کەسانێک دروست دەبن کە لادەدەن لە هەق: ﴿وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ [آل عمران: ٧٢]

«دەستەیەک لە خاوەن نامەکان وتیان (بە هەندێکیان) بڕوا بێنن بەو قورئانەی کە نێردراوەتە خوارەە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە سەرلەبەیانیان (بە فێڵ) بێبڕوا ببنەوە دەمەو ئێوارە بەڵکوو ئەوانیش پەشیمان ببنەوە.»

* کەسانێک شوێن هەق دەکەون و لادانیان لە هەق دەشارنەوە، تاکوو گومان بخەنە دڵی ئەوانەوە کە جێگیرن لەسەر هەق: ﴿وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ [آل عمران: ٧٢]

«دەستەیەک لە خاوەن نامەکان وتیان (بە هەندێکیان) بڕوا بێنن بەو قورئانەی کە نێردراوەتە خوارەە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە سەرلەبەیانیان (بە فێڵ) بێبڕوا ببنەوە دەمەو ئێوارە بەڵکوو ئەوانیش پەشیمان ببنەوە.»

* لادان لە بیروباوەڕێکەوە بۆ بیروباوەڕێکی دیکە، ئەوە ناگەیەنێت یەکێکیان هەق بێت، بانگەشە کردن بۆ ئەوە دژیەکی لە خۆدەگرێت چونکە هەموو بیروباوەڕێک کەسانێک دەچنە ناوی و کەسانێک لێی دەردەچن، جا هەق کامەیانە لەوکاتەدا؟! دەبینین شانازی دەکرێت بە هەندێک لەوانەی لە ڕێگە لایانداوە، وا نیشان دەدرێن کە ڕاستییان دەرخستووە، هەندێک جار داوایان لێ دەکرێت چیرۆکی پەشیمانی و پاشگەزبوونەوەیان بنووسنەوە، هەندێک جار بۆ پەندوەرگرتن بە سەلەفی یان سەحەوی پێشوو ناویان دەبەن، لەگەڵ ئەوەی پێشەوای لادەرەکان کە شەیتانە لەوەپێش فریشتە بووە -لەسەر بۆچوونێک- عەبدوڵڵای کوڕی جەحش لەوەو پیش هاوەڵی پەیامبەر بووە، هۆکارەکانی هاتنە ناو و چوونەدەر لە بیروباوەڕەکان لە ژمارە نایەن.

* گەورەترین هۆکاری بێئاگایی، سەرقاڵبوونە بە ناهەقانەوە لەبری سەرقاڵبوون بە خاوەن هەقەکانەوە، ئەمەش بە بێئاگابوون لە حیکمەتی خودا لە لادانی دڵەکان و جێگیرکردنیان بە دڵنیابوون لە پیلانی خودا دادەنرێت، هیچ لادەرێک نییە شارەزاتر بێت بە هەق هێندەی شەیتان.

* خودا دەفەرمووێت ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ [التين: ٤]

«سوێند بە خوا بەڕاستی ئینسانمان دروست کرد لە جوانترین شێوەدا.»

ئەو کەسەی وا گومان دەبات کەسانێکی بەڵەک و ناکامی دۆزیوەتەوە و خەڵکی دابەش دەکات بۆ تەندروست و نەخۆش، ئەوە دەیەوێت بگاتە ناهەقییەک بە بەڵگەیەک کە هەقە بەڵام پەراوێزخراوە. هەر بەو جۆرەیە ئەو کەسەی لە بابەتە جێگیرەکاندا دەڵێت دوو وتە هەیە: چونکە وتە نامۆکە لە مێشکیدا ئامادەیە و بەگەورە ڕایگرتووە، وای لێهاتووە لەگەڵ وتە بنەڕەتییەکەدا باسی بکات و بڵێت هاوشێوەن، ئەمەش لادانە بە ناوی هەقەوە. ئەو پەروەردگارەی کوێر و کەڕ و ناکامی دروست کردووە دەزانێت وەک چۆن شارەزایە بە تەندروستەکان کاتێک فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ [التين: ٤] «بەڕاستی مرۆڤمان لە باشترین پێکهاتە و بنیاددا دروست کردووە.»

* زۆرێک لە خەڵکی باوەش دەکەن بە فکرێکدا بەبێ ئەوەی باوەڕیان پێی هەبێت، بەڵکوو بۆ ڕاکردن لە بۆچوونێکی دیکە ئەو کارە دەکەن، دەیکەنە پەناگە بۆ خۆیان، ئەمە پیشەی زۆرینەی ئەو کەسانەیە کە لادەدەن و هەڵدەگەڕێنەوە.

* هەندێک لە خەڵکی باوەڕیان بە هەق هەیە، چونکە یەکەم شت کە فێری بووە و زانیوەتی ئەوە بووە، یاخود هێز و جەماوەری لە ناهەقی و باتڵ زیاتر بووە، جا کاتێک ناهەقیی جەماوەری زیاتر بوو، ئەوا ئەویش هەڵدەگەڕێتەوە لە هەق و بەرەو ئەو ناهەقییە دەڕوات لە کاتێکدا پێی وایە لە ناهەقییەوە دەڕوات بەرەو هەق، لە ڕاستیدا ئەو هەڵخەڵەتاوە بە ڕووکەشی دەرەوە، لە

ڕووکەشێکی لاوازەوە ڕۆیشتووە بۆ ڕووکەشێکی بەهێز و گرنگی نەداوە بە ناوەڕۆکی بیروباوەڕەکان تا وردەکاری تێدا بکات.

* هەندێک لە خەڵکی باوەڕیان بە هەق هەیە، چونکە هێز و ڕەشایی لە ناهەقی و باتڵ زیاترە، جا کاتێک ناهەقی جەماوەری زیاتر بوو، ئەوا ئەویش هەڵدەگەڕێتەوە لە هەق و بەرەو ئەو ناهەقییە دەڕوات لە کاتێکدا پێی وایە لە ناهەقییەوە دەڕوات بەرەو هەق، لە ڕاستیدا ئەوە باوەڕهێنانە بە ڕووکەش، نەک بە ناوەڕۆک.

* زۆرێک لە خەڵکی لەسەریان قورسە زۆر چاوەڕوانی سەرکەوتن بکەن بۆیە لادەدەن و هەڵدەگەڕێنەوە، بێئاگان لەوەی خودا بەڵێنی داوە هەق سەربخات، نەک کەسەکان، زۆرێک لە هەوەڵان وەفاتیان کرد پێش ئەوەی هێز و دەوڵەتی پەیامبەری خودا (ﷺ) ببینن.

* زۆرێک لە هۆکاری هەڵگەڕانەوەی کەسە دیار و پێشەنگەکان لە هەق پەلەکردنیانە بۆ بینینی دەرئەنجامەکان: ﴿فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡ﴾ [الأحقاف: ٣٥]

«کەواتە خۆگر بە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) هەروەکوو پێغەمبەرانی خۆڕاگری بەهێز دانیان بەخۆدا گرت و پەلە مەکە.»

بەشوێن ڕێگەیەکی دیکەدا دەگەڕێن ئەگەر ڕێگەکە درێژ بێتەوە و سەرکەوتن دوواکەوێت.

* ﴿إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠﴾ [الأحزاب: ١٠]

«کاتێک (بێباوەڕان) هێرشیان بۆ هێنان لەسەرووتانەوە و لەخواروووتانەوە (چواردەوری مەدینەتان گرت) و چاوەکان ئەبڵەق بوون و دڵەکان (لە ترسا)

گەیشتبوونە گەروو و گومانی جۆربەجۆرتان بەخوا دەبرد.»

ئەو ترسەی لەگەڵ هەقدا دروست دەبێت، هەلێکە بۆ شەیتان بۆ گۆڕینی خەڵکی، چونکە دەروون لاواز دەبێت و بەشوێن دەرچەیەکدا دەگەڕێت لە کاتی فیتنەدا، بەهانە شەیتانییەکان دەکرێنەوە، زۆرێک لەوانەی لایانداوە و هەڵگەڕاونەتەوە لە قۆناغی ترسدا هەڵگەڕاونەتەوە نەک لە ئارامیدا، کەم کەمە دەستیان کردووە بە لادان و گۆڕان.

* هەڵگەڕانەوە و لادانی لاوازەکان لە هەق کاریگەری دەکاتە سەر کەسانی دیکە، پێشخستنیان لە سەرەتاوە کارێکی هەڵەیە: ﴿لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا﴾ [التوبة: ٤٧]

«ئەگەر لەگەڵتاندا دەرچووبوونایە، هیچ شتێکیان بۆ زیاد نەدەکردن بێجگە لە تێکدان و خراپە.»

﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ﴾ [آل عمران: ١٤٦]

«زۆر لە پێغەمبەران جەنگ و کوشتاریان کردووە لەگاڵیاندا، زۆر لە زانایان و خواناسان، جا سست و دەستە پاچە نەبوون.»

# شوناسی ئیسلامی و بەڕۆژئاواکردن

* ئەوەی ڕۆژئاوا بە داگیرکاری و جەنگ بڵاوی کردەوە لە کەلتوور و شوێنکەوتوویی و ئەوانەی پەیوەستن پێیەوە، لەمڕۆدا ڕاگەیاندنی عەرەبی بەو ڕۆڵە هەڵدەستن و بەبێ جەنگ کردن بڵاوی دەکاتەوە.

* عەرەبە نەفامەکانی سەردەمی کۆن لە دینداریدا زۆر باشتر بوون لە نەفامەکانی ئەمڕۆ، چونکە نەفامانی کۆن شوێن باووباپیریان دەکەوتن، بەڵام ئەوانەی ئەمڕۆ شوێن دوژمن دەکەون، بەڵگەیان بۆ ئەو کارەیان: ﴿وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ﴾ [الزخرف: ٢٣]

«بەڕاستی ئێمە لەسەر ئایینی ئەوان دەڕۆین.»

* کاتێک دەڵێیت بەرزکردنەوەی پۆشاک بۆ سەروو قولەپێ ڕێبازی پەیامبەرە، زۆرێک خۆیان بەگەورە دەزانن بەرانبەری، بەڵام کاتێک دەبینیت بۆتە ڕێبازێکی ڕۆژئاوایی لە ئەمڕۆدا، دەبینیت زۆرێک لە پانتۆڵەکان تاکوو نیوەی قاچ بەرز دەکرێتەوە. هەردووکیان یەک وێنەن، بەڵام دانەرەکەیان جیاوازە!

* دەوڵەتە ئیسلامییەکان ئیسلامیان کردووەتە یاسا و دەستوور بەڵام جێبەجێی ناکەن، و دەوڵەتانی ڕۆژئاوا ئەقڵیان کردووەتە دەستوور، بەڵام جێبەجێی دەکەن، جا دەبینیت چەندەها نەوە پەیدا بوون کە گومانی خراپ بە ئیسلام دەبەن و گومانی چاکیان بە ڕۆژئاوایە.

* زۆرێک لە نووسەران ئەو دەقانە دەهێننە پێش کە نەرمونیانی ئیسلامی تیادایە، ئەم کارەشیان بۆ ئەوەیە وێنای ئیسلام جوان نیشان بدەن، ئەو

دەقانەش دەشارنەوە کە دوژمنایەتی نێوان هەق و ناهەقی تیادایە، ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی نەوەیەکی سەرکز و سەرشۆڕ لەژێر پەردەی لێبوردەییدا.

* ئیسلام مافی ئاژەڵی زۆر زیاتر داناوە لەوەی ڕۆژئاوا بۆ مافی مرۆڤ دایانناوە، بەڵام دادگەری لە ڕۆژهەڵاتدا نەماوە، بۆیە ئیسلام دیار نییە، لە ڕۆژئاواشدا نەماوە بەوەی مرۆڤیان تێکەڵ بە ئاژەڵ کردووە.

* خراپەکاری و ڕەوشت نزمی لە ڕۆژئاوادا گەل بەسەر دەسەڵاتدا دەی چەسپێنێت، بەڵام لە ڕۆژهەڵاتدا دەسەڵات بەسەر گەلدا دەی چەسپێنێت. بۆیە ڕەوشت نزمی لە ڕۆژئاوا پەرەدەسەنێت و بەردەوام دەبێت، بەڵام لە ڕۆژهەڵات پەرە ناسەنێت و بەردەوام نابێت.

* ستایشی گەلانێک دەکەن کە بەرنامە و یاسایان داناوە و پەیوەستن پێیەوە، لەگەڵ ئەوەی باوەڕیان بە خودا هەیە کە بەدیهێناون و پەرتووکی بۆ دابەزاندوون و فەرمانیان پێ دەکات پەیوەست ببن بەو پەرتووکەوە، بەڵام ئەوان دەیانەوێت خۆیان دەرباز بکەن لێی ئەو کارەشیان وەک پێشکەوتنخوازی دەبینن!

* لە فەرموودەدا هاتووە «لەو کاتەوەی ئادەم لە زەویدایە فیتنە و ئاشووبێک نییە گەورەتر بێت لە فیتنەی دەجال، خودا هیچ پەیامبەرێکی نەناردووە گەلەکەی لە دەجال ئاگەدار نەکردبێتەوە، ئێوە کۆتا ئوممەتن و هەر لەناو ئێوەدا دەردەچێت.»

* خەڵک ڕۆژئاوا بەگەورە دادەنێن بەهۆی هێز و تەکنەلۆژیایانەوە، جا دەبێت چۆن بن بەرانبەر دەجال کە خەڵکی تووشی فیتنە دەکات و تەنانەت لە کاروباری ئاسمانیشدا دەستوەردان دەکات و باران دەبارێنێت و دەیوەستێنێت و دەژێنێت و دەمرێنێت، فەرمان دەکات بەروبومی زەوی دەربچێت ڕاستەوخۆ دەردەچێت؟!

* هەر شکۆمەندی و هێزێک لە جگە لە خودا بخوازرێت کاتییە و بەردەوام نابێت، سەرشۆڕی و پەشیمانی بەشوێندا دێت: ﴿أَيَبۡتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا﴾ [النساء: ١٣٩]

«ئایا بەتەمان سەربەرزییان لای ئەوان دەست کەوێت؟ (بۆچوونێکی هەڵەیە) چونکە بەڕاستی سەربەرزی و باڵادەستی هەمووی بۆ خوایە.»

* پێشینەکانمان هەژار بوون، بەڵام بوونە سەرداری هەموو ئوممەتان، موسڵمانانی ئەمڕۆ دەوڵەمەندن، بەڵام زەبوونترین و لاوازترین ئوممەتن. چونکە خودا شکۆ نادات بەوانەی ناپاکی لێ دەکەن، هەرچەندە دەوڵەمەندیش بن، ئەوانەش سەرشۆڕ ناکات کە سەرخەرین هەرچەندە هەژاریش بن.

* ئەگەر خودا ئوممەتێک یان دەوڵەتێکی شکۆدار کرد بە ئیسلام، پاشان ئەوان دەستیان کرد بە لادان لە ئیسلام، ئەوا گۆڕینیان بە کەسانێکی باشتر دەرئەنجامیانە: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم﴾ [محمد: ٣٨]

«جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن، ئێوە دەگۆڕێت بە کەسانێکی تر (ی زۆر چاک) کە وەکوو ئێوە نابن.»

* ئوممەتی ئیسلام بە شکۆی دینداریيان سەردەکەون، نەک بە هێزی دونیایان، ئەگەر وازیان لە دینەکەیان هێنا ئەوە بەبێ شکۆی دیین و هێزی دونییاش دەمێننەوە، پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرموویت: «خودا شکۆ و هەیبەتی ئێوە لە دڵی دوژمنانتاندا دەردەهێنێت.»

* جووڵەی مرۆڤ هەمووی بۆ بەدەستهێنانی شکۆیە، هەندێکیان لە هەندێکی دیکەیان، تەنها هۆکارەکانیان جیاوازە: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًا إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥ﴾ [فاطر: ١٠]

«هەر کەسێک گەورەیی و سەربەرزی دەوێ (لە خوای بوێت) چونکە بەڕاستی هەموو گەورەیی و دەسەڵات هەر بۆ خوایە، وتەی پاک و چاک تەنیا بۆ لای ئەو (خوا) سەردەکەوێت و (وتەی پاک) کردەوەی چاک بەرزی دەکاتەوە.»

* هەرکەس بەردەوام ژیانی لە تاریکیدا بەسەر بەرێت، ڕۆشنایی لەسەر چاوەکانی قورسە. ئەو کەسەی بەردەوام دانیشتووە، هەستانەوە قورسە لەسەری. ئەو کەسەیشی بەردەوام سەرشۆڕ و زەلیل بووە، شکۆمەندی و عیززەت لەسەری قورسە.

* دیموکراتی بڕیار و حوکمی زۆرینەیە، جیل و نەوەی زۆرینە دەمرن و نامێنن، بەڵام بڕیارەکانیان وەک دەستوور لەسەر جیل و نەوەی تازە دەمێنێتەوە، ئەو کات زۆرینەیەکی مردوو لەسەر هەموو زیندوەکان بڕیار و حوکم دەدات. حوکمی مردووەکان دەخەنە پێش حوکمی ئەو زاتەی زیندووە و هەرگیز مردنی بەسەردا نایات.

* هەر یاسایەک ئەگەر خودی خۆی حوکم و بڕیاری هەڵوەشانەوەی بەسەر خۆیدا دەدا، ئەوا یاسایەکی ناتەواوە، دیموکراتی یاسای زۆرینەیە، ئەگەر زۆرینە بڕیار بدەن دیموکراتی وەرنەگرن، ئەوا خۆی بەخۆی هەڵدەوەشێتەوە.

* دیموکراتی ئەگەر بخرێتە سەروو ئیسلام، ئەوا تێکی دەدات؛ ئەگەر بخرێتە خوار ئیسلام، ئەوا ئیسلام ئەو چاک دەکات.

* دیموکراتیی ڕۆژئاوا بتێکە لە خورما و خەڵکی بە دەستی خۆیان دروستیان کردووە، ئەگەر سوودیان پێ بگەیەنێت، دەیپەرستن؛ ئەگەر برسیشیان بکات، دەیخۆن. هیچ شتێک گونجاو و چاک نییە بۆ بەندەکان تەنها حوکمی بەدیهێنەری بەندەکان نەبێت: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ [الأنعام: ٥٧]

«فەرمانڕەوایی تەنیا بۆ خوایە.»

* سەرسامبوونی هودهود بە شارستانییتی سەبەء نەبووە بەربەست لە دیتنی کوفرەکەیان: ﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٢٤﴾﴾ [النمل: ٢٣-٢٤]

«بەڕاستی من دیم ئافرەتێک پادشای ئەوانە (بەناوی بەڵقیس) کە هەموو شتێکی (پادشایەتی) پێ دراوە و تەختێکی (پادشایەتی) زۆر گەورەی هەیە. خۆی و گەلەکەیم دی لەجیاتی خوا سوژدە بۆ ڕۆژ دەبەن و شەیتان کردەوە (خراپە)کانیانی بۆ ڕازاندبوونەوە.

* مرۆڤی ژیر جیاوازی دەکات لەنێوان پیشەسازی و پێشکەوتنی ڕۆژئاوا و ئایینی ڕۆژئاواییدا، خەڵکی سوود لە هەموو شتێک وەردەگرن، تەنانەت لە ئاژەڵیش. وەفاداری لە سەگەوە فێر ببە، بەڵام وەڕین نا، لە داڵەوە فێری فڕیین ببە، بەڵام خواردنی لاکەتۆپیو نا.

# فیتنە و ئاشووب، ڕاستی و حەقیقەتی و هەلوێست لە ئاستیدا

* فیتنە وەک ئاگر وایە هەڵگیرساندی ئاسانە و کوژاندنەوەی گرانە.

* ئەو تێگەیشتنەی بۆ فیتنە دەکرێت لە ئەمڕۆدا، ئەوە نیشان دەدات بە لەدەستدانی شتە دونیاییەکان لێکدەدرێتەوە، نەک بە لەدەستدانی شتە دینییەکان، ئیسلام لێکدەدانەوەی بۆ فیتنە کەمییە لە دیندا نەک کەمی لە دونیادا.

* فیتنە چەند پلەیەکە. لەوانە: وازهێنانە لەهەق بۆ ناهەقی، لەوانە: سەرقاڵبوون بە هەقێکەوە کە پلە نزمە لەبری سەرقاڵبوون بەو هەقانەی لەپێشتر و پلەبەرزترن، یەکەمیان فیتنەی نەزانەکانە و دووهەمیان فیتنەی زانایانە.

* هەموو شتێک فیتنە و ئاشووبی هەیە و دەبێت هۆشیار بیت بەرانبەری، تەنانەت فیتنە لە خودی خۆیدا فیتنەیە، نەزانینت بە پلەبەندی فیتنەکان وادەکات هەڵبێیت لە فیتنەی بچووک، بەڵام بکەویتە فیتنەی گەورەوە: ﴿ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْۗ﴾ [التوبة: ٤٩]

«ڕوخسەتم بدە (با نەیەم بۆ جیهاد) و تووشی گوناه و خراپەم مەکە، با ئاگادار بن (هەر لە ئێستەوە) کەوتوونەتە ناو گوناه و خراپەوە.»

* فیتنەی شاراوە زۆرێک لە خەڵکی نایبینن و دەکەونە ناوی چونکە بەهەند وەرناگرن، لە کاتێکدا ئەوە پێشەکییەکە بۆ فیتنەی ئاشکرا و گەورە، پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «پەنا بگرن بە خودا لە فیتنە، ئەوەی کە دیارە و ئەوەش کە شاراوەیە.»

* پەیامبەری خودا وازی لە وتاری هەینی هێنا و لە مینبەرەکەی دابەزی تاکوو حەسەن و حوسەین هەڵبگرێت، پاشان فەرمووی: خودا ڕاستی فەرمووە: ﴿إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٌ﴾ [التغابن: ١٥]

«بێگومان دارایی و منداڵتان هەر هۆی تاقیکردنەوەتانن.»

ئەمە واتایەکی زۆر وردە بۆ فیتنە کە ناتواندرێت ببیندرێت تەنها بە پێوەری پەیامبەرییەتی نەبێت، سەرقاڵبوونی پەیامبەر بۆ ساتێکی کەم بەهۆی هەڵگرتنی دوو کچەزاکەی لە شتێکی لە پێشتر کە وتاری هەینیی بوو، لەگەڵ ئەوەی هیچ کاریگەرییەکی جێنەهێشتووە، بەڵام پەیامبەر بە فیتنە ناوزەندی کردووە، جا دەبێت ئەندازەی ئەو فیتنەیە چەند بێت کە سەرقاڵی بەکارهێنانی ئینتەرنێتین و پێویستیمان پێی نییە لە بەرانبەر ئەو شتانەی واجبن بۆ ئوممەت ئەنجامیان بدەین.

* هیچ شوبهە و گومانێک نابینیت کە لە منداڵدانی شەهوەت و ئارەزووەوە دەرنەچووبێت، پاشان دواتر بووەتە مەزهەبێکی شوێنکەوتە.

* گومان و شوبهەکان لە زەوی ئارەزووەکاندا دەچێندرێت، ئارەزووی شتانێک دەکەن و پاشان ئەنجامی دەدەن ئەگەر ڕەخنەیان لێ گیرا، ئارەزووەکانیان دەشەرعێنن و دەیکەنە شوبهە و گومان، تاکوو لە ڕەخنە پارێزراو ببن.

* شەهوەت و ئارەزوو ئەگەر چووە ناو ئەقڵەوە، بەڵگەکان لە بەڵگەوە دەکەنە شوبهە و گومان.

* پێویستە ڕێگە لە ئارەزووەکان بگیرێت پێش ئەوەی ببن بە شوبهە و گومان و پاشان ببن بە ڕۆشنبیری و کەلتوور، ئەوکات جیاکردنەوەی زۆر ئەستەم دەبێت.

* دەوڵەتەکان بە ئارەزووەکان هەرس دەهێنن، فکرەکانیش بە گومان و شوبهەکان هەرەس دەهێنن، ئەگەر دەوڵەتێک دەیەوێت بەردەوام بێت، ئەوا با کاروباری نەداتە دەست سەرکردەیەک کە ڕۆچووبێت لە ئارەزوودا، زانایەکیش نەکەن بە پێشەنگ کە نقوم بووبێت لە گومان و شوبهەدا.

* ئەگەر شەهوەت و ئارەزوو مرد بە شوێنیدا گومان و شوبهەش دەمرێت، بۆیە گومڕایی لەناو گەنجاندا زیاترە وەک لە ناو پیردا، چونکە تەماع و ئارەزوو لە پیردا لاوازترە.

* مرۆڤ کاتێک هەست دەکات مەرگی نزیک بووەتەوە، دەست دەکات بە خۆ دەربازکردن لە هەندێک فکر و ئارەزووی، لەکاتێکدا مەرگ هیچ پەیوەندی بە دروستییەتی فکر و بیروباوەڕەوە نییە، بەڵام بە نزیکبوونەوەی مەرگ ئارەزووەکان دەمرن و ئەوەش دەبێتە هۆی مردنی فکرەکانیان.

* ئەگەر دەروونی مرۆڤ پارێزراو بێت لە ئارەزوو، ئەوا پێوەرێکی دروستی دەبێت بۆ ناسینی هەق، بەڵام شەهوەت و ئارەزوو کۆمەڵە بەردێکن ئەو تایی تەرازووە قورس دەکەن کە دەیانەوێت، بەرزی دەکاتەوە و دایدەبەزێنێت جارێک بۆ لای ڕاست و جارێک بۆ لای چەپ.

* نەخۆشکەوتنی دڵ بە شوبهە و گومان زیاد دەکات ئەگەر وازی لێ بهێندرێت، بۆیە بوونی یەک گومان دەبێتە هۆی دروستبوونی چەندین گومان: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البقرة: ١٠]

«دڵیان نەخۆشی تیایە، بۆیەخودا نەخۆشییەکەیان زیاد کردووە.»

بۆیە شوبهە بستێکە کاتێک دەست پێ دەکات، بە کوفر کۆتایی دێت.

* هەموو پووچەڵ و ناهەقییەک دەبێت پشت ببەستێت بە شوبهە و گومانێک تاکوو ناهەقی و باتڵەکەی بەردەوام بکات، تەنانەت شەیتان بۆ

سەرپێچیکردنی خودا پاساوی دەهێنایەوە لە شێوەی بەڵگەدا: ﴿فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا﴾ [الإسراء: ٦١]

«هەموویان سوژدەیان برد بێجگە لەئیبلیس وتی ئایا من سوژدە بەرم بۆ کەسێک کە لە قوڕ دروستت کردووە.»

* شوبهە و گومان لە فکر و بیروباوەڕدا بە بستێک دەست پێ دەکات، بە کوفر کۆتایی دێت: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗا﴾ [البقرة: ١٠]

«دڵیان نەخۆشی تێدایە، بۆیە خودا نەخۆشییەکەیان زیاد کردووە.»

* لە فەرموودەدا هاتووە، دەربارەی ڕۆژی دوایی «پیاوی وەها هەیە بەیانی دەکاتەوە و باوەڕدار، ئێوارە کافر بووە.» لە چەند کاتژمێرێکدا کافر دەبێت، جا دەبێت چەند کاتی بوێت تاکوو فاسق و گومڕا و لادەر بێت لە موسڵمانییەوە! ئەمە ئاماژەیە بە بڵاوبوونەوەی گومان و تەشەنەسەندنی.

* قورئان خۆی شوبهە و گومان ناخاتە ناو دڵێکی پاکەوە، بەڵام دڵە نەخۆشەکان ئەوانەن کە لە قورئاندا گومان دەدۆزنەوە: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ﴾ [آل عمران: ٧]

«ئەوانەی کە لە دڵیاندا لادان و چەوتی هەیە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە لە قورئاندا موتەشابهن (هاوشێوەن) بۆ تێکدانی بیروباوەڕی موسڵمانان و بۆ ڕاڤەکردنی بەئارەزووی ناپاکی خۆیان.»

* فیتنە و ئاشووب ڕیزی موسڵمانان دەپاڵێوێت و نهێنییەکان دەردەخات، موعاویە دەڵێت: "ڕقتان لە فیتنە نەبێت، چونکە سەرانی دووڕووەکان دەردەخات."

* فیتنە دێتە ڕێگەی هەق تاکوو پیادەکارانی ڕاستگۆ جیابکاتەوە لە پیادەکارە درۆزنەکان: ﴿وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ [العنكبوت: ٣]

«سوێند بەخوا بێگومان کەسانی پێش ئەوانمان تاقی کردەوە (ئەمانیش تاقی دەکەینەوە) ئینجا بێگومان خوا ئەو کەسانەی ڕاستیان کرد، دیاری دکات، درۆزنەکانیش دیاری دەکات واتە دەناسرێن.»

* خودا بەڵا و فیتنە دادەبەزێنێت تا ئەوانەی تەنها بانگەشەی ڕێبازی هەق دەکەن و دەریان بهێنێت: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ [العنكبوت: ٣]

«سوێند بەخوا بێگومان کەسانی پێش ئەوانمان تاقی کردەوە (ئەمانیش تاقی دەکەینەوە) ئینجا بێگومان خوا ئەو کەسانەی ڕاستیان کرد، دیاری دکات، درۆزنەکانیش دیاری دەکات واتە دەناسرێن.»

لەکاتی فیتنەدا ڕاستگۆییان بە جێگیری دەمێننەوە.

*ئەگەر بینیت بەڵا و فیتنە هەیە ئەوە یان فەرمانێک لە فەرمانەکانی خودا کاری پێ ناکرێت یان ڕێگرییەک لە ڕێگرییەکانی ئەنجام دەدرێت: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ﴾ [النور: ٦٣]

«جا با بترسن ئەوانەی کە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن کە (لە دنیادا) بەڵا و تاقیکردنەوەیەکیان تووش ببێت.»

* فیتنە و تاقیکردنەوە زیاد و کەم دەکات لەگەڵ زیادبوون و کەمبوونی تاواندا: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ﴾ [النور: ٦٣]

* پرسیار کرا لە ئیبن مەسعوود دەربارەی کات و سەردەمی فیتنە گوتی: "ئەگەر قورئانخوێنەکانتان زۆر بوون و زانایانتان کەم بوون و ئەمیر و پێشەواتان زۆر بوون، و ئەمیندارەکانتان کەم بوون، دونیا ویسترا لەڕێی کردەوەی دواڕۆژەوە و بۆ جگە لە دین خۆیان فێری دین کرد" ئەم گێڕانەوەیەش بە سەحیح هەژمار دەکرێت.

* لە ئاشکراترین هۆکاری فیتنە بریتییە لە خۆپێشخستنی قورئان خوێنەکان بۆ فەتوا، و لێکهەڵوەشانی دەوڵەتانی ئیسلام، پرسیار کراوە لە ئیبن مەسعوود دەربارەی کات و سەردەمی فیتنە گوتی: "ئەگەر قورئانخوێنەکانتان زۆر بوون و زانایانتان کەم بوون و ئەمیرو پێشەواتان زۆر بوو."

* ئەگەر ئیسلام دابەش بوو بۆ چەند دەوڵەتێک، ئەوا سەرکردەکانیان زۆر دەبن و پێشبڕکێ دەکەن و هەق بە لای ویستی خۆیاندا دەشکێننەوە، پرسیار کراوە لە ئیبن مەسعوود دەربارەی فیتنە فەرموویەتی: "ئەگەر قورئانخوێنەکانتان زۆر بوون، و زانایانتان کەم بوون، و ئەمیرو پێشەواتان زۆر بوو."

* بڕواداری ڕاستگۆ فیتنە نایگۆڕێت، بەڵکوو جێگیر دەبێت لە کاتی بەڵا و فیتنەکاندا، لە فەرموودەدا پەیامبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: «وێنەی مرۆڤی باوەڕدار وەک پارچەیەک ئاڵتونە، ئەگەر بخرێتە کورەوە سوور دەبێتەوە، ئەگەر کێشانەش بکرێت کێشی کەم ناکات).

* ئەگەر دڵ خۆی بخاتە بەر بای فیتنە ئەوا هەڵی دەگێڕێتەوە، بۆیە لەسەری پێویستە خۆی حەشاردا لە پەناگەی باوەڕ و زانستدا، تا جێگیر ببێت، لە فەرموودەدا هاتووە: «وێنەی دڵ وەک وێنەی پەڕێک وایە لە زەوییەکی چۆڵدا با هەڵگەڕانەوەی پێ بکات.»

* هەرکەس هەق بناسێت لە کاتی فیتنەدا جێگیر و دامەزراو دەبێت، ئەو کەسەی فیتنە بەرەو ڕووی بێت و زانستی نەبێت، سەرگەردان و شێواو و گومڕا دەبێت. حوزەیفە دەڵێت: "فیتنە زیانت پێ ناگەیەنێت ئەگەر ئایینەکەت بناسیت."

* لە فەرموودەدا هاتووە "هاوەڵانم جێی ئاسایشی ئوممەتی منن، ئەگەر هاوەڵانم نەمان، ئەوە هەموو هەڕەشەکان دێنە پێش بۆ ئوممەتەکەم. ئەگەر خودی کەسەکان نەمابن ئەوا خۆ زانست و تێگەیشتنیان بۆ دەقەکان ماوە، دەستگرتن پێیانەوە پارێزراوییە لە فیتنە و ناکۆکی.

* گومانبوون لە ئارامی و ئاسایشی ڕێگە، جۆرێکە لە فیتنە، نەزانی زیادی دەکات و زانستیش لای دەدات، حوزەیفە دەڵێت: "ئەگەرهەق و ناهەقت لێ تێکەڵ بوو و نەت دەزانی شوێن کامیان بکەویت، ئەوە بزانە تووشی فیتنە بوویت."

* لە سەردەمی هەڵگەڕانەوە و لاداندا پێویستە خۆپەنادانت بە خودا زۆر بێت، ئەبوو بەکری سدیق لە کاتی هەڵگەڕاوەکاندا قنووتی لە نوێژەکانی خۆیدا دەخوێند و ئەم ئایەتەی دەگوت: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا﴾ [آل عمران: ٨]

«دەڵێن ئەی پەروەردگارمان لای مەدە (لە ڕێی ڕاست) دڵەکانمان دوای ئەوەی کە ڕێنموونیت کردین.»

* باشترین کەس لە فیتنەدا ئەو کەسەیە، دونیای پارێزراو بێت و توێشوو بەرەو قیامەت پێش بخات.

* پێویستە لە کاتی فیتنەدا فەتوا تەنها لەو زانایانە وەربگیرێت کە دونیا نەچووەتە ناو دڵیانەوە و دڵی پڕ نەکردووە لە دونیا. دڵ وەک گۆزەیەکە ناتوانێت شیر بدات ئەگەر ناو گۆزەکە زۆرینەی ئاو بێت، خۆ ئەگەر دیتت سپییە ئەوە ساختەیە!

* لە کاتی فیتنەدا ئامۆژگاری خەڵکی بەوە دەکرێت پەیوەست بن بە زانایانەوە و دوور بکەونەوە لە شیکردنەوەی خەڵکی عەوام بۆ بابەتەکان، فیتنە خاوەنی بریقەیە خەڵکی پێی هەڵدەخەڵەتێن، تەنها ئەو زانایانەی کە هۆشیارن شیکردنەوە و دەرئەنجام و سوودی بابەتەکان دەزانن.

* تەنها ئەو زانایانە دەتوانن لە کاتی فیتنەدا هەق جیا بکەنەوە کە دوو بابەت لە خۆیاندا کۆ دەکەنەوە: زانست هەبوون بە واقیع و سەرئەنجامی

فیتنەکە و خۆدوورگرتن لە تەماع لە دونیادا، زانستێک کە خۆپارێزی لە دونیا لەگەڵدا نەبێت، هەواوئارەزووە. خۆپارێزی بێ زانستیش سەرکەشییە.

* هیچ فیتنەیەکی دیار ڕاوەستاو نابێت ئەگەر لەسەر پشتی فیتنەیەکی شاراوە نەبێت، فیتنەی شاراوەش تەنها زانای خۆپارێز لە دونیا دەی بینێت، لە فەرموودەدا هاتووە: «پەنا بگرن بە خودا لە فیتنە بە ئاشکرا و شاراوەکانیەوە.»

* ئامۆژگاری پەیامبەر (ﷺ) لە کاتی فیتنەدا ئەوە بووە «دەست بە ئەو شتانەوە بگرە کە دەیزانیت و واز لەوانە بهێنە کە نایزانیت، پەیوەست بە بە خودی خۆتەوە و واز لە خەڵکی گشتی بهێنە،) کەسی زاناش کاریگەر دەبێت بە لێکدانەوەی خەڵکی گشتی، بە جۆرێک واز لە هەق دەهێنێت بە ڕەشایی و زۆرییان دەخەڵەتێت.

* لە کاتی فیتنەدا زۆرێک لە ئەقڵەکان تووشی فیتنەی مەستبوون دەبن بە هەواڵەکان، لە کاتێکدا هیچ پێشکەوتن و دواکەوتنێکیان تێدا ڕوونادات، کاتێک فیتنەکە نەما، بە دەستی خاڵییەوە دەگەڕێنەوە، ئەوکات تێدەگەن کە نە زانست فێربوون و نە کردەوەیان کردووە لەگەڵ ئەوەی تەمەنیان بەفیڕۆ ڕۆیشتووە.

* ئامۆژگاری خودا لە قورئاندا بۆ ئێمە ئەوەیە ئەگەر دییت کەسانێک شوێن لێکچوو و متشابهەکان دەکەون لەبری بەڵگە جێگیرەکان، ئەوا بڵێ: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً﴾ [آل عمران:٨]

«دەڵێن ئەی پەروەردگارمان لای مەدە (لە ڕێی ڕاست) دڵەکانمان دوای ئەوەی کە ڕێنموونیت کردین و پێمان ببەخشە لای خۆتەوە بەزەییەک.»

* خۆت دەرمەخە بۆ هێزی دەسەڵاتدار و ستەمکار، نەوەک ببنە هۆی فیتنە و تاقیکردنەوەت لەسەر هەق، خۆ تۆ باوەڕت لە ئیبراهیم بەهێزتر نییە کە

دەیفەرموو: ﴿رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ [الممتحنة: ٥]

«ئەی پەروەردگارمان! مەمانکە بە مایەی تاقیکردنەوە بۆ بێباوەڕان، واتە: کە ئەزیەتمان بدەن و لە ئایین لامان بدەن.»

واتە: بەسەرماندا زاڵ بن و ببنە مایەی فیتنە بۆمان.

* دەوڵەتەکان دەربازیان نابێت لە فیتنە تەنها بە گەڕانەوەیان نەبێت بۆ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا و وازهێنانیان لە هەواوئارەزووی دەسەڵاتدار و گەل: ﴿فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ﴾ [النور: ٦٣]

«جا با بترسن ئەوانەی کە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن کە (لە دنیادا) بەڵا و تاقیکردنەوەیەکیان تووش ببێت.»

* دونیا پڕ بووە لە فیتنە و ئاشووب بۆیە پێویستە لەسەر دەسەڵاتدار و گەل بەپەلە بگەڕێنەوە بەرەو خودا، نەک زیاتر لێی ڕابکەن: ﴿فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾ [الذاريات: ٥٠]

«ئینجا بەپەلە بەرەو لای خوا بڕۆن بەڕاستی من لەلایەن خواوە ترسێنەرێکی ئاشکرا و ڕوونم بۆ ئێوە.»

* زۆرێک لە خەڵکی وازیان لە هەق هێناوە، بەهۆی ئەوەوە کە لە سەرەتادا بۆ سەرخستنی بۆچوون و فکرێک هەوڵ دەدەن و کەچی لە کۆتایدا هەموو هەوڵیان بۆ سەرخستنی هەڵگرانی ئەو فکرەیە.

* پاراستنی بیروباوەڕ لە پێشترە وەک لە پاراستنی تاکەکان، بیروباوەڕ سەرناخرێت بە سەرخستنی تاکەکان، چونکە ئەگەر بیروباوەڕێک سەربخرێت بە سەرخستنی کەسەکان، ئەوا بە نەمانیان بیروباوەڕەکە نامێنێت.

* حیزبایەتی و شوێنکەوتنی تاکەکان گەورەترین فیتنەی خاوەن هەقەکانە بۆ سەر هەق، شوێن هەق دەکەون لەپێناو وتەبێژەکەی نەک لەپێناو خودی هەقدا؛ ئەگەر وتەبێژەکە هەڵگەڕێتەوە، ئەوانیش هەڵدەگەڕێنەوە.

* گەورەترین سەرمەشق موحەممەدە، لەگەڵ ئەوەشدا خودا زەم و سەرزەنشتی ئەوانە دەکات کە هەڵدەگەڕێنەوە و لاوازی ڕوویان تێ دەکات ئەگەر ئەو وەفات بکات: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ أَفَإِين مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ﴾ [آل عمران: ١٤٤]

«موحەممەد (ﷺ) تەنیا پێغەمبەرێکە (نەمر نییە) بێگومان لەپێش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردوون، جا ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان (پاشگەز دەبنەوە)؟»

* ترسناکترین جۆری فیتنە ئەوەیە ڕاستیەکان بشێوێندرێن، ناهەقی بە ڕەوا دابندرێت، وهەق بە خراپە لە قەڵەم بدرێت، بێدەنگی لەو کاتەدا بریتییە لە فیتنە ﴿لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ﴾ [التوبة: ٤٨]

سوێند بەخوا (ئەو دووڕووانە) پێشتریش هەوڵیان داوە فیتنە و ئاشووب (لەنێوان ئیمانداراندا) بەرپا بکەن و چەندەها فەرمان و نەخشەیان گۆڕی بۆ ئەوەی فێڵت لێ بکەن و ورەت بڕوخێنن.

* خەڵکی واگومان دەبەن فیتنە تەنها ئاژاوە و خوێنڕژانە، بێ ئاگان لە ترسناکترین جۆری فیتنە کە بریتییە لە هەڵگێڕانەوەی ڕاستیەکان و چەمکەکان ﴿لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ﴾ [التوبة: ٤٨]

سوێند بەخوا (ئەو دووڕووانە) پێشتریش هەوڵیان داوە فیتنە و ئاشووب (لەنێوان ئیمانداراندا) بەرپا بکەن و چەندەها فەرمان و نەخشەیان گۆڕی بۆ ئەوەی فێڵت لێ بکەن و ورەت بڕوخێنن.

* گەورەترین فیتنەکان فیتنەی هەڵگەڕاندنەوەی ڕاستییەکانە، ترسناکترین جەنگەکانیش جەنگی درووشمەکانە، لە فەرموودەدا: «ئەوەی کە زۆرترین ترسم دەربارەی هەیە لەسەر ئوممەتەکەم: دووڕووی زمان پاراوە.»

* گەورەترین فیتنە لەسەر تاک فیتنەی هەڵگەڕانەوەی هەقە لە دەروونیدا و گۆڕانی چەمکەکانە لە لای، ئەو فیتنەیە گەورەتر دەبێت ئەگەر دڵخۆش بوو بەو گۆڕانەی!

* گەورەترین هۆکاری سزای خودا بۆ ئوممەتەکان هەڵگێڕانەوەی ڕاستییەکانە و تێکەڵکردنیانە لەگەڵ درۆ: ﴿قُلْ سِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ﴾ [الأنعام: ١١]

«ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ بڕۆن و بگەڕێن بەزەویدا پاشان سەرنج بدەن سەرەنجامی ئەوانەی بەڵگەکانی خوایان بەدرۆ دادەنا چۆن بووە؟»

* خراپترین سەردەم ئەو سەردەمەیە کە خراپە بە ناوی چاکەوە ئەنجام دەدرێت، چاکەش بە ناوی شەڕ و خراپەوە، لە ئەسەردا هاتووە: "سەردەمانێک بەسەر خەڵکیدا دێت وا دەبینن خراپە چاکەیە و چاکەش خراپەیە."

* لە زمانی خراپەکار و ستەمکاردا ڕاستییەکان بە جگە لە ناوی خۆیان ناودەبرێن، فیرعەون وتی: ﴿إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَا مُوسَىٰ مَسْحُورًا﴾ [الإسراء: ١٠١] «من وای دەبینم ئەی مووسا کە تۆ سیحرلێکراویت»، ﴿إِنِى أخاف أن يبدل دينكم أو أن يظهر فى الأرض الفساد﴾ [غافر: ٢٦] «من دەترسم مووسا ئایینەکەتان بگۆڕێت یاخود خراپە لە سەرزەویدا زۆر و بەربڵاو بکاتەوە.»

* فیتنە بە شڵەژانی پاش ئارامی ناناسرێتەوە، هەروەها بە لێکبوونی دوای یەکبوونیش ناناسرێت، گەرنا بانگەوازی پێغەمبەرانیش فیتنە دەبوو، بەڵکوو فیتنە گۆڕینی چاکەیە بە خراپە، و چارەسەریشی چاکسازییە بە حیکمەت و لێزانی.

* لە زمانی گەندەڵ و ستەمکاراندا شتەکان ناو دەنرێن بە جگە لە ناوی خۆی. فیرعەون گوتی: ﴿إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسۡحُورٗا﴾ [الإسراء: ١٠١]

«من وای دەبینم ئەی مووسا کە تۆ سیحرلێکراویت»

﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ﴾ [غافر: ٢٦]

«من دەترسم مووسا ئایینەکەتان بگۆڕێت یاخود خراپە لە سەرزەویدا زۆر و بەربڵاو بکاتەوە.»

* زۆرینەی نەزانەکان فیتنە بەکاردەهێنن بۆ هەقێکی ڕوون و ئاشکرا، لەکاتێکدا هەڵگێڕانەوەی دەستەواژەکانی هەقیش بۆ ناهەقی بریتییە لە خودی فیتنە، خودا دەفەرموێت: ﴿لَقَدِ ٱبۡتَغَوُاْ ٱلۡفِتۡنَةَ مِن قَبۡلُ وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلۡأُمُورَ﴾ [التوبة: ٤٨]

«سوێند بەخوا (ئەو دووڕووانە) پێشتریش هەوڵیان داوە فیتنە و ئاشووب (لەنێوان ئیمانداراندا) بەرپا بکەن و چەندەها فەرمان و نەخشەیان گۆڕی بۆ ئەوەی فێڵت لێ بکەن و ورەت بڕوخێنن.»

* دەقەکان یەکن و حوکمەکانیان ڕوونە، بەڵام دەگۆڕێن بە هەڵگێڕانەوەی شوێنەکەیان، هەروەها گۆڕانیان بەسەردا دێت بە هەڵگەڕاندنەوە و لاڕێکردنی دەستەواژەکانیان، بەهۆی دابڕینی چوارچێوە و بوارەکەیەوە واتاکەشی دەپچڕێت، ﴿يَلۡوُۥنَ أَلۡسِنَتَهُم بِٱلۡكِتَٰبِ لِتَحۡسَبُوهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ [آل عمران: ٧٨]

«زمانیان با دەدەن و دەپێچنەوە بە خوێندنەوەی کتێبەکەیان (تەورات) تا تۆ وا بزانیت لە نامەی خوایە.»

* لە چ حاڵەتێکدا گۆڕانی بۆچوون دەبێتە فیتنە؟ کاتێک گۆڕانی مرۆڤ لەگەڵ لاوازی پەرستشی بەیەکەوە ڕوو بدەن، لە بنەڕەتدا گۆڕان پەیوەندی نییە بە پەرستشەوە، جا ئەگەر پەرستشی نەما بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو گۆڕانەی فیتنەیە.

* هەمووان گۆڕانیان بەسەردا دێت بەڵام ئەو گۆڕانەی بە فیتنە هەژمار دەکرێت، کاتێک هاوتابێت لەگەڵ کەمبوونی پەرستشەکانی، لە بنەڕتدا گۆڕان پەیوەندی نییە بە پەرستشەوە، جا کاتێک پەرستشی نەما، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو گۆڕانەی فیتنەیە.

* گۆڕان و هەڵگەڕانەوەی بۆچوونەکان زیاد دەبن بە زیادبوونی فیتنە، فیتنەکان دەکوڵێن و دڵ هەڵدەگێڕنەوە، تەنها ئەوانە نەبێت کە خودا جێگیریان دەکات، لە فەرموودەدا هاتووە: «دڵی نەوەکانی ئادەم زۆر خێراتر هەڵدەگەڕێتەوە لەوەی لە مەنجەڵێکدا دەکوڵێت.»

* تاکەکان فیتنەی تایبەتیان هەیە، کۆمەڵەکانیش فیتنەی گشتیان هەیە، گەورەترین فیتنە لەسەر تاک فیتنەی هەڵگەڕانەوەی هەقە لە دەروونیدا و گۆڕینی تێگەیشتنەکانیەتی، ئەو فیتنەیە گەورەتر دەبێت ئەگەر دڵخۆش بوو بەو گۆڕانەی بەسەریدا هاتووە، حوزیفە دەڵێت: "هەرکەس حەزدەکات بزانێت کە تووشی فیتنە بووە یان نا، با بڕوانێت ئەگەر شتێکی لا حەرام بوو کە پێشتر بە حەڵاڵی دەبینی یان حەڵاڵێک پێشتر بە حەرامی دەبینی، ئەوا با بزانێت تووشی فیتنە بووە."

* ئەگەر لە سەردەمی ململانێدا هەق لە ناهەقی جیابوویەوە، ئەوە بەشێکە لە فیتنە ئەگەر ئەو ناکۆکییە بە فیتنە ناو ببرێت: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُواْ﴾ [التوبة: ٤٩]

«ڕوخسەتم بدە (با نەیەم بۆ جیهاد) و تووشی گوناه و خراپەم مەکە، با ئاگادار بن (هەر لە ئێستەوە) کەوتوونەتە ناو گوناه و خراپەوە.»

* بەشێک لە فیتنە ئەوەیە هەق وەسف بکەی بە فیتنە! ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُواْ﴾ [التوبة: ٤٩]

# ڕاگەیاندن

* بەهێزترین ڕاگەیاندنە عەرەبییەکانی ئەمڕۆ ڕاگەیاندنە حوکومییەکانن، دژایەتی ئیسلام دەکەن و ڕەخنەی لێ دەگرن و دوژمن سەردەخەن و پشتگیرییان دەکەن، لە کەمیندان بۆ هەق و پشتی بەردەدەن، دەسەڵات خۆی شاردووەتەوە لە پشت ڕاگەیاندنەکانەوە بۆ دژایەتی و جەنگکردن لەگەڵ ئیسلام.

* ئەوەی زۆرێک لە ڕاگەیاندنەکان دەیکەن لە ڕانان و دەرخستنی خراپەکان و وەسوەسە و بوێرکردنی نەفسن لەسەر ئەنجامدانی خراپە، وەک وەسوەسەی شەیتانە بۆ ئادەم بۆ خواردنی درەختەکە خۆ ئەگەر شەیتان وازی لەو وەسوەسەیە بهێنایە، ئەوا ئادەم بیری لێ نە دەکردەوە.

* هەرکەس زانیاری لە شەریعەتدا هەبێت و زانیاری لەسەر کەناڵەکانی (MBC) هەبێت، دڵنیا دەبێت کە دەچنە ژێر ئەم ئایەتەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ﴾ [النور: ١٩]

«بەڕاستی ئەوانەی پێیان خۆشە زینا (کرداری ناشرین) بڵاوبێتەوە لەناو خەڵکی ئیمانداردا سزای سەختیان بۆ هەیە لە دونیا و ڕۆژی دواییدا.»

*سەیرە کۆمەڵە خەڵکێک بابەتگەلێکیان لا شاراوەیە لەسەر هەندێک لە کەناڵەکان لەگەڵ ئەوەی کە کەناڵن و ئاشکران! کەچی شارەزایی و زانیاری لەسەر مزگەوتی ضرار هەیە کە مزگەوتە! جا دەبوو چۆن شاردنەوە و فێڵیان بکردایە کاتێک کەناڵکان ببوونایە بە مزگەوت و بێژەرەکانیش وتارخوێنەکان بوونایە!

* ترسناکترین جۆری دوژمنایەتی ئیسلام دوژمنایەتی ناوخۆیە، دووڕووان مزگەوتی ضراریان دروست کرد بۆ پەرتەوازەبوون، لە کاتێکدا بانگ و نوێژی تێدا دەکرا بەو جۆرەی کە خودا داوای کردبوو. ئەمڕۆ هەندێک لە کەناڵەکان هەمان حاڵەت دووبارە دەکەنەوە.

* ئەگەر کەناڵی (العربية) لە سەردەمی پەیامبەردا بووبا، ئەوا دووڕووەکان تەنها لەوێدا کۆ دەبوونەوە، ماڵ و سامانی بەنی قوڕەیزەش هەر لەوێدا خەرج دەکرا.

* لەوانەیە نەتوانیت خراپە لە فکر و ڕەوشتێکدا بدۆزیتەوە کە لەسەر شانی ڕاگەیاندنەکان بەرزنەبووبێتەوە و لەڕێی ئەوانەوە نەهێنرابێت.

* فەتواکان دەربارەی ئافرەت و سیاسەت، تەنها پاش داگیرکاری ڕۆژئاوا گۆڕانکاری و شێواوییان بەسەردا هات، جا کاتێک ڕاگەیاندن کرایەوە بێڕێزەکان ڕێزدار کران، ئەوکات ئیسلام تێڕوانینی ڕۆژئاوایی کرا بەبەردا، هەرچەند بە زۆرەملەش بێت.

* لێکۆڵینەوە دەربارەی بابەتە ناکۆک و خیلافییەکان هیچ کێشەیەکی تێدا نییە، بەڵکوو کێشەکە لەوەدایە لە ناوجەرگەی ڕاگەیاندندا بڵاو بکرێتەوە و گاڵتە بکەن بە بابەتە بنەڕەتییەکان، بە ویستی خۆیان بابەتە بنەڕەتییەکان بکەن بە بابەتی ناکۆک، بە تێگەیشتنی ڕاگەیاندکارێک ئیسلام دارمێنن.

* لە حوزەیفەوە هاتووە دەڵێت: نزیکە شەڕ و فیتنەیەک لە ئاسمانەوە دابەزێت و هەموو شوێنێک بگرێتەوە تەنانەت (الفيافي)کانیش بگرێتەوە، گوترا: فیافي چییە؟ گوتی: زەوییە ڕووت و چۆڵەکان. من وەها گومان دەبەم فیتنەی ڕاگەیاندن تەنانەت گەیشتبێتە شوانی مەڕەکانیش.

* پەیامبەر (ﷺ) دەفەرموویت: «شەش شت بژمێرن پێش ئەوەی قیامەت بێت ڕوو دەدات -یەکێک لەوانەی فەرمووی- فیتنەیەک کە هیچ ماڵێک لە ماڵەکانی عەرەب جێ ناهێڵێت و دەچێتە ناو هەموویانەوە.»

* لە ئاخیر زەماندا وەک لە فەرموودەدا ئاماژەی پێ کراوە: پیاوی وەها هەیە بەیانی باوەڕدارە و ئێوارە دەبێتە کافر، لەنیو ڕۆژدا باوەڕی هێناوە و کافربووەتەوە، ئەم گۆڕانکارییە دەبێت بە هۆکارێکی خێرا ڕووبدات، وادەبینم ڕاگەیاندن ئەو ڕۆڵە ببینێت.

* ئەقڵ لە قاڵب دەدرێت و کاریگەر دەبێت بەو شتانەی لە دەوروبەریدان، وەک چۆن مادده خامەکان لە قاڵب دەدرێن، ئەگەر دە کەس کۆببنەوە و بیانەوێت گومان بۆ کەسێک دروست کەن دەربارەی شێواوی جەستەی، هەریەکەیان کە پێی گەیشت بە شێوازێک ئەو بابەتەی پێی بڵێت وەک ئەوەی لەنێوان خۆیاندا لەسەری ڕێک کەوتوون، پاشان یەک بەدوای یەک کەسەکانی دیکە هەریەکە و بە وتەیەکی جیاواز بەڵام هەمان واتا بگرنەخۆ ئەو بابەتەی لای ئەو کەسە باس بکەن، دەبینیت ئەو کەسە باوەڕ بە وتەکەیان دەکات کە بەو جۆرەیە و ئەو وەسفەی ئەوان دەیکەن تیایدایە. جا دەبێت ڕاگەیاندن چۆن کاریگەری هەبێت لە کاتێکدا بە بینین و بیستن و وێنە و خوێندنەوە ژەهر دەڕێژێت، بە شەو و بە ڕۆژ کار دەکەنە سەر ئەقڵی خەڵکی و گومانی بۆ دروست دەکەن لە ئایین و ئاکار و ڕەوشتیان. جا دەبێت چۆن ئەقڵ کاریگەر نەبێت پێی و وێنەکان لە مێشکیدا دووبارە نەبنەوە؟! جا دەبێت چۆن بێت ئەگەر ڕاگەیاندن تەواو شارەزایانە لەو بوارەدا بێنە پێش لەگەڵ ئەوەشدا ئەقڵەکان زۆر سادە و ئاسان گۆڕانیان بەسەردا دێت؟

* بێگومان هەموو ئەقڵێک کاریگەر دەبێت بە دووپاتکردنەوەی باتڵ و ناهەقی لەسەری بە شێوازی بیستن و بینین، سەرەتا بەرپەرچی دەداتەوە و

وەرگیراو نییە لای، پاشان کەمێک لای ئاسای دەبێت بە پلەبەندی، تا وای لێدێت دەچێتە دڵیەوە، هەموو باتڵ و ناهەقییەک لە زەویدا دەروونەکان لە سەرەتاوە لێی ڕادەکەن پاشان هۆگری دەبن، پاشان هەڵدەگەڕێنەوە و دژایەتی هەق دەکەن، هەموو ناهەقییەکان بەم هەنگاوانە لەناو ئوممەتاندا بڵاوبوونەتەوە، هەر بۆیە دووپاتکردنەوەی هەق لە قورئان و سونەتدا هەرچەندە بە یەک شێوازی دەربڕینیش بێت مەبەست تیایدا جێگیر بوون و ڕەگداکوتانی واتاکانە، شۆردنی ئەو پیسی و چڵکەییەی دەوری ئەقڵیان داوە جار لەدوای جار دەبێت بە بارانی وەحی جۆراوجۆری جار لەدوای جار بشۆرێت و پاک بێتەوە، شتانێکی دووبارەی دوور کاریگەرییان لەسەر ئەقڵ زیاترە وەک لە شتانێکی زۆر کە بۆ یەکجار ڕوو دەدەن، ئەگەر حەوزێکی ئاو بەیەک جار بکرێت بەسەر پۆشاکێکی پیسدا هێندەی گۆزە ئاوێک پاکی ناکاتەوە ئەگەر بەردەوام بەسەر پۆشاکەکەدا بکرێت لەگەڵ سڕین و گوشینیدا، پیسی سەر ئەقڵ و جەستەش هەر بەو جۆرەیە، بەو جۆرەش لا دەچن!

* زۆرێک لەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە شوێنکەوتەی هەقن و ئازادن و شوێنکەوتەی هیچ کەسێک نیین، دەبینیت ئەقڵی لە قاڵب دراوە و وێنەی فکری بۆ کێشراوە!

* ئەقڵ کاریگەر دەبێت بە زۆر ڕەخنە گرتن لێی وەک چۆن لێدانی زۆر کار لە جەستە دەکات، ملکەچ دەبێت. ئەقڵ بە قامچی ڕاگەیاندن لێی دەدرێت کاتێکیش ملکەچ بوو دەڵێن: ئەمە بۆچوون و ویستی خۆیەتی و ئازادی تەواوە و ئەمە دیموکراسییە!

* ڕۆژئاوا جیهانی سەرقاڵ کردووە بە جەنگی گۆڕینی جەستە، بەڵام لەژێر ئەوەدا خۆی حەشارداوە بۆ جەنگی گۆڕینی ئەقڵ، بە ڕاگەیاندنەکان قامچی لێ دەدات تا ملکەچ ببێت بۆ فکریان، جا ئایا جەستە تەنها پەیکەرێک نییە کە ئەقڵ بەڕێوەی دەبات؟

# تاریفکردن و هەڵەپۆشین

* دەروونی مرۆڤ ستایشکردنی پێ خۆشە، مرۆڤی ئاقڵ ناڕوانێتە ستایشکردنی، چونکە بەردەوام تەماشاکردنی ئەو شتەی کە خۆشت دەوێت دەبێتە هۆی وابەست بوونی دڵ پێیانەوە، جا کاتێک ستایش نەکرا کۆمەڵە کردەوەیەک بەزۆرلەخۆکردن دەکات تاکوو بگات بە خۆشەویستەکەی.

* ئەگەر دەروون سەرقاڵ بوو بە خۆشەویستی ستایشکردنیەوە، ئەوا وازهێنان لە هەڵەکانی لەسەر قورس دەبێت تا ستایشکارانی لێ نەڕەنجێت.

* ستایش و سەرکۆنەی خەڵکی لەگەڵ مرۆڤدا ناچێتە گۆڕەوە، هیچ شتێکی لەگەڵ ناچێت تەنها کردەوەکانی خۆی نەبێت، هەر ئەوەش بەرزی دەکاتەوە یان دایدەبەزێنێت.

* ستایشکردنی مرۆڤ بەرەو ڕوو ئەو مرۆڤە بەرەو تیاچوون دەبات، بوێرییەکی تێدا دەچێنێت بەرەو هەڵدێری دەبات بەجۆرێک بوێری دەکات لەسەر ئەو شتانەش کە نایزانێت، بەوەش خۆی تیادەچێنێت و ستەم لە کەسانی دیکەش دەکات، پەیامبەری خودا (ﷺ) بە ستایش کارێکی فەرموو: «گەردنی هاوڕێکەت بڕی.»

* دووجۆر کەس هەن کە مرۆڤی ئاقڵ نابێت ستایشیان لێ وەربگرێت:

ئەو کەسەی شارەزایی لە تۆ کەمترە، چونکە نەزانە بە تۆ.

ئەو کەسەی لێت دەترسێت و ئومێدی پێت هەیە، چونکە سوود لە تۆ وەردەگرێت، هەموو خۆبەگەورەزانێکیش لەم دوو جۆرە سوود وەردەگرێت و دروست دەبێت.

* خودای گەورە لەیەکەم جاردا تاوانی بەندەکەی ئاشکرا ناکات ئەگەر ئەو بەنهێنی ئەنجامی دابێت، بەڵکوو ماوەیەک ڕێگەی دەدات، ئەمەش ناوەڕۆکی ناوی (الستیر] «زۆرداپۆشەر» لەخۆی دەگرێت، خۆ ئەگەر ئاشکرای بکات، ئەوا هەموو شاراوەکانی ئاشکرا ناکات بەڵکوو بەشێکی هەر دەهێڵێتەوە بۆ ئەو ڕۆژەی کە نهێنێییەکان تیایدا هەڵدەماڵرێت.

* خودا یەکەم تاوانی بەندەکەی ئاشکرا ناکات، تاکوو جەند جارێک دووبارەی نەکاتەوە و بەردەوام نەبێت لەسەری، ڕیوایەت کراوە لە پێشەوا عومەرەوە، بە دزێکی گوتووە کاتێک کە پۆزشی هێناوەتەوە بەوەی یەکەم جار بووە ئەو کارە بکات، "درۆ دەکەی خودا لە یەکەم جاردا، تاوانی هیچ بەندەیەک ئاشکرا ناکات."

* خودا یەکەم جارتاوانی هیچ بەندەیەک ئاشکرا ناکات، ئەگەر کەسێکی ئاشکرا کرد، ئەوە بەهۆی ئەوە بووە کە چەند جارێک جار لەدوای جار ئەو تاوانەی ئەنجام داوە. خودا مۆڵەتی داوە تاکوو تەوبە بکات، بەڵام ئەو سوور بووە و بەردەوام بووە. خودا شەرمن و داپۆشەرە.

* خودا تاوانی نهێنی هیچ بەندەیەک ئاشکرا ناکات بە دوو هۆکار نەبێت:

ئەگەر تاوان و نهێنی خەڵکی ئاشکرا کرد، خودا تاوانەکانی ئاشکرا دەکات.

ئەگەر تاوانی پەنهانی زۆر بوو، خودا هەندێکی لێ دەردەخات تاکوو تەمبێ ببێت و وازبهێنێت و ببێتە پەند بۆ کەسانی دیکەش.

* داپۆشینی خەڵکی لەلایەن بەندەکانەوە پێوەری پەردەهەڵماڵینە لەلایەن خوداوە، تاوانە بچووکەکانی کۆمەڵە کەسانێک دەردەخات، کۆمەڵانێکیش بە تاوانی گەورەوە دادەپۆشێت، لە فەرموودەدا هاتووە: «هەرکەس موسڵمانێک بپۆشێت، خودا لە دونیا و دواڕۆژدا دەپۆشێت.»

* هەندێک جار خودا کەسانێک دەپۆشێت کە تاوانێکی زۆریان ئەنجام داوە و کەسانێک ئاشکرا دەکات لە کاتێکدا تاوانێکی کەمیان ئەنجام داوە، چونکە یەکەمیان تاوانی خەڵکی داپۆشیوە خوداش تاوانە گەورەکانی داپۆشیوە، دووهەمیان تاوانی خەڵکی ئاشکرا کردووە و خوداش تاوانە بچووکەکانی ئەوی ئاشکرا کردووە، لە فەرموودەیەکدا پەیامبەر دەفەرمووێت: «هەرکەس موسڵمانێک بپۆشێت خودا لە دونیا و دوارۆژدا دەیپۆشێت.»

* کەموکوڕیی خەڵک پۆشاکێکە ئەو کەسانە دەپۆشێت کە داپۆشەرن، لە فەرموودەیەکدا پەیامبەر دەفەرمووێت: «هەرکەس موسڵمانێک بپۆشێت، خودا لە دونیا و دوارۆژدا دەپۆشێت.»

* هەرکەس دەیەوێت بەردەوام لەژێر پۆشینی خودادا بێت، ئەوا با کەموکوڕی کەسانی دیکە بپۆشێت.

* ئەو کەسەی تاوانە شاراوەکان بڵاو بکاتەوە، ئەوا هاوشێوەی ئەنجامدەری یەکەم جار تاوانبارە، لە ئەسەردا هاتووە "هەرکەس خراپەیەک ببیستێت و بڵاوی بکاتەوە، ئەوا هاوشێوەی ئەو کەسەیە کە ئەنجامی داوە لەسەرەتادا."

# ڕەوشتە چاکەکان و ڕەوشتە خراپەکان

* ڕەوشتجوانی کردەوەکان گەورە دەکەن هەرچەندە کەمیش بێت، خراپیی ڕەوشت کردەوەکان خراپ دەکات، هەچەندە گەورەش بن. لە فەرموودەدا ڕیوایەت کراوە «ڕەوشتنزمی کردەوەکان خراپ دەکات وەک چۆن سرکە هەنگوین تێک دەدات.»

* کەسی نەزان بە ڕەوشتبەرزی دەگاتە پلەی زانا، کەسی زاناش بە ڕەوشت نزمییەکەی دەگاتە پلەی نەزان، گەورەترین بەڵا کۆبوونەوەی نەزانی و ڕەوشتنزمییە.

* ڕێبای ئاکار و ڕەوشت ئەوەیە چاکەیەک بکەیت و وە بتەوێت چاکتر وەربگریتەوە، ڕێزدارترین کەسەکانیش ئەوانەن کە چاکە دەکەن بەبێ چاوەڕوانی وەرگرتنەوەی پاداشت و چاکە لەبەرانبەریدا.

* لێبوردن و چاوپۆشی لە هەڵەی خەڵکی هۆکاری داپۆشینی کەموکوڕی و لابردنی تاوانە: ﴿وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ [النور: ٢٢]

«دەبا لێبوردە بن و چاوپۆشی بکەن، ئایا پێتان خۆش نیە خوا لێتان خۆش ببێت؟»

* ئەو کەسەی خاوەنی زۆرترین لێبوردەی و چاوپۆشی بێت، زۆرترین لەخوداترسانی هەیە، ئەو کەسەی کەمترین لێبوردەی هەیە، دڵڕەقترینە و لاوازترین باوەڕی هەیە: ﴿وَأَن تَعْفُوٓاْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ [البقرة: ٢٣٧]

«لێخۆشبوونتان لە پارێزکارییەوە نزیکترە.»

* هەرچەندە ستەملێکراو بەتواناتر بوو لە تۆڵەسەندنەوە و تووڕە بوونی زیاتر بوو، ئەوا لێخۆشبوون و چاوپۆشی لەوکاتەدا شکۆمەندی زیاتر دەبێت، لە فەرموودەدا هاتووە «لێبوردن تەنها شکۆمەندی بۆ مرۆڤ زیاددەکات.»

* نابێت پێگە و شکۆ و زانستی هیچ کەس ببێتە ڕێگری ئەوەی ڕاوێژ بە کەسانی لەخۆی نزمتر نەکات، پێگەی هیچ کەس ناگاتە پێگەی پەیامبەر، ئەبوو هورەیرە دەڵێت: «نەم دییوە هیچ کەسێک هێندەی پەیامبەر ڕاوێژی بە هاوەڵانی کردبێت.»

* ڕاستگۆیی دەربازکەرە، ئەگەر خودی خۆت دەرباز نەکات، ئەوا ئوممەتێک لەپاش خۆت دەرباز دەکات، لە فەرموودەدا هاتووە: «هیچ شتێک دەربازت ناکات تەنها ڕاستگۆییت نەبێت.»

* ئەگەر ڕەوشتێکی خراپت لە کەسێکدا بەدی کرد، ئەوا بگەڕێرەوە بۆ نەفسی خۆت و خراپەیەک بە هەمان قەبارە لە خۆتدا بدۆزەوە، ئەمە وادەکات تێڕوانینت بگۆڕێت بەرانبەر ئەو کەسە لە سووک تەماشاکردنی و بێئەرزشی بوونی لات بۆ بەزەیی و نەرم و نیانی پێی.

* ﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾ [یوسف: ٥٥]

«یوسف فەرمووی (بە پادشا) لەسەر خەزنە و دارایی زەوی (میسر) دامنێ بەڕاستی من پارێزارێکی شارەزام.»

یوسف بەند کرا، کاتێک هاتەدەر، هەوڵی دەدا خەڵکی میسر و ئەوانەشی لە بەندیان کردووە دەرباز بکات لەو ئاستەنگی و قەیرانەی تیایدا بوون، دەروونێکی بەرزی هەبوو لەسەروو کینە و تۆڵەسەندنەوە بوو.

* هەرچەندە مرۆڤ پێگەی بەرز بێت، دەبێت ڕەخنە زیاتر هەڵگرێت و لایبدات، ڕەخنەگرتن لە شتە لاوەکییەکان سەرقاڵت دەکەن لە بابەتە

سەرەکییەکان، پەیامبەر هەرگیز ڕەخنەی لە خزمەتکار نەدەگرت، هیچ ڕەخنەی لە خواردن نەدەگرت ئەگەر حەزی لێی بووایە دەیخوارد و ئەگەر نا وازی لێ دەهێنا.

* هەرکەس خاکی بێت و خۆ بەکەمزان بێت بەرز دەکرێتەوە، هەرکەس خۆبەگەورە زان بێت سەرشۆڕ دەکرێت. خۆبەکەمزان بە پێش ئەوەی سەرشۆڕ بکرێیت.

* هەرکەس خۆبەگەورەزانین لە دڵیدا زیاد بکات، ئەوا خودا سەرشۆڕی دەکات لە دڵی خەڵکیدا: ﴿قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴾ [الأعراف: ١٣]

«خوا فەرمووی: (لە بەهەشت) بڕۆرە خوارە چونکە بۆت نییە لەو (بەهەشتەدا) خۆت بە گەورە و زل بزانی، یەکسەر دەرچۆ بەڕاستی تۆ لە بێنرخ و ڕیسوایانی.»

* هەرکەس بۆ ئەوانەی خوار خۆی خۆبەکەمزان بێت، ئەوا کەسانی لەو بەرزتر خۆبەکەمزان دەبن بەرانبەری بە ئەندازەی خۆبەکەم زانینەکەی، هەر بەو جۆرەیە کەسێک خۆی بەگەورە بزانێت لەسەر ئەوانەی خوار خۆی، ئەوا کەسانی سەروو خۆی لووتبەرزدەبن بەسەریدا. تۆڵە و دادوەرییەکی ئەزموونکراوە.

* سەرپشکانە و بەویستی خۆتان خۆبەکەمزان بن. پێش ئەوەی بەزۆر کەم و ڕسوا بکرێن.

* ئەبوو عوبەیدە دەڵێت: ئەسکەندەر بە شارێکدا تێپەڕی کە حەوت پاشا یەک لەدوای یەک خۆیان و وەچەکانیان تیایدا مردبوون، پرسی هیچ کەس لە وەچەی ئەوان ماوەتەوە؟ گوتیان: یەک پیاو ماوە لە گۆڕستانەکان دەژیی، بۆیان هێنا و پێی گوت: بۆچی بەردەوام لای ئەو گۆڕانەی، گوتی: ویستم ئێسکی پاشاکان جیا بکەمەوە لە ئێسکی خزمەتکارەکانیان کەچی دیتم هەموویان وەک یەکن!

* تاکە شتێک کە هۆکاری زۆرترین تێکدانی نێوان خەڵکییە، وەرگرتنی گومانی خراپە، جا کاتێک گومانە خراپەکە دژ بەو کەسە بوو کە نەفسیش ڕقی لێیەتی، ئەوا ئەو گومانە لە دەروونیدا دەبێت بە دڵنیای و یەقین: ﴿ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٌ﴾ [الحجرات: ١٢]

«خۆتان لە زۆرێک لە گومانەکان بپارێزن، چونکە بەڕاستی هەندێک لە گومانەکان تاوانن.»

* زۆرێک لەو شتانەی نێوانی خەڵکی دەشێوێنێت گومانی خراپی بێ بەڵگەیە، خودا ڕێگری کردووە لە هەموو گومانێکی خراپ، چونکە بەهۆی هەندێکیەوە خراپە و پشێوییەکی زۆر دێتە ئاراوە: ﴿ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٌ﴾ [الحجرات: ١٢]

خۆتان لە زۆرێک لە گومانەکان بپارێزن چونکە بەڕاستی هەندێک لە گومانەکان تاوانن.

* ئەگەر مرۆڤ کەسێکی لا بێزراو بوو، ئەوا گومانە خراپەکان کە دەربارەی ئەو کەسە هەیە لای دەبێتە ڕاستی و یەقین، خۆ ئەگەر کەسێکی خۆش ویست، ئەوا بابەتە دڵنیایی و یەقینیە خراپەکانی ئەو کەسەی لا دەبێتە گومان. خۆشویستن و بێزراوبوون ئەقڵ کوێر دەکەن و دەرئەنجامەکان دەگۆڕن.

* ئەگەر گومانەکان گونجان لەگەڵ هەواوئارەزوودا، ئەوا دەبنە دڵنیایی: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهۡوَى ٱلۡأَنفُسُ﴾ [النجم:٢٣]

«تەنیا شوێنی گومان و ئەو شتە دەکەون کە نەفسی خۆیان حەزی لێیەتی.»

* دەروون ئەگەر کۆمەڵە هەواڵێکی پێ بگات کە خوازراوە لای بەو جۆرە لێکۆڵینەوەی تێدا ناکات وەک ئەو هەواڵانەی نەخوازراوە لای.

* مرۆڤ پۆزش و عوزری ئەوانە وەردەگرێت کە خۆشی دەوێن، بەڵام بەو جۆرە نییە لەگەڵ ئەوانەی خۆشی ناوێن، مرۆڤ ئەگەر خودی هەقی خۆش بووێت، ئەوا تەرازوو پێوانەی پۆزش و عوزرەکانی ڕاست دەبێت.

* ئەو کەسەی لەسەر زەویدا خۆبەگەورەزانینی تیادایە، بێگومان بەهۆی نەزانییەتی بە گەورەیی ئەو زاتەی لە ئاسماندایە.

ئەو کەسانەی زۆرترین خۆبەگەورەزانینیان تیادایە، زۆرترین مەودا دوورن لە خوداوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا﴾ [النساء:٣٦]

«بەڕاستی خوا خۆشی ناوێت ئەو کەسەی کە خۆباگەورەزان و شانازیکەر بێت.»

* کەسانی خۆبەگەورەزان بەهیچ جۆرێک نزیک نابنەوە لە خودا، بەڵکوو بە ئەندازەی خۆبەگەورەزانینیان لە خودا دوور دەکەونەوە: ﴿قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴾ [الأعراف: ١٣]

«خوا فەرمووی: (لە بەهەشت) بڕۆرە خوارە چونکە بۆت نییە لەو (بەهەشتەدا) خۆت بە گەورە و زل بزانی، یەکسەر دەرچۆ بەڕاستی تۆ لە بێنرخ و ڕیسوایانی.»

* خۆبەگەورە زانین و ستەم پەیوەستن بەیەکەوە، ئەگەر یەکیان بەدی کرا، ئەوا ئەوی دیکەشیان بەدی دەکرێت، بە ئەندازەی خۆبەگەورەزانین ستەم بوونی دەبێت، لە فەرموودەدا هاتووە: «خودا سروشی بۆ کردم کە خۆبەکەمزان و خاکی بن تاکوو کەس ستەم لە کەسی دیکە نەکات.»

*خۆبەگەورەزانین و ئیرەیی تێکەڵی هەر شتێک بن، تێکی دەدات.

* ئەگەر کەسێکی خۆبەگەورەزانت بینی، ئەوا بزانە خاوەن نوێژێکی کەمە یان هەر نایکات، چونکە خۆبەگەورەزانین و زۆر کڕنووش بردن بەیەکەوە کۆ نابنەوە: ﴿سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ﴾ [الفتح: ٢٩]

«نیشانەیان لەناو چاوانیاندا دیارە بەهۆی زۆر سوژدەبردنیانەوە.»

* ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ [غافر: ٦٠]

«پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە، وەڵامتان دەدەمەوە بەڕاستی ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن کە بمپەرستن لەمەوپاش بەسەرشۆڕی دەچنە دۆزەخەوە.»

نیشانەی خۆبەگەورەزانینیان کەمی نزا و پاڕانەوەیانە لە خودا، چونکە نزا و پاڕانەوەیان لە خودا دەبێتە هۆی شکاندنی نەفس و خۆبەکەمزانینی بەرانبەر خەڵکی.

* خۆبەگەورەزانەکان زۆر کەمیان دەگەن بە ئامانجەکانیان، چونکە لەناو خەیاڵاتدا دەژین و خەیاڵیش نایەتەدی، خودا دەفەرمووێت: ﴿إِن فِى صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِ﴾ [غافر: ٥٦]

«هیچ لە دڵیاندا نییە جگە لە خۆبەزلزانی، هەرگیز بە مەبەستیان ناگەن.»

* ئەگەر خۆبەگەورە زانین لەمرۆڤدا زیادی کرد، ئەوا تێڕامان و بیرکردنەوەی کەم دەکات، چونکە خۆبەگەورە زانین و زیرەکی بەیەکەوە کۆ نابنەوە: ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ—أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ﴾ [المؤمنون: ٦٨]

«لە بەرانبەر ئەو (قورئانە) خۆتان بەگەورەدەزانی، شەوگارتان دەبردە سەر بە گاڵتەکردن و قسەی ناشرین وتن بە ئایەتەکانی ئێمە. دەی ئایا ئەوان (قوڕەیش) بیریان لەم قورئانە کردووەتەوە؟»

* هەق و خۆبەگەورەزانین پێچەوانەی یەکترن، بەئەندازەی زیادبوونی هەریەکیان لە دڵدا ئەوی دیکەیان کەم دەکات: ﴿يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا﴾ [الجاثية: ٨]

«کە بەڵگەکانی خوا دەبیستێت بۆی دەخوێندرێتەوە لە پاشان (لەسەر کافری) بەردەوامە چونکە خۆبەزلزانە و دەڵێی هەر نەیبیستووە.»

* خۆبەگەورەزانین پەردەی ڕێگری سەر دڵە، کەسی خۆبەگەورەزان هەرگیز لە هەق تێ ناگات، تاکوو خۆبەگەورە زانینەکەی لانەبات، بە ئەندازەی خۆبەگەورە زانینی نەفس، کەمی لە وەرگرتنی هەقدا ڕوو دەدات.

﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾ [غافر: ٣٥]

«ئا بەو جۆرە خوا مۆر دەنێ بەسەر دڵی هەموو خۆبەزلزانێکی زۆرداردا.»

* خۆبەگەورەزانین ڕێگەی تێڕامان لە ئەقڵ دەگرێت، هەق خزمەتکار نییە و تۆ گەورەی بیت، بەڵکوو هەق خاوەن و گەورەیە کەواتە خۆبەکەمزان بە بەرانبەری

﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ—أَفَلَمْ يَدَّبَّرُواْ ٱلْقَوْلَ﴾ [المؤمنون: ٦٨]

«لەبەرانبەر ئەو (قورئانە)دا خۆتان بە گەورە دەزانی شەوگارتان دەبردە سەر بە گاڵتەکردن و قسەی ناشرین وتن بە ئایەتەکانی ئێمە. دەی ئایا ئەوان (قوڕەیش) بیریان لەم قورئانە نەکردووەتەوە.»

* زۆرینەی گومڕایی مرۆڤ بەهۆی ئەوەوەیە کە دەرفەتێکی نەداوە بە ئەقڵی لە ئایەتەکانی خودا ڕابمێنێت، جا بەهۆی خۆبەگەورە زانینیەوە، یان بەهۆی چێژی دونیاوە بووبێت، هەرکات بەڵایەک یەخەی پێگرت خۆبەگەورەزانین و چێژی دونیای لێ لادەچێت، ئەوکات بیردەکاتەوە و هەق دەبینێت.

* ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا﴾ [لقمان: ٧]

«هەر کاتێک ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا بخوێنرێتەوە ڕوو وەردەگێڕێت بەخۆبەگەورەزانییەوە.

تەنها خوێندنی بەسە، تەنها ئەوەندەی لێ داواکراوە گوێ بیست بێت و بیری لێ بکاتەوە، کەچی پشت هەڵدەکات و دەیەوێت خۆی هەق بدۆزێتەوە، گەورەترین نەخۆشی ئەقڵ بریتییە لە خۆبەگەورەزانین.

* کەسانی خۆبەگەورەزان لە تێگەیشتن بێبەش دەبن، خۆ ئەگەر تێشبگات، بەهۆی خۆبەگەورەزانییەوە شوێنی ناکەوێت: ﴿سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا﴾ [الأعراف: ١٤٦]

«بەم زووانە لائەدەم و بەرگری لە نیشانە و بەڵگەکانم دەکەم ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن لەسەر زەویدا بە ناهەق و ناڕەوا، ئەوانە ئەگەر هەموو ئایەت و موعجیزەیەک ببینن، باوەڕی پێ ناهێنن.»

* خۆبەگەورەزانان کەمترین تێگەیشتنیان هەیە، چونکە دڵیان پڕە لە خەیاڵات، ئەگەر هەق بەرەو ڕووی بێت لە دەروونیدا جێی نابێتەوە، خودا دەفەرموویت: ﴿سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ﴾

«بەم زووانە لائەدەم و بەرگری لە نیشانە و بەڵگەکانم دەکەم ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن...»

ئەوانەی خۆبەکەمزانن زۆرترین تێگەیشتنیان هەیە.

* ئایەتەکان و بەڵگەکان هیچ سوود ناگەیەنن بە خۆبەگەورەزانان: ﴿سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا﴾ [الأعراف: ١٤٦]

«بەم زووانە لائەدەم و بەرگری لە نیشانە و بەڵگەکانم دەکەم ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن لەسەر زەویدا بە ناهەق و ناڕەوا، ئەوانە ئەگەر هەموو ئایەت و موعجیزەیەک ببینن، باوەڕی پێ ناهێنن.»

* خۆبەگەورەزانین ڕێگری لە مرۆڤ دەکات کە پەند لە کەسانی دیکە وەربگرێت، چونکە خاوەنەکەی وا دەبینێت ئەو گەورەتر و بەهێزترە لە کەسانی دیکە، بۆیە ستەمکاران پەند وەرناگرن تەنها بە خودی خۆیان نەبێت.

* پرسیارم لە زانایەکی شارەزا لە بابەتە خودابییەکان کرد کە بەرەگەز ئەمریکی بوو، موسڵمان ببوو، دەربارەی موسڵمان نەبوونی خەڵکانی ڕۆژئاوا لە کاتێکدا قورئانیش دەخوێننەوە، گوتی: هیچ شتێک ڕێگر نییە تەنها خۆبەگەورەزانیین نەبێت، گوتم: خودا ڕاستی فەرمووو: ﴿إِن فِي صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ﴾ [غافر: ٥٦]

«هیچ لە دڵیاندا نییە جگە لە خۆبەزلزانی.»

* مرۆڤ بەهەر شتێکی خۆی بەگەورە بزانێت بەرانبەر خودا، ئەوا خودا بەو شتە سزای دەدات، فیرعەون بە ڕووبارەکانی کە بەژێریدا دەڕۆیشت خۆی هەڵدەکێشا: ﴿وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ﴾ [الزخرف: ٥١]

«ئەم ڕووبارانە بەژێر (کۆشکەکانی) مندا نارۆن؟»

خودا ڕووبارەکەی بەسەردا هێنا، ﴿فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ﴾ [طه: ٧٨]

«جا لەناکاو دەریا ئەوانی (لەناو شەپۆلی خۆیدا) داپۆشی چ داپۆشینێک.»

* زۆرترین شوێنکەوتووانی هەق لاوازەکانن و زۆرینەی دەوڵەمەندەکان لەسەر ناهەقی و باتڵن، چونکە خۆبەگەورەزانین لەگەڵ دەوڵەمەندیدا پەیدا دەبێت، خۆبەگەورەزانین دەبێتە بەربەست و ڕێگر لە وەرگرتنی هەق. جا کەوابوو ئەگەر هەژاری نەبووە هاونشینت، ئەوا تۆ ببە هاونشینی هەژاران.

* تێکەڵاوی لەگەڵ خۆبەگەورەزانان دەبێتە هۆی چاندنی خۆبەگەورەزانین لە دڵدا، هەروەها تێکەڵاوی لاوازان دەبێتە هۆی چاندنی خاکیبوون و خۆبەکەمزانی، لە فەرموودەدا هاتووە: «پەیامبەری خودا (ﷺ) دەچووە لای لاوازان و سەردانی دەکردن و دەچووە لای نەخۆشەکانیان و بەشداری ناشتنی جەنازەکانیانی دەکرد.»

* ئەوکەسەی زۆرترین مناقەشە دەکات، زۆرترین خۆبەگەورە زانیین لە ناخیدا هەیە، چونکە ئەو جۆرە کەسانە زیاتر خۆیان سەردەخەن وەک لەوەی

هەق سەربخەن: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ﴾ [غافر: ٥٦]

«بەڕاستی ئەو کەسانەی دەمەقاڵێ و کێشە دەکەن دەربارەی نیشانەکانی خودا بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێ هیچ لە دڵیاندا نییە بێجگە لە خۆبەزلزانی.»

* هەر کەس حەزبکات خەڵکی لێی بترسن تەنیا لەبەر خودی خۆی، ئەوا خۆبەگەورەزانە. پیاوێک هاتە لای پەیامبەر هەموو جەستەی لەترسا دەلەرزی، پەیامبەر فەرمووی «ئەوە چیتە، من وەک پاشاکان نیم من کوڕی ژنێکم گۆشتی وشکەوەبووی دەخوارد.»

* زۆرجار ئەو کەسەی ئیرەیی بە کەسێکی دیکە دەبات دەبێتە هۆکاری بەرزکردنەوەی ئیرەیی پێبراو، ئەو دەیەوێت دایبەزێنێت، بەڵام خودا هەر بەرزی دەکاتەوە.

* لە ناو دڵی ئەو کەسەی ئیرەیی دەبات ئاگرێک هەیە هیچ کەس هەستی پێ ناکات تەنها خۆی نەبێت، دەست دەکات بە ناشرینکردن و تۆمەت هەڵبەستن بۆی، دەیەوێت بە ئاو ئەو ئاگرەی ناو ناخی بکوژێنێتەوە، بەڵام بێئاگایانە درەختی کەسی ئیرەیی پێبراو ئاو دەدات و گەورەی دەکات، ئەو کەسەی ئیرەییەکە دەبات، کەسی ئیرەیی پێ براو بەرز دەکاتەوە تا خەڵکی بیبینن، بەڵام ئەو هەستی پێ ناکات.

* گەورەترین هۆکاری یارمەتیدەر بۆ باوەڕدار کە خۆی بگرێت لەسەر قسە و توانجی ئیرەییبەران، پشتبەستنە بە یادی خودا و ئەنجامدانی نوێژە: ﴿فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَا﴾ [طه: ١٣٠]

«کەواتە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ئارام بگرە لەسەر ئەوەی ئەوان دەیڵێن و

پەروەردگارت بە پاک ڕابگرە و سوپاسی بکە لەپێش هەڵهاتنی خۆر و لەپێش ئاوابوونیدا.»

* گەورەترین ئیرەیی ئەوەیە خراپەی کەسانی دیکە باس بکەیت تا کەموکوڕی خۆت داپۆشی، پاکترین دڵیش ئەو دڵەیە کە غەمبار دەبێت لەسەر تاوانی خەڵکی وەک ئەوەی خۆی ئەنجامی دابێت.

* ئەو کەسەی زیاتر دڵخۆشە بە هەڵەی کەسانی دیکە وەک لە بێزاربوون و ئازارچێژان بۆیان ئەوە دەروونێکی پڕ لە ئیرەیی هەیە. کەسانی ڕێزدار دڵگران دەبن بە هەڵەی خەڵکی و ئامۆژگارییان دەکەن، بەڵام دەروون نەخۆشەکان دڵخۆش دەبن و ئاشکرایان دەکەن.

* غەیبەت تاوانێکی گەورەیە، ئەگەر کەسەکە زانی کە غەیبەتت کردووە، بچۆ گەردنی خۆتی لێ ئازاد بکە و لای ئەو کەسانەی غەیبەتت کردووە بە چاکە باسی بکە، ئەمە دەبێتە کەفارەتی تاوانەکەت. خۆ ئەگەر نەیزانی غەیبەتت کردووە، ئەوا داوای لێخۆش بوون لە خودا و باسکردنی بە چاکە دەبێتە کەفارەتی ئەو تاوانە.

* شاعیر و ئەدیبەکان باس لەوە دەکەن کە باسکردنی سەرکردەکان وەک میوە خواردن وایە بۆ خەڵکی گشتی، چونکە سەرکردەکان هەموو خەڵکی دەیانناسن، هەموو خەڵکی داوای مافەکانیان لەوان دەکەن، بەڵام ئەو کەسیان ناناسێت، ئەوان جێی قسەی خەڵکین هەرچەندە نەشیان ناسن. خەڵکی دەتوانن باسی مافەکانیان بکەن و داوای دادوەری بکەن، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە گومانی خراپیان پێ ببرێت و جوێنیان پێ بدرێت و باسی کەسایەتیان بکرێت و نهێنی ژیانی تایبەتییان باس بکرێت، کەچی دەبینیت هەندێک لە ژیرەکان کەوتوونەتە ناو ئەو هەڵەیەوە و بە ناوی داواکردنی مافەکانیانەوە.

* درۆ گەورەیە، هەرچەندە پێگەی مرۆڤەکە بەرز بێت لەناو خەڵکیدا، درۆ لە مافی ئەودا تاوانەکەی گەورەتر دەبێت، ترسناکترین درۆش ئەوەیە کەسێک بیکات کە بەرزترین پلەی هەبێت، لە فەرموودەدا هاتووە: «خودا قسە لەگەڵ پاشایەکی درۆزندا ناکات و سەیریشی ناکات.»

* گوێنەدان بە وەسفکردنی درۆیینەی خەڵکی و ڕووداوەکان بە تاوانێکی گەورە هەژمار دەکرێت، ﴿وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ﴾ [الأنبياء: ١٨]

«هاوار (سزای بەتین) بۆ ئێوە لەبەر ئەوەی دەیڵێن.»

حەسەنی بەسری دەڵێت: "والله ئەم سزا بەتینە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتە کە وەسفی بەدرۆ دەکەن تا ڕۆژی دوایی."

* تۆمەتبارکردنی باوەڕدار لە نییەت و کردەوەکانیدا بە ناهەق و بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی لەسەرهەبێت، بە تاوانێکی گەورەی لەناوبەر هەژمار دەکرێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحْتَمَلُواْ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾ [الأحزاب: ٥٨]

«کەسانێک کە ئازاری پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار دەدەن بێئەوەی هیچ تاوانێکیان کردبێت، ئەوە بەڕاستی ئەوانە بوختان و تاوانێکی ئاشکرایان گرتووەتە ئەستۆ.»

* تۆمەتدانە پاڵ کەسێک بە کارێک کە ئەنجامی نەداوە، تاوانێکی گەورەیە کەچی زۆرێک لە خەڵکی گوێی پێ نادەن: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحْتَمَلُواْ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾ [الأحزاب: ٥٨]

«کەسانێک کە ئازاری پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار دەدەن بێئەوەی هیچ تاوانێکیان کردبێت، ئەوە بەڕاستی ئەوانە بوختان و تاوانێکی ئاشکرایان گرتووەتە ئەستۆ.»

* زمان پەرداخە و عەقڵیش گۆزەیەتی، زمان بەشی باش و سەرەوەی لە ئەقڵ هەڵدەگۆزێت و دەری دەبڕێت. مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە دڵی پڕ دەکات لە هەق، تا هەموو ناو دڵی وەک یەکی لێ دێت، ئەقڵی پڕ دەبێت و زمانی دێتە گۆ بەو هەقە.

* زمان ئەو ئەندامەیە کە زۆرینەی مرۆڤەکان دەخاتە بەهەشت یان دۆزەخەوە، ئەمەش بەهۆی ئاسان بەکارهێنانی و گەورەیی شوێنەواریەوە، پەیامبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «جا ئایا ئەوەی خەڵکی بەسەر دەموچاودا فرێدەداتە دۆزەخەوە هەر کاری زمانی نییە؟»

* هەندێک وتە و کردار لای خەڵکی زۆر سانایە و گوێی پێنادەن و دەری دەبڕن، بەڵام لای خودا زۆر گەورەن، لەوانەیە دەربڕینی ئەو وتەیە کەوتبێتە ناو کاتێکی ڕێزدارەوە، پێوانەی ئەو کارانە لای خودایە، نەک لای بەندەکان: ﴿وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ﴾ [النور: ١٥]

«واتان دەزانی شتێکی سووک و ئاسانە لەکاتێکدا لای خوا زۆر گەورەیە.»

* لە ڕووداوی (إفک) و تۆمەت هەڵبەستن بۆ عائیشەی دایکی باوەڕداراندا کەسانێک چەند وتەیەکیان دەردەبڕی و بەسووک و سانا هەژماریان دەکرد، بەڵام بەو جۆرە نییە، چونکە پێوانەی ئەو کارانە لای خودایە، نەک لای بەندە: ﴿وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ﴾ [النور: ١٥]

«بە زمانتان شتێک دەڵێن کە زانیاریتان دەربارەی نەبوو و واتان دەزانی شتێکی سووک و ئاسانە لەکاتێکدا لای خوا زۆر گەورەیە.»

* ئەو وتانەی لای خودا گەورەن مەرج نییە لای خاوەنەکەیان گەورە بن، «پیاوی وەها هەیە وتەیەک دەڵێت لە تووڕەیی خودادا هیچ گوێی پێ نادات، بەڵام حەفتا پایز دەیباتە خوارەوە بە دۆزەخدا.»

* ڕێژەی باوەڕ لە مرۆڤدا کەم دەبێتەوە بە ڕێژەی زمان پیسیەکەی، لە فەرموودەدا هاتووە «بڕوادار تانەدەر و لەعنەتکار و خراپەبێژ و زمانپیس نییە.»

* ئەو شتانەی کە ناتوانی دەریان ببڕیت، دڵت پڕ مەکە لێیان و بیریان لێ مەکەرەوە، ئەگەر نا کاتێک دێتە پێش بە سەرتا زاڵ دەبێت و دەردەچێت هەرچەندە پێشت ناخۆش بێت: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ﴾ [القصص: ١٠]

«جا دڵی دایکی مووسا خاڵی بوو (لە هەموو شت جگە لە منداڵەکەی) نزیک بوو (نهێنی) ئەو منداڵە ئاشکرا بکات.»

دڵی خاڵی بوو لە هەموو شتێک تەنها مووسا نەبێت.

# دڵ و کارتێکەرەکانی

* مرۆڤ خاوەنی تەنها یەک دڵە ئەگەر سەرقاڵ بوو بە ڕوانین بۆ بەدیهێنراوەکان ئەوا سەرقاڵ دەبێت لە بەدیهێنەر.

* دڵ ڕووگەی هەیە وەک ڕووگەی نوێژ، مرۆڤی ڕاستگۆ زۆر سوورە لەسەر پێکانی ئەو ئامانجەیی و بەرەو ئاسمان ئاڕاستەی دەکات.

* داوای شتێک لە دڵت مەکە کە لەوەو پێش پێت نەدابێت، هەر چاکەیەکت پێ سپاردبێت، بەدی دەکەیتەوە تیایدا، چونکە بۆت دەپارێزێت و زیادی دەکات.

* دڵت مەکەرە دیلی کەس، تەنها ئەو زاتە نەبێت کە پێی بەخشیویت، خۆ ئەگەر دڵت نەدەیتە خودا، ئەوا بێگومان دەیدەیتە جگە لەو.

* دڵ دروست کراوە تا پەیوەست ببێت، هەرکەس پەیوەستی بکات بە جگە لە خوداوە ئەوا سووکی کردووە و پلەی نزم کردووەتەوە، هەرکەسیش دڵی وابەستەی خودا کرد ئەوا بەرز ڕایگرتووە، چونکە خەڵکی هەندێکیان بەسەر هەندێکی دیکەیاندا بەرز دەبنەوە، بەڵام خودا هیچ شتێک بەسەریدا بەرز نابێتەوە.

* دڵی قفڵ لێدراو وەک پەرداخێکی هەڵگەڕاوە وایە، ئەگەر ئاوی دەریایەکی پێدا بکرێت سوودی لێ نابینێت: ﴿فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ إِذْ كَانُوا۟ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ [الأحقاف: ٢٦]

«بەڵام سوود و کەڵکی پێ نەگەیاندن نە گوێ و نەچاو و نەدڵیان هیچێک چونکە ئەوان باوەڕیان بەنیشانەکانی خوا نەبوو.»

* دڵ لە کاتی خوێندنەوە و گەڕان بەزەویدا هەموو ئەو بەڵگە و پاڵپشتانەی پێوە وابەستە دەبێت کە حەزی لێیەتی و پێی خۆشە، جا بەڵگەکان بە دڵوە دەنووسێن وەک چۆن دڕک لە خورییەوە دەئاڵێت، ترسناکترین دەرئەنجام ڕوو دەکاتە ئەو کەسانەی بیروباوەڕیان دادەمەزرێنن پێش گەڕان بەشوێن بەڵگەکاندا، هەر کات ئەوەیان کرد، ئەوا تەنها بەشوێن ئەو بەڵگانەدا دەگەڕێت کە حەزیان لێیەتی، نەک بەڵگە ڕێنمایی کەرەکان: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ﴾ [النجم: ٢٣]

«تەنیا شوێنی گومان و ئەو شتە دەکەون وۆ نەفسی خۆیان حەزی لێیەتی لەکاتێکدا بەڕاستی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هیدایەتیان بۆ هاتووە.»

* هەر دەبێت مرۆڤ دڵی پڕ ببێت لە ترس، ئەگەر ترسی خودای زیاد کرد، ئەوا ترسی کەسانی دیکە لەدڵیدا کەم دەکات، وتەکان و کردارەکان پێوەری ئەم بابەتەن.

* هەرکەس ترسی کەسێکی گەورەی لەدڵیدا بەدی کرد، ئەوا با یادی گەورەی خودا لەدڵیدا بکاتەوە، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی جگە لە خودای لەبەرچاو بچووک ببێتەوە ﴿أَتَخْشَوْنَهُمْ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ [التوبة: ١٣]

«ئایا لێیان دەترسن جا هەر خوا شایستەترە کە لێی بترسن ئەگەر ئێوە بڕوادارن.»

* دڵ گۆزەیە، ئەگەر بە گەورەیی و ترسی خودا پڕکرا، هیچ شتێکی دیکەی تێ ناچێت و هەمووی دەڕژێنێت.

* بێگومان دڵ دەبێت بە گەورەییەک پڕ بکرێت، پڕکردنی بە گەورەیی خۆت خۆبەگەورەزانینە، پڕکردنی بە گەورەییی کەسانی دیکە کوفر و کۆیلایەتییە و پڕکردنی بە گەورەییی خودا یەکخواپەرستی و ئازادییە.

* دڵ ڕوخساری هەیە وەک ڕوخساری جەستە ئەگەر ڕووی کردە لایەک سەرقاڵ دەبێت لە لایەکانی دیکە و فەرمۆشیان دەکات، ئەو کەسەی بە دڵی ڕووی کردووەتە جگە لە خودا چۆن گەورەیی حوکمی خودا و فەرمان و ڕێگری و دانایی خودای بۆ دەردەکەوێت.

* ئەگەر شتێکت لەبەر چاو گەورە بوو، ئەوا هەموو شتێکی دیکەی جگە لە ئەوت لە بەرچاو بچووک دەبێتەوە، دڵیش بەهەمان شێوەیە ئەگەر جگە لە خودای لا گەورە بوو، ئەوا فەرمان و ڕێگرییەکانی خودای لا بچووک دەبێت بە بەرانبەر بە فەرمانەکانی ئەوشتەت کە لە دڵیدا گەورەیە.

* وتە و کردەوەکان بۆ گەورەکان ئەنجام دەدرێن، ئەگەر خودات بە گەورە ڕاگرت، ئەوا کردەوەکانت بۆ ئەو ئەنجام داوە، خۆ ئەگەر جگە لە خودات لا گەورە بوو، ئەوا کردەوەکانت بۆ ئەو ئەنجام داوە، دڵ شتانێک بە گەورە ڕادەگرێت و جەستەش کردەوە دەکات.

* ئەگەر بۆشایی چاو پڕ بوو بە شتێک، ئەوا هیچی دیکە نابینێت. ئەگەر بۆشایی دڵ بەشتێک پڕ بوو، ئەوا هیچی دیکە تێ ناگات، بۆیە مافی خودا نابینیت ئەگەر چاو و دڵت پڕ بوو بە مافی جگە لە خودا.

# دونیا و دوارۆژ

* ئەو کەسەی دونیای ئاوەدان کردبێتەوە، حەز دەکات بەردەوام تیایدا بمێنێتەوە، ئەو کەسەی دوارۆژی ئاوەدان کردووەتەوە، ئەوا حەزدەکات زوو بڕواتەوە بۆی.

* هەرچەندە ئومێدت بە دونیا درێژ بێتەوە، زانستت بە دوارۆژ کەم دەکات: ﴿وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾ [الحجر: ٣]

«با ئومێد بێئاگایان بکات، جا بێگومان لەمەودوا دەزانن (چۆن سزایان دەدەین.)»

* دونیا بێباوەڕ هەڵدەخڵەتێنێت، دونیا باوەڕدار دڵ خۆش دەکات: ﴿وَقَالُواْ نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ [سبأ: ٣٥]

«وتیان ئێمە سامان و منداڵمان زۆرترە (لە ئێوە) ئێمە قەت سزا نادرێین.»

* لەپاش دونیا هیچ مەنزڵێکی دیکە بوونی نییە، جگە لە بەهەشت و دۆزەخ. دونیا مەنزڵێکی کاتییە، دوارۆژیش مەنزڵی هەتاهەتاییە.

* تەماع بۆ دونیا نیشانەی ئومێد درێژیی و بێئاگاییە لە دوارۆژ، خودا دەربارەی مرۆڤ دەفەرموویێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ﴾ [العاديات: ٨]

«بەڕاستی ئینسان بۆ خۆشەویستی ماڵی دنیا زۆر بەگیرە.»

پاشان هۆکاری ئەمەی ڕوون کردەوە و فەرمووی: ﴿أَفَلَا يَعۡلَمُ إِذَا بُعۡثِرَ مَا فِي ٱلۡقُبُورِ﴾ [العاديات: ٩]

«جا کە وادەکە هات، ئایا نازانێت کاتێت لە گۆڕەکان هێنرایە دەرێ و زیندوو کرایەوە.»

* لە فەرموودەدا هاتووە «نموونەی من لە دونیادا وەک پیاوێک وایە لە ژێر سێبەری درەختێکدا پشوو بدات و پاشان بڕوات و وازی لێ بهێنێت،) مرۆڤ بەو سێبەرە کورتە دەخەڵەتێت، ئەوەی بیر دەچێتەوە کە سێبەری ئەو کەمترە لە سێبەری درەختەکە. مرۆڤ تەواو دەبێت پێش تەواو بوونی دونیا.

* خۆیەکلاکردنەوە بۆ دونیا گونجاو و شایستە نییە بەو کەسەی کە خۆی ئامادەکردووە بۆئەوەی بانگ بکرێت و سەفەری دەست پێ بکات، لەوانەیە نۆرەی بێت و لە بێئاگایی و غەفڵەتدا بێت، ئیبن عەباس دەڵێت: "کەسی وەها دەبینیت سەرقاڵی ڕاخستنی فەرشە و زەوی چاندنە لە کاتێکدا لە مردوان هەژمار کراوە."

* گرنتییەکان لە دونیادا هەرچەندە گەورە و بەنرخ بن، ناگەنە ئەو گرنتییەی خودا بە پەیامبەرەکەی داوە: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ [المائدة: ٦٧]

«خوا تۆ دەپارێزێت لە خەڵکی کە بتکوژن.» ئەمە بووە هۆی زیاتر خاکیبوون و خۆبەکەمگرتنی پەیامبەر بەرانبەر خەڵکی، بەڵام دونیا ویستان هەرچەندە ژیانیان پارێزراوتربێت زیاتر خۆبەگەورەزان دەبن.

* ئەگەر خەڵکی نیوەی خەم و هەڵپە و دڵسۆزیان بۆ دونیا بدایە بە دینیان، ئەوا هیچ زەوییەک نەدەمایەوە بۆ خراپە تاکوو ئاڵای خۆی تێدا بچەقێنێت، بەڵام خەڵکی: ﴿... كَلَّا بَلۡ تُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ﴾ [القيامة: ٢٠]

«زیندووکردنەوە هەر دەبێت، بەڵام ئێوە هەر دونیاتان خۆشدەوێت.»

* دونیا بەڕووی خەڵکیدا واڵا بووە لە سامان و ڕاگەیاندن و خۆشی و خواردن و سواری وەک لە فەرموودەدا هاتووە: «بەڵکوو دەترسم دونیا بەڕووتاندا بکرێتەوە ... پێشبڕکێی تێدا بکەن.»

سەرفراز ئەو کەسەیە خۆی بپارێزێت لە پێشبڕکێی خراپ تیایدا.

* بەهەشت بەو هەموو فراوانییەوە ڕێگە پێدراو و حەڵاڵ بوو بۆ ئادەم تەنها یەک درەخت نەبێت، شەیتان ئادەمی سەرقاڵ کرد بەو تاکە درەختەوە، ئەو کات بەهەشت بەو فراوانییەی تەسک بوویەوە لای ئادەم ئەو تاکە درەختەش فراوان بوو لای! جا دەبێت ئێستا شەیتان چۆن دەست واڵا بێت بەرانبەر دونیایەکی تەسک و چەندەها حەرام کراو.

* ئەو کەسەی ڕووی کردووەتە خودا و دونیا بەرەو پیری هاتووە لە پێشترە بە هەڵبژاردن و ڕێزلێنان، لە کەسێک ڕووی کردووەتە خودا، بەڵام دونیا پشتی تێ کردووە.

* هەر کەس فەرمانەکانی خودا لە دڵیدا بێئەرزش بوو، ئەوا بەهۆی گەورەیی دونیایە لە دڵیدا، مرۆڤ خاوەنی یەک دڵە، ئەگەر پڕ بوو لە شتێک، ئەوا خاڵی دەبێت لە شتەکانی دیکە.

* بەدەستهێنانی دونیا پێوەری هەقبوونت نییە، لەوانەیە دونیا لەدەست بدەیت لە کاتێکدا لەسەر هەقی، لەوانەیە دونیا بەدەست بهێنیت لە کاتێکدا لەسەر باتڵ و ناهەقیت، چونکە هەق دەسکەوتێکی گەورەترە لە مادە و سامان.

* ترسناک ترین تێگەیشتنی مرۆڤ ئەوەیە وا گومان ببات کە خودا وەک ڕێزێکی دونیای پێ دەدات، لە کاتێکدا وەک تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندن پێی دەدرێت، سولەیمان لەبارەی پاشایەتییەکەیەوە دەی فەرموو: ﴿هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُ﴾ [النمل: ٤٠]

«وتی ئەمە فەزڵی پەروەردگارمە بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە ئایا شوکری (ئەم نیعمەتە) دەکەم یان پێنەزان و سپڵە دەبم؟»

* سەرسام مەبە بە سامانی کەسانی دیکە، لەوانەیە هۆکاری سزا بێت بۆی، بەڵام بە خۆشحاڵ خۆی دەربخات لە ترسی پێخۆشبوونی دوژمنەکانی: ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ [التوبة: ٥٥]

«جا با سەرنجت ڕانەکێشێت (سەرسامت نەکات) (زۆریی) ماڵ و دارایی و منداڵیان، بێگومان خوا دەیەوێت سزایان بدات بەهۆی ئەو (ماڵ و منداڵەوە) لەم ژیانی دنیایەدا.»



# چەند بابەتی جۆراوجۆر

* وێنەی فۆتۆگرافی بابەتێکە جێی ناکۆکییەکی لەبەرچاوگیراوە، بۆچوونی پەسەند دروستییەتی لەگەڵ هەبوونی دوو مەرج تیایدا:

١- دەستکاری نەکرێت و لەسەر شێوازی بنەڕەتی خۆی لانەبرێت.

٢- وەک پەیکەر هەڵنەواسرێت.

* وێنەی ڕۆحلەبەر کە سەری بەتەواوی کێشرابێت، جا بەدەست کێشرابێت یان چندرابێت یان داتاشرابێت، ئەمانە هەمووی حەرامە، بەڵام ئەو وێنەیەی جێی سووکایەتییە دروستە وەک ئەوەی لە ژێرپێ بندرێت یان لە عەلاگە و بەرگی سەر خواردن بێت کە فڕێ دەدرێن.

* تاشینی پەیکەری ڕۆحلەبەر و دانانی حەرامە بە کۆدەنگی زانایان، ئەمە بەشێکە لەو وەسیەتەی پەیامبەر (ﷺ) کە بۆ عەلی کرد، «هەر پەیکەرێکت بەدی کرد، ئەوا لەناوی بەرە» پێشەوا عەلی بە خودی خۆی تێکی دەشکاندن و فەرمانیشی دەکرد تێک بشکێندرێن.

* پێویست نییە کەسێک کە تەوبەی کرد بەهۆی تەوبەکەیەوە بەرز بکرێتەوە، وەک چۆن ناکرێت پلەی دابەزێندرێت بەهۆی پێشینەی تاوانەکانییەوە، بەڵکوو ستایش دەکرێت لەسەر تەوبەکەی، پلەی جێگیرەکان و پێشڕەوەکان بۆ هەق دەبێت لەبەرچاو بگیرێت.

* سەرخەوشکاندن لە ڕۆژدا نیعمەت و بەخششی خودایە و سروشت و فیترەتی مرۆڤە وەک خەوی شەو: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ [الروم: ٢٣]

«لە نیشانەکانی ئەوە خەوتنتان بە شەو و ڕۆژ.»

* لە کاتی بۆنە و مەراسیمدا دروستە گوێ گرتن لە دەف بەتەنها بەبێ ئامێرەکانی دیکەی مۆسیقا، وەک جەژن و ئاهەنگی هاوسەرگیری و هاوشێوەکانیان، دەف لێدراوە لای پەیامبەری خودا (ﷺ) بەڵام هەرگیز خۆی لێی نەداوە.

* حوکمی شیعر وەک پەخشانە لە ڕەخنە لێ گرتنیدا، شافعی دەڵێت هەر کەس جیاوازی بخاتە نێوانیان، بێگومان نەزانە لە فەرموودەدا هاتووە «شعر لە پێگەی وتە و قسەکاندایە، باشییەکەی وەک باشەکانە و خراپەکانی وەک خراپی وتەکان وایە.»

* نهێنی هیچ ڕێزێکی نامێنێت ئەگەر زیان بە کەسێک بگات، ئەو کات واجبە بۆ ئەو کەسەی کە زیانی بەردەکەوێت نهێنییەکەی بۆ دەربخەیت، بڕوانە پیاوێک بەهەڵەداوان هاتە لای مووسا و پێی گوت: ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ [القصص: ٢٠]

«ئەی مووسا (ئاگادار بە) سەر گەورەکان کۆبوونەوەتەوە لەبارەی تۆوە (قسە دەکەن) بۆئەوەی بتکوژن کەواتە دەرچۆ لە شار (با نەت گرن) بێگومان من دڵسۆزتم.»

* لە هەموو قورئاندا تەنها سێ جار هاتووە کە خودا جەنگ لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکات:

ڕیبا و سووخۆری چونکە جەنگی بەهێزەکانە بەرانبەر لاوازەکان.

دژایەتیکردنی پیاوچاکان، چونکە جەنگە لەدژی چاکسازان.

هاوەڵدانان چونکە جەنگە دژ بە یەکخواپەرستی.

* (المقت) ئەوپەڕ تووڕەییە. خودا لە قورئاندا تەنها بۆ کوفر و دووڕووی و بەدڕەوشتیی بەکاربردووە.

* گەورەترین هۆکار بۆ عاقیبەتخێری پەرستشی پەنهانییە، هەروەها گەورەترین هۆکاریش بۆ عاقیبەت شەڕی تاوانی پەنهانییە.

* خودا کردەوەی هیچ کەسێک بە عاقیبەت شەڕی و خراپە بە کۆتا ناهێنێت تەنها ئەو کەسە نەبێت کە لە ناخیدا خراپە، بەڵام کردەوەی چاکەی بە ڕووپامایی بۆ خەڵکی دەرخستووە، لە فەرموودەدا هاتووە: «کەسی وا هەیە کردەوەی بەهەشتی دەکات، بەڵام لە دۆزەخییەکانە، چونکە کردەوەکان بە کۆتاییەکانیان هەژمار دەکرێن.»

* جەستە بەبێ ڕۆح وەک پۆشاکی بێ جەستەیە، ئەو ئازارەی پێی دەگات زیان بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت، ئەگەر خودا ویستی خۆشی یان سزای کەسێک بدات لە گۆڕەکەیدا، ئەوا ڕوحی دەگەڕێنێتەوە ناو جەستەی، بەڵام ڕۆح خۆشی و سزا دەچێژێت بەبێ جەستە.

* لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە هاتووە کە پەیامبەر (ﷺ) باسی دوو فریشەی پرسیارکەری ناوگۆڕی کرد، عومەر گوتی: ئەقڵ و هۆشمان بۆ دەگێڕدرێتەوە لەو کاتەدا، پەیامبەر (ﷺ) فەرمووی: «بەڵی وەک ئێستاتان.»

* مەککە لە ئێستادا نیشانەیەکی دەرکەوتنی ڕۆژی دواییە، بە سەحیحی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە هاتووە: کاتێک مەکە هەمووی بوو بە تونێل و نەفەقی زۆر، باڵەخانەکان لە لوتکەی چیاکان بەرزتر کرانەوە، بزانە ڕۆژی دوای وا سێبەری کردووە بەسەرتاندا.

* شیرینکردنی مەڵاشووی منداڵ تایبەت بووە بە پەیامبەرەوە (ﷺ)، چونکە هاوەڵان نە لە ژیانیدا و نە لەپاش وەفاتی پەیامبەر ئەو کارەیان نەکردووە.

* بەڵگە گەردوونیەکان بۆ ترساندن و تێگەیاندنی مرۆڤە لە توانا و هێزی خودا، ڕێنمایکراوەکان پەند وەردەگرن و بێبەشەکانیش خۆبەگەورەزانی دەنوێنن: ﴿وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَٰنًا كَبِيرًا﴾ [الإسراء: ٦٠]

«(بەو جۆرە بەڵگانە) ئەوانە دەترسێنین کەچی ئەو (ترساندنە) هیچیان بۆ زیاد ناکات جگە لە یاخیوون و سەرکەشی.»

* زەمینلەرزە بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی خودای گەورە، پەیامێکی خودایی لە خۆ دەگرێت، بەهێزترینیان ئەوەیە ئەو زاتەی بەتوانایە لەسەر جووڵاندنی زەوی، دەتوانێت کەسانی سەر زەوی بجووڵێنێت: ﴿وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا﴾ [الإسراء: ٥٩]

«ئێمە هەموو موعجیزەکان نانێرین مەگەر بۆ ترساندن.»

* زانینی هۆکاری زەمینلەرزە لەلایەن مرۆڤەکانەوە لە حیکمەتی خودا کەم ناکاتەوە، خودا بەندەکەی پێ دەترسێنێت، ئەو دەوڵەتەی بە چەندان سەدە کە خەریکی ئاوەدانکردنەوەین خودا لە چەند چرکەیەکدا لەناوی دەبات بە کۆمەڵە هۆکارێکی گەردوونی نەبیندراو کە دەستەوەستانن لەوەی بتوانن ڕێگری لێ بکەن.

* ئەگەر لەم ئوممەتەدا هەژار بەدی کرا، ئەوا سامانەکەی زەوت کراوە لای دەوڵەمەندێک کە زەکاتی نەداوە، یان لای سەرکردەیەکی زەوتکەرە، خودا کاتێک مرۆڤێک دروست دەکات بەشی پێویستی خۆی بۆ دادەنێت، خودا دادوەرە، بەڵام خەڵکی دادوەر نیین.

* گەورەترین تاوان پاش کوفر، ڕشتنی خوێنێکی حەرامە، ئەگەر تاوانێک پێش کوفر بکەوتایە ئەوا کوشتن پێشی دەکەوت، لە فەرموودەدا هاتووە: «بەردەوام باوەڕدار لە فراوانیدایە لە ئایینەکەی، تا ئەو کاتەی تووشی خوێنڕێژییەکی حەرام نەیەت.»

* شکۆی خوێنی موسڵمان و کەسایەتی گەورەترە لە شکۆی کەعبە، ئیبن عومەر و ئیبن عەباس تەماشای کەعبەیان کردووە و گوتویانە: ئای چەند گەورەی ئای چەند شکۆداری، بەڵام باوەڕدار شکۆی زۆر زیاترە لای خودا لە تۆ.

* ئەم تاقمانە هەموویان بەشدار دەبن لە ڕشتنی خوێنێکی حەرامدا ئەوەی کە ئەنجامی داوە و ئەوەی پاڵپشت بووە و ئەوەی یارمەتی داون، جا بە ئاماژە یان دەربڕین یان سامان، هەموو ئەمانە لە تاواندا وەک بکوژەکە وان.

* پەرستشە فەرزەکان پاداشتیان گەورەترە لە سونەتەکانی هاوجۆری خۆیان، نوێژی فەرز گەورەترە لە نوێژە سونەتەکان، بەڵام ئەمە لە کاتی جیاوازی جۆرەکاندا ناگوترێت، وەک جیاوازی وەڵام دانەوەی سڵاو و حەجی سونەت.

* گرتنەبەری هۆکارەکان سونەتێکی خوداییە، خودا بەتوانا بوو کە دەریا لەت بکات بۆ مووسا بەبێ گۆچان، بەڵام بۆئەوەی خەڵکی دەست بگرن بە هۆکارەکانەوە، خودا یارمەتی دانیشتوویەکی تواناداری نادات: ﴿أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ﴾ [الشعراء: ٦٣]

«بە گۆچانەکەت بدە لە دەریاکە.»

* دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە داواکارییەکی گەردوونییە، وازهێنان لێی گێلێتییە. نووح کاتێک زریانەکە نزیک بوویەوە سوار کەشتیەکەی بوو، هەرچی کوڕەکەی بوو چووە سەر لووتکەی چیایەک. بڕوانە ئەمانە هەموویان هۆکارگەلێکی ڕاستن، نووح دەربازی بوو بەو هۆکارە لاوازە کە کەشتییەکەی بوو، چونکە گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بوو، بەڵام کوڕەکەی لەناوچوو لەسەر ئەو چیا گەورەیە بەهۆی تاوان و سەرپێچییەکانییەوە.

* هۆکارەکان نابنە مایەی دەربازبوون، تەنها بەهۆی یارمەتی خوداوە نەبێت، ئەو دەریایەی مووسای شیرەخۆرە تیای دەرباز بوو، هەمان دەریا بوو

کە فیرعەونی دەسەڵاتداری تێدا لەناوچوو: ﴿فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ﴾ [طه: ٣٩]

«جا با دەریاش بیباتە کەناری ئاوەکە.»

﴿فَأَغْرَقْنَـٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ﴾ [الأعراف: ١٣٦]

«لە دەریادا خنکاندمانن.»

* وەقف سوننەتە ئەنجام بدرێت بۆ هەموو کەسێک با دەوڵەمەندیش نەبێت، جابر دەفەرمووێت: هیچ یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر نەبووە توانای هەبێت و وەقف نەکات.

هاوەڵان مەنجەڵ و سەتڵ و گوریسیان دەکردە وەقف.

* ئەوەی بە ڕووداوی هاتوچۆ یان کەوتنەخوارەوە دەمرێت، ئومێدی شەهیدی هەیە، چونکە دەچێتە ژێر ناوی بەسەردا ڕووخانەوە، فەرموودەی سەحیح دەفەرمووێت: «بەسەردا ڕووخاو شەهیدە.» هەروەها فەرموودەی: «ئەوەی لە ئاژەڵەکەی دەکەوێتە خوارەوە و دەمرێت شەهیدە.»

* سولەیمان لەبارەی هودهودەوە فەرمووی: ﴿لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ﴾ [النمل: ٢١]

«سوێند بە خوا سزایەکی بەتینی دەدەم یا بێگومان سەری دەبڕم.»

سزایەکی سەختی دەدەم یاخود سەری دەبڕم، دروستە ئاژەڵ بکوژرێت یاخود لێی بدرێت ئەگەر تەنیا بەوە لە زیانەکەی سەلامەت دەبوویت، بەڵام لە بنەڕەتدا ئازاردانی حەرامە بەبێ بوونی زیان.

* "من بەندەیەکی فەرمانبەردارم" ڕستەیەکە کەسێک دەیڵێت بە ناهەق، ڕزگاریشی ناکات چونکە ئەو بەندەی خوایە بەر لەوەی هی جگە لەو بێت، فیرعەون فەرمانی بە سەربازەکانی کرد و ئەوانیش بەگوێیان کرد، بەڵام خودا:

﴿فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [القصص: ٤٠]

«سا خۆی و سەربازەکانیشیمان گرت و فڕێماندانە دەریاوە.»

* وتنی (الحمد لله) لەگەڵ (بسم اللّٰه) لەپێش نانخواردن سوننەتێکە کەم کاری پێ دەکرێت، ئەبووهوڕەیرە دەفەرمووێت: پەرداخەکەم دایە پێغەمبەر (ﷺ) سوپاسی خوای کرد و (بسم الله)ی کرد. سەرەتا سوپاسی دەکات بۆ پێدانی ئەو ڕۆزییە لە کۆتاییشدا سوپاسی دەکات بۆ ئەو بڕەی کە خواردوویەتی لێی.

* ئەوەی نەگۆڕێت، ناگۆڕدرێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ﴾ [الرعد: ١١]

«بەڕاستی خوا (بار و حاڵی) هیچ گەلێک ناگۆڕێت، هەتا ئەوان خۆیان (بار و حاڵی) خۆیان نەگۆڕن، کاتێک خوا بیەوێت هۆزێک تووشی بەڵا بن هیچ بەرگرێکی بۆی نییە.»

بەڕاستی خودا ئەوەی لە قەومێکدایە نایگۆڕێت، هەتا خۆیان ئەوەی تیایاندایە دەیگۆڕن.

* ئەم ئایەتە لە چوارچێوەی ستایشکردنی گۆڕانکاریدا باس دەکرێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ﴾ [الرعد: ١١]

«بەڕاستی خوا (بار و حاڵی) هیچ گەلێک ناگۆڕێت، هەتا ئەوان خۆیان (بار و حاڵی) خۆیان نەگۆڕن، کاتێک خوا بیەوێت هۆزێک تووشی بەڵا بن هیچ بەرگرێکی بۆی نییە.»

لە کاتێکدا لە قورئاندا لە چوارچێوەی سەرکۆنەکردنی گۆڕانکاری خراپ بەکار هاتووە.

* پەروەردگار ڕێبازێکی تایبەتی هەیە لە بەرز کردنەوە و ونزم کردنەوەی بەندەکانی، جا گەر ڕێبازی دیاری پەروەردگارمان گۆڕا، ئەوا دڵی بەندەکان وەکو یەک نییە، ئەگەر کار وکردەوەکانیشیان وەک یەک بن.

* یەکێک لە هەڵەکان ئەوەیە بانگەشە بکەی بۆ متمانەبوون بە خود و نەفس: ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ﴾ [یوسف: ٥٣]

«(یوسف وتی) من هەرگیز پاکانە بۆ خۆم ناکەم (چونکە) بەڕاستی نەفس زۆر فەرماندەرە بە خراپە بێجە ئەو نەفسەی پەروەردگارم ڕەحمی پێ کردبێت.»

لەکاتێکدا ڕاست وایە: متمانەت بە بیروباوەڕە ڕاست و دروستەکەی خۆت بێت و بی پارێزی لە زاڵبوونی نەفس و هەواوئارەزووت بەسەریدا.

* لە فەرموودەدا هاتووە: «خەڵکی لە پلەو پایەی خۆیاندا دابنێن»، ئەم فەرموودەیە زۆر باس دەکرێ لە زەم وسەرزەنشت کردن و بەکەم دانانی کەسی گەورەدا، کەچی فەرامۆش دەکرێت لە باسی گەورە کردنەوەی کەسی بچووکدا، لە کاتێکدا مەترسی بەرزکردنەوەی نەزان زیاترە لە مەترسی بەکەمگرتنی زانا.

* وابەستەکردنی فەرموودەی «تفتحون البيت الأبيض» کۆشکی سپی ئازاد دەکەن. بە واقیعی ئەمڕۆوە هەڵەیە، چونکە سەردەمی عومەر ئازاد کراوە، کۆشکی سپی کیسرای مەلیکی فارس خاوەنی بووە نەک مەلیکی ڕۆم! چەسپانی دەسەڵات و توانای ئیسلام بەگشتی بابەتێکی جێگیر و موتەواتیرە.

* زۆرجار کۆمەڵە وتەیەکی دروست خەڵکی وازی لێ دەهێنن، بەهۆی هەڵە جێبەجێکردنی خاوەنەکەیەوە، خەڵکی وتەکەی دەبەستنەوە بە جێبەجێ کردنەکەیەوە، لە کاتێکدا دروستی بۆچوون بابەتێکە و دروست جێبەجێ کردنەکەشی بابەتێکی دیکەیە.

* تەعزێباری گشتی لە ئیسلامدا بوونی نییە، چونکە زیاتر دڵ دەبەستێتەوە بە کەسایەتییەوە نەک بنەماکانەوە، مافی مردوو ئەوەیە نزا و چاکەی بۆ بکرێت، چاکەکانی بڵاو بکرێتەوە، گەورەترین مردووەکان پەیامبەرانن و تەعزێبارییان لەسەر ناگیرێت.

# چەند ئامۆژگاری و پەند و حیکمەت

* ئەگەر وتەیەکی هەقت گوت و خەڵکی گواستیانەوە، بەڵام نەیاندایەوە پاڵ تۆ، ئەوا سپاسی خودا بکە کە خودا سوودێکی بە خەڵکی گەیاندووە بەهۆی تۆوە، هەروەها نییەتپاکی بۆ هێناویتەجێ، شوێن ئارەزووی دەروون مەکەوە نەبادا تووشی بەڵایەک ببیت کە خودا تۆی لێ پاراستووە.

* مرۆڤی ژیر دەبێت دەرگایەک لەسەر نەفسی دابخات کە چاکەیەکی لێوە دێتە ژوورەوە، بەڵام خراپە گەلێکیش بەشوێن خۆیدا دەهێنێت.

* پەلە بکە بۆ ئەنجامدانی چاکە، ئەگەر کارەکە لە تۆوە دوور بوو، ئەوا پەلە بکە بۆ نییەتهێنانی خێر. خۆ ئەگەر نەت توانی ئەو چاکەیە ئەنجام بدەیت، ئەوا پاداشتی تەواوت هەیە: ﴿وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ﴾ [طه: ٨٤]

«بەپەلە هاتم بۆ لات ئەی پەروەردگارم بۆئەوەی لێم ڕازی بیت.»

* سەیرکردنی شوێنپێی قاچ پێش دانانی لە پێشترە لە سەیرکردنی ئەو شوێن پێیەی کە هەڵگیراوە، مرۆڤی ژیر ناڕوانێتە ڕابردوویەک کە سەرقاڵی بکات لە ئێستای، چونکە یەک ڕوانینی هەیە نابێت بە زایەی بدات.

* با ڕووکەشی شتەکان نەتخەڵەتێنێت لەوەی لەناو ناخدا دەگوزەرێت، چون پارچەیەک لە ئاڵتوون هەرچەند ناشرینیش بێت، باشترە لە پارچە تەختەیەک هەرچەندە ڕازێندرابێتەوە: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ﴾ [المنافقون: ٤]

«هەر کاتێک دەیان بینیت لەش و قەڵافەتیان سەرسامت دەکات و

ئەگەر قسە بکەن، گوێ لە قسەکەیان دەگریت (دووڕووان) هەر وەک داری هەڵسپێردراون.»

* پێش ئەوەی بگەیتەوە بە پەروەردگار چاوەڕوانی پاداشتی کردەوەکانت مەکە، چونکە پاداشت تەنها لای ئەوە و لای جگە لە ئەو دەستت ناکەوێت، هەروەها لە نیوەی ڕێدا دەست ناکەوێت: ﴿وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ [المزمل: ٢٠]

«هەر چاکەیەک پێش بخەن بۆ خۆتان، لای خوا دەستتان دەکەوێت.»

* تەنانەت نەفسە پاکەکانیش هەڵپە و تەماعی تایبەتیان هەیە، ئەگەر بەوریایی دەری نەهێنێت، ئەوا تێکەڵ بە حەق دەبێت و لە خۆی و خەڵکیشی تێکدەدات، لە نزاکانی پێغەمبەری خوادا هاتووە لە کاتێکدا ئەو پارێزراویش بووە لە هەڵە و تاوان: «پەروەردگارا ژەنگ وپیسی دڵم دەربێنە».

* چاکبوون لەگەڵ خەڵکی میسر وەسیەتی پەیامبەرە (ﷺ) لە سەحیحدا هاتووە: «ئێوە میسر ئازاد دەکەن، ئەگەر ئازادتان کرد، چاک بن لەگەڵ خەڵکەکەیدا، چونکە ئەوان خاوەن ماف و خزمایەتین لەسەرمان.»

* ترس پشتگیری دروست ناکات، بەڵکوو دووڕوویی دروست دەکات، ئەگەر ترسیان ڕۆیشت دوژمنایەتییان دەردەخەن، کەسی ڕاستگۆ ئەو کەسەیە ئامۆژگاریت دەکات کاتێک بەهێزیت و پشتگیریت دەکات کاتێک لاوازیت.

* تەمەن قادرمەیەکە مرۆڤ بەرەو لای خودا پیایدا سەر دەکەوێت، هەموو هەنگاوێک پلەیەکە مرۆڤ لە لێپرسینەوە نزیک دەکاتەوە، سەیرە کەسانێک هەرچەندە لە لێپرسینەوەیان نزیک دەبنەوە خراپەکارییان زیاد دەکەن.

* بڕیار لەسەر کاری هیچ کەس مەدە تاکوو خۆت لە پێگەی ئەودا دانەنێیت، ئەو کەسەی ئاگری لەدەستدایە وەک ئەو کەسە نییە کە پارەی لەدەستدایە.

* خودا ناڕوانێتە زیرەکیی عەقڵت، بەڵکوو دەڕوانێتە پاکی دڵت.

* ئەو کەسەی لە سنوورەکانی خودا ناوەستێت، ئەوا بزانە لە سنووری تۆشدا ناوەستێت، ئەوەی لە خودا نەترسا لێی دڵنیا مەبە: ﴿وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ [الأنفال: ٧١]

«ئەگەر (ئەو دیلانە) بیانەوێت ناپاکیت لەگەڵدا بکەن، ئەوە بێگومان ناپاکییان لەگەڵ خوادا کرد لەپێش (ئەمەدا) خواش (تۆی) زاڵ کرد بەسەریاندا و خوا زانای دانایە.»

* هەرکەس بەڵێنی خودا و ئەمانەتی خودای نەپاراست، ئەوا لێی دڵنیا مەبە لە پاراستنی بەڵێن و ئەمانەتی تریشدا: ﴿وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ﴾ [الأنفال: ٧١]

«ئەگەر (ئەو دیلانە) بیانەوێت ناپاکیت لەگەڵدا بکەن، ئەوە بێگومان ناپاکییان لەگەڵ خوادا کرد لەپێش (ئەمەدا).»

* کەسی ژیر پێویستە زیاتر شارەزای ئەندازەی نەزانییەکەی بێت بەراورد بە ئەندازەی زانینی، چونکە ئەو کەسەی سەرقاڵی ئەندازەی نەزانینی بێت خۆی فێردەکات، هەرکەسیش خۆی سەرقاڵ بکات بە ئەندازەی زانستییەوە ئەوا خۆبەگەورەزانینی تێدا پەیدا دەبێت.

* سیاسەتێکی ژیرانە نییە فەرمان بە شتێک بکەیت کە خەڵکی نەتوانن جێبەجێی بکەن -هەرچەندە لەسەر هەقیش بێت- چونکە ئەوە کارەکە بێواتا و بێئەرزش دەکات و فەرمان کاریش شکۆی لەدەست دەدات.

* ئەگەر دەستت کرد بە وازهێنان لە خراپە، ئەوا بە گەورەترینیان دەست پێ بکە چونکە لە ناوبەرن، خۆ ئەگەر دەستت کرد بە ئەنجامدانی چاکە لە نزمترینیان دەست پێ بکە تا تووشی نشوست و سستی نەبێت.

* مادام تۆ لەسەر هەق بیت هەڵمەخڵەتێ بە زۆری، هەروەها کەمیش کارت تێ نەکات.

*هەرچەندە کات لە مرۆڤ نزیک ببێتەوە، ئیسلام زیاتر گرنگی پێ دەدات، لە قورئان و سوننەتدا زۆرتر باسی کاتژمێرەکانی ژیانی مرۆڤ کراوە، پاشان ڕۆژەکانی، پاشان هەفتەکانی، پاشان مانگەکانی، پاشان ساڵەکانی، چونکە مرۆڤ وابەستەیە بەو ساتەیەوە.

* بنەمای ڕازیبوون بە بەشی خودا ئەوەیە مرۆڤ نیعمەتەکانی بەراورد بکات بە کەسانی خوار خۆی، لە فەرموودەدا هاتووە: «سەیری ئەوانە بکە کە لەخوار خۆتن، سەیری ئەوانەی سەروو خۆتەوە مەکەن، ئەمە زۆر یارمەتی دەرە کە سپڵەیی نەکەن بەرانبەر نیعمەتەکانی پەروەردگارتان.»

* هەرکەس بڕوانێتە خوار خۆی، سوپاس گوزار دەبێت، بەڵام ئەوەی بڕوانێتە سەروو خۆی، سپڵە دەبێت بەرانبەر نیعمەتەکان «سەیری ئەوانە بکە کە لەخوار خۆتن، سەیری ئەوانەی سەروو خۆتەوە مەکە، ئەمە زۆر یارمەتی دەرە کە سپڵەیی نەکەن بەرانبەر نیعمەتەکانی پەروەردگارتان.»

* بە تەنها ڕوانیین بۆ کردارەکان بەبێ سەرئەنجامەکانیان بە کورت بینینی هەژمار دەکرێت، سەرەتا و سەرئەنجامەکان لەیەک دابڕێنیت، پەیامبەری خودا مزگەوتی ضراری ڕووخاند لە کاتێکدا جێگەی پەرستش بوو، بەڵام ئەو کارەی بەهۆی نییەت خراپی ئەو کەسانەوە کرد کە دروستیان کردبوو.

* دڵنیا و ئەمین مەبە لەو کردەوە خێرانەی دەکرێت تا دڵنیا نەبیت لەو دەستەی کە ئەنجامی داوە و ژیاننامە و فکریان نەزانی، پەیامبەر (ﷺ) مزگەوتی ضراری ڕووخاند، بەڵام لە مزگەوتی قوبا نوێژی کرد، هەردووکیان مزگەوت بوون، بەڵام ڕوانین بۆ پشت کردەوەکان بە سەرنج گیراوە.

* زۆرینەی هەڵەکانی مرۆڤ لە دەرئەنجامی بڕیار و حوکمەکانیدا بەهۆی ئەوە دروست دەبێت کە دەڕوانێتە یەک لایەنی بابەتەکان، بێئاگایە لە لایەن و ئەنجامەکانی دیکەی ئەو بابەتە، خۆ ئەگەر ئەو بابەتەی لە هەموو لایەنەکانەوە سەیری بکردایە، وەک ئەو تاکە لایەنەی کە سەیری کردووە، ئەوا حوکم و بڕیارەکەی دەگۆڕی، بۆیە خودا لە پاش باسکردنی سنوورەکانی هاوسەرگیری و میرات و ئافرەتان باسی ناوی (العلیم) البقرة٣٢ دەکات، تاکوو ئاماژە بێت بەوەی ئەو حوکمە بە زانستێکی زۆر وردەوە دابەزێندراوە.

* بزانە هەموو ئەو کەسانەی کە خودات تووڕە کردووە بۆ ڕازیکردنیان، هەر دەبێت ڕۆژێک تووڕەت بکەن بۆ ڕازیکردنی کەسانێکی دیکە.

* هەموو ئەوانەی خودات تووڕە کردووە بۆ ڕازیکردنیان، هەر دەبێت ڕۆژێک تووڕەت بکەن بۆ ڕازیکردنی کەسانێکی دیکە، تۆ ڕازیکردنیان لێگەڕێ بۆ خودا پێش ئەوەی ڕازی بوونت وازلێ بهێندرێت بۆ جگە لە خودا.

* خۆشەویستی خودا لە ئاسمانەوە بۆ بەندەکەی دادەبەزێت، نەک خەڵکی لە زەویدا لەسەریەکتر بیسەپێنن، لە فەرموودەدا هاتووە لە ئاسماندا بانگبێژێک جاڕ دەدات: «خودا فڵان کەسی خۆش دەوێت، خۆشتان بووێت.»

* ڕازیبوون و قبووڵبوونی بەندە لەناو خەڵکیدا لە ئاسمانەوە دادەبەزێت نەک لە زەوییەوە بەرز ببێتەوە، ئەوەی لە ئاسمانە یەکێکە، بەڵام ئەوانەی سەر زەوی چەندان ئوممەتن یەکیان ڕازی بکەی ئەوی دیکەت لێ دەڕەنجێت. خودا ڕازی بکە، خەڵکی ڕازی دەبن.

* پێگەی شایستە داوا ناکرێت، هەرکەس خودا لە ناو دڵیدا بێت، خودا دەیخاتە ناو دڵی خەڵکییەوە.

* کۆتا ئایەت کە دابەزی یادی کۆتا مەنزڵمان وەبیر دەهێنێتەوە: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ [البقرة: ٢٨١]

«بترسن لە ڕۆژێک دەگەڕێنرێتەوە بۆ لای خوا لەپاشان دەدرێتەوە بە هەموو کەسێک (پاداشت و سزای) ئەوەی کردوویەتی و ستەمیان لێ ناکرێت.»

ئیبن عەباس دەڵێت: "ئەمە کۆتا ئایەت بوو لە قورئان کە دابەزی."

* لە وتەی خودادا ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ [العنكبوت: ٥٧] «هەموو نەفسێک دەبێت چێژی مردن بکات، پاشان دەگەڕێندرێتەوە بۆ لامان.»

پرسە و ماتەمینیە بۆ هەموو مرۆڤەکان کە مردن دەرگایەکە دەبێت هەموو خەڵکی پیایدا گوزەر بکەن.

* ڕاکردن نییە لە مردن بەڵکوو خۆی بۆ ئامادە دەکرێت، مرۆڤ بەرەو ڕووی دەڕوات، بەڵام وا گومان دەبات لێی هەڵدێت: ﴿لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ﴾ [الأحزاب: ١٦]

«هەڵهاتن سوودتان پێ ناگەیەنێت ئەگەر لە مردن یا کوشتن هەڵبێن خۆتان بدزنەوە.»

﴿إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ﴾ [الجمعة: ٨]

«بەڕاستی ئەو مردنەی کە لێی ڕادەۆن بێگومان پێتان دەگات و تووشتان دەبێت.»

* خەڵکی سوود لە ڕووکاریان نابینن. لە فەرموودەدا هاتووە: «پیاوانی گەورە و قەڵەوی وەها دێنن لە قیامەتدا سەنگی باڵە مێشوولەیەکی نییە.» ئەگەر ویستان ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا﴾ [الكهف: ١٠٥]

«لە ڕۆژی دواییدا هیچ نرخ و ڕێزێکیان بۆ دانانێین.»

* فیرعەون دەربارەی مووسا گوتی: ﴿هُوَ مَهِينٌ﴾ [الزخرف: ٥٢]

بێڕێزە. واتە: بێڕێز کراوە، بەڵام خودا دەربارەی دەفەرموویێت: ﴿وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾ [طه: ٤١]

«تۆم هەڵبژارد بۆ خۆم.»

زۆرجار سەرکردەکانی دونیا بەندەیەکیان لا بێڕێزە، بەڵام لە کاتێکدا ئەو هەڵبژێردراوە لای پاشای ئاسمانەکان و زەوی.

* بێبەش ئەو کەسە نییە کە بێتوانایە، بەڵکوو بێبەش ئەو کەسەیە کە کردەوە چاکەکان واز لێ دەهێنێت لە کاتێکدا تواناى هەیە و هۆکارەکانی بۆ فەراهەم کراوە.

* هەموو بینەرێک بەرچاو ڕوون نییە: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ﴾ [الحج: ٤٦]

«لە ڕاستیدا چاوەکان کوێر نابن، بەڵکوو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە لە سینەکاندان.»

* ئەگەر خودا لە دڵدا گەورە بوو، کردەوەی ئەندامەکان گەورە دەبن.»

* هەرکەس ئەو شتانە ببینێت کە بەدەستی خودان، ئەوا ئاوڕناداتەوە بەلای دەستەکانی دیکەدا.

* گەورەترین کەس ئەو کەسەیە لە پاش مردنی سوودی زیاتری لێ وەرگیرێت وەک لە ژیانیدا.

* هەرکەس خەڵکی ناوی زیندوو ڕاگرن، ئەوا ناوی نامێنێت بە مردنی ئەو خەڵکە، بەڵام هەرکەس خودا ناوی بەرز ڕابگرێت، ئەوا خودا زیندووە و هەرگیز نامرێت.

* تۆ لەو شوێنە بە کە خودا دەیەوێت، هەرچەندە لای خەڵکیش نەناسرێیت.

* ئەگەر بەرەو خودا ڕێ دەکەیت، ئەوا وەسفی ڕێگاکەی لە خۆی نەبێت لە کەسی دیکەوە وەرمەگرە.

* ئەگەر مرۆڤ نێوانی خۆی و خودای چاک کرد، ئەوا خودا نێوانی ئەو و خەڵکی چاک دەکات، ئەو کەسەی سەرقاڵە بە خودای تاک و تەنهاوە، ئەوا بێپێویستی دەکات لە هەموو خەڵکی.

* هەرکەس لە دڵیدا خەمی گەورەیەکی هەڵگرتبوو، ئەوا با گەورەیی خودا بێنێتە بەرچاوی ئیدی جگە لەوی لە لا بچووک دەبێتەوە.

* خودا شکۆ و گەورەیی تایبەتی هەیە، ئەگەر لە دڵتدا بەدیت نەکرد، ئەوا لە وتە و کردارەکانیشتدا بەدی ناکەیت.

* پارێزگاری لە دین و دونیات بکە، خۆ ئەگەر دژیەک وەستان ئەوا دونیات ملکەچ بکە بۆ دینەکەت و بەڕێ بکەوە بەرەو خودا.

* لەسەر شانی هیچ کەسێک مەمێنەوە هەرچەندە بەرزیشت بکەنەوە، چونکە ئەگەر کڕنووش ببەن بۆ جگە لە خودا، ئەوا تۆش کڕنووش دەبەیت لە گەڵیاندا.

* زۆرن ئەوانەی خەڵکی بەرزیان دەکەنەوە، ئەگەر کەسانی بەرزکەرەوە نەمان، ئەوا کەسی بەرزکراوە دەکەوێت، ئەو کەسەشی خودا بەرزی بکاتەوە، هەرگیز ناکەوێت، چونکە خودا بەردەوامە و نەمانی بەسەردا نایات.

* هەڵەکانت لە ناخی خۆتدا باس بکە، پێش ئەوەی هەڵەی خەڵکی باس بکەیت.

* هەرکەس پشت ببەستێت بە شتێک جگە لە خودا، خودا دەیکاتە هۆکاری سەرگەردانی و سزا بۆی.

* مەڕوانە ئەوەی لە دەستی خەڵکیدایە، خەڵکی و ئەوەشی لەدەستیاندایە لە دەستی خودادان.

* متمانەی خۆت مەسپێرە بە ئەو کەسەی کە دەترسی پەیوەندییەکانی لە گەڵتدا بپچڕێنێت، متمانەت تەنیا بە خوا بسپرە، چونکە پەروەردگار پەیوەندیی لەگەڵ کەس ناپچڕێنێت مەگەر ئەو کەسە دەست پێشخەر بێت. پەروەردگارمان بۆ پێویستی پەیوەندیت پێوە ناکات، لە بێپێویستیش پەیوەندیت نا پچڕێنێت، بەڵکوو لە هەردوو حاڵەتەکە هەر تۆ پێویستت بە پەروەردگارتە.

* ڕێگە مەدە خاوەن ئارەزووەکان بەرزت بکەنەوە، چونکە لە ژێر ڕەحم و سۆزی ئەواندا دەمێنیتەوە، یان پشتگیری دەکەیت یان دات دەبەزێنن.

* مانەوە لە چاڵ و نشێویدا زۆر باشترە لە بەرزبوونەوەت لەسەر پیسی.

* دەکرێت شتانێک لە حەقی تۆدا دروست بن کە لە حەقی کەسانی دیکەدا دروست نەبن، بەهۆی جیاوازی پێگەیان بە بەراورد بە تۆ، مرۆڤ بینین و بینایی هەیە، مەودای تێڕوانینی دەگۆڕێت بە پێی شوێنی، چونکە قسە تیرە و هەموو نیشانەکانیش لە یەک چێوە نابینرێن.

* وتەکان وەک تیر وان، هەمووان دەی هاوێژن، بەڵام کەسی دانا ئەو کەسەیە نیشانەی قسەکانی دەزانێت، وەک چۆن نیشانەی تیرەکانی دەبینێت.

* ئەوە وتەی تۆ نییە کە لە زارت هاتووەتە دەر، بەڵکوو ئەوە وتەی تۆیە کە خەڵکی لێی تێدەگەن.

* زۆر زیاتر چاودێری وتەکانت بکە کە چۆن خەڵکی لێی تێدەگەن بەراورد بەوەی چاودێری ئەوە بکەی کە چۆن دەردەچێت لە زارتەوە.

* ئەگەر خۆشەویستی کوێرت بکات لە خراپەی ئەوانەی خۆشت دەوێن، ئەوا ڕقیش کوێرت دەکات لە چاکەی ئەوانەی ڕقت لێیانە.

* زۆرجار گوریس بە دەستی ئەو کەسەوە دەقرتێت کە دەیەوێت توندی بکاتەوە.

* سەرنج ڕاکێشان کارێکی ئاسانە، بەڵام ئەقڵ ڕاکێشان کارێکی قورسە.

* پلەبەندی لە سەرەتاوە دەبێتە هۆی جێگیربوون لە کۆتاییدا، هەرکەس پەلە بکات لە سەرەتادا، ئەوا جێگیر نابێت لە کۆتادا.

* بۆچوونی بەتەمەنێک لە تێڕوانینی بۆ ڕووداوەکان وردتر و نزیکترە لە ڕاستییەوە لە بۆچوونی لاوێکی تازە پێگەیشتوو، هەرچەندە بەتەمەنەکە دووریش بێت لە ڕووداوەکەوە و لاوەکە نزیکی ڕووداوەکە بێت، عەلی کوڕی ئەبوو تالیب دەڵێت: "بۆچوونی بەتەمەنێک باشترە لە بینینی ڕاستەوخۆی لاوێک."

* پلەو پایەی خەڵکی دوای مردنیان دەزانرێت، چونکە ترس و ئومێدی خەڵکی نامێنێت، نە لە خۆیان و نە لە نەیارەکانیشیان.

* بوێرترین کەس لە سەرەتاکاندا نەزانترینیانە بە کۆتایی و سەرەنجامەکان.

* حیکمەت و کارجێیی بەزایە دەچێت لەنێوان پەلەکاران و تەمبەڵ و سستەکاندا.

# ناوەڕۆک




**شێخ تەریفی یەکێکە لەو کەسانەی لەم سەردەمەی ئێمەدا کە قسەکانی لە هیچ ڕووداوێک لە ڕووداوەکانی ئوممەتدا ون نابن، بەڵکوو وای لێهاتووە کە قسەکانی ئەو گونجاوترین بن بۆ هەر بابەتێکی زیندووی ناو ئوممەت، لەوانەیە باوەڕ نەکرێت کە پیاوێک سەرەڕای وەستانی لە نووسین بۆ ماوەی نیو دەیە، هێشتا قسەکانی پێشەنگن لەنێو هەموو ڕووداوێکدا.**

**ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، بەبێ هیچ زێدەڕۆییەک، زیاتر باوەڕ ئەوە دەکەم کە شێخ تەریفی سەرسووڕهێنەری سەردەمی خۆیەتی، چونکە ئەو ئەوکەسەیە کە تەنانەت توندڕەوترین دژەبیرەکانیشی ناتوانن نکۆڵی لە بڵندیی ئاستی زانستی بکەن! ناتوانرێت نکۆڵی لە دانایی ئەو بکرێت.**

**هەرچەندە ستەمکاران ئێستا بیشارنەوە، بەدڵنیاییەوە مێژوو یادی دەکاتەوە، وە نەوەکانی داهاتوو لەڕیزی گەورە زاناکاندا دای دەنێن.**







نرخ : ١٢٠٠٠ دینار